# وێنەی کورد

## لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا

نووسینی
حەیدەر لەشکری

وەرگێڕانی
د. محەمەد تاتانی

# وێنەی کورد
# لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا

## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی ڕەخنەییە

نووسینی : حەیدەر لەشکری
وەرگێڕانی : د. محەمەد تاتانی

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

هەرێمی كوردستان
سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی كوردۆلۆجی

❖ ناوی كتێب: وێنەی كورد لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا
❖ نووسەر: حەیدەر لەشكری
❖ وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: د. محەمەد تاتانی
❖ پیتچنین: وەرگێڕ
❖ دیزاینو سەرپەرشتیی چاپ: بریار فەرەج كاكی
❖ بەرگ: كەمال عەلی
❖ ژمارەی سپاردن: ١٦٨٣ / ساڵی ٢٠٠٩
❖ چاپخانە: رەنج/ سلێمانی
❖ تیراژ: ١٠٠٠ دانە
❖ نرخ:٣٠٠٠ دینار
❖ زنجیرە:٤٣

مەڵبەندی كوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/ ١٠٥، كۆڵان/ ٢٥، ژ.خانوو/ ٤، ژ. پۆست/ ٩٥
تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣
www.kurdology.com
kteb@kurdology.com

# ناوەڕۆك

## هێما و وشه کورت کراوەکان

| وشه | هێماکەی | وشه | هێماکەی |
|---|---|---|---|
| توفي | ت | لاپەڕە | ل |
| هجري | هـ | المصدر نفسه | م. ن |
| ميلادي | م | المصدر السابق | م. س |
| الهجري الشمسي | هـ. ش | المصدر نفسه (بۆ سەرچاوە فارسییەکان) | ن. م |
| جزء | ج | هەمان سەرچاوە | هـ. س |
| مجلد | مج | لاپەڕە (بۆ سەرچاوە ئینگلیزییەکان) | P |
| القسم | ق | لاپەڕەکان | PP |
| بدون تاريخ نشر | د. ت | هەمان سەرچاوە | Ibid |
| صفحة | ص | سەرچاوەی پێشوو | Op. Cit |
| صفحات | ص ص | | |

# پێشەکی

## ١- بابەتی لێکۆڵینەوەکەو چوارچێوەی میتۆدی

زانینی مێژوویی بەشێکی زیندووی رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامیی پێك دەهێنا لە چاخە کلاسیکییەکەیدا[1]، لەو سەردەمەدا عەقڵی هەندێك لە دەستەبژێرە رۆشنبیری و ئاینی و سیاسییە ئیسلامییەکە بەم زانینەوە خەریك بوو و بە جۆرێك لە جۆرەکان گوزارشت بوو لە تێڕوانینی ئەوان بۆ رابردووی ئینسانی، چ لەسەر ئاستە جیهانییەکەی بێت، یان لەسەر ئاستی کایەی ئیسلامی، واتە ئەو مەودا شوێنییەی ئیسلامی تیا بڵاو بوویەوە و بنەماکانی تیایدا باڵادەست بوون. بەو واتایەی ئەم زانینە مێژووییە رەنگدانەوەی شێوازی بیرکردنەوەی ئەوانە بوو، کە بە خوێندنەوەیەوە خەریك بوون. پاشان تۆمارکردنی ئەو هەواڵانە بوو، کە لە رابردوودا روویان دابوو.

---

(1) بەکارهێنانی زاراوەی (چاخی ئیسلامی کلاسیکی)، لەناو لێکۆڵەرە تازەکاندا باوە، بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە فەزای رۆژهەڵاتی ناوەڕاستن، ئەمەش وەك هەوڵێکە بۆ دەرچوون لە باڵادەستیی رۆژئاوا لە دیاری کردنی چاخە مێژووییەکانداو دابەشکردنی ئەم مێژووە ـ بە پێی سەنترالیزمی رۆژئاوا ـ بۆ مێژووی کۆن و مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و مێژووی نوێ و هاوچەرخ. ئێمە ئەم زاراوەمان پێ باش بوو بۆ (سەردەمی ئیسلامی ناوەند)، چونکە دابەشکردنەکەی رۆژئاواییەکان بەردەوامیی ئیسلام و کاریگەریی لەسەر رەوتی رووداوەکان لەناو دەبات بە بێ ئەوەی ئەمە مانای کورتکردنەوەی رووداوەکان و بەستنەوەیان) بێت بە ئیسلامەوە ـ واتە هۆکاری ئاینی ـ و کاریگەریی رەهای لەسەر رەوتی مێژوو. ئەمەو جگە لەوەی سەدەکانی ناوەند لە کایەی رۆژئاواییدا چەمکێکی سەلبییە، لە کاتێکدا لە هەمان ئەو قۆناغەی مێژووی رۆژهەڵاتدا ئەم سەلبییەتە کەمترە.

یەکێك لە ناونیشانەکانی ئەم زانینە (ئیسلامی بوون)یەتی، بۆیە ئەگەر بیویستایە هاوڕەوت یان گونجاو بێت لەگەڵ گوتاری مەرجەعیەتی ئاینی ـ ئیسلامیدا، کە داوای یەکتر ناسین دەکات لە نێوان میللەت و نەتەوەکاندا، لەسەری پێویست بوو ـ بە جۆرێك لە جۆرەکان ـ مێژووی نەتەوەکانی ناو ئەم عەقیدەیە لە خانەکەی خۆیدا (خانەی ئیسلام) لەخۆ بگرێت، هەروەها پێویست بوو مێژوونوسیش لە کاتی تۆمارکردنی مێژوودا سەرجەم جیاوازییە ئەتنی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسی و تەنانەت ئاینییەکانی ناو ئەم کایەیە ببینێت.

بەڵام ئایا زانینی مێژوویی توانیویەتی ئەم جیاوازییانە ببینێت؟ ئایا مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەم جیاوازییانەدا بەردەوام ئیجابی و بێ لایەنگیری و دادپەروەرانە بووە و لەگەڵ گوتاری ئاینیدا گونجاوە؟ یان ئایا مێژوونوسەکان کاریگەر نەبوون بە چوارچێوە گشتییە دیاریکراوەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤ، بە تایبەتی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی ـ سیاسی؟ با ئەم پرسیارە بە شێوەیەکی تر دابڕێژین: ئەو چوارچێوانە چی بوون، کە بیرکردنەوەی مێژوونوسیان دیاری دەکرد، کاتێك لەناو هەموو کەس و کۆمەڵ و ناوچەکاندا، هەواڵی کەسێك، یان کۆمەڵێکی مرۆیی و ناوچەیەکی دیاری کراوی تۆمار دەکرد؟ لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین بە تەرکیزکردنە سەر مامەڵەکردنی ئەم زانینە لەگەڵ کۆمەڵێکی مرۆییدا، کە کوردە، وەڵامی ئەم پرسیارانە و پرسیاری تریش بدەینەوە، هەروەها دەمانەوێت چۆنیەتی باسکردنی ئەم کۆمەڵەیە وەك یەکەیەکی مێژوویی سەربەخۆ، لە لایەن مێژوونوسەکانەوە روون بکەینەوە و دەشخوازین ماهیەتی ئەو ئالییەتە دەر بخەین، کە لە کاتی ئەم باسکردنەدا، تەحەکومی بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی ئەم مێژوونوسانەوە دەکرد. بە دەربڕینێکی تر، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە بارەی ئەو بۆچوون و وێناکردنانەوەیە، کە لەسەر ئەم کۆمەڵە مرۆییە شێوەگیر بوون و دیاریکردنی ئەو رووبەرەشە، کە مێژوونوس ـ لە پرۆسەی نوسینەوەی مێژوودا ـ تایبەتی دەکات بە بوون و کارایی مێژووییان.

بێگومان، وێنەیەکی کورد هەیە، کە لە چاخە مێژووییە ئیسلامییەکاندا شێوەگیر بووە و زانینی مێژوویی لە گێڕانەوە و کتێبە جۆراو جۆرەکانیدا بەرجەستەی کردووە. بۆ ئەوەی سەرەتای شێوەگیر بوون و پرۆسەی گشتاندنی ئەم وێنەیە بزانین، پێویستە چینە کەڵەکە بووەکانی ئەم زانینە هەڵکۆڵین و گوتارە عەقیدەیی و میتۆدییەکانی

هەڵوەشێنینەوە، بە بێ ئەوەی ئەمە مانای ئەوە بێت، کە ئەم پرۆسەی هەڵکۆڵین و هەڵوەشاندنەوەیە دەمان گەیەنن بە وێنەیەکی راستەقینە ـ رەسەنی کورد، چونکە ئەم وێنە شێوەگیربووەی کورد پەیوەستە بە تێڕوانین و هەڵوێستی عەقیدەیی سەرجەم نەوەکانی مێژوونوسان، بۆیە ئەرکی هەر هەڵکۆڵین و هەڵوەشاندنەوەیەك دەبێتە گەیشتن بەم تێڕوانین و هەڵوێستانە، نەك گەیشتن بەو دیویان و وێنە راستەقینەکەی کورد، کە ئەستەمە تەنها بە پشتبەستن بە دەقی کتێبەکان، پەی بە هەموو رەهەندەکانی ببرێت.

سەرەتا دەبێت ئەوە بلێین، کاری ئێمە ئەوەندەی باسکردنی سوڕانەوەی مێژوونوسانە بە دەوری هەڵەو راستیی مێژووییدا، ئەوەندە دەرخستنی ئەم دوو چەمکە نییە لە گێڕانەوە مێژووییەکاندا، پاشانیش کرۆکی بابەتەکەمان شیکردنەوەی گێڕانەوەکانە بۆ زانینی مەبەست لە هێنانیان و رەخنەگرتنە لەو زەینییەتەی تۆماری کردوون یان گێڕاونییەتەوە. بەڵام کاتێك رەخنە لە مێژوونوسەکان دەگرین و گومان لە راستگۆیی گێڕانەوەکانیان دەکەین، هەرگیز مەبەستمان ئەوە نییە لە شان و شکۆو واقیعییەتیان کەم بکەینەوە، یان لە سودی بەرهەمەکانیان کەم بکەینەوە سەبارەت بە رۆشنبیریی ئیسلامی وەك گشتێك، ئێمە هەوڵی ئەوە نادەین و ناشمانەوێت رێژەی راستگۆیی و هەڵەگۆیی مێژوونوسەکان بسەلمێنین، بەڵکو دەمانەوێت رادەی ماقولێەتی گوتراوەکانی ئەوان دەربخەین، لەگەڵ ئاستی پەسەندێتییەکەی لە سەردەمەکەیاندا ، ئیتر گرنگ نییە راست بێت یان هەڵە.

کەواتە لێکۆڵینەوەکە هەوڵدانە بۆ روونکردنەوەی تێگەیشتنی زانینی مێژوویی ئیسلامی لە حەقیقەتی مێژوویی لە میانەی مامەڵەکردنی لەگەڵ کورد و هەروەها روونکردنەوەی ئەو چوارچێوانەیە، کە دەبنە دیاریکەری تێڕوانینی ئەم زانینە لەم حەقیقەتە یان لەو رووداوانەی دەیانگێڕێتەوە، یاخود لەوەی کە هەر دەبێت بیگێڕێتەوە. جگە لەمە ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی گوتاری مێژوویی ئیسلامی دەدات لە ناوەوە و لە میانەی باسکردنی کورد وەك یەکەیەك، کە خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندییە و ئەم تایبەتمەندییانە لە یەکە پێکهێنەرەکانی تری ئەم گوتارە جیای دەکەنەوە. بە بۆچوونی ئێمە گرنگیی ئەم پرۆسەیەش لەوەدایە کورد سەر بەوانەن، کە ناونراون هێزی پەراوێز یان دەوروبەر بەرامبەر ئەو سەنتەرەی، کە لە زۆربەی بارەکاندا ئەم گوتارە دەدرێتە پاڵی. لەبەر ئەمە پێمان وایە ناتوانین لەوە تێبگەین، کە مێژوونوس

تۆماری دەکات، ئەگەر بێت و لەو سیاقە مێژووییەدا دای نەنێین، کە مێـژوونوس تیایـدا ژیاوە و نەیخەینەوە ناو ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتی ـ سیاسـی ـ هزرییـەی بیرکردنەوەکـەی ئاراستە دەکات.

بۆیـە ئـەم بابەتـەمان هەڵبـژارد، چـونکە قەناعـەتمان وایـە ئـەم جـۆرە بابەتانـە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی ئەکادیمییان لەسەر نەکراوە و زۆربەی لێکۆڵینـەوەکانی پێـشتر لـە بـارەی کـورد لـە چاخی کلاسـیکی ئیـسلامیدا، تـەنها گـەڕانن بـە دوای حەقیقەتـە مێژووییەکاندا بە مەبەستی کۆکردنـەوە و تۆمارکردنیـان بـە پێـی ئـەو پلانـە گـشتییەی لێکۆڵەر هەڵیبژاردووە. بەڵام لێکۆڵینەوە لەوەی لە پشت تۆمارکراوە مێژووییەکانەوەیە ـ واتە مێژوونوس و هزرەکەی و چوارچێوەی ئـەم هـزرەی ـ زۆر بـە کـەمی قـسەی لەسـەر کراوە، ئەم لێدوانە کەمانەش لە پێشەکیی لێکۆڵینەوەکانیاندایە؛ بە تایبەتی لەو کاتەدا هـەوڵی دیـاریکردن و شـیکردنەوەی ئـەو سەرچـاوانەیان داوە، کـە تایبـەتن بـە لێکۆڵینەوەکەیان. زۆربەی جاریش ئـەم دیاریکردن و شـیکردنەوانە لـەوە دەرناچـن، کـە بریتیـن لە پێناسەی مێژوونوس و کتێبەکەی، ئەمەش لەبـەر ئەوەیـە ئـەم لێکۆڵینەوانـە گرنگییان بە بابەتی تۆمارکردنی مێژوویی و چۆنیەتی بەرهـەمهێنانی زانـینی مێـژوویی نەداوە لە چوارچێوەیەکی شارستانیی دیاریکراودا.

ئەو ماوە زەمەنییـەش، کـە لێکۆڵینەوەکـە وەری گرتـووە، بـە سـەرهەڵدانی زانینـی مێژوویی ئیسلامی لە سەدە سەرەتاییەکانی کۆچییەوە دەست پێدەکات تـا سـەردەمی بیرمەند و مێژوونوسی گەورە عەبدولڕەحمان کوڕی خەلدون (٨٠٨ك مردووە). لێـرەدا دوو پرسیاری رەخنەیی سەر هەڵدەدەن: یەکەم ئەوەیە: ئایا ئەم ماوەیە لەوە درێژتر نییە، کـە یەك لێکۆڵینەوە بتوانێت دایپۆشێت و مافی خۆی پێ بدات؟ پرسیاری دووەمیش ئەوەیە: بۆچی لێکۆڵینەوەکە بە سەردەمی ئیبن خەلدون کۆتایی دێت؟ وەڵامان بۆ پرسـیاری دووەم ئەوەیە ئیبن خەلدون ئەو کەسـەیە، کـە هـزری مێـژوویی ئیـسلامی لەسـەر دەستی ئـەو گەیـشتە ئەوپـەڕی قووڵبوونـەوە و پێگەیـشتن، چـونکە زۆر تیـۆری رەسـەنی لـە بـارەی مێژووەوە پێشکەش کرد، کە رەنگدانـەوەی تێگەیـشتنە شـیکردنەوەیی و گـشتگیرەکەی بوون لە مێژووی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان لە ناویشیاندا کورد. تیۆرەکانی ئـیبن خەلـدون وەرچەرخانێکی ریشەیی بوون لە مامەڵەکردن لێکۆڵینەوەی مێژوو و تێڕوانین لە رووداوە جیاوازەکانی و پەیوەندیی دیالێکتێکیی نێوان ئەم رووداوانە. بۆیە دانـانی ئـیبن خەلـدون

وەك خاڵی کۆتـایی لەوێوەیـە ئـەو دابڕانێکـی ئاشـکرا دەنوێنێت لـە زانینـی مێـژوویی ئیسلامیدا.

بەڵام سەبارەت بە درێژی ماوەی نامەکە، پێویستە ئاماژە بەو گومانانە بکەین، کە هەندێك کەس هەیانە و پێیان وایە یەك لێکۆڵینەوە، کە لاپەڕەکانی سنوردارن، ناتوانێت بە تەواوی پەی بە پێگەی کـورد ببـات لـە زانینـی مێـژوویی ئیـسلامیدا. ئێمـە لەگـەڵ هەندێك لە گومانەکانی ئەمانەداین، ئەگەر بێت و لێکۆڵینەوەکە تەنها بریتیی بێت لـە گێڕانـەوە و باسـکردنی رووداوەکـانی ئـەو ماوەیـە و دەرخـستنی سـیما و رەهەنـدە جیاوازەکانی مێژووی کورد تیایدا. بەڵام کاتێك لێکۆڵەر بیەوێت لەم لێکۆڵینەوەیەدا لـە باسکردن و گێڕانەوەی رووداوە یەك لە دوای یەکەکان دەرچێت، تەنها لە کاتی پێویـستدا نەبێت، ئەوا بە رای ئێمە ئەم گومانانە دەڕەونـەوە یـاخود لـەجێی خۆیانـدا نـین، چـونکە لێکۆڵینەوەکـە شـیکاری و رەخنەییـە و تـەنها تـەرکیز دەکرێتـە سـەر لێکۆڵینـەوەی بیرۆکـەکانی وەك ریـشەی کـورد و سروشـت و بـوون و پێگـەی دەسـەڵاتدارانە و کـارایی مێژوورییان و چۆنیەتیی دەستاودەست کردنـی ئـەم بیرۆکانـە لـە هـەموو سـەردەمەکاندا. لێرەدا پێویستە ئەوەمان بیرمان نەچێت ئەستەمە بتوانین لەم بیرۆکانەوە وێنەیەکی روونی کورد بەدەست بهێنین، ئەگـەر بێـت و ئـەم مـاوە درێـژە وەرنـەگرین و لێـی نەکۆڵینـەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا میکانزمی ئیشکردنی زانینـی مێـژوویی ئیسلامیمان بۆ دەرکەوێت. یەکێك لە تایبەتییەکانی ئەم ماوە درێـژەش تێبـینی کردنـی زەینییەتی بەرهەمهێنـەرەکانی مێـژووە بـە شـێوەیەکی ورد و قـووڵ، هـەروەها تێبـینی کردنی بۆچوونە باسکراوەکانە لە بارەی بیرۆکـەی لێکۆڵینەوەکـە و سـەرجەم پێکهێنـەر و رەهەندە جیاوازەکانییەوە.

هەنـدێکی تـر گومـانی ئـەوە دەکـەن لێکۆڵـەر ناتوانێـت پـەی بـە گـشت هـەواڵ و مێژوونوسەکانی ئەم ماوەیە ببات، کـە تایبەتـە بـە لێکۆڵینەوەکـە، ئێمـەش لەگەڵیانـدا هاوڕاین، بەڵام بۆ ئـەوەی بـە پێـی توانـا خۆمـان لـەم کـەم و کوڕییـە لادەیـن ـ وەك لـە شیکردنەوەی سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێدەکەین ـ پـەنامان بردووەتـە بـەر مانـدوو بـوونی ئەو لێکۆڵەرە کوردانەی لەم ساڵانەی دواییدا لە رێگەی لێکۆڵینـەوە ئەکادیمییەکانیانـەوە مێـژووی ئـەم مـاوە درێـژەیان داپۆشـیوە و لـە بـواری پـسپۆڕییەکانی خۆیانـدا زۆر لێکۆڵینەوەی باشیان پێشکەش کـردووە. ئەمـە لـە لایەکـەوە، لـە لایـەکی تـرەوە ئێمـە

کاتێك لە بەرهەمی مێژوونوسە موسڵمانەکان دەکۆڵینەوە، دێین کورد دەکەین بە سەنتەر و تێڕوانینی هەموو ئەم مێژوونوسانە کۆ دەکەینەوە و لەگەڵ یەك دایان دەنێین بۆ خوێندنەوەی ئەم مەرکەزیەتە کوردییە، بە بێ ئەوەی ئەمە مانای لەبیرکردنی جیاوازییەکانی نێوان ئەم مێژوونوسانە و پێکهاتە هزرییەکانیان بێت بە پێی چوارچێوەی کاتی و شوێنیی هەر یەکەیان و پەیوەندییان بە کوردەوە. بەڵام لای ئێمە، بە پلەی یەکەم لە سەرجەم وێستگەکانی بەرهەمی مێژوویی ئەم ماوە درێژەدا، مەرکەزیەتی کورد ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکە و شیکردنەوەی بۆچوون و تێڕوانینی مێژوونوسەکان دیاری دەکات.

بێگومان مەرکەزیەتی کوردیش، هەرگیز مانای پێدانی چەمکێك نییە بە کورد، کە پێچەوانەی چەمکە ناسراوەکەی ئەو سەردەمە بێت، چونکە ئەو چەمکەی لەو سەردەمەدا هەیبووە، ئەوە نییە، کە ئەمڕۆ دراوە بەم ناوە ئەتنییە. چەمکە تازەکەی ئەمڕۆ بە کاریگەریی نوێگەری و پەرەسەندنە کۆمەڵایەتی ـ سیاسیی و ...هتد، بارگاوییە بە کۆمەڵێك دەلالەتی وەك (نیشتمانپەروەری) و (نەتەوایەتی)، کە لەسەردەمی پێشوودا ئەو دەلالەتانە ئەم هێز و کاریگەرییەی ئێستایان نەبووە. ئینتیما بۆ کورد ـ لەم لێکۆڵینەوەیەدا ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی ئینتیمای تاکەکانی ئەم کۆمەڵە مرۆییە، کاریگەریی ئەم ئینتیمایە کاریگەرییەکی کەمترو لاوازتر نەبووە لە کاریگەریی هێز و توانای جۆرەکانی تری ئینتیما وەك ئینتیمای خێڵەکی ـ لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی ـ و ئینتیمای ئاینی ـ لەسەر ئاستی عەقیدەیی ـ و ...هتد.

ئێمە کاتێك لە ڕووی میتۆدییەوە، لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، لە کورد دەکۆڵینەوە و لە مەرکەزدا دایان دەنێین، ڕەوتی مێژوویی ڕووداوە گشتییەکان پشتگوێ ناخەین، چونکە ئەم ڕەوتە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی باشتر لە پێگەی کورد تێبگەین لەو سیستەمە زانینییەدا، کە لێی دەکۆڵینەوە. بۆ ئەوەی بە ئاسانیش لەم ڕەوتە تێبگەین و پەی بە سەرجەم ڕەهەندەکانی سیستەمەکە ببەین، تەنها پشت بەو زانینە مێژووییە دەبەستین، کە بە زمانی عەرەبی بەرهەم هاتووە و خۆمان لەو زمانانەی تر نادەین، کە کتێبی مێژووییان پێ نوسراوە، بەتایبەتیش زمانی فارسی، ئەمەش لەو باوەڕەوەیە هەر زمانێك تایبەتمەندێتی و سیستەمێکی واتایی جیاوازی هەیە لە زمانەکانی تر. هەر زانینێکی بەرهەم هاتوو، ڕەنگدانەوەی ئاگایی بەرهەمهێنەرەکانیەتی بەوەی لە دەوروبەریاندا هەیە، ناشتوانرێت ئەم ئاگاییە لەو زمانە

دابېڕێت کـه بیرۆکـه‌کانی پـێ کراوه‌تـه به‌رهـه‌مێکی نوسـراو. ئـه‌م زمانـه ده‌بێتـه به‌سته‌ره‌وه‌یه‌ك له نێوان خودو بابه‌تدا، له نێوان مێژوونوس و ئه‌و مێـژووه‌ی ده‌ینوسـێت. مێـژوونوس ـ کاتێـك بـه زمـانی عـه‌ره‌بی ده‌نوسـێت ـ بـه‌بیّ ئـه‌وه‌ی ئـاوڕ لـه ئینتیمـا ئه‌تنییه‌که‌ی بده‌ینه‌وه، مه‌حکومـه به بیرکردنه‌وه به‌و زمانه و هێمـا و توانـا گـوزاره‌یی و ره‌وانبێژییه‌کانی زمانه‌که.

لـه لایـه‌کی تریـشه‌وه کاتێـك ئێمـه رای ده‌گه‌یـه‌نین لـه‌و سـیاقه مێژووییـه‌دا لـه هه‌واڵه‌کانی کورد ده‌کۆڵینه‌وه،' که مێژوونوسان تیایدا ژیاون، ئه‌مـه مانـای ئـه‌وه نییـه لێکۆڵینه‌وه‌که هه‌موو ئه‌و مێژوونوسـانه وه‌رده‌گرێـت، کـه لـه زه‌مه‌نێکدا ده‌رکـه‌وتوون، ئێمه کاتێك باسی مه‌سه‌له‌یه‌کی په‌یوه‌ست به کورده‌وه ده‌که‌ین و شیی ده‌که‌ینـه‌وه، ئـه‌وا تیشك ده‌خه‌ینه سه‌ر مێژوونوسێك یان زیاتر، به بیّ ئه‌وه‌ی ئه‌مه مانـای کورتکردنـه‌وه‌ی مه‌سه‌له‌که بێت له‌م مێژوونوسـانه‌دا، چـونکه مێژوونوسـی تـر هـه‌ن هـه‌مان مه‌سـه‌له‌یان باسکردووه و ته‌نانه‌ت هه‌یانه ئه‌وه دووباره ده‌کاته‌وه، کـه مێژوونوسـانی پـێش ئـه‌و یـان هاوچاخه‌کانی وتویانه و هه‌مان ده‌ربڕین و میتۆدی ئه‌وان به‌کار ده‌هێنن لـه تۆمـارکردنی هه‌واڵه‌کانـدا. بۆیـه بـاس نـه‌کردنی سـه‌رجه‌م مێژوونوسـه‌کان، له‌بـه‌ر چـه‌ند هۆکـارێکی هونه‌ریی په‌تیی و له ترسی درێژدادڕی و په‌راوێزی زۆره، هه‌روه‌ها ـ ئه‌گه‌ر هه‌ڵـه نـه‌بین ـ له باوه‌ڕمانه‌وه‌یه به‌وه‌ی سیسته‌می زانینی مێژوویی ئیسلامی لـه ناوه‌ڕۆکـدا یـه‌کێتی و گونجانی تیایه‌و له روخساریشدا فره‌یه، کاریگه‌ریشه به چوارچێوه‌ی گشتی و دیـاریکراوی وێنـاکردن و بیرکردنـه‌وه. له‌بـه‌ر ئه‌مـه هه‌وڵمانـداوه تـه‌رکیز بکه‌ینـه سـه‌ر مێژوونوسـه گه‌وره‌کان، چونکه ئه‌وانی تر، مـاده‌م سـه‌ر بـه هـه‌مان فـه‌زای کۆمه‌ڵایـه‌تی ـ سیاسـی ـ عـه‌قیده‌یی باوی مێژوونوسه به‌ناوبانگه‌کانن، به‌زۆری له‌مانه‌وه شت وه‌رده‌گرن، یاخود لـه تێڕوانین و میتۆددا لاسایی ئه‌مان ده‌که‌نه‌وه.

لێـره‌دا خـاڵێکی میتـۆدیی دیکـه هه‌یـه پێویـسته ئامـاژه‌ی پـێ بکـه‌ین، ئـه‌ویش بـه‌کارهێنانی چـه‌مکی نوێیـه لـه پرۆسـه‌ی خوێندنـه‌وه‌ی ده‌قه‌کانـداو سـه‌ر لـه‌نوێ داڕشتنه‌وه‌یانه. به مه‌زه‌نده‌ی ئێمه هه‌ر لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ك کۆمـه‌ڵێك چـه‌مکی تایبـه‌ت بـه خۆی هه‌یه، یان با به ده‌ربڕینێکی تر بڵێین، جیهازێکی تێگه‌یشتن هه‌یه‌و بـه جۆرێـك لـه جۆره‌کان ته‌حه‌کوم به‌و هزرانه ده‌کات، که لـه لێکۆڵینه‌وه‌یـه‌کی دیـاری کـراودا ده‌خرێنـه روو. له‌م روانگـه‌وه ئـه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یـه کۆمـه‌ڵێك چـه‌مکی خـۆی هه‌یـه، وه‌ك چـه‌مکی

کۆئەندێشە (المخیال الجمعي)، بوونی مێژوویی، کارایی مێژوویی، دیالێکتیکی پەیوەندیی نێوان (ئێمە) و (ئەوان)، سەنتەر و دەوروبەر، شوناسی گێڕانەوەیی و ...هتد. ئەو بوارەی ئێمە ئەم چەمکانەمان تیا بەکار هێناوە، سەبارەت بەم چەمکانە شتێکی نوێیە، بۆیە بە پێی توانا هەوڵ دەدەین پێناسەی چەمکەکان بکەین و لە سیاقی بەکارهێنانەکەیاندا مەدلولەکانیان ئاشکرا بکەین. لە کەس شاراوە نییە کۆمەڵێك فەیلەسوف و بیرمەند و مێژوونوس و کۆمەڵناس، لە کاتی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆییدا، واتا و دەلالەتی ئەم چەمکانەیان دارشتووە و شێوەگیریان کردوون. ئەزموونی بەکارهێنانی ئەم چەمکانەش، کە پەنابردنە بەر ئامرازی زانینی جیاواز دەگەیەنێت لەوەی لە میتۆدە کۆنەکاندا بەکار هاتووە، هاریکاریمان دەکات بۆ کێشانی وێنەیەك ـ لەوانەیە تەواو جیاواز بێت ـ بۆ ئەو مێژووەی لێی دەکۆڵینەوە و هەوڵی تێگەیشتنی دەدەین بە جۆرێکی جیاواز لە تێگەیشتنی مێژوونوسانی پێشوو و گێڕانەوەکانیان، لەمەشدا هەوڵمان داوە نەکەوینە ناو ئەو هەڵە مێژووییانەی بەرئەنجامی دابەزاندنی چەمکە نوێکانن بە سەر رابردوویەکدا، کە تیایدا ئەم چەمکانە لە مێشکی مرۆڤەکانیدا نەبوون. ئامانجیشمان لە هەموو ئەمانە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی رابردووە، بە بێ ئەوەی ئەمە مانای تێکەڵکردنی ئێستاو رابردوو بێت، یان بە بێ ئەوەی وێناکردنی رابردوو بێت بە پێی تێڕوانینی هەنوکەییمان، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە، واتە رابردوو و بۆچوون و وێناکردنەکانی هەڵدەوەشێنینەوە بە مەبەستی ئەوەی لە ئێستادا باشتر لێیان تێ بگەین.

### ٢ـ بەشەکانی نامەکەو ناوەرۆکەکانیان

ئەم نامەیە لە دەستپێکێك و سێ بەشی سەرەکی و ئەنجام و سەرچاوەکان پێك هاتووە. دەستپێکەکە لە سروشتی زانینی مێژوویی ئیسلامی دەکۆڵێتەوە لەم روانەوە: هۆکارەگانی گرنگیدان بەم جۆرە زانینە لە کایەی ئیسلامیدا، هەندێك لە پەرەسەندنەکانی زانینەکە، ئەو بابەتانەی نوسینی مێژووییان داگیر کردبوو و کاریان کردبووە سەر رەوتی هزری مێژوویی لە کایەی ئیسلامیدا.

لە بەشی یەکەمدا باسی وێنەی کورد کراوە لە زانینی مێژووییدا و چۆنیەتی ناسینی کورد لە لایەن ئەم زانینەوە روون کراوەتەوە. ئەم بەشە لە سێ پاری سەرەکی پێك

هاتووه: له پاری یه‌که‌مدا باس له پرۆسه‌ی ناسپاندن و ناونان کراوه له سیاقی مێژوویی عه‌ره‌بیی ئیسلامیدا، هه‌روه‌ها باسی هه‌وڵی زانینی مێژوویی کراوه بۆ تێگه‌یشتن و له‌خۆگرتنی (کورد) وه‌ك زاراوه و له رووی زمانه‌وانیشه‌وه. پاشان باسمان له مه‌سه‌له‌ی دووباره ناونانه‌وه‌ی شار و ده‌ڤه‌ر و هه‌رێمه کوردییه‌کان کردووه به جۆرێك، که ناوه‌کانیان له‌گه‌ڵ زمانی عه‌ره‌بی و تایبه‌تمه‌ندییه‌کانیدا بگونجێن، بۆ ئه‌مه‌ش هه‌ندێك له ناوه‌کان کراون به عه‌ره‌بی یان هه‌وڵ دراوه ریشه‌یه‌کی عه‌ره‌بی بۆ هه‌ندێك له‌و ناوانه بدۆزرێته‌وه. هه‌روه‌ها که‌مێك تیشکمان خستووه‌ته سه‌ر مه‌سه‌له‌ی نه‌بوونی ناوێکی گشتگیر بۆ وڵاتی کورد (کوردستان) به زمانی عه‌ره‌بی له‌م زانینه نوسراوه‌دا.

له پاری دووه‌مدا هه‌وڵمان داوه له چوارچێوه‌ی زانینی ره‌چه‌ڵه‌کناسی (علم الأنساب)ی ئیسلامیدا، له ریشه‌ی کورد بکۆڵینه‌وه و باسی مامه‌ڵه‌ی ئه‌م زانینه‌مان کردووه له‌گه‌ڵ ریشه‌ی میلله‌ت و نه‌ته‌وه‌کاندا. هه‌روه‌ها له‌م پاره‌دا باسمان له‌و پاڵنه‌رانه کردووه، که له پشت بردنه‌وه‌ی ره‌چه‌ڵه‌کی کوردن بۆ کۆمه‌ڵه ریشه‌یه‌کی جگه له ریشه‌که‌ی خۆی، وه‌ك دانانیان به عه‌ره‌ب یان به فارس، جگه له‌مه تیشکمان خستووه‌ته سه‌ر ئه‌و هۆیانه‌ی بوو بوونه هۆی ململانێ له نێوان رۆشنبیرییه ئه‌تنی و خێڵه‌کییه‌کاندا له باره‌ی ره‌چه‌ڵه‌کی کورده‌وه. دواتریش، ئه‌و گێڕانه‌وه جیاواز و ئه‌فسانه‌ییانه‌مان خستووه‌ته روو، که له باره‌ی ریشه‌ی کورده‌وه‌ن له چوارچێوه‌ی دیالێکتیکی (ئێمه) و (ئه‌وان)ی باڵاده‌ست به‌سه‌ر په‌یوه‌ندییه‌کانی نێوان ئه‌و رۆشنبیرییانه‌دا. پاشان باسمان له هه‌ڵوێستی کورد کردووه له‌و ریشانه‌ی ئه‌م رۆشنبیرییانه بۆیان دۆزیوه‌ته‌وه و زانینی مێژووییش به‌رجه‌سته‌ی کردوون، هه‌روه‌ها باسی میکانیزمی ره‌تکردنه‌وه یان قبوڵکردنی ئه‌م ریشه ئه‌فسانه‌ییانه‌مان کردووه له لایه‌ن کورده‌وه.

له پاری سێهه‌مدا باس له سروشتی کورد و وێناکردنی ئه‌م سروشته کراوه له زانینی مێژوویی و زانینه‌کانی تردا. لێره‌دا هه‌وڵمان داوه پێدراوه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کانی ناو ئه‌م کتێبانه شی بکه‌ینه‌وه و په‌نجه‌مان خستووه‌ته سه‌ر هه‌ندێك له پیاده‌کارییه‌کانی (الممارسات) زانینه ئیسلامییه‌کان، که چینه تایبه‌ته‌کانی کۆمه‌ڵگا به‌رهه‌میان هێناون و له باره‌ی دیاریکردنی سروشت و ره‌فتاری کورده‌وه‌ن، دواتر کۆمه‌ڵێك زانیاریمان له باره‌ی پێکهاته‌ی خێڵایه‌تی کورد و چواندنیان به ئه‌عراب هێناوه ، ئنجا باسمان له کاریگه‌ریی ژینگه‌ی سروشتی له‌سه‌ر کورد کردووه وه‌ك باڵاده‌ستیی مۆرکی چیانشینی به‌سه‌ر

پێکهاتەی جەستەیی و دەروونیی کورددا، هەروەها باسی کاریگەریی هەموو ئەمانەمان کردووە لە دانانی کورد لەناو نەتەوە کۆچەرەکاندا. جگە لەمانە باسی دیاردەی ڕێگریی کوردمان کردووە و لێکدانەوەکانی ئەم دیاردەیەمان لای مێژوونوسان خستووەتە ڕوو. پاشان ئاماژەمان کردووە بە هەندێك مۆرکی تری کورد و ئەو بۆچوونانەی لە بارەیانەوە شێوەگیر بوون، وەك ئازایەتیی کورد و شوێن ئارەزوو کەوتنیان بەرامبەر لاوازی توانای عەقلّیان و ...هتد.

لە بەشی دووەمدا هەولّمان داوە لە ڕێگەی لیکۆلّینەوەی پێگەی تایبەتی کورد لە زانینی مێژووییدا، پەیوەندیی نێوان ئەم زانینە و دەسەلّاتی سیاسی ئاشکرا بکەین، بە واتایەکی تر، لەم بەشەدا دەمانەوێت لێکۆلّینەوە بەکەین لە پەیوەندی نێوان زانین و دەسەلّات و ئاستی پابەندبوون و دلّسۆزی یەکەم بۆ دووەم و چۆنیەتی مامەلّەکردنی زانین لەگەلّ پێدراوەکانی دەسەلّات، ئەمەش بە جەختکردنەوە لەسەر سروشتی بوونە کوردییەکە لە مێژووی ئیسلامیدا، هەروەها بە جەختکردنەوە لەسەر مێژووی دەسەلّاتداریی کورد لە میانەی تێڕوانینی مێژوونوسان لەم مێژووە و تۆمارکردنی هەوالّەکانیدا.

لەم ڕوانگەوە بە پێی ئامادەبوونی کورد لە مێژووی قۆناغە جیاوازەکاندا، ئەم بەشەمان کردووە بە سێ پارەوە: لە پاری یەکەمدا باسی ئەو قۆناغە کراوە، کە تیایدا کورد لە دەرەوەی دەسەلّاتی ناوەندیدا بوون و دەولّەتی خەلافەتی ئیسلامی ئەم قۆناغەی دەنواند، ئەم قۆناغەش لە داگیرکردنی ولّاتی کورد لە لایەن عەرەبە موسلّمانەکانەوە دەست پێدەکات تا دامەزراندنی کۆمەلّێك قەوارەی سیاسی (میرنشینەکان) لە ولّاتەکەیاندا. هەولّمان داوە کاریگەریی بوونی دەسەلّاتێکی ناوەندی بەهێز دەر بخەین لەسەر هەلّوێستی مێژوونوسەکان لە بەرامبەر کۆمەلّەکانی دەوروبەر (الاطراف)، کە چانسێکی کەمیان هەبوو لە دەسەلّاتدا؛ هەروەها تیشکمان خستووەتە سەر پیادەکارییە عەقیدەییەکانی مێژوونوسان، کە دەبووە هۆی باسکردنی هەوالّەکانی کورد یاخود دەبووە هۆی باس نەکردنیان و غاییکردنیان لە مێژوودا. بەلّام ئایا پالّنەرەکانی ئەم غاییکردنە چین؟ ئایا مێژوونوسەکان جەختیان لە چی دەکردەوە؟ چۆن وێنەی بوونی کوردیان کێشاوە لەم قۆناغەدا؟ هەولّمانداوە لە ڕێگەی شیکردنەوەی ئەو هەوالّانەی مێژوونوسەکان دەیان هێنن، وەلّامی ئەم پرسیارانە و پرسیاری تریش بدەینەوە.

لە پاری دووەمدا باسی بوونی کوردمان کردووە لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا، چونکە لەم قۆناغەدا بە ڕەسمی دان بە بوونیاندا نرا بوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە وڵاتەکەیاندا کۆمەڵێك میرنشینیان دەمەزراند. لەم پارەدا هەوڵمان داوە لە هەڵوێستی مێژوونوسەکان بکۆڵینەوە لە بارەی دامەزراندنی ئەم میرنشینانە، هەروەها باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنی مێژوونوسانمان کردووە لەگەڵ ئەم بوونەدا لە ڕوانگەی پێدراوە فیقهییەکانەوە بۆ ڕەوایی دان بەم بوونە. بە هەمان شێوە باسی گۆشەنیگای ئەو مێژوونوسە ناوچەییانەشمان کردووە، کە کتێبەکانیان تایبەت کردووە بە مێژووی ئەم میرنشینانە.

لە پاری سێهەمدا باسی بوونی کوردمان کردووە لە زانینی مێژوویی بەرهەم هاتوو لە سەردەمێکی تا ڕادەیەك درێژدا، کە دەکەوێتە نێوان هاتنی سەلجوقییەکان تا سەردەمی دەوڵەتی مەملوکی. سەرەتا باسی کاریگەریی هاتنی سەلجوقییەکانمان کردووە لەسەر پێگەی کورد و بوونیان لە مێژوودا، پاشان باسی شێوەگیر بوونی کەسێتیی جیهادیانەی کوردمان کردووە بەهۆی هێرشەکانی مەغۆل و خاچییەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، صەلاحەدینی ئەیوبییشمان وەك نمونەی کەسێتیی جیهادی لە تێڕوانینی مێژوونوسەکاندا، وەرگرتووە و لێمان کۆڵیوەتەوە و باسی کاریگەریی ئەم کەسێتییەمان کردووە لەسەر هەڵوێستی مێژوونوسەکان بەرامبەر کورد لەم قۆناغە ناخۆشەی - بە پێی مێژوونوسەکان - مێژووی موسڵمانانندا. پاشان باسمان لە بوونی کورد کردووە لەو نوسینە مێژووییانەدا، کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی مەملوکی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم بوونەمان لە لایەن مێژوونوسەکانی ئەمە قۆناغەوە ڕوون کردووەتەوە.

لە بەشی سێهەمدا هەوڵمان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە: ئایا بوونی کورد لە مێژوودا کارایی مێژووییشی لەگەڵدا بووە؟ یان ئایا کورد لەناو میللەتە کاراکاندا پێگەیەکیان هەبووە؟ ئایا سنوری ئەم کاراییە لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی کوردی و لەسەر ئاستی تاکەکانیدا تا کوێیە؟ پاشان ئەو میتۆدە چییە، کە مێژوونوس لە خستنە ڕووی گێڕانەوەکانی تایبەت بە کورددا پەیڕەوی کردووە؟ ئەم بەشەش لە سێ پار پێکهاتووە: لە پاری یەکەمدا باسی پێگەی کوردمان کردووە لە ڕیزبەندیی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا بۆ نەتەوەکان، دواتر باسمان لە تێڕوانینی ئەم زانینە کردووە بۆ ئەزموونی نەتەوە مێژووییەکان و مامەڵەکردنی لەگەڵ کاراییە مێژووییەکەیاندا، هەوڵیشمانداوە ئەم

پێگەیە و جۆری کارایی کورد وەك نەتەوەیەك لە نەتەوەکان دیاری بکەین، هەروەها مامەڵەکردنی مێژوونوسەکان لەگەڵ کورددا لە روانگەی تێگەیشتنیان لە کارایی مێژوویی نەتەوە لەناو چووەکان، یان ئەو نەتەوانەی دوای هاتنی ئیسلام ماونەتەوە، خراوەتە روو. پاشان لە گۆشەنیگای ئیبن خەلدونەوە باسمان لە کورد کردووە وەك نەتەوەیەکی کارای کایەی ئیسلامی و باسمان لە تیڕوانینەکانی کردووە بۆ ئەم کاراییە لە چوارچێوەی ریزبەندییەکەی بۆ نەتەوە موسڵمانەکان و باسکردنی نەتەوە کۆچەرییەکان و ئەو تیۆرانەی لە روانگەی کارایی ئەم نەتەوانەوە داینان بۆ ئەوەی واتا گشتییەکەی مێژوویان پێ شی بکاتەوە. هەروەها باسمان لە مامەڵەی ئەم مێژوونوسە ـ بیرمەندە کردووە لەگەڵ کورد و باسی ئەوەشمان کردووە چۆن و لە چ رێگەیەکەوە کوردی ناسیوە. بەراوردیشمان کردووە لە نێوان تیۆرەکانی لە بارەی نەتەوە کۆچەرییەکان و کاراییێ مێژووییانەوە، لەگەڵ ئەوەی خۆی ـ لە کتێبە مێژووییەکەیدا ـ لە بارەی کورد و بوونی دەسەڵاتدارانەیانەوە دەیلێت.

لە پاری دووەمدا جەختمان کردووەتە سەر تاکی کارای کورد لە زانینی مێژوویی و ئەو پانتاییەی تایبەت کراوە بە تاکەکان لە نوسینی مێژوویی ناسراو بە کتێبی چینەکان (کتب الطبقات) و ژیاننامەکان. ئاماژەمان بە سیما و تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئەم کاراییە و هۆکارە کاریگەر و دیاریکەرەکانیشی کردووە. هەروەها باسمان لە پەیوەندیی ئەم کارا کوردییە کردووە بە کۆمەڵە ئەتنییەکەیەوە و ئینتیمای بۆ ئەو کۆمەڵە تایبەتەی خۆی، کە مێژوونوس مێژووی ژیانیان دەنوسێتەوە. سەرەڕای ئەمانە، کاریگەریی میتۆدە پەیڕەوکراوەکان لە لایەن مێژوونوسانی ئەم جۆرە نوسینە مێژووییەوە لەسەر پێگەی کارای کورد و جۆری ئامادەییە مێژووییەکەی خراوەتە روو.

لە پاری سێهەمدا باس لە کاریگەریی میتۆدە پەیڕەوکراوەکانی نوسینی مێژوویی ئیسلامی کراوە لەسەر گێڕانەوەی هەواڵەکانی کورد، هەروەها باس لە ئامانجی گێڕانەوەی مێژوویی و دەرکەوتنەکانی کراوە لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا بەو شێوەیەی مێژوونوس گێڕاویەتەوە، نەك بە شێوە و جۆرەکانی تر. پاشان باس لە شوێنگەی هەواڵی کورد کراوە بە پێی سیاقی گشتیی گێڕانەوەی هەواڵەکان و کارگەریی رێکخستنی گێڕانەوەیی بەرهەم هاتوو لە لایەن زانینی مێژووییەوە لە پرۆسەی گێڕانەوەی هەواڵەکاندا.

دواجار لافي ئەوە لێنادەین توانیومانە بە تەواوی ناوەڕۆکی ئەو گێڕانەوە مێژووییانە شی بکەینەوە، کە مێژوونوسەکان لە کتێبەکانیاندا لە بارەی کوردەوە هێناویانن، بەڵکو بە راشکاوی دان بە قورسیی بەدیهێنانی ئەوەدا دەنێین، کە ئێمە دەمانویست بەدیی بهێین و دان بەوەشدا دەنێین ئەو ئەنجامانەی پێیان گەیشتووین و ئەو بڕیارانەی بەسەر هەڵوێست و تێڕوانینی مێژوونوسەکاندا داومانن، رێژەیین و مەرج نییە راستیی رەها بن. زۆر قورسە بتوانین بە تەواوی پەی بە بابەتێکی لەم جۆرە ببەین و بە مەزەندەی ئێمە، پەی بردن بە هەموو رەهەند و لایەنەکانی ئەم بابەتە پێویستی بەوەیە زیاتر لە لێکۆڵینەوەیەك و کتێبێکی لەسەر بنوسرێت. لەگەڵ ئەمەشدا بە شێوەیەکی گشتی هەوڵمان داوە بە پێی توانا چەند پرسیارێکی جۆراوجۆر لە بارەی زانینی مێژووییەوە بوروژێنین، ئەمەش لەو باوەڕەوەیە، کە لەسەر لێکۆڵەرەکان پێویستە کۆمەڵێك ئیشکالیەتی مەعریفی قووڵ بجولقێنن، ئەمەش بۆ رۆچوون نییە بەناو کۆمەڵێك دالانی (متاهات)ی مەعریفیدا، کە زۆر قورسە قەیرانەکانی چارەسەر بکرێن، بەڵکو بۆ دووبارە بیرکردنەوەیە لەوەی بە شێوەیەکی تەقلیدی بیری لێکراوەتەوە، چونکە بەم دووبارە بیرکردنەوەیە هزری مێژوویی و میتۆدە پەیڕەکراوەکانی نوسینەوەی مێژوو تازە دەکرێنەوە. هەروەها بۆ ئەوە نییە کۆمەڵێك بۆچوونی پێشوەخت، کە باوەڕمان پێیانە، بەسەر دەقی مێژووییدا بسەپێنین، لە کاتێکدا ئەو دەقانە توانای گوزارشتکردن لەو بۆچوونانەیان نییە، بەڵکو بۆ ئەوەی لەگەڵ تازەبوونەوەی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوودا بڕۆین، چونکە بەمە تێڕوانینێکی جیاوازمان دەبێت لەوەی پێشتر باو بووە. ئەم واتایەش یارمەتیمان دەدات بۆ ئاشکراکردنی کۆمەڵێك گۆشە و لایەنی مێژوو، کە ئەگەر لە روانگەیەکی نوێوە لێمان نەکۆڵینایەتەوە ئاسان نەبوو ببینرێن. لەمڕۆدا زۆر پێویستمان بە باسکردنی ئەم جۆرە بابەتانەیە بە میتۆدێکی نوێ، هەروەها پێویستمان بە فراوانکارییە لە بواری لێکۆڵینەوە رەخنەییە تایبەتەکان بە کولتوری مێژوویی، نەك تەنها بە مەبەستی رەخنەگرتن، بەڵکو بۆ ئەوەی تێگەیشتنمان بۆ ئەم کولتورە گشتگیرانەتر بێت و بتوانین لە هەموو رەهەندەکانی تێ بگەین.

### ٣ ـ هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان

**یەکەم: سەرچاوە بنەڕەتییەکان (المصادر)**

لەبەر ئەوەی توێژینەوەکە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی مێژوونوسەکان و شیکردنەوە و ڕەخنەگرتن لەوەی لە کتێبەکانیاندا لە بارەی کوردەوە نوسیویانە، بە پێویستی نازانین ئەو کتێبانە هەڵسەنگێنین و بیانناسێنین، چونکە ئەمە بابەتی هەموو کارەکەیە و لە سیاقی لێکۆڵینەوەکەدا کتێبەکان هەڵدەسەنگێنین و دەیانناسێنین و مێژووی ژیانی زۆربەی ئەو مێژوونوسانەش دەنوسینەوە، کە لێیان دەکۆڵینەوە. بۆیە لێرەدا تەنها ئەو سەرچاوانە هەڵدەسەنگێنین، کە دەتوانین بە سەرچاوە یارمەتیدەرەکان ناویان ببەین، چونکە کۆمەڵێك سەرچاوەمان بەکار هێناوە، کە لە دوو لایەنەوە یارمەتییان داوین: لە لایەکەوە لە پێدانی وێنەیەکی روون بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا و لە لایەکی تریشەوە لە دیاریکردنی پێگەی کورد لەم زانینەدا.

قسەکردن لە بارەی کۆمەڵگا مرۆییەکانی ناو چەمکی ئوممەتی ئیسلامیی تەنها تایبەت نەبوو بە زانینی مێژوویی، بەڵکو زۆربەی زانینەکانی کایەی ئیسلامی بە جۆرێك لە جۆرەکان لەم کۆمەڵگایانە دواون و سەروکاریان لەگەڵیاندا هەبووە. بۆیە ئێمەش بە پێویستمان زانی پشت بە زانینەکانی تری وەك ئەدەب و زمان و جیۆگرافیاو فەلسەفە و فیقهی سیاسی و ...هتد ببەستین، چونکە ئەم کێڵگە زانینانە زۆر هەواڵیان تێدایە ڕەهەندێکی مێژووییان هەیە، یان سەرنج و تێبینییەکانیان لەسەر ئەم کۆمەڵگا موسڵمانانە، ئەو وێنەیەی ئەم کۆمەڵگایانە تەواو دەکەن، کە زانینی مێژوویی کاری لەسەر بەرجەستەکردنی دەکرد. ئەم پشت بەستنەش بەو سەرچاوانە لەو باوەڕەوە هاتووە، کە لە رووی هێڵە گشتییەکانی بیرکردنەوە و ئیعتیقادەوە پەیوەندی و بەناویەکدا چوونێکی ئۆرگانی لە نێوان کێڵگە زانینە ئیسلامییە جیاوازیەکاندا هەیە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی مێژوونوسەکان تەنها لە نوسینی مێژوودا پسپۆڕ نەبوون، بەڵکو لە کێڵگە زانینەکانی تریشدا هزری خۆیان خستووەتە کار، چونکە لە ناویاندا زۆر فەقیە و فەیلەسوف و ئەدیب و وڵاتناس و ...هتد دەبینین، لە پاشخانە هزری و رۆشنبیرییەکەیانەوە، مێژوو دەنوسنەوە.

بە هەرحاڵ ، سەرەتا پەنامان بردووەتە بەر کتێبە زمانییەکان، وەك کتێبی (جمهرة اللغة)ی ئەبوبەکری کوڕی دورەید (٣٢١ك/٩٣٣ز مردووە)، کتێبی (المعرب من الکلام

الاعجمي على حروف المعجم)ی جەوالیقی (٥٤٠ك/١١٤٥ز مردووه)، (لسان العرب)ی ئیبن مەنظور (٧١١ز/١٣١١ك مردووه)و ... هتد. گرنگیی ئەم کتێبانە لەوەدایە لە ناساندنی کورد و ناونانیاندا پشتیان بە مێژوونوسەکان یان پسپۆڕییە زمانەوانییەکەی خۆیان بەستووە، بۆ دۆزینەوەی ریشەکانی ئەم کۆمەڵە و دارشتنی ناوەکەیان و ...هتد.

لە کاتی باسکردنی سروشتی کورد و رەفتاری کۆمەڵایەتییاندا گەڕاوینەتەوە بۆ تێڕوانین و هەڵوێستی هەندێك لەو فەیلەسوفانەی لە رەفتاری کۆمەڵایەتیی کۆمەڵە مرۆییەکان دواون، یەکێك لەو فەیلەسوفانەش ئەبوبەکری کوڕی زەکەریای رازیی (٣٢٠ك/٩٣٢ز مردووه) خاوەنی کتێبی (الطب الروحاني)یە، کە لەناو (رسائل الفلسفية)دا بلاو کراوەتەوە، هەروەها ئیبن روشدی فەیلەسوف (٥٩٥ك/١١٩٨ز مردووه) و کتێبی (الضروري في السياسة)ەکەی. سودێکی زۆرمان لە پێدراوەکانی ئەم دوو فەیلەسوفە بینیوە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی کورد بە پێی ئەو بۆچوونەی لە بارەی ئەم سروشتەوە شێوەگیر بوو بوو.

هەروەها لەم چوارچێوەیەدا پشتمان بە هەندێك کتێب بەستووە، کە مۆرکێکی ئەدەبییان هەیە و نوسەرەکانیان لە دوو توێی لاپەڕەکانیاندا باسی زۆ هەواڵ و مەسەلەیان کردووە بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەستن بە کوردەوە، وەك نوسینەکانی جاحظ (٢٥٥ك/٨٦٩ز مردووه) بە تایبەتی کتێبی (البيان والتبين) و (رسائل الجاحظ). هەروەها کتێبی (نثر الدرّ)ی ئابی (٤٢١ك/١٠٣٠ز مردووه) و کتێبی (التذكرة الحمدونية)ی ئیبن حەمدون (٥٦٢ك/١١٦٦ز مردووه).

هەروەها کتێبی گەڕیدە و ولاتناسەکانیش یارمەتییەکی باشیان داین لە ناسینی شارە کوردییەکان و ریشەی ناوەکانیان و ریشەی دانیشتوانە کوردەکانی و جۆری رەفتاریاندا، لەم کتێبانەش وەك کتێبی (المعجم البلدان)ی یاقوتی حەمەوی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز مردووه) و کتێبی (صورة الأرض)ی ئیبن حەوقەل (٣٦٧ك/ ٩٧٨ز مردووه).

سەبارەت بە مەسەلەی ناساندنەکانیش سودمان لە کتێبە فەرهەنگییەکان وەرگرتووە، بەتایبەتی کتێبی (الفهرست)ی ئیبن نەدیم (٣٨٣ك/٩٩٣ز مردووه)، چونکە ئەم کتێبە لە ناسینی مێژوونوسە کۆنەکان و کتێبەکاندا زۆر یارمەتیی داین. دەتوانرێت هەمان شت لە بارەی کتێبی (معجم الادباء)ی یاقوت ئەلحەمەویشەوە

بوترێت، چونکە باسی ژیانی زۆربەی ئەو مێژوونوسانەی کردووە، کە تا سەردەمەکەی خۆی لە کایەی ئیسلامیدا دەرکەوتبوون.

هەروەها سودمان لەو کتێبانە بینیوە، کە لە چاخەکانی دواییدا دەرکەوتوون و لە بارەی زانینی مێژوویی و نوسینی مێژوویین لای موسڵمانەکان و باس لە واتا و گرنگیی مێژوو دەکەن. لەو کتێبانەش وەك کتێبی (المختصر فی علم التأریخ)ی کافیجی (٨٧٩ك/١٤٧٤ز مردووە)، هەروەها کتێبی (الإعلان بالتوبيخ لمن ذم التأريخ)ی سەخاوی (٩٠٢ك/١٤٩٧ز مردووە).

لە کتێبەکانی فیقهی سیاسیشدا سودمان لە (الأحكام السلطانية والولايات الدينية)ی ئەبی حەسەنی ماوەردی بینیوە، ئەم کتێبە زۆر یارمەتیی داین لە پەی بردن بە زەمینەی رووداوەکان لە گۆشەنیگای فەقیهەوە، بە تایبەتی کاتێك باس لەو میرنشینانە دەکات، کە لە دەوروبەردا دەردەکەوتن وەك میرنشینە کوردییەکان، هەروەها لە کاتی بەراوردکردنی مەرجەکانی ئەو کەسەی دەست بەسەر دەسەڵاتدا دەگرێت، لەگەڵ ئەو رووبەرەی مێژوونوس تایبەتی دەکات بە میری کوردی ـ دەست بەسەر دەسەڵات گرتوودا.

جگە لەم سەرچاوانە سودمان لە دەیان سەرچاوەی تر بینیووە، کە لە لیستی سەرچاوەکاندا ناویان هاتووە.

**دووەم: سەرچاوە لاوەکییەکان ( المراجع )**

ئامادەکردنی ئەم بابەتە پێویستی بە گەڕانەوە بوو بۆ چەندان توێژینەوەی جۆراو جۆر، کە دەکرێت بکرێن بە دوو بەشی سەرەکییەوە: ئەوانەی لە بارەی مێژووی کوردەوە نوسراون لە چاخی کلاسیکیی ئیسلامیدا، لەگەڵ ئەوانەی لە بارەی زانینی مێژوویی ئیسلامییەوەن.

لە راستیدا مێژووی کورد لەو سەردەمەدا لە لایەن لێکۆڵەرو مێژوونوسانەوە زۆر بە کەمی بایەخی پێدراوە، لەوانەیە دیارترین مێژوونوس، کە باسی ئەم بابەتەی کرد بێت، محەمەد ئەمین زەکیی مێژوونوس بێت لە کتێبی (تأريخ الكرد والكردستان) و (تاريخ الدول والإمارات الكردية)دا. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا لێکۆڵەرە کوردەکان هەوڵیان داوە لە هەموو روویەکەوە لەم مێژووە بکۆڵنەوە و نامە و تێزە ئەکادیمییەکانیان تایبەت

کردووە بە کورد و پێگەی کورد لە مێژوو و شارستانێتیی ئیسلامیدا، لە هەموو قۆناغەکاندا لە مێژووی کوردیان کۆڵیوەتەوە و سەرجەم ئەو دەقانەیان وەرگرتووە، کە لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا لە بارەی ئەم مێژووەوەن. سەبارەت بە ئێمە ئەم لێکۆڵینەوانە یارمەتیدەرێکی زۆر باش بوون بۆ بینینی مێژووی کورد، لە چاخی کلاسیکیی ئیسلامیدا بە شێوەیەکی زنجیرەیی و ساغکراوە و دوور لە شێوازی تەقلیدیی پەیڕەوکراو لای مێژوونوسە کۆنەکان، کە بە زۆری رووداوەکانیان بەش بەش دەکرد و نەیان دەبەستن بەیەکەوە.

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوانە یارمەتییان داین بۆ سەرنجدان لە وێستگە سەرەکییەکانی ئامادەیی کورد لە مێژووی ئیسلامیدا و بینینی ئەو بۆشاییانەی، کە لەو قۆناغەدا لە مێژووی کورددا هەبوون. ئەگەر ئەم نامە و تێزانە نەبوونایە ـ وەك پێشتر وتمان ـ نەمان دەتوانی پەی بە سەرجەم لایەنەکانی مێژووی کورد ببەین لەو ماوە درێژەدا. دیارترینی ئەو لێکۆڵینەوانەش بریتین لە: (الكرد في الدينور والشهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين)، کە نامەیەکی ماستەرە و حیسامەدین عەلی غالب نەقشبەندی نوسیویەتی، نامەی ماستەر (الكرد في العصر العباسي حتى مجئ البوهيين)ی زرار صدیق تۆفیق لەگەڵ تێزی دکتۆراکەیدا ـ کە چاپکراوە ـ بە ناوی (كردستان في القرن الثامن الهجري)، نامەی ماستەری قادر محەمەد حەسەن کە بە ناوی (الإمارات الكردية في العهد البويهي)ەوەیە، هەروەها تێزی دکتۆراکەی نیشتیمان بەشیر محەمەد بە ناوی (الكرد والسلاجقة ـ دراسة في العلاقات السياسية). جگە لە زۆر نامە و تێزی تری بڵاوکراوە و بڵاو نەکراوە، کە لە لیستی سەرچاوەکاندا ناوەکانمان نوسیون.

ئەم لێکۆڵینەوانە کاریان لەسەر ئەوە نەکردووە بە شێوەیەکی سەراپاگیرانە سەرنجی ئەو بابەتانە بدەن، کە لێیان دەکۆڵنەوە، بە تایبەتی بینینی ئەوەی تەحەکوم بە بیرکردنەوەی مێژوونوس و تۆمارکەرانی هەواڵەکانی کوردەوە دەکات لە سەرجەم قۆناغەکاندا، بە رای ئێمە هۆی ئەمەش ئەوەیە لێکۆڵینەوەکەیان پسپۆڕیی وردە و ئەو میتۆدەی لە (بە ناوەندکردن)ی کورددا پەیڕەویان کردووە بواری ئەمە نادات. لە راستیدا بینینی ئەوەی لە پشت گێڕانەوە کوردییەکانەوەیە کاری ئەم لێکۆڵینەوانە نەبووە، بە هۆی ئەوەی ـ وەك پێشتر وتمان ـ ئەم لێکۆڵینەوانە تایبەت بوون بە گێڕانەوەی ریوایەتەکان و دۆزینەوەی جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان هەواڵە بەش بەش کراوەکاندا و

دواتر بە دەستهێنانی مۆرکێکی تایبەت بە مێژووی کوردی ئیسلامی، کە لە کەمترین باردا ئەوەی پێی جیا دەکرێتەوە بریتییە لە یەکێتیی بابەت و یەکێتیی میتۆد لە وەرگرتنی مێژووەکەدا.

جگە لەم لێکۆڵینەوانە هەندێك رۆژهەلاتناس مێژووی کوردی ئیسلامییان نوسیوەتەوە، بەناوبانگترینیان فلادیمیر مینۆرسکییە و ئێمەش پشتمان بە زۆربەی نوسینەکانی بەستووە، بە تایبەتی کتێبی (Studies in Caucasian History)ەکەی، هەوەرها سودمان لە کتێبی (الأكراد حسب المصادر العربية)ی لێکۆڵەری ئەرمەنی ئەرشاك پۆلادیان وەرگرتووە.

بەڵام بەشی دووەمی سەرچاوەکان ئەو لێکۆڵینەوانەن لەبارەی نوسینی مێژوویی ئیسلامییەوەن لە رووی سەرهەڵدان و گەشەکردنەوە و هەروەها لە رووی ئەو بیرۆکەیەوە، کە مێژوونوسە کۆنەکان لە چارەسەرکردنی مێژوو و شێوازە جیاوازەکانی نوسینی مێژوویدا پەیڕەویان کردووە. جگە لەمانە ئەوانەی لە بارەی شێوازە جیاوازەکانی نوسینەوەی مێژوون، چونکە زۆر کەس لە بارەی ئەم جۆرە نوسینەوەیە بە شێوە گشتییەکەی، یان لە بارەی چەند مێژوونوسێکی دیاریکراو و تێڕوانینیان بۆ مێژوو، شتیان نوسیوە. ئێمەش هەوڵمان داوە ئاگاداری زۆربەی نوسینەکانی ئەم بوارە بین، بەڵام ئەوەمان بە باش زانی تەنها پشت بە هەندێك لەم کتێبانە ببەستین، بە تایبەتی ئەوانەی نوسەرەکانیان بە وردی بابەتەکانیان نوسیوە و تیایدا قووڵبوونەتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە درێژدادڕی نەکەین و لەو باوەڕەشمانەوەیە ئەوەی ئەو کەسانەی تر نوسیویانە، کە پشتمان پێنەبەستوون، لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی ئەوانە دەرناچێت، کە پشتمان پێبەستوون.

کتێبی (بحث في نشأة علم التاريخ عند العرب)ی عەبدولعەزیز ئەلدوری لە پێشەوەی ئەو کتێبانەدایە، کە سودمان لێ بینیوە، چونکە ئەم کتێبە لە توێژینەوە پێشەنگەکانی باسکردن و لیکۆڵینەوەی سەرهەڵدانی زانینی مێژووییە ـ بە بەرگە ئیسلامییەکەی ـ لە رووی هۆکارەکانی ئەم سەرهەڵدانە و گرنگترین قوتابخانەکانی و پیاوە دیارەکانی ئەم بوارە و سەرچاوە سەرەکییەکانی. هەروەها پشتمان بە کتێبی (التاريخ العربي والمؤرخون)ی شاکر مستەفا بەستووە، کە لێکۆڵینەوەیەکی فراوانە لە ریشەی نوسینەوەی مێژوو لای عەرەب و موسڵمانان و قۆناغەکانی پەرەسەندنی. بە بۆچوونی ئێمە ئەم

لێکۆڵینەوەیە تەواوکەری لێکۆڵینەوەکەی ئەلدورییە، چونکە شاکر مستەفا لە دیاریکردنی قۆناغەکانی پەرەسەندنی نوسینەوەی مێژوودا لەسەر هەمان ڕێبازی ئەلدوری دەڕوات، بەلاَم دەبێ ئەوەش بڵێین: کە ئەم دوو لێکۆڵینەوەیە ڕەخنەیی و شیکاری نین و توانای سەرنجدانی زانینی مێژووییان نییە لە هەموو لایەنەکانییەوە و هەروەها توانای بینینی چوارچێوە دیاری کراوەکانی ئەم زانینەو دەرکەوتنەکانیان نییە.

بەلاَم لێکۆڵینەوەی تر هەن، کە بەم ئاڕاستەیەدا ڕۆیشتوون و هەوڵیان داوە بە میتۆدێکی جیاواز و بە پشتبەستن بە شیکردنەوە و بەراوردی پێکهاتەیی، لە ڕووی بیرۆکەو ریشەوە لە زانینی مێژوویی بکۆڵنەوە. وەك کتێبی (الکتابة التأریخیة والمعرفة التأریخیة)ی عەزیز عەظمە، توێژەر لەم کتێبەدا هەوڵیداوە لە میانەی لێکۆڵینەوەی ناوەرۆکی هزریی چەمکی مێژووەوە، لەم چەمکە بکۆڵێتەوە لای مێژوونوسە موسڵمانەکان. ئەو لێرەدا لە بیرۆکە دەکۆڵێتەوە، مەبەست لە بیرۆکە بیرۆکەی مێژووە لە سیاقی گشتیی بەکارهێنانیدا، ئەمەش لە ڕێگەی جەختکردنەوە لەسەر مەسەلەی ماقوڵیەتی مێژوویی و چۆنیەتی گێڕانەوەی هەواڵە مێژووییەکەو ناوەڕۆکە گشتگیرەکانی مێژووەوە ئەنجام دەدات. سەبارەت بە کارەکەی ئێمەش، بایەخی پێدراوەکانی ئەم توێژەرە لێرەدایە، بۆیە لە زۆربەی بەش و پارەکانی ئەم نامەیەدا، سودێکی زۆرمان لەم پێدراوانە بینیوە.

لە ڕووی گرنگییەوە نەك لە ڕووی بیرۆکە و میتۆدەوە، هەندێك لێکۆڵینەوەی تری هاوشێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەن، وەك لێکۆڵینەوەکەی طریف خالیدی، کە بە زمانی ئینگلیزی نوسیویەتی و بە ناوی ( Arabic Historical thought in the classical Period)ەوەیە، ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکێکە لە لێکۆڵینەوە بە پێز و باشەکان لە بارەی هزری مێژوویی ئیسلامییەوە، لێرەدا خالیدی بە زمانێکی ڕەوان و شێوازێکی ئاسانتر لە عەزیز عەظمە باسی ئەم بیرۆکەیە دەکات.

ئەوەی لێکۆڵینەوەکەی خالیدی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە لێکۆڵەر هەوڵی داوە هزری مێژوویی و گۆڕاوە زەمەنییەکان پێکەوە ببەستێت و زۆر تێکۆشاوە بۆ ئەوەی لای هەر یەکێك لە مێژوونوسەکان لەو بوارە شوێنکاتییەی تیایدا ژیاون لە (مێژوو) تێبگات. خالیدی لە هەموو ئەمانەدا هەوڵ دەدات چۆنیەتیی بیرکردنەوە لە ڕابردوومان پیشان بدات، بە پێی ئەو چوارچێوە کۆمەلاّیەتی ـ ئاینی ـ سیاسیانەی ئەم بیرکردنەوەیە

سنوربەند دەکەن و لە تۆمارکردنی مێژوودا ئاراستەی دەکەن. لێرەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە باشترین ڕێگە نیشاندەرمان بوو بۆ ناسینی ئەم چوارچێوانە.

هەروەها سودمان لە هەندێك لەو لێکۆڵینەوانە بینیوە، کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە بارەی نوسینی مێژوویی ئیسلامییەوە ئەنجامیان داون، وەك کتێبی (علم التاريخ عند المسلمين)ی فرانز روزنتال، کە یەکێکە لە کتێبە باشەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوو و قۆناغەکانی پەرەسەندنی و وێنە جیاوازەکانی لە کایەی ئیسلامیدا. بە هەمان شێوە ئەو لێکۆڵینەوانەی لە کتێبێکی کۆییدا بڵاو کراونەتەوە و بێرنارد لویس و هۆڵت سەرپەرشتییان کردووە و بە ناوی (Historians of the middle east)ەوەیە، سودێکی زۆری پێگەیاندین لە ناسینی سیما و تایبەتمەندییەکانی نوسینی مێژوویی ئیسلامی لە قۆناغە جیاوازەکانی شێوەگیر بوون و پەرەسەندنیدا.

# سروشتی زانینی مێژوویی ئیسلامی

سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین بابەتی زانینی[(١)] مێژوویی ئیسلامی، لە رووی سەرهەڵدان و شێوەگیربوونەوە لە لایەن زۆر لێکۆڵەرەوە بە تێر و تەسەلی لێی کۆڵراوەتەوە و سیما و پێکهاتەکانی روون و ئاشکران، بۆیە لەم دەستپێکەدا قسەکردنمان کورت و پێناسەئاسا دەبێت، بەبێ ئەوەی لە بابەتەکە کەم بکەینەوە. لە دوو توێی نوسینەکەشدا لێرە و لەوێ هەندێك زانیاری و وردەکاری لە بارەی پەرەسەندنی زانینی مێژوویی و شێواز و میتۆدەکانی دەخەینە روو، بە مەبەستی روونکردنەوەی ئەوەی لەم دەستپێکەدا چاومان لێ پۆشیوە.

بێگومان پرسیارکردن لە پاڵنەرەکانی نوسینەوەی مێژوو، کە لە سادەترین پێناسەیدا بریتییە لە زانینی رابردووی مرۆڤ، پرسیارکردنە لە حەقیقەتی بوونی مرۆڤ

---

(1) زانین (المعرفە) زاراوەیەکە لە کولتوری ئیسلامیدا ریشەیەکی کۆنی هەیە، زۆر مێژوونوس لە ناونیشانی کتێبەکانیاندا بەکاریان هێناوە، بە ناوبانگترینیان «المعارف»ی ئیبن قوتەیبەی دینەوەریی (٢٧٦ك/٨٨٩ز مردووە) و "السلوك لمعرفە دول الملوك"ی مەقەریزی (٨٤٥ك/١٤٤١ز مردووە) و ...هتد. زانین (المعرفە) لە واتا کولتورییەی بەکارهێنانیدا بریتییە لە: "پەی بردن بە شتێك وەك ئەوەی هەیە، کە بەر لەوەی بزانرێت بیر لێ نەکراوە بووە. الجرجاني: کتاب التعریفات، (بیروت: ١٩٦٩)، ص٢٣٦. بەڵام بەکارهێنانی زانین (المعرفە) لەم نامەیەدا سەرەڕای چەمکە کولتورییەکەی، پەیوەندیی هەیە بەو واتایەی ئەمڕۆ هەیەتی، بە تایبەتی واتا کۆمەڵایەتییەکەی، چونکە زانین (المعرفە) بریتییە لە: "دڵنیا بوون لە راستی و تایبەتمەندییەتیی دیاردەکان". بڕوانە:
Peter L. (Berger) And Thomas (Luck man): The Social Construction of reality – A treatise in the Sociology of (Know I edge, New York: 1966), P.1.
لەم روانگەوە زانینی مێژوویی لەم نامەیەدا، بریتییە لە دەرککردن بە خودی رووداوەکان یان دیاردەکانی رابردوو و باوەڕهێنان بە واقیعیەتی ئەو رووداو یان دیاردانەو تایبەتمەندییە زەمەنییەکەیان.

خۆی و لەوەی لە ناو سروشتی مرۆڤدا شاراوە و پەنهانە، ئەمە بۆچوونی لێکۆڵەرانی بواری ئەنترۆپۆلۆجیایە، ئەوان وای دەبینن حەز و خەریکبوونی مرۆڤ بە مێژووەوە و بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە زانینە، وەڵامدانەوەی رۆحی پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییە لای مرۆڤ، ئەو رۆحەی توانای بەجێهێنانی رەفتاری کۆمەڵایەتیی ئاڵۆز دەنوێنێت لە مرۆڤدا[١]، بۆیە مێژوو بەرهەمی دەرکەوتنی چەندین شێوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی ئاڵۆزە. مرۆڤ لە ئەنجامی ئەم پەیوەندییە ئاڵۆزانەوە، رێگەی نوێی بیرکردنەوە و کار و کاریگەریی داهێناوە لە خودی خۆی یان لە مرۆڤەکانی چواردەوری یان لە ژینگە سروشتییەکەی دەوروبەری، ئەمانەش وایان لێکرد زانینی مێژوویی بەرهەم بهێنێت[٢].

لەم روانگەیەوە ئاسانە لەو پاڵنەرانە بدوێین، کە لە پشت نوسینەوەی مێژووەوەن لە کولتوری موسڵمانەکاندا، ئەمانە کۆمەڵە پاڵنەرێکن زۆر دوور ناکەونەوە لە پەیوەندییە شێوەگیر بووەکانی نێوان کۆمەڵگە مرۆییە جیاوازەکانی ناو کایەی ئیسلامی و پەیوەندیی نێوان ئەم کۆمەڵگانە و سروشت بە پێی تێڕوانینە ئیسلامییەکە بۆ ئەم سروشتە. بۆیە بە پێی عەقیدە ئیسلامییەکە[٣]، دەبوو زانینی مێژوویی ئەم پەیوەندییە هۆکارییانە بۆ مرۆڤی موسڵمان باس بکات، چونکە ئەم عەقیدەیە باوەڕی بە سود و کەڵکی ئەم پەیوەندییانە و مێژوویی بوونە عەقیدەییەکەیان هەبوو، پێشی وابوو باسکردن یان گێڕانەوە و تۆمارکردنیان کارێکی رەوایە.

پێش ئەوەی باسی گرنگترین پاڵنەرەکانی پشت دەرکەوتن و سەرهەڵدانی زانینی مێژوویی ئیسلامی بکەین، بە باشی دەزانین کەمێك تیشك بخەینە سەر تێگەیشتنی

---

[1] مایکل (کاذیرس): لماذا ینفرد الانسان بالثقافة؟ الثقافات البشریة: نشأتها وتنوعها، ت: شوقي جلال،(الکویت: ١٩٩٨)، ص٦٣.

[2] م. ن، ص٨٣.

[3] ئەم ئایەتە قورئانییە لەمە دەکات، کاتێك دەفەرموێت: ﴿یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم﴾. سورة الحجرات، الآیة (١٣). لە پاری یەکەمی بەشی یەکەمدا دەگەڕێینەوە سەر مەبەست و ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە. مانای ئایەتەکەش ئەمەیە: ئەی خەڵکینە ئێمە لە نێر و مێیەك ئێوەمان دروست کردووە و کردوومانن بە چەند میللەت و خێڵێکەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، بەرێزترینتان لای خوا ئەو کەسەیە لە خوا دەترسێت و سنورەکانی ناشکێنێت.

موسڵمانان لە مێژوو و چۆنیەتی بەکارهێنانەکەی. دیارە گوزارەی (مێژوو ـ التأریخ) چ عەرەبی بێت[1]، یان فارسی و لە وشەی (ماه روز)[2]ەوە وەرگیرابێت و کرابێتە عەرەبی، لە ئەدەبیاتی عەرەبیی پێش ئیسلامدا نەبووە و لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا نەهاتووە. مێژوونوسە کۆنەکان لەسەر ئەوە هاوڕان، کە ئەم وشەیە یەکەم جار لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا (١٣-٢٣ك/٦٣٤-٦٤٤ز) بەکارهاتووە، ئەویش ئەو کاتەی کۆچی پێغەمبەری لە مەککەوە بۆ مەدینە وەك سەرەتای مێژووی ئیسلامی دیاری کرد[3]، لەو کاتەدا مێژوو تەنها واتای دیاریکردنی کات دەگەیاند[4]، لەمڕۆشدا هاوواتای وشەی (date)ە لە زمانە لاتینییەکاندا[5].

بەم جۆرە لە ئاستی زمانەوانیدا مێژوو بەسترا بە کاتەوە، بۆیە مێژوو بریتی بوو لە باسکردنی کات[6]، مێژووی هەر شتێکیش ئامانجەکەیتی، کە بە گەیشتن بەو

---

(1) الصولي: ادب الكتاب، (القاهرة: ١٣٤١ك/١٩٢٢ز)، ص١٧٨. ابن عساكر: تهذيب تاريخ دمشق الكبير، هذبه ورتبه: الشيخ عبدالقادر بدران، ط٢، (بيروت: ١٩٧٩)، ج١، ص١٩. ابن منظور: لسان العرب، (بيروت: د. ت)،ج١، ص؟ السخاوي: الاعلان بالتوبيخ لمن ذم اهل التاريخ، تحقيق: فرانز روزنتال، منشور ضمن كتابه (علم التاريخ عند المسلمين)، ت: صالح احمد العلي، (بغداد: ١٩٦٣)، ص٣٨٢-٢٨٢.

(2) الاصفهاني: تاريخ سني ملوك الارض والانبياء، (بيروت: ١٩٦١)، ص١٢. الخوارزمي: مفاتيح العلوم، (القاهرة: ١٣٤٢ك/١٩٢٣ز)، ص٥٠. البيروني: الآثار الباقية عن القرون الخالية، (لايبزك: ١٩٢٣)، ص٢٩. الجواليقي: المعرب من الكلام الاعجمي على حروف المعجم، تحقيق: احمد محمد شاكر، ط٢، (القاهرة: ١٣٨٩ك/١٩٦٩ز)، ص١٣٧-١٣٨. الكافيجي: المختصر في علم التاريخ، تحقيق: فرانز روزنتال، منشور ضمن كتابه (علم التاريخ)، ص٣٣٠-٣٣١.

(3) خليفة بن خياط: تاريخ خليفة بن خياط، تحقيق: اكرم ضياء العمري، (بيروت:١٣١٧ك/١٩٧٧ز)، ص٥١. الطبري: تاريخ الرسل والملوك، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، ط٤، (القاهرة: ١٩٦٥)، ج١، ص٣٨-٣٩. البيروني: م. ن، ص٢٩. ابن عساكر: م. س، ج١، ص٢٣-٢٤. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، (بيروت: ١٩٧٩-١٩٨٢)، ج١، ص١٠-١٢.

(4) خليفة بن خياط: م. ن، ص٤٩. ابن عساكر: م. ن، ج١، ص١٩-٢٠. الكافيجي: م. ن، ص٣٢٧.

(5) وجيه (كوثراني): التاريخ ومدارسه في الغرب وعند العرب، (بيروت: ٢٠٠١)، ج١، ص٢٠-٢١.

(6) الطبري: م. س، ج١، ص٣٢.

ئامانجە زەمەنەکەی کۆتا دێت[١]، ئەویش ماوەیەکی دیار و ئاشکرای کاتە[٢]. ئەم بەستنەوەیەی مێژوو بە کاتەوە ڕێگە خۆش دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لەوەی لە کاتدا روو دەدات، واتە بارودۆخی کات و ڕووداوەکانی، ئەمەش دەمانخاتە بەردەم واتای زاراوەیی (مێژوو). دیارە شێوەگیر بوونی ڕەهەندە زاراوەییەکەی وشەی مێژوو لە ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا ماوەیەکی خایاندووە و ـ بە لایەنی کەمەوە ـ لە سەدەی دووی کۆچی/ هەشتی زایینییەوە بووە[٣]، لێرەوە واتای مێژوو بووە گەڕان بە دوای کات و بارودۆخەکانیدا[٤]، یان واتای تۆمارکردنی ڕووداوەکان بوو لەسەر بنەمای کات[٥].

بەڵام کاتێك دەگەینە ئەو بابەتەی کە مێژوو وەری دەگرێت و باسی دەکات، مەسەلەکە ئاڵۆزتر دەبێت، چونکە لای مێژوونوسەکان پێناسەیەکی دیاری کراو بۆ بابەتی مێژوو نادۆزینەوە، لە ڕاستیدا مێژوونوسەکان نەیان ویستووە ـ یان بیریان چووە ـ لە ڕووی بابەتەوە چەمکی مێژوو بخەنە ژێر پرسیارەوە و بیکەن بە ئیشکالیەتێك، یاخود هەر نەیانویستووە بچنە ناو ئەو واتا ناوەکییانەی مێژووەوە، کە دەتوانرێت لە ناساندنی بابەتەکەیدا پشتیان پێ ببەسترێت. لەوانەیە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەرك و وەزیفانەی لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا درا بوون بە مێژوو.

---

(1) الصولي: م. س، ص١٧٨.

(2) البيروني: م.س، ص١٣. الكافيجي: م. ن، ص٣٢٦.

(3) بڕوانە: ابن النديم: الفهرست، (القاهرة: د. ت)، ص: ١٤. هەروەها بڕوانە: روزنتال: علم التاريخ، ص٢٤.

(4) الكافيجي: م. س، ص٣٢٧.

(5) بڕوانە: حسين (نصار): نشأة التدوين التاريخي عند العرب، ط٢، (بيروت: ١٩٨٠)، ص٦. شاكر (مصطفى): التاريخ العربي والمؤرخون، ط٢، (بيروت: ١٩٧٩)، ج١، ص٥١. مصطفى (ابو ضيف): منهج البحث التاريخي بين الماضي والحاضر، (دار البيضاء: ١٩٨٧)، ص٤٧-٤٨.

ئەمە لەو وتەیەی مەسعودیی (٣٤٦ك/٩٥٧ز مردووە)[1] گەورە مێژوونوسی موسڵماندا روون دەبێتەوە، کاتێك وا دەبینێت، کە زانینی مێژوویی پێویستییەکی زانستی و ئاینییە، پاشان درێژەی پێدەدات و دەڵێت: ((لە هەواڵەکان هەموو زانستێك دەردەهێنرێت، هەموو داناییەکیان لێوە هەڵدەهێنجرێت، فیقهـ راوێژیان پێدەکات، زمان پاراوی سودیان لێدەبێنێت، هەڵسەنگێنەرەکانیش (اصحاب القیاس) شتیان لەسەر بنیات دەنێن))[2]. لەم دەقەوە ئەوە هەڵدەهێنجین، کە مێژوو بابەتێکی سەربەخۆی نییە، بەڵکو بەستراوە بە زانست و زانینەکانی ترەوە و شتی لێ وەردەگرن. ئەو زانینەی مێژوو وەك کاراییەك بەرهەمی دەهێنێت، دەکرێت لە زۆربەی چوارچێوە زانینیەکانی ناو رۆشنبیریی ئیسلامیدا ـ وەك فەرموودە و فیقهـ و تەفسیر و سۆفیگەری و ئامۆژگاری ـ سودی لێ وەربگیرێت، کەچی ئەم زانینە مێژووییە کۆمەڵێك بنەمای نییە، کە تایبەت بن بە کارایی خودی مێژوو[3]. لەبەر ئەمە دەبینین ئەوانەی هەوڵیان داوە بابەتی مێژوو دیاری بکەن، لەو باوەڕەدان بابەتی مێژوو لە کۆمەڵێك بنەمای جۆراو جۆر پێکهاتووە، ئیدی مێژوو بریتییە لە ماوەیەکی دیار، ((کە تیایدا پێغەمبەرێك نێرراوە ... یان پاشایەکی زۆردار سەری هەڵداوە ... یان نەتەوەیەك لەناو چوون بە لافاو ... یان زەمین لەرزە ... یان پەتایەکی کوشندە ... یان وشکە ساڵی و گرانییەکی ریشەکێش یان

---

[1] مەسعودی: ئەبو حەسەن عەلی کوڕی حسێن کوڕی عەلی مەسعودی، رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر عەبدولڵای کوڕی مەسعود، کە یەکێکە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر. لە بەغداد گەورە بووەو لە پێناو بەدەستهێنانی زانستدا زۆر شوێن گەڕاوە، چووەتە ئەوپەڕی وڵاتی فارس و سەردانی ئازەربایجان و ئەرمینیا و ئاران و زۆر هەرێم و وڵاتی تری کردووە، سەرئەنجام لە میسر جێگیر بووە و هەر لەوێش ساڵی (٣٤٦ك/٩٥٧ز) کۆچی دوایی کردووە. زۆر کتێب و دانراوی هەیە، وەك (مروج الذهب و معادن الجوهر) و (التنبیه والاشراف) و (اخبار الزمان) و ...هتد. ابن الندیم: م. س، ص٢٢٥. یاقوت الحموي: معجم الادباء المعروف بإرشاد الاریب الی معرفة الادیب، (بیروت: ١٩٣٦)، ج١٣، ص٩٠-٩٤. الزركلي: الاعلام، ط٣، ج٥، ص٨٧.

[2] مروج الذهب ومعادن الجوهر: قدّم له: محمد محي الدین عبدالحمید، (بیروت: ١٩٨٩)، مج١، ص٣٨٤.

[3] عزیز (العظمة): الكتابة التاریخیة والمعرفة التاریخیة مقدمة في اصول صناعة التاریخ العربي، ط١، (بیروت: ١٩٨٣)، ص١٤-١٥.

نەمانی دەوڵەتێك یان گۆڕانی میللەتێك یان ڕووداوێکی گەورە لە نیشانە ئاسمانییەکان و نیشانە زەمینییە بەناوبانگەکان ...»[1] و شتی لەم بابەتە. ئەم دەقە تا ڕاددەیەك درێژەشمان لەبەر ئەوە هێنا، تا ئەوە ڕوون بێتەوە کە لە بارەی بێ سنوریی بابەتی مێژوویی و پاشان گشتگیریەکەیەوە وتمان، مێژوو بریتییە لە «باسکردنی هەواڵەکانی تایبەت بە سەردەمێك یان نەوەیەك»[2] بە بێ دیاریکردنی بابەتی ئەم هەواڵانە. کاری مێژوو لە خستنە ڕووی بابەتە زۆر و جۆرا و جۆرەکاندا قەتیس دەمێنێت، ئیتر گوێ بەوە نادات پەیوەندی هەبێت لە نێوان ئەم بابەتانەدا یان نا.

دەگەڕێینەوە بۆ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی زانینی مێژوویی ئیسلامی و قۆناغەکانی شێوەگیر بوونی و دەڵێین: ڕۆشنبیریی ئیسلامی لە نەبوونەوە ئەم زانینەی نەهێناوەتە گۆڕێ و لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلامیشدا دەرنەکەوتووە، چونکە ئاماژە بۆ بوونی جۆرێك لە زانینی مێژوویی دەکرێت لای عەرەب لە قۆناغی پێش سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلامدا و لە هەندێك بەشی جەزیرەکەیان بە تایبەتی لە وڵاتی یەمەندا گەیشتبوونە ئاستێکی باشی شارستانی، بەڵام ئێمە هیچ تۆمارکراوێکی مێژووییمان لەبەر دەستدا نییە بگەڕێتەوە بۆ ئەم قۆناغەی پێش ئیسلام. هەروەها لەم قۆناغەدا کولتوری مێژوویی عەرەب شتێکی وای نەماوە شایەنی باس بێت، ئەوەی ماوە تەنها هەندێك گێڕانەوەی زارەکییەو لەوەدا خۆی دەنوێنێت، کە بە ڕۆژگار (الایام) ناو دەبرێت، مەبەستیش لە ڕۆژگار شەڕە ناوخۆییەکانی عەرەب و ڕووداوە گرنگەکانی ئەو سەردەمەیە، کە وەرچەرخانێکی گەورەی لە ژیانیاندا پێك هێنا. هەروەها ڕەچەڵەکگەری (***الانساب***) و هەندێك حیکایەتی مێژوویی ماون، کە مۆرکی ئەفسانەیی بەسەریاندا زاڵە.

ڕۆژگاری عەرەب و ڕەچەڵەکگەری ـ وەك دوو فۆرمی سەرەکیی دەربڕینی مێژوویی لای عەرەب لە سەردەمی پێش ئیسلامدا ـ گوزارشت لە هەستی مێژوویی دەکەن لای ئەم کۆمەڵە مرۆییە، بێگومان ئەم هەستە هەستێکی هاوبەشە و هیچ جۆرە پسپۆڕییەکیشی تیا نییە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەم زانینە پەیوەست بوو بە پێکهاتەی

---

[1] البيروني: م. س، ص١٣. هەروەها بڕوانە: الكافيجي: م. س، ص٣٣٣.

[2] ابن خلدون: المقدمة، (بيروت: ١٩٨١)، ص٢٥.

کۆمەڵایەتی ـ خێڵەکیی ئەم کۆمەڵە و بیرو ڕاو نمونە کۆمەڵایەتییە باوەکانیان لە بارەی رەچەڵەك و سروشتی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ خێڵ و کۆمەڵگاکانی تردا. لەبەر ئەمە هەواڵ و حیکایەتە گێڕراوەکان بە تەنها هی گێڕەرەوەکانیان نەبوون، بەڵکو ـ وەك عەبدولعەزیز دوریی لێکۆڵەر بۆی دەچێت ـ سامانێکی هاوبەشی خێزان یاخود خێڵ بوون و لە نێوەندە کۆمەڵایەتیەکەدا دەستاو دەستیان پێ دەکرا[1].

وا پێناچێت ئەم هەستە مێژووییە بەرز بوو بێتەوە بۆ ئاستێك بتوانرێت زانینێکی مێژوویی لەسەر بنیات بنرێت وەك ئەوە بێت، کە بە هاتنی ئیسلام دامەزرا، چونکە لەو کاتەدا عەرەب مەلەکەی مێژوویی و توانای پەی بردن بە حەقیقەتی ڕووداو و بەسەرهاتەکانیان نەبوو[2]، لەبەر ئەمە لەو کاتەدا ئەفسانە زاڵ بوو بوو بەسەر ڕاستیی مێژوویی و میتۆدی بیرکردنەوەی مێژووییدا، ئەگەر چی ئەمە تەنها لەسەر ئاستی باسکردن و گێڕانەوە بوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە پێمان وایە ئەم پاشخانە پاڵنەرێکی تری موسڵمانان بوو و کاری کردە سەر بیرکردنەوەی مێژووییان و ڕێبازی گێڕانەوەی هەواڵەکان، ئەگەر چی زانینی مێژوویی ئیسلامی تێڕوانینێکی جیاوازی هەبوو بۆ ئەم هەواڵانە.

لێکۆڵەرەکان کۆمەڵێك پاڵنەریان پێشنیار کردووە، کە لە پشت سەرهەڵدان و شێوەگیر بوونی ئەم زانینە مێژووییە نوێیەوە بوون. پاڵنەری ئاینی لە پێشەوەی ئەم پاڵنەرانەدایە، ئەمەش پەیوەستە بە دەقە ئاینییەکان و[3] لە پێش هەمووشیانەوە بە قورئانەوە، کە زۆر هەواڵ یان حیکایەتی تیایە لە بارەی ڕێباز و ژیاننامەی میللەتانی پێشوو، ئەم هەواڵە چەسپاوانەی ناو قورئان زۆر ڕەهەندو ئاڕاستەی جیاوازیان هەیە، کە بریتین لە باسکردنی ڕاستەوخۆ و گێڕانەوەی حیکایەت ئامێزانەی ئەزموونی ژمارەیەك

---

(1) عبدالعزیز (الدوري): بحث في نشاة علم التاريخ عند العرب، (بيروت: ١٩٦٠)، ص١٤-١٥.

(2) بڕوانە: هاملتون (جب): علم التاريخ، ت: ابراهيم خورشيد وآخرون، (بيروت: ١٩٨١)، ص٤٧-٤٨.

(3) "هیچ کتێبێك لە کتێبەکانی خوا، لە مێژوو بە تاڵ نەبوون". القرماني: اخبار الدول وآثار الاول في التاريخ، (بيروت: د. ت)، ص٣.

کۆمەڵی مرۆیی[1]. ئەمە پاڵنەرێکی بەهێزی موسڵمانان بوو بۆ بایەخدان بە مێژوو بە مەبەستی زانینی ناواخنی ئەم حیکایەتانە یان دۆزینەوەی لێکدانەوەیەکی مێژوویی بۆیان، تا یارمەتییان بدات بۆ تێگەیشتن لەم حیکایەتە ئامۆژگاری ئامێزانە و بەکارهێنانیان لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئێستایاندا. جگە لەمە پێویستیان بە زانینی هۆی «دابەزینی ئایەتەکانی قورئان» بوو، بە تایبەتی ئەوانەی لە بارەی رووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر و هاورێکانییەوە دابەزی بوون، بۆیە دەبوو بە پشت بەستن بە گێڕرەوەکان، بگەڕێنەوە بۆ ئەو رووداوانە تا لە راستیی رووداوەکان تێ بگەن، هەروەها بۆ زانینی حوکمە شەرعییەکانی ناو قورئان لەو رووەوە کامیان لە پێشتر هاتوون و کامیان دواتر هاتوون و زانینی سڕەرەوە (الناسخ) و سڕاوە (المنسوخ) بە مەبەستی چەسپاندنی حوکمەکان بە پێی ئەمە[2].

ئەم پاڵنەرە ئاینییە رۆڵی هەبووە لە گرنگیداندا بە مێژوو و لقەکانی، کارەکەش تەنها پەیوەست نەبوو بە دەقەکانی قورئان و ئەو پاڵنەرانەی قورئان، کە دەبوونە هۆی گەڕانەوە بۆ مێژوو و لێکۆڵینەوەی ئەم مێژووە، بەڵکو ئەمە بەسترا بوو بە ژیانی پێغەمبەر و کارەکانییەوە و گەڕانەوە بۆ وتە و کردارەکانی بۆ لێکدانەوەی قورئان و زانینی هەواڵەکانی پێغەمبەر خۆی و ئەو پەند و ئامۆژگارییانەی دەکرێت لەم هەواڵانەوە وەر بگیرێن، هەروەها پشت بەستن پێیان لە دانانی رێسای شەرعی و رێکخستنی ئیداریی و کاروبارەکانی ژیاندا، ئەمەش بە پێوانی (قیاس) کێشە بینراوەکانی ئێستا بە پێی ئەو کێشانەی پێغەمبەر چارەسەری کردوون یان لە بارەیانەوە فەرموودەی هەیە. هەموو ئەمانە بوونە هۆی سەرهەڵدانی شێوازێکی تایبەتی نوسینەوەی مێژوو و لەوەدا رەنگی دایەوە کە بە کتێبەکانی (ژیاننامە و جەنگەکان) ناسراون، واتە ئەو نوسراوانەی لە بارەی ژیانی پێغەمبەر و جەنگەکانی و ئەو رووداوانەوە بوون، کە پیایاندا تێپەڕیوە. هەروەها لەمەشەوە گرنگیدان بە وتە و کرداری یاوەرانی

---

(1) عمادالدين (خليل): التفسير الاسلامي للتاريخ، ط٤، (نينوى: ١٩٨٦)، ص٥.

(2) زۆر کەس لەم کولتورە قورئانییەیان کۆڵیوەتەوە، بە تایبەتی بڕوانە: نصار: م. س، ص٩. مصطفى: م. س، ج١، ص٥٧-٦٠. عبدالله (العروي): العرب والفكر التاريخي، ط٢، (بيروت: ١٩٨٥)، ص٧٩-٨٠.

پێغەمبەر و ئەوانەی پاش ئەوان هاتن (التابعين) سەری هەڵدا، ئەمەش بە تەواوکەری فەرموودە و کردارەکانی پێغەمبەر دادەنرا، یان بۆ ئەوە بوو بۆ گەیشتن بە فەرموودە و سوننەتەکانی پێغەمبەر پشتیان پێ ببەسترێت، سەرەڕای ئەوەی دیاریکردنی پێگەی ئەو یاوەرانە بوو لای پێغەمبەر و لە بانگەوازی ئیسلامیشدا.

پەرەسەندن و ڕووداوە سیاسییەکانی کایەی ئیسلامیش ـ لە قۆناغی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە ـ ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە گرنگیداندا بە مێژوو، چونکە مەسەلەی خەلافەت و ململانێی لایەنەکان لەسەری و کێشەی ئەوەی کێ لە دوای پێغەمبەر فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست، وایان لە زۆر کەس کرد بگەڕێنەوە بۆ مێژوو بۆ ئەوەی کۆمەڵێك بەڵگە بەدەست بهێنن و بیانکەنە پاڵپشتییەك بۆ گۆشەنیگای هەر یەك لە لایەنەکانی ئەو ململانێیە[1]. هەر لایەنێك، بە تایبەتی هەر یەك لە شیعە و سوننە، هەوڵی دەدا مێژوویەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە تا لە ئێستادا پێگە و بوونی شەرعیی خۆی پێ بسەلمێنێت و لە ململانێکانیدا لەگەڵ لایەنەکانی تردا بەکاری بهێنێت و لە ناوەوەش لایەنگرانی خۆی پێ ئارام بکاتەوە و یەکیان بخات.

لە لایەکی تریشەوە ئەو دەوڵەتەی پێغەمبەر بناغەکەی دانابوو، ئەوەندەی پێنەچوو بە هۆی بزافی وڵاتگیرییەوە بووە ئیمپراتۆریەتێکی فراوان، ئەمەش وردە وردە بووە هۆی ئەوەی زۆر میللەت و نەتەوە بێنە ناو ئیسلامەوە. شتێکی سروشتی بوو ئەم میللەت و نەتەوانەش خاوەنی مێژووی خۆیان بن[2] و لە نوسینەوەی ئەم مێژوودا گۆشەنیگای خۆیان هەبێت، بۆیە هەوڵیان دەدا ئەو زانینەی هەیانە بیهێننە ناو ڕۆشنبیریی ئیسلامییەوە، وەك لای جولەکەکان ئەمە دەبینرێت، بە تایبەتی ئەوانەیان موسڵمان بوو بوون زۆر لە حیکایەتەکانی خۆیان خستە ناو نوسینی مێژووی

---

(1) الدوري: م. ن، ص٣٢-٣٣. مصطفى: م. س، ص٦٤. هەروەها بڕوانە: طريف (الخالدي): بحث في مفهوم التاريخ ومنهجه، ط١، (بيروت: ١٩٨٢)، ص٢٧.

(2) "هەر یەکێك لەو نەتەوە جیاوازانەی هەرێمەکانیش مێژووی خۆی هەبوو، کە تایبەت بوو بە سەردەمی پاشاکانیان یان پێغەمبەرەکانیان یان دەوڵەتەکانیان یان هۆیەك لە هۆیەکان ...." البيروني: الآثار الباقية، ص١٣.

ئیسلامییەوە[1]، هەروەها فارسەکانیش بەردەوام کاریان لەسەر ئەوە دەکرد مێژوو و ئەفسانەکانی خۆیان بخزێننە ناو زانینی مێژوویی ئیسلامییەوە. ئەمەش لە چوارچێوەی کۆمەڵە پەیوەندییەکدا بوو، کە ململانێی نێوان سەرجەم میللەت و کۆمەڵەکانی پێوە دیار بوو، وەك ململانێی فارس و عەرەب و ئەوانی تر، بە تایبەتی ئەو کاتەی ئەم میللەتانە هاتنە ژێر ئالای ئیسلامەوە و هەر لایەك هەوڵی ئەوەی دەدا بەرامبەر ئەوی تر شانازی بە خۆیەوە بکات، یان بە گەڕانەوە بۆ گەنجینەی مێژوویی خۆی لە پلەو پایەی ئەویتر کەم بکاتەوە، ئەمە سەرەڕای بەردەوامبوونی ململانێی نێوان خودی خێڵە عەرەبییەکانیش، کە ئەنجامەکەی گەڕانەوە بوو بۆ زانینی مێژوویی رەچەڵەکگەری و گەشەپێدانی ئەم زانینە، کە دواتر بە زانستی رەچەڵەکگەری ناسرا[2].

کاتێك پایەکانی دەوڵەتی ئیسلامی جێگیر بوون، پاڵنەری ئیداری و ئابووری رۆڵیان هەبوو لە گرنگیدان بە لێکۆڵنەوەی مێژوودا، بە تایبەتی مێژووی زەوییە داگیرکراوەکان و چۆنیەتیی داگیرکردنیان و باجی سەپێنراو بەسەریاندا و زۆر مەسەلەی تری لەم جۆرە[3]. هەروەها ئاماژە بەوە دەکرێت، کە دەسەڵاتدارەکان بایەخیان بە زانینی مێژوویی دەدا و هانی لێکۆڵینەوە لەم زانینەیان دەدا و زۆر حەزیان لە زانینی هەواڵی نەتەوە و میللەتەکانی پێشوو بوو، بۆ نموونە لە بارەی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەمەوییەوە (١٠-٦٠ك/ ٦٦٠-٦٧٩ز) ئەوە دەگێڕنەوە، کە بەردەوام گوێی لە هەواڵ و ژیاننامەکان دەگرت و هانی زاناکانی دەدا بەسەرهاتی پێشینەکان بگێڕنەوە[4].

---

[1] بۆ ئەمە بڕوانە:
Franz (Rosntal): The influence of the biblical tradition on muslim historiography, in: of the middle east, (London: 1962), pp.

[2] لە بەشی یەکەمی ئەم نامەیەدا بە دوور و درێژی رۆڵی ئەم ململانێیانە لە سەرهەڵدانی مەعریفەی مێژووییدا روون دەکەینەوە.

[3] الدوري: م. س، ص. نصار: م. س، ص١٦.

[4] بۆ نموونە بڕوانە: المسعودي: التنبيه والاشراف، (بيروت: ١٩٨١)، ص١٠٧-١٠٩. ابن النديم: م. س، ص١٣٨.

هەموو ئەم پاڵنەرانە بەس بوون بۆ دروستبوونی نەزعەیەکی مێژوویی[1] لە رۆشنبیریی ئیسلامیدا و کارکردن لەسەر بەرهەمهێنانی رێژەیەکی زۆری زانینی مێژوویی بە شێوازی جۆراو جۆر. بەڵام لێرەدا ئەوەی دەمانەوێت جەختی لەسەر بکەینەوە ئەوەیە، بە خوێندنەوەی پاڵنەرەکانی سەرهەڵدانی ئەم نەزعەیە، دەگەینە ئەوەی ئەم نەزعە مێژووییە بەرهەمی ئەو کۆئەندێشەیە (المخيال الجمعي)[2]، کە بە تەواوی پەیوەستە بە چوارچێوە ئاینییە - سیاسییە - کارگێڕییە باوەکانی کایەی ئیسلامییەوە. ئەو کۆمەڵگەیەی دەکەوێتە ناو چوارچێوەی کایەکەوە، لە میانەی ئەم ئەندێشەیەوە خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە و شوناس و رۆڵەکانیش دابەش دەکات، وەك دیاریکردنی ئەو رۆڵـەی کێ مافی وەرگرتنی خەلافەتی هەیە. بەو واتایەی کۆمەڵگاکە - فۆڕمەکەی هەر چییەك بێت - لە میانەی ئەندێشەکەیەوە خۆی دیاری دەکات و پێوەر و بەها جیاوازەکان دەچەسپێنێت[3].

کەواتە لەم بارەدا ئەم ئەندێشەیە ناتوانێت، بە بێ گۆرانکاری یان راڤەکردن یان دەستکاریکردن، بە تەواوی حەقیقەتە مێژووییەکەمان وەك خۆی پێ بگەیەنێت، چونکە دەبێت ئەم حەقیقەتە بە ناو سەرجەم چوارچێوە ئاینی و سیاسییەکاندا بڕوات، بۆ ئەوەی جارێکی تر لە ئەندێشەی مێژوونوس - گوزارشتکەر لە کۆئەندێشە - دا شێوەگیر بیێتەوەو تۆماری بکات. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەم پرۆسەی تۆمارکردنە، یاخوود گۆڕینی واقیعە مێژووییەکە بۆ باری نوسین، واتای تایبەتی خۆی

---

[1] بڕوانە: جب: م. س، ص٦٤.

[2] ئەندێشە (المخيال) یەکێکە لەو چەمکانەی لە زۆر شوێنی ئەم باسەدا بەکاری دەهێنین، ئەم چەمکە لە لێکۆڵینەوە مێژوویی - کۆمەڵایەتییە هاوچەرخەکاندا گرنگییەکی زۆری پێدراوە. ئەم چەمکە گوزارشتە لە تۆڕێك لە رەمز و پێوەر، کە تیایدا یان بەهۆیەوە دیاردەو شتە جیاوازەکان راڤە دەکرێن. لێرەشدا - سەبارەت بە ئێمە - پەیوەندیی ئەندێشە بە زانینی مێژووییەوە ئەوەیە خەیاڵگە وەك "چاویلکەیەکە"، کە لە میانەی ئەوەوە "حەقیقەتی شتەکان"دەبینین، واتە لە میانەی ئەوەوە واتا بە شتەکان دەدەین. محمد عابد (الجابري): العقل السياسي العربي - محدداته وتجلياته، ط٣، (بيروت: ١٩٩٥)، ص١٠٥.

[3] الجابري: م. ن، ص١٥. ئەویش لەم سەرچاوەیە وەری گرتووە:
Pierre Ansart: Ideologies Pouvoirs, (Paris: 1977), p.21.

هەیە، ئەویش پێدانی فۆرمێکی جیاوازە بە فۆڕمە ڕاستەقینەکەی واقیع، ئەم واقیعە ئێستا بووەتە واقیعێکی گوتەیی و بە پلەی یەکەم زمان ـ لێرەدا زمانی عەرەبیی ـ و توانا ڕەوانبێژییە داڕێژەرەکانی، وەك خوازە و درکە و ڕەمزدانان و شتی لەم جۆرە، تەحەکومی پێوە دەکەن. بۆیە واقیعە مێژووییەکە دەبێتە گوزارشتکردن لە بیرکردنەوەی تۆمارکەرەکەی و ئەو ئەندێشەیەی، کە ئەم بیرکردنەوەیە ئینتیمای بۆی هەیە نەك واقیعە ڕاستەقینەکە[1]، بەمە نوسراوەکە دەبێتە نێوەندێکی هێمایی (الوسيط الرمزي) و دەمان بەستێتەوە بە ئەندێشە مێژووییەکەوە[2]، ئەم ئەندێشە مێژووییەش لە پێناو خودی مێژوودا مامەڵە لەگەڵ مێژوودا ناکات، بەڵکو وەك پێویستییەکی هەنووکەیی دیاری کراوی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

زانینی مێژوویی هەوڵی داوە (پێویستبوون بە مێژوو) ببەستێتەوە بە سروشتی مرۆڤ خۆیەوە، ناکرێت مرۆڤ دەست بەرداری مێژوو ببێت، چونکە لە ((هەموو ئەو کۆڕانەی بۆ کاری خێر و چاکە و پیاوەتی بەستراون، بەسەرهاتیان تێدا گێڕراوەتەوە، جا چ باسی پێغەمبەرێك بێت، یان پاشایەك یان ڕەچەڵەكێك یاخود سەردەم و ڕۆژگارێکی عەرەب بێت))[3]. ئەم دەقە تیشك دەخاتە سەر مەبەستی ئێمە لە پێویستبوونی مێژوو بە پێی کۆئەندێشەکە، چونکە ئەوەمان پیدەڵێت، کە مێژوو زانینێکی کۆڕگێڕانەیە، کرۆکی ئەم کۆبوونەوەیەش چاکەو ڕێی ڕاست گرتن و پیاوەتییە واتە کۆبوونەوەیەکی ئەخلاقییە. پاشان باسکردنی مێژوو باسکردنێکی ئەخلاقییە، ئەوە بنەما ئەخلاقییەکانی ناوەوەی مرۆڤە داوای باسکردنی مێژوو و گێڕانەوەی هەواڵەکان دەکات و بەلایەوە گرنگ نییە لە بارەی هەر بابەتێکەوە بن. لەبەر ئەمە مرۆڤ لە ناخەوە ئارەزووی

---

(1) بڕوانە: محمد (الجويلي): الزعيم السياسي في المخيال الاسلامي ـ بين المقدس والمدنس، (تونس: ١٩٩٢)، ص٣٠.

(2) م. ن، ص٣١.

(3) ابن قتيبة: المعارف، صححه وعلق عليه: محمد اسماعيل عبدالله الصاوي، ط٢، (بيروت: ١٣٩٠ك/١٩٧٠ز)، ص٢.

زانینی هەواڵەکانی رابردوو دەکات و حەزی لەم زانینەیەو سۆزی بۆی هەیە، چ پەیوەست بێت بە سەرەتای شتەکانەوە یان هەواڵی پێغەمبەرەکان یان ژیاننامەی پاشاکان[1].

بۆ نمونە لای مەسعودی، مێژوو پێویستییەکی سروشتیی مرۆڤە بە هەموو چین و توێژەکانییەوە: زاناو نەزان، گەمژەو ژیر، چینی بەرز و چینی نزم، جیاوازی نێوان ئارەزووی میللەتەکانیشی بۆ مێژوو تۆمار کردووە[2]. کەچی هەندێکی تر وای بۆ دەچن مێژوو پێویستییەکی هزریی ئەو مرۆڤانەیە، کە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرز و بیرێکی راستیان هەیە[3] و ((ئارەزووی ناسینی سەرەتاکانن و تامەزرۆی پەی بردنن بە سەرهەڵدانەکان))[4].

وەرگری مێژوو لە هەر ئاستێکدا بێت، دەیەوێت لەگەڵ ئەو مێژوو ـ رابردووەدا بژی، یان بە دەربڕینێکی وردتر، دەیەوێت رابردوو زیندوو بکاتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژی. ئەم کارەش رەهەندێکی ئاینیی هەیە و ئەم رەهەندە ئاینییە دەدرێت بەو کەسەی (واتە مێژوونوسەکان) ئەم پرۆسەی زیندوو کردنەوەیە ئەنجام دەدات، بۆیەش بە زیندوو کردنەوە دادەنرێت، چونکە باسکردنی هەواڵەکانی پێشینەکان زیندوو کردنەوەیانە ((ئەوەی زیندووی بکاتەوە وەك ئەوەیە هەموو خەڵکی زیندوو کردبێتەوە))[5]، ناتوانین لەم ئاراستەیە تێبگەین، کە مەبەست لێی پێدانی پێگەیەکی ئاینی ـ کۆمەڵایەتیی بەرز بوو بە مێژوو، ئەگەر بێت و لەگەڵ تێڕوانینی گشتیدا بۆ مێژوو واتە لەگەڵ مەبەستگەرایی خودی مێژوودا نەیگونجێنین. مرۆڤ پێویستی بە مێژووە، چونکە بە زۆری لەمەدا کۆمەڵێك مەبەستی مەعنەویی هەیە و دەیەوێت لە رێگەی مێژووەوە بەدییان بهێنێت، بە پێی زانینی مێژوویی ئیسلامیش ئامانجی سەرەکیی مێژوو پەندو ئامۆژگارییە.

---

[1] ابن الجوزي: المنتظم في تواريخ الملوك والامم، حققه و قدم له: سهيل زكار، (بيروت: ١٤١٥ك/١٩٩٥ز)، ج١، ص٥.

[2] مروج الذهب، مج١، ص٣٨٤. هەروەها بڕوانە: ابن خلدون: المقدمة، ص٢.

[3] ابن قتيبة: م. س، ص٢. سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، حققه وقدم له: احسان عباس، (بيروت: ١٤٠٥ك/ ١٩٨٥ز)، السفر الاول، ص٣٩.

[4] سبط ابن الجوزي: م. ن، السفر الاول، ص٣٩.

[5] السخاوي: الاعلان بالتوبيخ، ص٤٠٩-٤١٠. ئەم دەقە لە بناغەدا ئایەتێکی قورئانییە "فمن احياها فكأنما احيا الناس جميعا". سورەتی المائدة، ئایەتی ژمارە (٣٢).

لە ئیسلامدا پەند وەرگرتن لە مێژوو بە پلەی یەکەم بیرۆکەیەکی خوداییە، چونکە قورئان داوای کردووە لە مێژوودا سەرنج بدەینە هەواڵ و چارەنوسی نەتەوە و میللەتە پێشینەکان ﴿فانظروا كيف كان عاقبة الذين من قبل﴾[1] واتە بڕوانن چارەنوسی ئەوانەی پێشوو چۆن بووە. سەرنجدانیش لە مێژوو واتە گەڕان بە دوای جەوهەری رابردوودا، نەك تەنها بە مەبەستی زانینی رابردوو، بەڵکو بە مەبەستی پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن ﴿لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الالباب﴾[2] واتە لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانی ئەواندا پەند هەیە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن فام و ژیرین. پەند وەرگرتنیش لە قورئاندا، وەك لێکۆڵەرێك بۆی چووە، ئیحای جوڵەو گواستنەوەی جەستەیی و دەروونیی و عەقڵییە لە حاڵەتی کپییەوە بۆ حاڵەتی درەوشانەوە ، ئەم جوڵە و گواستنەوەیەش دوای ئاشکراکردنی ئامانج لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە روو دەدەن[3]. لەبەر ئەمە موسڵمانەکان داوایان لێکرابوو هۆشیارییەکی زیاتریان بە مێژوو هەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆسەی کەشفکردنە یان بۆ راڤەکردنی قورئان و تێگەیشتنێکی قووڵ لە چیرۆك و بەسەرهاتە مێژووییەکانی ناو قورئان، چونکە ئەم چیرۆکانە لە پلەی یەکەمدا ئامانجیان گۆڕینی حاڵەتی کۆمەڵایەتی ـ سیاسیی ئێستایە، هەروەها بۆ وروژاندنی هزری مرۆیی و هاندانی مرۆڤن تا بەردەوام بپرسێت و بە دوای ئەم گۆڕانەدا بگەڕێت[4].

مێژوونوسەکان پابەند بوون بەم تێگەیشتنە قورئانییەی مێژوو، بەو جۆرەش مامەڵەیان لەگەڵ مێژوودا دەکرد، کە بۆ سەرنجدان و تێڕامانە بۆ ئەوەی کەسی ئامادە لە کەسی بەسەرچوو فێر ببێت و چاوی لێ بکات. هەروەها باوەڕیان وابوو مێژوو بۆ دنیا و قیامەت سودی هەیە، چونکە مرۆڤ دەرسی لێ وەردەگرێت و پەیڕەوی دەکات بۆ ئەوەی

---

(1) سورة الروم، الآية (٤٢). لە قورئاندا زۆر ئایەتی تر هەن هەمان واتا دەگەیەنن، وەك : سورة الاعراب ، الآية (٨٤)، (١٠٣). سورة يونس ، الآية (٣٩)، (٧٣).

(2) سورة يوسف، الآية (١١١).

(3) عفت محمد (الشرقاوي): ادب التاريخ عند العرب، (بيروت: د. ت)، ص٢١٣.

(4) خليل: التفسير الاسلامي، ص١٠٦. محمد (اركون): الفكر الاسلامي ـ قراءة علمية، ت: هاشم صالح، (بيروت: ١٩٨٧)، ص١٤٦.

((توێشووی قیامەت)) بەدەست بهێنێت[1]. ئەم پەندە ئاینییەش لە ((نەبوونی متمانە بە دنیای بڕاوە و ئارەزووی زۆر لە دوارۆژی نەبڕاوە))[2]دا خۆی دەنوێنێت. بۆیە مێژوو لە دنیادا ((پەندێکی ئەخلاقییە و مرۆڤی تێگەیشتوو پەروەردە دەکات))[3]و مرۆڤ سود لە باشترین پەندو ئامۆژگاریی هەواڵەکان وەردەگرێت[4] و ئەگەر مێژوو نەبوایە کەم پەند لە سەرەنجام و سزاکانیان وەردەگیرا[5].

پاڵنەری ئاینی و پاڵنەری سیاسی، دوو پاڵنەری سەرەکیی گرنگیدان بوون بە زانینی مێژوویی ئیسلامی، بۆیە سروشتی بوو بابەتی ئەم زانینە بە دەوری ئەم دوو مەسەلەیەو ڕەهەندە جیاواز و جۆراو جۆرەکانیاندا بخولێتەوە، واتە زۆربەی کتێبە مێژووییەکان بایەخیان بە مێژووی ئاینی و سیاسی دەدا[6]. مێژووی ئاینی تەنها گرنگیدان بوو بە قۆناغی پێغەمبەرایەتی و ئەوەی لە بارەی قۆناغەکانی ترەوە نوسراوە لەوە تێ ناپەڕێت، کە بریتییە لە ناساندنی زاناو فەقیهەکان و ئەوانەی بایەخیان بە زانستی ئاینی دەدا، لەگەڵ نوسینەوەی مێژووەکەیان، کە زۆربەیان بە شێوازێکی تایبەت بوون و پێیان دەوترا کتێبی ژیاننامەو چینەکان (الطبقات). بۆیە شتێکی سروشتی بوو تێکڕای مێژووی گشتی، مۆرکێکی سیاسی وەرگرێت و بەشی هەرە زۆری بریتیی بێت لە تۆمارکردنی هەواڵەکانی پەیوەست بە دەسەڵاتی سیاسییەوە بە واتا فراوانەکەی. ئەم دەسەڵاتە توانیی لە زانینی مێژووییدا پێگەیەکی بەرز بەدەست بهێنێت و ئەستەمە بتوانین لە کایەی ئیسلامیدا مومارەسەی سیاسی و زانینی مێژوویی لە یەك دابڕین.

بەشێوەیەکی گشتی مێژوو بریتییە لە مێژووی سیاسی و ناساندنی دەسەڵاتی سیاسی و ئەو ڕووداوانەی پەیوەستن بەم دەسەڵاتەوە، چونکە هەواڵ و ڕووداوەکانی تر بە

---

(1) ابن الاثير: م. س، ج١، ص٨. ابن خلدون: م. س، ص٨.

(2) الروذراوردي: ذيل كتاب تجارب الامم، اعتنى بنسخه وتصحيحه: هـ. ف. امدروز، (مصر: ١٩١٦)، ج٣، ص٤. السخاوي: م. س، ص٤٢٣.

(3) الهمداني: تكملة تاريخ الطبري، تحقيق: محمد ابوالفضل ابراهيم، (القاهرة: ١٩٨٢)، ص١٨٧.

(4) الروذراوردي: م. س، ج٣، ص٤. ابن الجوزي: م. س، ج١، ص٧.

(5) العماد الكاتب الاصفهاني: الفتح القسي في فتح القدسي، تحقيق: محمد محمود صبح، (القاهرة: ١٩٦٥)، ص٤٤.

(6) الخالدي: بحث في مفهوم التاريخ، ص٢٧. ابو ضيف: منهج البحث، ص٤٧.

پێی یاسای هاوچاخی (التعاصر) سەرپێییانە باس دەکرێن و لە راستیدا مێژوو بریتییە لە مێژووی پاشاکانی رابردوو و ((گێڕانەوەی رووداوی کاروبارەکان لە سەردەم و رۆژگاری ئەواندا))[1]، یان گێڕانەوەی کاروباری خەلیفەکانە لە سەرەتای ژیانەوە تا سەردەمی مێژوونوس. مێژوو بە تەواوەتی مێژووی پاشاکانی رۆژهەلات و رۆژئاوایە[2]، مێژوونوسیش ئەوە بە بیر وەرگرەکانی دێنێتەوە یەکێك لە سودە سەرەکییەکانی مێژوو باسکردنی پاشاکان و سیاسەتەکانیانە[3]. بە کورتی مێژوو بریتییە لە باسکردنی هەواڵی زنجیرەی یەك بە یەکی پاشا یاخود خەلیفەکان[4]، یان ئەم باسکردنە ((گێڕانەوەیەکی بێ لایەنانەی هەواڵ و ژیاننامە و بەسەرهاتەکانە))[5].

لەوانەیە ئەم دەسەڵاتگەرایییەی مێژوو پەیوەندیی بە تێڕوانینی باوی کایەی ئیسلامییەوە هەبێت لە دەسەڵاتی سیاسی، کە لە خەلافەتدا بەرجەستە دەبێت، خەلیفە پیرۆزییەکی ئاینیی هەیە[6]، بۆیە ئاساییە خەلیفە بەرجەستەکەری رەوتی راستەقینەی مێژوو بێت، چونکە نوسینی مێژوویی بە جۆرێك لە جۆرەکان گوزارشتی لە پەیوەندی نێوان عەقیدەی ئاینی و دەسەڵاتی سیاسی دەکرد، پەندی مێژوو سەبارەت بە سوڵتان لەوەدایە دەست بە عەقیدەکەیەوە بگرێت و - لە پیادەکردنی دەسەڵاتدا - ئەو یاسا رەوشتییانە پەیڕەو بکات، کە ئیسلام بۆ دەسەڵاتدارانی دیاری کردووە. بۆیە لەم بارەدا ئاسایی بوو، هەندێك لە مێژوونوسان - داناکان گوتارە مێژووییەکانیان ئاڕاستەی دەسەڵاتدارەکان بکەن، بۆ ئەوەی لە هەموو خەڵك زیاتر پەند و ئامۆژگاری لە مێژوو

---

[1] المقدسي: البدء والتاريخ، وضع حواشيه: خليل عمران، (بيروت: ١٤١٧ك/ ١٩٩٧ز)، ج١، ص١٠.

[2] ابن الاثير: الكامل، ج١، ص٢.

[3] السخاوي: م. س، ص٤٠٠.

[4] الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ص٦٢-٧٠. ابن العمراني: الانباء في تاريخ الخلفاء، حققه: قاسم السامرائي، (لايدن: ١٩٧٣)، ص٤٣.

[5] الاصفهاني: تاريخ سني ملوك الارض، ص١٣.

[6] ((رازیکردنی گشتە بەوەی بەرژەوەندییە دنیایی و قیامەتییەکانیان لە چوارچێوەی شەریعەتدا بێت... لە راستیدا بریتییە لەوەی لە جێی پێغەمبەر چاودێریی ئاین و سیاسەتی دنیا بکرێت)) . ابن خلدون: م. س، ص١٥١.

وەرگرن، چونکە سودی مێژوو بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دنیادا زۆرترین بەشیان پێ براوە ((وەك وەزیرەکان و سەرکردە سەربازییەکان و بەڕێوەبەری شارەکان))[1]، مێژوونوس ڕەخنە لەو دەسەڵاتدارە دەگرێت، کە مێژوو پشتگوێ دەخات و چاو بە بارودۆخی پاشاکانی پێش خۆیدا ناخشێنێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەیان کە بە ڕێك و پێکی کاروباری وڵاتەکەی خۆیان بەڕێوە بردووە[2]، مێژوونوسێکی تر دەڵێت گەورەترین هەڵەی دەسەڵاتدارەکان ((تێڕوانینیانە لە سیاسەتی ئەوانەی پێش خۆیان و کارکردنیانە بە پێی ئەو سیاسەتانەی ئەوان، بە بێ وردبوونەوە لەوەی شەرع هێناویەتی))[3]. مێژوو لە یەکێك لە ڕووەکانیدا، ئامۆژگارییە بۆ ئەو پاشایانەی، کە دەتوانن پەندی لێ وەرگرن و چارەنوسی ئەوانە ببینن، کە خراپەیان کردووە و هەواڵی ئەوانەش بزانن، کە چاکەیان کردووە، ئەمەش بۆ ئەوەی واز لە خراپە بهێنن و بەرەو چاکە کردن بچن[4]. هەروەها ئەمە لە فیقهی سیاسیی ئیسلامیشدا ڕەنگی داوەتەوە، بە تایبەتی لەو کتێبانەدا، کە ناو نراون ئامۆژگاریی پاشاکان (نصائح الملوك)، چونکە یەکێك لەو ئامۆژگارییانەی ئاڕاستەیان دەکرێت ئەوەیە هەواڵی پێشینان لەبیر نەکەن، بەڵکو لێیان ورد ببنەوە و لە سیاسەتی خۆیاندا سودیان لێ وەرگرن. ئەوەی لەمەشدا یارمەتییان دەدات ئەو لێکچوون و نزیکییەیە، کە لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا، لە نێوان پاشاکاندا هەیە[5].

کەواتە سوڵتان ئەو ڕەگەزە سەرەکییەیە، کە بوونێکی ڕەهای هەیە و ڕەگەزە کۆمەڵایەتییەکانی تر، بۆ نمونە چینە گشتییەکەی خەڵك، لە بەرامبەر ئەمدا بوونیان نییە. ئەوەی چاو بە کتێبەکانی مێژووی ئیسلامیدا بخشێنێت، بە ئاسانی ئەوەی بۆ دەردەکەوێت، کە سوڵتان ـ پاشا ـ خەلیفە ـ میر تاکە دروستکەر و کارای مێژووە، بە

---

(1) الخالدي: م. س، ص٢٥. ئەویش وەریگرتووە لە: مسکویە: تجارب الامم، (لایدن: ١٩٠٩)، ج١، ص٥. (نەمان توانی ئەم بەشەی کتێبەکە ببینین و ئاگاداری بین).

(2) مسكويه: تجارب الامم وتعاقب الهمم، تحقيق: هـ. ف. امدروز، (مصر: ١٩١٤)، ج٢، ص٣٦-٣٧.

(3) ابن الجوزي: م. س، ج١، ص٧.

(4) ابن الاثير: م. س، ج١، ص٦-٧. الكافيجي: م. س، ص٣٦٨.

(5) الماوردي: نصيحة الملوك، تحقيق: محمد جاسم الحديثي، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ١١١.

جۆرێك بابەتی سەرەكیی مێژوو بریتییە لە بەدوای یەكدا هاتنی زەمەنییانەی پاشاكان. بۆیە، بە پێی ئەوەی عەزیز عەظمەی توێژەر بۆی چووە و ئێمەش لەگەڵیدا هاو راین، سروشتی بوو پاشاكان بەشی هەرە سەرەكیی چوارچێوە و ناوەڕۆكی مێژوو بن و ململانێی خودی زەمەن بكەن لە دیاریكردنی زەمەنیبوونی شتەكاندا[1].

راستییەكەی دسەڵاتی سیاسیش لە لایەن خۆیەوە پێویستی بەو هەواڵە مێژووییانە هەبوو، كە بە هەموویان كولتورێكی رۆشنبیریی پێویستیان پێك دەهێنا بۆ چەسپاندنی شەرعیەتی ئەم دەسەڵاتە ئیسلامییە و پاراستنی یەكێتییەكەی[2]. ئاسایی بوو دەسەڵاتدارەكانیش هەوڵ بدەن، بە شێوەیەكی راستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، مێژوونوسەكان بە لای خۆیاندا رابكێشن. بۆیە دەبینین زۆر لە مێژوونوسەكان بە ئیحای راستەوخۆی پیاوانی دەوڵەت، یان لەژێر سایەی ئەواندا، یان بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندیی ئەوان مێژوویان نوسیوە[3]، تەنانەت مێژوونوسێكی پاكیش، كاتێك دەسەڵاتی سیاسی لە سەنتەری هەواڵەكاندا دادەنێت، ئەوا بەمە وەلائی خۆی بۆ ئەو دەسەڵاتە دەردەبڕێت، ئیتر گرنگ نییە فۆڕمەكەی هەرچییەك بێت، هەرچەند ئەم وەلائە ـ وەك دواتر باسی دەكەین ـ لە زەینی مێژوونوسدا شێوەگیر بووە، واتە لەو ئاستەدایە، كە مێژوونوس ئاگای لێ بێت یان ئاگای لێ نەبێت، تەحەكوم بە بیركردنەوەی دەكات و تێڕوانینی بۆ رووداوەكان و مامەڵەكردنی لەگەڵیاندا دیاری دەكات. دەسەڵاتی سیاسیش لە كایەی ئیسلامیدا، تا رادەیەكی باش لە چێوەداركردنی زانینی مێژووییدا سەركەوتوو بوو، ئەمەش بەهۆی باڵادەستیی نەزعەی یەكێتیی ـ ناوەندییەوە بوو لای زۆربەی ئەوانەی لەم كایەیەدا زانینە جۆراوجۆرەكانیان بەرهەم دەهێنا[4]. سەبارەت بە پەرەسەندنی زانینی مێژوویی ئیسلامیش، ئەوا موسڵمانەكان هەر زوو، بە لایەنی

---

[1] الكتابة التاريخية، ص٨٠.

[2] بڕوانە: اركون: م. س، ص٢٣.

[3] الخالدي: م. س، ص٢٥.

[4] پێمانویست لێرەدا هەندێك نمونە بهێنینەوە، چونكە ئەمە بابەتی سەرەكیی بەشی دووەمی نامەكەیە.

کەمەوە لە کۆتایی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە، دەستیان کرد بە تۆمارکردن[1] لە سەدەی دووی کۆچیدا ئەم پرۆسەی تۆمارکردن و ریزبەندییە قۆناغێکی باشی بڕی و گەیشتە ئاستی پێگەیشتن[2]. زانینی مێژوویی هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە دوو ئاڕاستەی سەرەکیی گرتە بەر، هەر یەك لەو ئاڕاستانەش بە ناوی ئەو شوێنەوە ناسران، کە تیایدا سەریان هەڵدابوو، لێکۆڵەرەکانیش ئەم ئاڕاستە جیاوازانەیان ناونا قوتابخانە، هەریەك لەم قوتابخانانەش لە نوسینەوەی مێژوودا میتۆدو کۆمەڵە ناوەڕۆکێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، بە ناوبانگترین قوتابخانەش لەم بوارەدا بریتیی بوون لە قوتابخانەی مەدینە و قوتابخانەی عێراق.

زۆبەی کەسەکانی سەر بە قوتابخانەی مەدینە ئەهلی فەرموودە بوون و بە پلەی یەکەم بایەخیان بە مێژووی ئاینی دەدا، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەست بوو بە پێغەمبەرەوە، لە گێڕانەوەی ژیاننامەکەی و جەنگەکانی و سوننەتەکانی و ...هتد[3]. مێژوونوسەکانی ئەم قوتابخانەیە لە تۆمارکردنی مێژوودا پەیڕەوی میتۆدی زانایانی فەرموودەیان دەکرد، ئەو میتۆدەش بە رەخنە و راستکردنەوە (الجرح والتعدیل)ی گێڕانەوەکان ناسراوە، ئەمەش بەوە دەبێت رەخنە لە گێڕەرەوەکە دەگیرێت و گێڕانەوەکان بژار دەکرێت بە مەبەستی زانین و جیاکردنەوەی ئەو فەرموودانەی راستن و ئەوانەی هەڵبەستراون. مێژوونوسەکانیش بە کاریگەریی ئەم میتۆدە باسی زنجیرەی دانەپاڵەکان

---

[1] بۆ ئەمە بڕوانە: فؤاد (سزكين): تاريخ التراث العربي، نقله الى العربية: محمود فهمي حجازي وفهمي ابو الفضل، (القاهرة: ١٩٧٧)، مج١، ص٣٩٧-٤٠٩. صالح احمد (العلي): التدوين وظهور الكتب المصنفة في العهود الاسلامية الاولى، مجلة المجمع العلمي العراقي، مج (٣٢)، ٤ (٢)، (بغداد: ١٤٠٠هـ/ ١٩٨٠م)، ص٢٢-٢٨.

[2] بڕوانە: الذهبي: تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام، تحقيق: محمد عبدالسلام تدمري، (بيروت: ١٩٨٨)، حوادث ووفيات (١٤١-١٦٠)، ص١٣.

[3] جب: م. س، ص٦٠. الدوري: م. س، ص١١٨-١١٩. نصار: م. س، ص٩٦-٩٧.

(سلسله الاسناد) دەکەن، واتە گێڕانەوەکان دەدەنەوە پاڵ گێڕەرەوەکانی تا دەیگەیەننەوە سەر گێڕەرەوەی یەکەم یان سەر ئەو کەسەی بە چاوی خۆی بەسەرهاتەکەی بینیوە[1].

بەڵام قوتابخانەی عێراق رێڕەوێکی تری گرتبووە بەر، چونکە تۆمارکەرانی هەواڵ لەم قوتابخانەیەدا سەر بە فەزا کۆمەڵایەتیە خێڵەکییە باوەکەی عێراق بوون بە تایبەتی بەصرە و کوفە، کە نیشتمانی رێ و رەسمی خێڵەکین، بۆیە جەختیان دەکردە سەر مێژووی شکۆمەندی و رەچەڵەك و ...هتدی خێڵەکی[2].

ئەگەر ئەو مێژووەی هەواڵگێڕەوەکان (الاخباریون) بەرهەمیان هێناوە، بە زۆری مێژوویەکی تایبەت بوو بێت، نەك مێژوویەکی گشتی، ئەوا لە نیوەی دووەمی سەدەی سێی کۆچییەوە کۆمەڵە مێژوونوسێك دەرکەوتن، کە بە واتای وشە هەوڵیان دا لە رێگەی تەرکیزکردنە سەر مێژووی جیهانی و پاشان مێژووی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی، ئاسۆی تێڕوانینیان بۆ مێژوو و میتۆدی تۆمارکردنەکەی فراوان بکەن. ئێمە پێمان وایە فراوانبوونی ئاسۆی تێگەیشتنی مێژوونوسەکان، ئەنجامێکی واقیعیی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بوو لەناو زۆربەی نەتەوە و میللەتەکاندا و بەشداریکردنی دەستەبژێرەکانیان بوو لە رۆشنبیریی ئیسلامیدا بە گشتی و لە مێژوودا بە تایبەتی، ئەمەش واتای خستنە ناوەوەی زۆر لە هەواڵەکانی ئەم میللەتانە بوو بۆ ناو ئەو مێژووەی مێژوونوسی سەر بە فەزا کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکە دەینوسییەوە. ئیتر لێرەوە زۆر گۆشەنیگای جیاواز لە رووی بابەت نەك لە رووی بیرۆکەوە، لە نوسینەوەی مێژوودا سەریان هەڵدا، چونکە هەندێك مێژوونوس دەرکەوتن مێژووی گشتییان دەنوسییەوە و هەندێکی تریش بایەخیان بە مێژووی ناوچەیی دەدا. نوسینی مێژوویش لە رووی ریزبەندییەوە یان لە رووی میتۆدی پەیڕەو کراو لە خستنە رووی بابەتە مێژووییەکەدا، گەیشتە ترۆپکی گەشەسەندن و پێگەیشتن، مێژوونوسەکانی ئەم

---

[1] زۆر کەس لە بارەی ئەم میتۆدە و کاریگەرییەکەی لەسەر نوسینی مێژوویی ئیسلامی نوسیویانە، یەکێك لەو لێکۆڵینەوە دیار و کۆنانەی لەم بوارەدا کراون بریتییە لە: اسد (رستم): مصطلح التاریخ، (بیروت: ١٩٥٥). لە بارەی ئەم کاریگەرییەش لە گۆشەنیگای فەرموودەوە بڕوانە:
Tarif (Khalidi): Arabic historical thought in the classical Period, (Cambridge: 1996), pp. 28-43.

[2] الدوري: م. س، ص١١٨-١١٩. نصار: م. س، ص٢.

قۆناغەش دەستێکی باڵایان هەبوو لە پەرەپێدانی ئەم نوسینەو چەسپاندنی بنەماکانیدا[1]. بەناوبانگترینی ئەو مێژوونوسانەش موحەمەدی کوڕی جورەیری طبەرییە (٣١٠ك/ ٩٢٣ز مردووە)[2]، ئەم ئەگەر چی بە هۆی کاریگەریی پێکهاتە ئاینییەکەیەوە[3]مەسەلەی دانەپاڵ (الاسناد)ی پشتگوێ نەدەخست، بەڵام مێژوویەکی گشتی و سەراپاگیری نوسیوە، کە لە دروستکردنی جیهانەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ساڵی (٣٠٢ك/ ٩١٤ز). ئەم مێژوونوسە بەوە جیا دەکرێتەوە، کە لە بارەی یەك رووداوەوە سەرجەم گێڕانەوەکانی کۆ دەکردەوە، بەڵام رەخنەی ئەوەشی لێ دەگیرێت، کە لە تێگەیشتنی مێژوودا قووڵ نەدەبوویەوە و لە کاتی سەلماندنی راستیی گێڕانەوەکانیشدا پشتی بە عەقڵ نەدەبەست، ئەو خۆیشی دان بەمەدا دەنێت و پێی وایە کاری ئەو تەنها بریتییە لە گێڕانەوە و گواستنەوەی زانیارییەکان بە بێ ئەوەی، وەك خۆی دەڵێت، بە بەڵگەی عەقڵی بیانسەلمێنێت و لە رێگەی بیرکردنەوەوە شتیان لێ هەڵێنجێت[4].

زانینی مێژوویی ئیسلامی بە تەواوی بەسترابوو بە چوارچێوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و هزرییە باوەکانی کایەی ئیسلامییەوە، کاتێکیش لە ناوەڕاستی سەدەی سێهەمی کۆچییەوە، یەکێتییە سیاسییەکەی ئەم کایەیە نەماو پەرت بوو، ئەمە کاری

---

[1] وەك ئیبن قوتەیبەی دینەوەری (٢٧٦ك/ ٨٨٩ز مردووە)، بەلاذری (٢٧٩ك/ ٨٩٢ز مردووە)، ئەبو حەنیفەی دینەوەری (٢٨٢ك/ ٨٩٥ز مردووە)، یەعقوبی (دوای ساڵی ٢٩٢ك/ ٩٠٥ز مردووە). لە دوو توێی توێژینەوەکەدا ئەم مێژوونوسانە دەناسێنین.

[2] طبەری: ئەبو جەعفەر موحەمەد کوری جورەیر کوڕی یەزید کوڕی خالید ئەلئامولی. ساڵی (٢٢٤ك/ ٨٣٨ز) لە دایك بووە. یەکێك بووە لە فەقیهە بەناوبانگەکان و لە هەموو زانینەکانی سەردەمی خۆی شارەزا بووە. لە بواری فیقه و مێژوودا ناوبانگی دەرکردووە. زۆر دانراوی هەیە، کە سەرەڕای کتێبە مێژووییەکەی بە ناوبانگترینیان کتێبی راڤەکردنەکەی قورئانە، کە ناوی ناوە (جامع البيان في تفسير القرآن). ابن النديم: م. س، ص٣٤٠-٣٤١. ياقوت الحموي: معجم الادباء، ج١٨، ص٤٠-٩٤.

[3] مارجيلوث: دراسات عن المؤرخين العرب، ت: حسين نصار، (بيروت: د. ت)، ص١٢٥. السرقاوي: م. س، ص٢٦٢.

[4] الطبري: م. س، ص٢٦٢.

کردە سەر تێڕوانین و بۆچوونی مێژوونوسەکان لە بارەی رابردووی مرۆڤایەتییەوە، هەروەها بووە هۆی فراوانبوونی بیرکردنەوەیان لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا[1]، ئەم پەرتبوونەی تێڕوانین رێگە خۆشکەر بوو بۆ کۆمەڵێك گۆڕانکاری لەو میتۆدانەدا، کە مێژوونوسەکان پەیڕەویان دەکردن، بۆ نمونە حاڵەتی وازهێنان لە دانەپاڵ کە تا رادەیەك مانای رزگاربوون بوو لە شوێنەکەوتەیی مێژوو بۆ زانستی فەرموودە، ئەمەش تەنها لە ئاستی میتۆدیدا بوو، کە بێگومان بە جۆرێك لە جۆرەکان تەحەکومی بە تێگەیشتن لە مێژووەوە دەکرد. ئەمە بە روونی لای مەسعودی دەردەکەوێت، کە دانەپاڵی پشتگوێ خست و لە گۆشەنیگایەکی سەراپاگیرەوە لە مێژووی دەڕوانی و دەیتوانی لە مێژووی سەرجەم مرۆڤایەتی ورد ببێتەوەو تێی بگات[2]. ئەم مێژوونوسە بایەخی بە کێشەی زانینی مێژوویی دەداو هەوڵی دەدا لە ناوەڕۆکی هەواڵەکان تێبگات[3]، بۆ ئەوەی لە تۆمارکردنیاندا زەینییەتە باوەکە تێپەڕێنێت، کە جەختکردنەوە بوو لەسەر گێڕانەوەکان و هەوڵی دەدا بە قوڵایی گێڕراوەکاندا رۆبچێت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم زانینە نەیتوانی بە تەواوی خۆی لە کولتوری قۆناغی پێشوو رزگار بکات و زاڵبوونی مۆرکی گێڕانەوەیی نیشانەیەکی دیاری ئەم نوسینە بوو، بە تایبەتی لە قۆناغەکانی دواییدا ئەوەی مێژوونوسان دەیاننوسی لاساییکردنەوەی پێوە دیار بوو، مۆرکی جوینەوە و دووبارەکردنەوەی ئەوەی کەسانی پێشوو وتویانە بە بێ هیچ گۆڕانکارییەك لە میتۆدەکە یان لە هزرە مێژووییەکە، یان تەنانەت لە زمانی تۆمارکردنەکەشدا، شتێکی زاڵ بوو. لەگەڵ ئەمەشدا لە کاروانی مێژوو نوسیی ئیسلامیدا کۆمەڵە بیرمەندێك دەرکەوتن و هەوڵیان دەدا سروشتێکی جیاواز بدەن بە زانینی مێژوویی و ئەم زانینە لە مۆرکە

---

[1] بروانە: هرنشو: علم التاريخ، ترجمه و علق حواشيه واضاف فصلا في تاريخ العرب: عبدالحميد العبادي، (بيروت: ١٩٨٨)، ص٥٧-٥٨.

[2] ((هەموو جۆرە زانستێك و هەموو هونەرێکی هەواڵەکان و هەر شێوازێك، کە مابێتەوە، لەم کتێبەدا بە تێر و تەسەلی باسمان کردووە، یان بە چەند هێمایەك ئاماژەمان پێکردووە، یان لە میانەی گوزارشتەکانەوە تیشکمان خستووەتە سەر)). مروج الذهب، مج١، ص١٥.

[3] الخالدي: م. س، ص٣٢-٣٣.

گێڕانەوەییەکەی ڕزگار بکەن و بەدوای واتا و چەمکی نوێدا دەگەڕان بۆ مێژوو. بەناوبانگترینی ئەو کەسانەش عەبدولڕەحمانی کوڕی خەلدونە (ئیبن خەلدون)[1].

ئەم مێژوونوسە ـ بیرمەندە دوای ئەو قۆناغە دەرکەوت، کە زانینی مێژوویی و هەموو زانینە ئیسلامییەکانی تر دووچاری چەق بەستن بوو بوون. ئیبن خەلدون هەوڵی دا لە تێگەیشتنە تەقلیدییەکە بۆ مێژوو دەرچێت، ئەمەش بەوەی واتاکانی پێشووی بخاتە ژێر پرسیارەوە و دووبارە پێناسەی بکاتەوە و ئەرکی نوێی بۆ دیاری بکات، ئەو لەو باوەڕەدا نییە مێژوو تەنها ڕواڵەتێکە و هەواڵی کۆمەڵە ڕۆژگار و دەوڵەت و سەدەیەکی ڕابردوو دەگێڕێتەوە و ئامانجەکەی پەندو ئامۆژگارییە. بەڵکو پێی وایە مێژوو ناوەڕۆکێکیشی هەیەو ئەم ناوەڕۆکەی بریتییە لە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە و پشکنین، بریتییە لە گەڕان بە دوای هۆکارە شاراوەکاندا، مێژوو لەم ئاستە ناوەکییەیدا ((سەرنج دان و پشکنینە، ڕوونکردنەوەی بونەوەرەکان و وردەکاریی بنەماکانیانە، زانستی چۆنیەتی ڕووداوەکان و هۆکارە قووڵەکانیانە، لەبەر ئەمە مێژوو ڕەسەنە و پڕە لە دانایی))[2]. ئەمە ئەو ئاستەیە، کە زۆربەی زۆری مێژوونوسە موسڵمانەکان نەیانتوانی

---

[1] عەبدولڕەحمان ئەبو زەید کوڕی خەلدونی حەضرەمی مەغربییە. ساڵی (٧٣٢ک/ ١٣٣٢ز) لە تونس لە دایك بووە، خێزانەکەی لە ئەسڵدا خەڵکی حەضرەمەوتی یەمەنن. هەر لە منداڵییەوە زانستە ئاینییەکان و زانستی زمان و فەلسەفە و سروشتناسی و ماتماتیکی خوێندووە. لە دەوڵەتۆکە بچوکەکانی باکوری ئەفریقا و ئەندەلوسدا چەند پۆستێکی ئیداریی وەرگرتووە. کاتێك گەڕاوەتەوە بۆ مەغریب پۆستی پەردەداری یەکێك لە میرەکانی وەرگرتووە، بەڵام لە ساڵی (٧٧٦ک/١٣٨٧ز) تا (٧٨٠ک/ ١٣٧٨ز) لە قەڵای ئیبن سەلامەدا بەند کراوە، لەم ماوەیەدا خەریکی خوێندنەوە و دانانی کتێب بووە. کتێبی (المقدمة) لە ماوەی پێنج مانگدا نوسیوە. هەروەها چەند بەشێکی کتێبە مێژووییەکەی (العبر)ی نوسی. ساڵی (٧٨٩ک/١٣٨٧ز) چووە میسر و لە دەوڵەتی مەملوکیدا پۆستی (قاضي القضاة)ی وەرگرت. ساڵی (٨٠٨ک/ ١٤٠٦ز) لە میسر کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی ژیانیەوە دەکرێ سەیری ژیاننامەکەی بکرێت، کە خۆی نوسیویەتی: التعریف بإبن خلدون ورحلته غربا وشرقا، (بیروت: ١٩٧٩).

[2] المقدمة: ص٢.

بوو دەركی پێ بكەن، بۆیە تێبینیی هۆكاری رووداو و بارودۆخەكانیان نەكردبوو و لەبەرچاویان نەگرت بوون[1].

بەم جۆرە ئیبن خەلدون رەخنە لە مێژوونوسەكان دەگرێت، هەروەها رەخنە لە میتۆدەكانی نوسینەوەی مێژوویان و بیركردنەوەیان لە مێژوو دەگرێت، بۆ ئەوەی لە پشت روالەتی مێژوو لای ئەوان، بە دوای پەیوەندییە هۆكارییەكانی نێوان سەرجەم رووداوەكاندا بگەڕێت. ئەم پەیوەندییانە یارمەتیی مێژوونوس دەدەن لە دانانی ئەو تیۆرە گشتی و سەراپاگیرانەدا، كە دەشێ بۆ شیكردنەوە و تێگەیشتن لە رەوتی مێژوو و بە تایبەتیش مێژووی ئیسلامی بەكار بهێنرێن. هەوڵەكانی ئەم بیرمەندە لە كایەی ئیسلامیدا بێ وێنەن. ئەگەر چی تیۆرەكانی ئەو، وەرچەرخانێكی میتۆدیی بوون لە مامەڵەكردن لەگەڵ مێژوودا، بەڵام نە بوونە هۆی گۆڕانی گۆشەنیگای مێژوونوسەكان و هیچ كاریگەرییەكیشیان نەبوو بۆ سەر هۆشیارییە گشتییەكە. جێی سەرنجە ئیبن خەلدون لە كاتی تۆماركردنی مێژوودا سودی لەم میتۆدە نوێیەی خۆی وەرنەگرتووە[2] و وەك ئەوانی تر پەیڕەوی ئەو میتۆدە كۆنانەی كردووە، كە وەك خۆیان مابوونەوە و تەحەكومیان بە گێڕانەوەی رووداوەكان و سەرنجدان لە رابردووی مرۆیی دەكرد، وەك لە ناوەڕۆكی ئەم كارەدا دەیبینین و ئاماژەی پێدەكەین.

---

(1) م. ن، ص.

(2) بڕوانە: العروي: مفهوم التاريخ، ط١، (بيروت/ الدار البيضاء: ١٩٩٢)، ج١، ص٢٨-٢٩.

# پاری یەکەم

# ناساندن و ناونان لە سیاقی مێژووی عەرەبی ئیسلامیدا

## ١) چوارچێوەی گشتیی ناساندنی کورد

یەکێك لە ئاکامەکانی وڵاتگیری (الفتوحات) و پرۆسەی بڵاوبونەوەی ئیسلام لە سەدەی یەکەمی کۆچی/حەوتەمی زاینیدا، ئەوە بوو دنیای بەسەر دوو بەرەی لێکدژدا دابەشکرد، کە بریتی بوون لە: (خانەی شەڕ) یان (خانەی کوفر)، کە وڵاتگرەکان (الفاتحون) عەقیدەی ئیسلامیان تێدا بڵاو نەکردبوویەوە، لەگەڵ (خانەی ئیسلام) یان ئەو چوارچێوە جوگرافی ـ مێژووییەی ئیسلام تیایدا بڵاو بووبوویەوە. لێرەدا ئەم دابەشکردنە ـ بەپلەی یەکەم ـ لەسەر بنەمایەکی عەقیدەیی ئەنجام دراوە، چەمکی (خانەی ئیسلام)یش شەقڵێکی سەراپاگیری هەیە بەجۆرێك نیشتمانێکی فراوان و چەندین دەستەی ئەتنیی ـ رۆشنبیریی هەمەجۆر لەخۆ دەگرێت. ئەم دەستە جیاوازانە بەهۆی کاریگەریی پاشماوەی کولتوری ناوچەیی و بارودۆخی جیۆگرافی و کۆمەڵایەتی و رامیاریی ناوچەکانیانەوە، تەنانەت لە تێگەیشتنی خودی ئیسلامدا ناکۆکی سیاسی و جیاوازی عەقیدەییان هەبوو[1]. لەگەڵ ئەمەشدا موسڵمانەکان بەشێوەیەکی گشتی چاویان بڕیبووە دامەزراندنی ئەوەی بە (ئوممەت ـ دەوڵەت) ناودەبرێت. مەبەست لە ئوممەت، ئوممەتێکی ئایینیە ـ کە لە پلەی یەکەمدا ـ واتایەکی ئیمانی بدات بە سیستەمی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو ئەتنیکە جیاوازانەی لەژێر ئاڵای عەقیدەکەیدان و هەوڵ بدات سنورەکانی رەچەڵەك و دەمارگیری و جیاوازیی کۆمەڵایەتی و ئەتنیکی تێ

[1] جب : دراسات في حضارة الإسلام، ت: إحسان عباس وآخرون، (بيروت: ١٩٦٤)، ص٣. عبدالله (إبراهيم): المركزية الإسلامية ـ صورة الآخر في المخيال الإسلامي خلال القرون الوسطى، (بيروت/الدرار البيضاء: ٢٠٠١)، ص ١٢ .

پەرێنێت. مەبەستیش لە دەوڵەت، دەوڵەتێکی ناوەندییە، کە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە دام و دەزگا و یاساکانی لە پێکهاتندا بوون، بۆ رێکخستنی ئەم پەیوەندییە نوێیانە بەپێی گۆشەنیگای کاربەدەست و تیۆریزەکەرەکانی لە مێژووی پەرەسەندنیدا[1].

ئاشکرایە ئەم خواستە لەزۆربەی بارەکاندا زیاتر وەك مەسەلەیەکی تیۆری مایەوە و لە واقیعدا بەدی نەهات. لەگەڵ ئەمەشدا بەلایەنی کەمەوە لە ماوەی دامەزراندا جۆرە رۆشنبیرییەکی یەکگرتووی باو هەبوو، ئەویش رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی بوو، کە سەرەڕای ئەوەی لە (خانەی ئیسلام)دا ئەو جیاوازیانەی بەرجەستە دەکرد، کە پێشتر باسکران، بەڵام بەهای راستەقینەی خانەکە لەناو ئەمدا بوو و بەپلەی یەکەم یەکێتی رۆشنبیریی خانەکە بوو[2]. ئەمەش بەسترا بوو بەزمانی عەرەبییەوە، کە گوزارشتی لە شوناسی شارستانی ئەم رۆشنبیرییە دەکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەم زمانە وەك زمانێکی هاوبەشی رۆشنبیری ئیسلامیی هەمەجۆر خۆی سەپاند. لەڕاستیدا بۆ ئەم رۆشنبیرییە تازە دامەزراوە ئاسان نەبوو واز لەم زمانە بهێنێت، چونکە زمانی عەقیدە و شەریعەت بوو، زمانێك بوو بەراورد بە زمانەکانی دی، کە لە پووکانەوە و تەسکبوونەوەدا بوون، پیرۆزییەکی هەبوو. ئیبن خەلدون بەڕوونی باسی ئەمە دەکات و دەڵێت: «نەتەوەکان لە هەموو شار و ناوچەیەك وازیان لە زمانی خۆیان هێنا و زمانی عەرەبییان کردە زمانی خۆیان»[3]. زمانی عەرەبی دوای ئەوەی ناوچەیەکی فراوان و

[1] أركون: تأريخية الفكر العربي الإسلامي، ت: هاشم صالح، (بيروت: ١٩٩٨)، ص٩٥. الفضل (شلق): الأمة والدولة ـ جدليات الجماعة والسلطة في المجال العربي الإسلامي، (بيروت ١٩٩)، ص٢٠٥-٢٠٦ .

[2] إبراهيم : م . س، ص ٣٥ .

[3] المقدمة: ص٣٠١ . بروانە: إبن حزم الأندلسي: الفصل في الملل والأهواء والنحل، ط٣، (بيروت: ١٣٩٥هـ/١٩٧٥م)، ج١، ص١١٢ .

بەربڵاوی تەنییەوە، بەرەو ئەوە دەچوو ببێتە زەمانێکی گەردوونی[1]، بۆیە دەبوو خۆی سیستەماتیزە بکات و سیمایەکی نوێ بەخۆی بدات تا لەگەڵ بارە نوێکەدا بگونجێت.

دەسەڵاتی ئایینی و کارگێڕیی خانەی ئیسلام، کە عەرەب بەڕێوەیان دەبرد، بواری بۆ زمانەکەیان ڕەخساند لەڕێگەی وشە و شێوازە گوزارەییەکانیەوە کار لەسەر ئەوە بکات واتا و دارشتنی گونجاو بدات بە شتە تازە و دیاردە جیاوازەکان و شێوە گوزارەییەکانی خۆی فراوان بکات. بۆیە زۆر وشە و چەمکی نوێی لەخۆگرت و بوو بە زمانی هزر و زانینە جۆراو جۆرەکان[2].

یەکێك لەو مەسەلانەی ڕۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی بە تایبەتی لە بواری مێژوودا هەوڵی دەدا بەم زمانە چارەسەری بکات، ناسینی ئەو گەل و نەتەوانە بوو، کە بوونە بەشێك لە (ئوممەت ـ دەوڵەت)ی ئیسلامی، چونکە ڕزگارکەرەکان پێویستیان بەوە بوو ئەو گەل و نەتەوانە بناسن و دواتریش یەکتر ناسین لەنێوانیاندا روو بدات بۆ گونجان لەگەڵ ئەو بانگە قورئانییەدا، کە دەفەرموێت ( وجعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا)[3]و داوای پێکهێنانی ئوممەتێك دەکات لە عەرەب و نەتەوەکانی تر[4].

کورد یەکێك بوون لەو کۆمەڵە مرۆڤانەی عەرەبە وڵاتگرەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە و[5] توانیان ملکەچی دەسەڵات و دەوڵەتیان بکەن[6]، ئیتر وڵاتەکەیان کەوتە

---

(1) سەبارەت بە زەمانی گەردوونی بڕوانە: بيار (بورديو): أسباب عملية ـ إعادة النظر بالفلسفة، (بيروت: ١٩٩٨)، ص ١٣٥ .

(2) بڕوانە : أحمد (أمين): ضحى الإسلام، (بيروت: د. ت)، ج١، ص٢٩١. جورج (طرابيشى): إشكاليات العقل العربي، (بيروت: ١٩٩٨)، ص٢١٠- ٢٢١.

(3) سورة الحجرات، الآية (١٣) .

(4) رضوان (السيد): الأمة والجماعة والسلطة، (بيروت: ١٩٨٣)، ص٣١.

(5) البلاذري : فتوح البلدان، (بيروت: ١٩٨٣)، ص٣١٧، ٣٢٣، ٣٢٥، ٣٧١، ٣٧٧. الطبري: تأريخ الرسل والملوك، ج٤، ص٣٣، ٧٦، ٧٨، ١٨٣، ١٨٦. قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة، شرح وتعليق: محمد حسين الزبيدي، (بغداد: ١٩٨١)، ص٣٢٨، ٣٧٨، ٣٨١، ٣٨٥.

(6) بڕوانە: فائزة محمد (عزت): الكرد في إقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الإسلام، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة الصلاح الدين، (أربيل: ١٩٩١)، ص٨٤-١٠٦. أحمد ميرزا(ميرزا): غربي إقليم

ناو مەملەکەتی ئیسلام و کاروبارەکانیەوە[1]. بۆیە سروشتی بوو رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی وەك هەولێك بۆ ناسین و لەخۆگرتنی کورد لەچوارچێوەی (ئوممەت - دەوڵەت)دا خوێندنەوەی خۆی هەبێت بۆ کورد و وڵاتەکەی. لێرەدا پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین ئینتیمای کورد بۆ ئەم چوارچێوەیە و شوێن و پێگەی کورد لە زانینی مێژوویی بەرهەم هاتوو بە زمانی عەرەبییدا، بەستراوە بە واقیعی خانەی ئیسلام و ئەگەرەکانیەوە و هەڵوێستی کورد بەرامبەر ئەم خانەیە، وا دەبێت لە سەردەمێکدا ئەم بەشەی (ئوممەت ـ دەوڵەت) بەشێکی نەفرەت لێکراوە، کەچی لە سەردەمێکی تردا دەبێتە بەشێکی چاك. لەبەر ئەمە، پێناسە و ناو و وەسفکردنی ئەم بەشە مرۆیی و جیۆگرافیە (کورد و وڵاتەکەی) بەپێی بارودۆخی مێژوویی سەردەمەکە دەخەملێت و دیاری دەکرێت. لێرەدا دەتوانین لەبارەی ئەو واتایەوە پرسیار بکەین، کە لەرۆشنبیری عەرەبی ئیسلامیی مێژوویدا بۆ چەمکی وشەی کورد بەکار هاتووە. ئایا ئەم ناوە بوونێکی بابەتیی سەربەخۆی هەیە، یان تەنها وشەیەکە و لە کایەی ئیسلامیدا بۆ کۆمەڵە مرۆڤێك بەکاردێت؟ یاخود چۆن لە واتای کورد تێگەیشتوون؟

هەندێ رۆژهەڵاتناس و لێکۆڵەری کورد[2] کۆششێکی زۆریان کردووە بۆ روونکردنەوەی واتای ئەم وشەیە و دۆزینەوەی رەهەندە مێژوویی و پەیوەندییە زمانەوانیەکانی ئەم ناوە. بەڵام لێرەدا ئێمە نامانەوێت شوێن پێی ئەوان هەڵگرین و هەوڵ دەدەین ئەوە روون بکەینەوە مانای وشەی کورد چی دەگەیەنێت لەو گوتارە

---

الجبال في صدر الإسلام حتى ١٣٢هـ/٧٤٩م، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (أربيل: ١٩٩٥)، ص٧٨-١٠٧. شوان عوسمان (مستەفا): کوردستان و پرۆسەی بەئیسلامکردنی کورد، (سلێمانی: ٢٠٠٢) ل١٤٤-٢٣٥ .

[1] قدامة بن جعفر: م . ن، ص ١٥٩ به دواوه.

[2] بۆ نموونە بڕوانە: ج. أر. (درايفر): الكرد في المصادر القديمة، ت: فؤاد حمه خورشيد، (بغداد: ١٩٨٦) ص١٣ بەدواوە. ئو. ل. (ڤیلچێڤسکی): نەژادی کورد ـ رەوتی مێژوویی دروستبوونی میللەتی کورد، و: رەشاد میران، (هەولێر: ٢٠٠٠)، ل١٥٧ بەدواوە. هەروەها بڕوانە: جمال رشيد (أحمد): ظهور الكرد في التأريخ ـ دراسة شاملة عن خلفية الأمة الكردية و مهدها، (أربيل: ٢٠٠٣) ج٢، ص ٧-٧١ .

عەرەبیەدا، کە هەر لەسەرەتای پرۆسەی وڵاتگیرییەکانی عەرەب و تێکەڵ بوونیان بە نەتەوەکانی تر و دانانی چوارچێوەیەکی نوێ بۆ رۆشنبیری، لە شێوەگیربووندا بوو. هەروەها ئەو هەوڵانە دیاری دەکەین، کە لەئارادا بوون بۆ ئەوەی مانا و دەلالەت بە وشەی کورد بدەن و ریشەیەکی وای بۆ بدۆزنەوە لەگەڵ چوارچێوەی تازەی زانینەکاندا و بەتایبەتیش زانینی مێژوویی بگونجێت.

ناتوانین لە دووتوێی کتێبە مێژووییە عەرەبیەکاندا لە واتای ئەم ناوە تێ بگەین، ئەگەر بێت و بەکارهێنانە فارسیەکەی لەناو چوارچێوەی کولتوری فارسیی پێش ئیسلامدا لەبەرچاو نەگرین، کە لە ئەنجامی فەرمانڕەوایی ساسانیەکان بەسەر ناوچەیەکی فراوانی کوردستاندا، مامەڵەیەکی راستەوخۆی لەگەڵ کورددا هەبووە[1]. گومانی تیا نییە کولتوری فارسی لە پرۆسەی شێوەگیربوونی زانینی ئیسلامیدا بە مێژووشەوە، ئامادەییەکی بەهێزی هەبووە، ئەم کولتورە رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە پێکهاتنی زۆربەی چەمك و بۆچوونە عەرەبییە ئیسلامییەکاندا، لەوانەش بۆچوونیان لەبارەی ناوی کورد و ریشە و سروشتی کوردەوە. موسڵمانەکان هەوڵیان دا لەرێگەی ئەم کولتورەوە وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی خۆیان بدەنەوە، بەتایبەتی ئەو پرسیارانەی پەیوەستبوون بە مەسەلە مێژووییەکانەوە، بۆیە رۆشنبیری فارسی سەرچاوەیەکی سەرەکی بووە بۆ زۆربەی مێژوونوسەکان[2]. پرۆسەی وەرگێڕانیش لە زمانی فارسیەوە

---

[1] أبو حنيفة الدينوري : الأخبار الطوال، تحقيق: عمر فاروق الطباع (بيروت: د. ت) ص٤٣. اليعقوبي: تأريخ اليعقوبي، (بيروت: ١٩٦١)، ج١، ص١٦٤-١٦٨، ١٧٧. الطبري: م. س، ج٢، ص٤١. أحمد: م . ن، ج١، ص ٢٦٦-٢٦٩ .

[2] جب : علم التأريخ، ص ٥٦-٥٧ .

Bertold Spuler :- The evolution of Persian historiography , in : lewis and holt (ed):- historians of the middle east , p 127 .

یارمەتیدەرێکی باش بووە بۆ گواستنەوەی سەرجەم هزر و بیری تۆمارکراوی فارسی (پەهلەوی) بۆ عەرەبی[1].

بۆ گەڕانەوە سەر بابەتەکەمان دەڵێین، لە میانەی پشکنینی گێڕانەوە مێژووییەکانی پێش ئیسلام و سەرەتای ئیسلامدا، بەتایبەتی ئەوانەی بە عەرەبی تۆمار کراون، دەبینین چەمکی وشەی کورد کۆمەڵێك دەلالەتی کۆمەڵایەتیی گشتگیری هەیە و لەوە دەرچووە ناوێکی ئەتنی بێت بۆ کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو، بۆ نمونە: ئەبو حەنیفەی دینەوەری (٢٨٢ك/ ٨٩٥ز مردووە)[2] لەو (ساسان)ە دەدوێت، کە دەوڵەتی ساسانی دەدرێتە پاڵی و دەڵێت: ((لەداخی کەمتەرخەمی باوکیی بەرامبەری، کۆمەڵێك مەڕی راگرت و چووە پاڵ کوردەکانی ناو چیاکان و لە شارستانیەت دوورکەوتەوە))[3]. لەبەرئەمە ـ بەپێی قسەی ئەبو حەنیفە ـ نەوەکانی ساسان تا سەردەمی ئەبوحەنیفە، واتە تا سەدەی سێی کۆچی/نۆی زایینی، وەك نەنگییەك ئەوەیان دەدرایە پاڵ ((مەڕ بەخێو دەکەن، بۆیە دەوترا ساسانی کوردی و ساسانی شوان))[4]. لەم گێڕانەوانەوە ئەوە دەردەکەوێت کورد دانیشتووی چیاکانن و لە شارەکانەوە دوورن، مەڕ بەخێو دەکەن و بەکەم سەیر دەکرێن. هەندێك مێژوونوسی تر لەبارەی (ئەردەشێری کوڕی بابەك)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانییەوە ئەو

---

[1] الجاحظ : الحيوان، حققه: عبدالسلام محمد هارون، (القاهرة: ١٩٦٨)، ج١، ص٣٨. إبن النديم: الفهرست، ص٣٦٣-٣٦٤. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم بزاڤەوە بڕوانە: محمد (محمدي): الترجمة والنقل عن الفارسية في القرون الإسلامية الأولى، (بيروت: ١٩٦٤)، ج١، ص٢-١٦ .

[2] ئەبو حەنیفەی دینەوەری : ناوی (ئەحمەد کوڕی داود کوڕی وەنەند)ە خەڵکی شاری دینەوەرە، لە دەیەی یەکەمی سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زاینی لە دایك بووە. شارەزاییەکی زۆری لە زانستەکانی سەردەمی خۆیدا هەبووە، بە تایبەتی (نەحو) و زمان و بیرکاری و ئەندازیاری، لە نوسەرە یەکەمانی بواری مێژووی گشتییە. گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە: (الأخبار الطوال) و (كتاب البلدان) و (كتاب الأنواء) و.. هتد. بڕوانە: إبن النديم : الفهرست، ص٨٦. عمر فاروق الطباع : مقدمته لكتاب الأخبار الطوال، ص أ ـ ن.

[3] الأخبار الطوال، ص ٣٠ .

[4] هـ. س ، هـ. ل .

گێڕانەوەیە دێنن گوایە دوا پاشای فەرثییەکان، کە فەرمانڕەوای فارسەکانی پێش ساسانیەکان بوون، نامەیەکی بۆ ئەردەشێر ناردووە و تیایدا هەڕەشەی لێ دەکات و تانووتی لێ دەدات و دەڵێت: ((تۆ لە سنوری خۆت دەرچوویت و بەمە مردنت بۆخۆت هێناوە ئەی کوردی بەخێوکراو لە رەشماڵی کورداندا))(١).

لەم روانگەوە و بە پشتبەستن بەم گێڕانەوانە، شێوە یەک دەنگییەك لەنێوان ئەو رۆژهەڵاتناسانەدا بەدی دەکرێت، کە بایەخ بە کورد دەدەن، ئەمەش کاتێك جەخت لە گشتگیریی واتای وشەی (کورد) دەکەنەوە لە سەردەمی ساسانی و سەدە یەکەمەکانی ئیسلامدا و ئاماژە بەوە دەکەن، (کورد) ناوبوو بۆ هەموو خێڵە کۆچەر و نیمچە کۆچەرە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە(٢). ئەوەی پشتگیریی ئەم باری سەرنجە دەکات ئەوەیە مێژوونوسی بە رەچەڵەك فارس، ئەبو حەسەن حەمزەی ئەسفەهانی (٣٦٠ ك / ٩٧٠ز مردووە)(٣) دەڵێت فارس: ((بە دەیلەمیان دەوت کوردەکانی تەبەرستان و بە عەرەبیشیان دەوت کوردەکانی سورستان، کە عێراقە))(٤). ئەم دەقە

---

(1) الطبري: م. س، ج١، ص ٣٩ . هەروەها: إبن الأثير: الكامل، ج١، ص ٣٨٢ .

(2) V.Minorsky : - The "Kurds", in the Encyclopaedia of Islam , (Leyden – London) , Vol . 11, P 1214 . هەروەها: ڤلادیمێر (مینۆرسکی): مینۆرسکی و کورد، کۆمەڵەی ٦ وتار، و: ئەنوەر سوڵتانی، (هەولێر: ٢٠٠٢)، ل ٨٣-٨٤. هەروەها بڕوانە بۆ: برتولد (اشبولر): تأريخ ايران در قرن نخستين اسلامي، ت: جواد فلاطوری، (تهران: ١٣٧٣ هـ .ش)، ص ص ٤٣٦-٤٣٧. مارتین فان برونەسن: ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و: کوردۆ، (سلێمانی : ١٩٩٩)، بەرگی یەکەم، ل ١٣ .

(3) ئەبو عەبدوڵا حەمزە کوڕی حەسەن، ساڵی (٢٨٠ ك/ ٨٨٣ ز) لە ئەسفەهان لە دایك بووە و ساڵی (٣٦٠ ك – ٩٧٠ ز) هەر لە ئەسفەهان مردووە. بەوە ناسراوە لە روانگەیەکی فارسییانەوە مێژووی نوسیوەتەوە. کۆمەڵێك کتێبی هەیە، کە بەناوبانگترینیان کتێبی ( تأريخ سني ملوك الأرض والأنبياء)ە. إبن النديم : م. ن، ص ١٥٤ . الزركلي: الأعلام، ج٢، ص ٣٠٩. سزكين: تأريخ التراث العربي، ج١، ص ٥٤٠ .

(4) تاريخ سني ملوك الأرض، ص ١٧٣.

بەڵگەیەکی بەهێز بوو بەدەست ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە بۆ سەلماندنی گشتگیرییەتی وشەی (کورد) و بەکار نەهێنانی وەك ناوێکی ئەتنی، کە واتای خودی (کورد) بگەیەنێت[1].

ئێمە پێمان وایە ئەم سەراپاگیرییە لە ناوناندا لای مێژوونوسەکان، گشتاندنی خودی ناوی (کورد)ە، کە خۆی ناوی کۆمەڵە مرۆڤێکی دیار و جیاوازە، بەڵام گشتێنراوە و وەك چواندنی خەڵکانی تر بەکورد لەوانیش نراوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە بونیاتی کۆمەڵایەتیی ئەم کۆمەڵانە (واتە کورد، دەیلەم، عەرەب) تاڕاددەیەك لەیەك دەچوون. کاتێك بە عەرەب دەوترێت کوردی سورستان و بە دەیلەمیش دەوترێت کوردی تەبەرستان، ئەوا ئەم ناوە وەسفیانە گوزارشت لەو بۆچوونانە دەکەن، کە لەبارەی سروشتی ئەم کۆمەڵە مرۆڤە جیاوازانە لە فارس، لە ڕۆشنبیریی باوی فارسیدا هەبوون، بەڕای ئێمە ئەم ناونانە لەم کۆمەڵانە، واتە لە عەرەب و دەیلەم، لەوەوەیە ئەم کۆمەڵانە ـ بەشێوەیەك لە شێوەکان ـ لە هەندێك دیاردەی کۆمەڵایەتیدا لەیەك دەچن، ئەم دیاردانەش ڕەنگدانەوەی ئەو ژینگانەن تیایاندا دەژین و لە ئاوەدانی و شارستانییەتەوە دوورن. بارودۆخی کورد و سروشتی پەیوەندییە خێڵایەتییەکانی بووبوونە هۆی ئەوەی ڕۆشنبیریی فارسی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ماناکانی ئەم ناوە بگشتێنێت. کەوابێ وەسفکردنی ئەم میللەتانە بە (کورد) ڕەنگە لە ڕوانینی تراندستالیی فارسە فەرمانڕەواکانی بەرهەمهێنی هزرەوە بێت، یاخود ڕەنگدانەوەی چۆنیەتی ڕوانینی شارییەکان بێ لە دێهاتی و شوانکارەکان، هەروەك ئەبوحەنیفەی دینەوەریش جەخت لەمە دەکاتەوە کاتێك دەڵێت: ((وەك بەکەمزانینێك بە (ساسان) دەوترا (ساسانی کوردی)))[2]، بێ ئەوەی ئەمە ئەوە بگەیەنێت ساسان لە ڕەچەڵەکی کوردەوە هاتووە.

بەڵام ئایا ناوی کورد و واتاکانی لە دووتوێی کتێبە مێژووییە عەرەبییەکاندا تەنها ئەم بەکارهێنانە گشتییەی هەیە؟ پێمان وایە مێژوونوسەکان لەم بوارەدا نەیانتوانیوە خۆیان لە کولتوری پێشوتر ڕزگاربکەن. قەرزاربارییی زانینی مێژوویی بۆ کولتوری پێشوو لەوەدا دەردەکەوێت، کە طەبەری لەبارەی سوتاندنەکەی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە

---

[1] مینۆرسکی: س. پ، ل٨٣ . اشپولر: ن. م، ص ٤٣٦.

[2] الأخبار الطوال: ص ٣٠.

باسی دەکات و ئاماژە بەوە دەکات عەبدولای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب لە یەکێکی پرسی: ((دەزانیت... کێ ئاماژەی بەوەکرد بە ئاگر ئیبراهیم بسوتێنن؟ دەڵێت: وتم نا . وتی : پیاوێك بوو لە ئەعرابی فارس. دەڵێت: وتم ئەی باوکی عەبولڕەحمان بۆ فارسیش ئەعرابیان هەیە؟ وتی: بەڵێ، کورد ئەعرابی فارسن))[1]. ئەمە مانای ئەوەیە وشەی ئەعراب بۆ جگە لە عەرەبیش بەکاردەهات. لێرەدا ـ وەك پێشتر بۆی چووین ـ زیاتر سەراپاگیریی وشەی کورد و توانای گشتاندنی دەردەکەوێت[2]. بەڵام ـ لەلایەکی ترەوە ـ ئەم جۆرە گێڕانەوانە دەمانخەنە بەردەم مەسەلەیەکی گرنگەوە، ئەویش بینینی کوردە لەکایەی نوێی ناساندن و ناوناندا، کە کایەی عەرەبیی ئیسلامییە، لەوانەیە ئەو گێڕانەوەیەی طەبەری دەیباتەوە سەر عەبدولای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (٧٤ك/٦٩٣ز مردووە) لە هەوڵە سەرەتاییەکانی ناساندنی کورد بێت لای عەرەب، واتە ئەم کۆمەڵە مرۆییە، کە بوونەتە بەشێك لە (ئوممەت ـ دەوڵەت)، وای لێ بکرێت لەم کایە نوێیەدا ناسراو بێت.

بەپێی ئەم گێڕانەوەیە هاوکێشەیەکی دوو لایەنەمان هەیە، لایەنی یەکەمی کوردە و لایەنی دووەمی ئەعرابی فارسە. بۆ تێگەیشتن لەم هاوکێشەیە پێویستە سەرنجی ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییە بدەین، کە ئەم زانینەی بەرهەم هێناوە. لەوانەیە هەڵە نەبێ ئەگەر بڵێین ئەم هاوکێشەیە جۆرێکە لە پێوانی (مقايسة) کورد بە هاوشێوەکانی، یاخود جۆرێکە لە پێوانی بینراو بە زانراو (قياس المشاهد على المعلوم )، واتە بینینی کورد، بەپێی بینراوی بینەری عەرەب دیاری دەکرێت (لێرەدا عەبدولای

---

[1] تأريخ الرسل والملوك، ج١، ص ٢٤٠-٢٤١ . زۆر مێژوونوسی تر ئەم گێڕانەوەیان گواستووەتەوەو کوردیان بە (ئەعرابی فارس) یان (ئەعرابی عەجەم) داناوە. بڕوانە: إبن الأثير: الكامل، ج١، ص٩٨. أبوالفداء: المختصر في اخبار البشر، (القاهرة: ١٣٢٥ ك) ج١، ص٨٣. إبن الوردي: تأريخ إبن الوردي المسمى (تتمة المختصر في اخبار البشر)، (النجف: ١٩٦٩)، ج١، ص ٧٢.

[2] حاڵەتێکی تری گشتاندنی ناوی کورد لای جاحظ بەدی دەکرێت کاتێك باس لەوە دەکات خێڵی (هذيل)ی عەرەبی پێیان دەوترا کوردەکانی عەرەب (أكراد العرب). رسائل الجاحظ : حققه: عبدالسلام محمد هارون، (القاهرة: ١٣٨٤ك/١٩٦٤ز) ج١، ص١٠، ٧١.

کوڕی عومەر بینەرە)و لە خودی خۆیەوە ـ وەك عەرەبێك ـ سەیری کورد دەکات[1].
ئەعرابی فارس دەلالەتێکی هەیە ئەو واتایە تێدەپەڕێنێت، کە ئەعراب (لای عەرەب) هەیبوو و واتای عەرەبی دەشتەکیی دەگەیاند ، بە هەموو ئەو دەلالەتە نەگەتیفانەوەی ئەم ناوە لە سەرەتای ئیسلامەوە[2] تا سەردەمی ئیبن خەلدون[3] هەڵی دەگرتن، هەروەها چەمکی فارسیش تێدەپەڕێنێت وەك ولاتی کۆمەڵە مرۆڤێکی جیا و ناسراو بەشارستانییەتەکەی[4] و جیاواز لە عەرەب، کە زیاتر دەشتەکین. سەرئەنجام، ئەعرابی فارس سیستەمێکی دەلالی گشتگیری هەیە و گوزارشت لە حاڵەتی کۆچەری دەکات لای بەشێك لە فارس و هاوکێشەکە دەبێتە جۆرێك لە دەلالەتگەرایی بۆ تێگەیشتن لە کورد. بۆ ئاسانکردنی ئەم تێگەیشتنە لای وەرگری عەرەب، بەپێی سیستەمی مەعریفی وەرگرەکە سیماکانی کورد دیاری دەکات،.چونکە کاتێك کورد بەم شێوە گشتگیرە وەسف دەکرێت، وەسفکردنەکە لە چوارچێوەی زانینی کۆمەڵگەی عەرەبی و کۆئەندێشەکەی (مخیاله الجمعي) دەرناچێت. هاوکێشەکەی عەبدولای کوڕی عومەریش لەو کۆئەندێشەیەوە هاتووە، کە فارس و عەرەب تیایدا ئامادەیی و پێگەیەکی دیاریان هەیە، کەواتە لێرەدا کارەکە لەوە تێناپەڕێت، کە دروستکردنی بۆچوونێکی گشتییە لەسەر کورد بەجۆرێك لەگەڵ زانیارییە خەزنکراوەکانی ناو بەشی دووەمی

---

[1] بۆ چەمکی پێوان و بینین (القیاس والشاهدة)، بەو واتایەی لێرەدا بەکار هاتووە بڕوانە: منذر (الکیلاني): الإستشراق والإستغراب ـ إختراع الآخر في الخطاب الأنثروبولوجي، ضمن: الطاهر (لبیب) وآخرون: صورة الآخر ـ العربي ناظراً ومنظوراً الیه، (بیروت: ۱۹۹۹) ص ۷۵-۷٦ .

[2] لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (الأعراب أشدُ کفراً ونفاقاً) سورة الحجرات، الآیة (١٤)، بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی وێنەی دەشتەکی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ئیسلامدا بڕوانە بۆ: السید: م. س، ص٦١-٦٤.

[3] المقدمة، ص١١٨-١٢٠.

[4] الجاحظ: البیان والتبیین، حققه: فوزي عطوي، (بیروت: ١٩٦٨)، ص٨٧. المقدسي: البدء والتأریخ، ج١، ص٣٦.

* لێرەدا بۆیە وشەی ئەکرادمان بەکار هێناوە نەك کورد، بۆ ئەوەی ڕووی لێکچوونی ئەم وشەیە لەگەڵ وشەی ئەعرابدا لە ڕووی فۆڕمیشەوە دیار بێت.

هاوکێشەکەدا بگونجێت. ئەنجامی کۆتایی مەسەلەکەش بریتییە لە ناسینی کورد وەك کۆمەڵە مرۆڤێك، کە شیاوی ئەوەیە تێی بگەیت، چونکە لە سیفەتدا وەك ئەعرابن (لەناو عەرەبدا هەن) بەڵام سەر بە فارسن. لەدوای ئەمەش ـ وەك پشتگیرییەك لەم هەڵوێستە ـ زۆربەی کات لە سیاقی هەواڵەکانی پەیوەست بە سەردەمە ئیسلامییە جیاوازەکانەوە، ئەوەی دەبینرێت بریتییە لە هاوواتایی ئەکراد و ئەعراب. بەم جۆرە زانینی مێژوویی وەك بڕیار بەدەستێك دەردەکەوێت و دەسەڵاتی ناساندن دەخاتە ژێر رکێفی سنورە تایبەتییەکانی خۆیەوە و کار لەسەر دروستکردنی نمونەیەك لە کورد دەکات، کە بەم گشتگیرییەتە دەناسرێتەوە و دیاری دەکرێت.

سەرەڕای ئەم گشتگیرییەتە لە دیاریکردنی واتای وشەی کورد و ناساندنیدا، ئەوەی لەمەو دوا باسی دەکەین بەکارهێنانی وشەی (کورد)ە وەك ناوێکی ئەتنی بۆ کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو، بۆیە کورد واپێناسە دەکرێت، کە بەرەیەك یان کۆمەڵێك خەڵکی ناسراون[1] و ئەو دەلالەتە گشتگیرییانەی درابوون بەم ناوە لەم کۆمەڵە خەڵکەدا چڕ کرانەوە. بەڕای ئێمە چەمکی کورد و کوردیەتی ـ بەمانای ئینتیما بۆ ئەم کۆمەڵە ـ لە میانەی چاخە ئیسلامییەکاندا رەگی داکوتا، بەمەش خودێکی کوردی، بەو چەمکەی لەو کاتەدا هەبوو پێکهات. بۆیە هەندێك کورد کاتێك تێکەڵ بە رۆشنبیریی عەرەبیی ئیسلامی دەبن و لە کایەی ئیسلامیدا دەبنە زانا، گوزارشت لەم خودەیان دەکەن و بەمە ئەو هەستە مێژووییەیان دەبێت، کە لەگەڵ پێدراوەکانی (ئەویتر)ی دەسەڵاتداردا تەبا دێتەوە[2]. ئەگەر چاو بە هەموو جۆرە کتێبە مێژووییەکاندا بخشێنین، ئەم هەستکردنە بە ئینتیما بۆ ناوی کورد دەدۆزینەوە. ئەوەتە ناودارەکانی کورد، بەتایبەتی ئەوانەی لە بواری کارگێڕی و رامیاری و زانستی و

---

[1] الأزهري: تهذيب اللغة، حققه: علي حسن هلالي، (القاهرة: ١٩٦٧)، ج١٠، ص١٠٩. إبن الأثير: اللباب في تهذيب الأنساب، (بيروت: ١٤٠٠ك/١٩٨٠ز)، ج٣، ص٩٢. إبن المنظور: لسان العرب، ج٣، ص٢٣٩.

[2] بڕوانە: المسعودي: مروج الذهب، ج١، ص٤٣٦. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٣٥-٣٦.

شەرعیدا دیار بوون، زۆربەیان نازناوی (الكردي)یان بۆخۆیان دادەنا[1] و لە بۆنەكاندا شانازییان بە كوردبوونیانەوە دەكرد[2]، بە تایبەتی لەكاتی شەڕی خاچییەكاندا و لە ئەنجامی بەریەك كەوتنی زۆر و راستەوخۆیان لەگەڵ میللەتەكانی تردا، شانازییان بە كوردبوون و سیما كوردیەكەیانەوە دەكرد[3]، لێرەدا بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی بابەتەكە دەرنەچین زیاتر ناچینە ناو وردەكاریی ئەم ئینتیمایەوە.

**٢) هەوڵی عەرەبی بۆ داڕشتنی ناوی كورد و وڵاتەكەیان**

سەبارەت بە ناوی كورد لەوێوە، كە تەنها ناوێكە و چۆنیەتی روونكردنەوە و ناساندنی لەلایەن رۆشنبیریی عەرەبیی ئیسلامییەوە، دوای پشكنینی سەرچاوەكان ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت بە شێوەیەكی گشتی دوو هەوڵی سەرەكی هەن بۆ نزیكبوونەوە لەم ناوە و داڕشتنە عەرەبییەكەی بەجۆرێك، كە لە سیاقی مێژووی عەرەبیدا بۆ بەكارهێنان بشێت: پوختەی هەوڵی یەكەم ئەوەیە (كورد) ناوی باوكی مێژوویی ((ئەو بەرەیەیە پێیان دەوترێت كورد))[4] و زۆربەی ئەو مێژوونوسانەی لە ریشەی كورد دواون

---

[1] بڕوانە: السمعاني: الأنساب، تقديم وتعليق: عبدالله عمر البارودي، (بيروت: ١٩٨٨)، ج ٥ ، ص ٥٤ . إبن الأثير: اللباب، ج ٣ ، ص ٩٢ . الذهبي : المشتبه في الرجال أسماءهم وأنسابهم، تحقيق: علي محمد البجاوي، (القاهرة: ١٩٦٢)، ج١، ص ٥٤٩ .

[2] عمادالدين الأصفهاني: خريدة القصر وجريدة العصر، تحقيق: شكري فيصل، (دمشق: ١٩٦٨)، ج ٢ ، ص٣٤٨.

[3] بڕوانە: عماد الأصفهاني: الفتح القسي، ص ٥٨٨ . إبن الأثير: الكامل، ج١١، ص٣٤٢، التأريخ البهر في الدولة الأتابكية، تحقيق: عبدالقادر أحمد طليمات، (القاهرة: ١٩٦٣)، ص١٤٢. إبن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية (سيرة صلاح الدين)، تحقيق: جمال الدين الشيال، (القاهرة: ١٩٦٤)، ص٦٣. إبن خلكان: وفيات الأعيان أنباء أبناء الزمان، تحقيق: إحسان عباس، (بيروت: د. ت) ج٧، ص١٥٥ .

[4] إبن دريد: جمهرة اللغة،(حيدرآباد/الدكن: ١٣٤٥هـ)، ص٢٥٥.

لەسەر ئەمە یەکدەنگن[١] ئەگەرچی لەوەدا هاوڕانین، کە لە پشت (کورد)ەوە چ باوکێکی تر هەیە. ئەم مێژوونوسانە، بەبێ هیچ رەخنە و پرسیار و مشتومالکردنێك، ئەم لێکدانەوە سادە و هەڵبەستراوەیان وەرگرتووە. لێرەدا ئەم کارە زۆر پەیوەست نییە بە پەرەسەندنی زمانەوانی ناوەکەوە، بەڵکو زیاتر پەیوەستە بە سنورەکانی زانینی مێژوویی ئیسلامییەوە، کە لەبارەی کۆمەڵە مرۆییە جیاوازەکانەوە بۆچوونی تایبەت بەخۆی هەیە و تیایدا هەر کۆمەڵێکی مرۆیی بەستراوە بە باوکێکی مێژوویی کۆنەوە و ناوی کۆمەڵەکە لەو باوکەوە هاتووە، وەك فارس و یۆنان یاخود عەدنان و قەحتان، کە هەموو عەرەب دەچنەوە سەریان[٢]. لێرەدا ئەم کارە دۆزینەوەی پاڵپشتێکی بان مێژوویییە بۆ ناوی ئەو کۆمەڵە مرۆییانەی لە ئێستادا هەن. بەم واتایە، مێژوو بریتییە لە پرۆسەی گەڕان بەدوای ریشە یان بە دوای بوونی سەرەتا و ئەو دابڕان و بەشبوونەی بەدوایدا هاتووە و وا دەکات لە مەسەلەی جیاوازیی نێوان میللەت و نەتەوەکان تێ بگەین. ئەو مێژوونوسانەی پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکەن گۆشەنیگایەکی عەقیدەیی باویان هەیە لەبارەی بوونی باوکێکی مێژووییەوە، کە هەموو مرۆڤایەتی دەچنەوە سەری، دوای ئەم باوکی هاوبەشی چەند نەتەوە و میللەتێك دێت وەك کوڕەکانی نوح (سام، حام، یافث). هەموو ئەو نەتەوانەی لای موسڵمانەکان ناسراون، دەچنەوە سەر یەکێك لەم سێ کوڕەی نوح[٣]. کوردیش وەك یەکێك لەم میللەتانە لای هەندێك

---

(1) المسعودي: مروج الذهب، ج١، ص٤٣٥، التنبيه والإشراف، ص٩٤ . إبن خلكان: م. س، ص٣٥٨ . النويري: نهاية الأرب في فنون الأدب، (القاهرة: د. ت) السفر الثاني، ص٢٩٠. المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، (بيروت: ١٩٩٧)، ج١، ص١٠١ .

(2) المقدسي: البدء والتأريخ، ج٢، ص٤٠ . الهمداني: كتاب الأكليل، حققه: محمد بن علي الأكوع، (بغداد: ١٩٩٧)، ج١، ص١٣٧. إبن حزم الأندلسي: جمهرة انساب العرب، تحقيق: لجنة من العلماء، (بيروت: ١٩٨٨)، ص٧. إبن قتيبة: المعارف، ص١٢-١٣. الطبري: تأريخ، ج١، ص١٠٥-١٠٦. الهمداني: الإكليل، ج١، ص١٣٧ به دواوه . إبن الأثير: الكامل، ج١، ص٧٨. أبو الفداء : المختصر، ج١، ص ١٠-١١ .

(3) إبن قتيبة: المعارف، ص١٢-١٣ . الطبري: تأريخ، ج١، ص١٠٥=١٠٦. الهمداني: الإكليل، ج١، ص١٣٧ به دواوه . إبن الأثير: الكامل، ج١، ص٧٨. أبو الفداء: المختصر، ج١، ص١٠-١١ .

مێژوونوس لە (یافث)ەوە[١] هاتوون و بەلای هەندێکی تریشەوە لە (سام)ەوە هاتوون[٢].
بێگومان ئەم روانینە سەراپاییە بۆ ریشەی میللەت و نەتەوەکان، لەژێر کاریگەریی کولتوری تەوراتی - ئینجیلیی پێش ئیسلامدا هاتووەتە ناو زانینی مێژوویی ئیسلامییەوە، چونکە لە مێژووی عەرەبیدا زۆر زانیاری مێژوویی هەن، کە مۆرکی حیکایەتیان هەیە و لە مێژوو و زانستە ئایینیەکاندا بە ئیسرائیلیات ناو دەبرێن[٣].

ئەم تێڕوانینە لە هەرکوێوە هاتبێت، ئێمە وای دەبینین گەڕانە بەدوای پاساوێکدا بۆ بوونی (کورد) لە ئێستادا، چونکە دانانی (کورد) بە سەرەتای ناوەکە، وەڵامی پێویستییەکی هەنوکەییە بۆ زانینی ریشەی کورد. لەم روانگەوە ریشە ـ وەك یەکێك لە لێکۆڵەرەکان بۆی چووە ـ ئاماژەیەکە کۆمەڵێك شت لەخۆ دەگرێت، کە دوای خۆی هاتوون. بۆیە ئەوەی سەیری رەوتی شتەکان بکات لە سەرەتاوە تا کۆتایی، دەبینێت کارەکان بەشێوەیەکی شاراوە روو دەدەن، هەروەها دەبینێت لە رەچەڵەك و ناوی رەچەڵەکی هەر میللەتێکدا هێزێکی وزەبەخش هەیە ئەو میللەتەی گەیاندووەتە ئێستای خۆی[٤]. جگە لەمە، سەرەتا و ریشەی شتەکان سەرەتایەکی ناوین نەك هۆکاریی و تەنها لە رابردوودا ناو بوون و ((هیچ پەیوەندییەکیان بە پاشترەوە نییە))[٥].

ئەوەی وتمان بەجۆرێك لە جۆرەکان بەسەر هەوڵی دووەمی لێکدانەوەی ناوی کورددا دەچەسپێت، کە دەیەوێت ئەم ناوە وا بناسێنێت گوایە وشەیەکی عەرەبییە و

---

(1) الحميري: التيجان في ملوك حمير واليمن، نشره: ن. ف . كرنكو، (حيدرآباد/ الدكن: ١٣٤٧هـ/١٩٢٨م)، ص٥١ . النويري: م . س، السفر الثاني، ص ٢٨٨-٢٩٠.

(2) إبن خلدون: تأريخ إبن خلدون، تحقيق: خليل شحادة، (بيروت: ١٩٩٦)، ص ٩ ، ١٨١ . هەروەها بڕوانە: القلقشندي: قلائد الجمان في التعريف بقبائل الزمان، تحقيق: إبراهيم الابياري، (القاهرة: ١٩٦٣)، ص٣١ .

(3) مصطفى : التأريخ العربي والمؤرخون، ج١، ص١٠٧ . بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم کاریگەریانەوە بڕوانە:
Franz Rosental :- The influence of the biblical tradition on Muslim historiography , in : Lewis and holt : op.cit , pp . 35-45 .

(4) العظمة: الكتابة التأريخية، ص ١٠٤ .

(5) م . ن، ص ١٠٨ .

لەناو زمانی عەرەبیدا واتای تایبەتیی خۆی هەیە. وشەی کورد ((ئەگەر عەرەبی بێت ئەوا ناوەکەی لە (المكاردة) وەرگیراوە، کە وەك (المطاردة) وایە لە جەنگدا))[1]. هەروەها دەوترێت ((تكارد القوم مكاردة وكرادا))، یاخود دەوترێت ((تكارد القوم تكاردا))[2]. ئەم لەخۆگرتنە زمانەوانییەی وشەی کورد لای هەندێك لە مێژوونوسان دەنگدانەوەی هەبووە، کاتێك ئەو ریوایەتە دەهێننەوە، کە لە نێو خەڵکدا لەسەر رەچەڵەکی کورد باو بووە،، بە پێی گێڕانەوەکە کورد دەگەڕێنەوە سەر ئەو کەنیزانەی سولەیمان پێغەمبەر، کە شەیتان بە نهێنی لەگەڵیان جووت بوون، کەنیزەکانیش منداڵیان بوو، سولەیمان گوتی: ((دەریان بکەن (اكردوهن) بۆ چیا و دۆڵان، لەوێ دایکەکانیان بەخێویان کردن... بەمەش رەسەنی کوردان دەستی پێکرد))[3]. لەم روانگەوە خوێنەر هەست بەوە دەکات ئەم هەوڵەی دووەم دەچێتە ناو هەوڵی سەراپایی بینین و بیرکردنەوە لەجیهان بە عەرەبی، ئەمەش بەوەی ناوەکان بەجۆرێك دابڕێژێت لەگەڵ ئەم زمانەدا بگونجێن و پێی نامۆ نەبن و لە واقیعی کۆمەڵایەتیی ئەم زمانەدا ببنە بەشێکی پەسەندکراو.

پێش ئەوەی لەبارەی ئەم پرۆسەی ناونانەوە نمونەی تر بهێنینەوە، بەپێویستی دەزانین ئاماژە بە مەسەلەیەك بکەین، کە تا ماوەیەکی زۆر لە زانینی مێژوویی و تەنانەت لە جوگرافیای ئیسلامیشدا (بیرلێنەکراوە) بووە، ئەویش بوونی ناوێکە بۆ وڵاتی کورد، کە بەسەر کۆمەڵێك هەرێم و ناوچەی جیاوازدا دابەش کرابوو[4] و پێکهاتە و سنورەکەی

---

[1] إبن دريد: جمهرة اللغة، ج٢، ص ٢٥٥ . الجواليقي: المعرب، ص ٣٣٢ . قارن مع الأزهري: تهذيب اللغة ، ج ١٠، ص١٠٩. إبن فارس : معجم مقاييس اللغة، تحقيق: عبدالسلام محمد هارون، (القاهرة: ١٩٧٩)، ج ٥ ، ص ١٧٦ ، إبن منظور، ج٣ ، ص ٢٣٩ .

[2] إبن دريد: م . ن، ج٢، ص ٢٥٥ . الجواليقي: م . ن، ص ٣٣٢ .

[3] المسعودي: مرزج الذهب، ج١، ص٤٣٥. هەروەها بڕوانە: المقريزي: المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار المعروف بخطط المقريزي، (بيروت: د. ت.)، ج٢، ص٢٣٢.

[4] محمد أمين زكي: خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، ت: محمد علي عوني، ط٢، (بغداد: ١٩٦١)، ص٣٥٥. وڵاتی کوردان لەسەردەمی ئیسلامدا بەشێوەیەکی گشتی بەسەر ئەم هەرێمانەدا دابەشکرابوو : چیاکان، فارس، جەزیرەی فورات، ئازەربایجان، ئەرمینیا، خوزستان و چەند هەرێمێکی تر . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حكيم أحمد (مام بكر): الكرد وبلادهم عند البلدانيين

بەپێی بارودۆخەکان بەردەوام لە گۆڕاندا بووە و زیاد و کەمی کردووە[1]. بێگومان دابەشکردنی وڵاتی کورد بەم شێوەیە، کە زیاتر دابەشکردنێکی کارگێڕییە، دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام و بە تایبەتیش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان[2]، دوای نەمانی ساسانیەکانیش دەسەڵاتی ئیسلامی ئەم دابەشکردنەی چەسپاند. تێبینیی ئەوەش دەکرێت ناوی هیچ کام لەم هەرێم و ناوچانە هەڵگری ئەدگاری ئەتنیی کورد نەبوون، وەك ئەوەی لە ناوە ئەتنییەکانی زۆربەی وڵاتاندا هەبوو و مێژوونوس و وڵاتناسەکان (البلدانیون) بەکاریان دەهێنان، بۆنمونە وڵاتی فارس، جەزیرەی عەرەب، خاکی تورك و زۆر ناوی جیۆگرافیی دیکە، کە لەسەر بنەمای ئەتنی دانرا بوون. تەنانەت مەسعودی، کە زانیارییەکی زۆری لەبارەی کوردەوە هەبووە[3]، ئاماژەی بەهیچ ناوێکی لەو جۆرە نەکردووە، کە وڵاتی کورد لەخۆ بگرێت، هەموو ئەوەی کردوویەتی ئەوەیە باسی شوێنی نیشتەجێبوونی کوردی کردووە لە هەرێم و ناوچە دابڕاو و جۆراوجۆرەکاندا[4].

ئەوەی مێژوونوسەکان لە سەرەتای تۆمارکردنە مێژووییەکانەوە تا سەردەمی ئیبن خەلدون و دواتریش لەبارەی کوردەوە بە ئێمەیان گەیاندووە، ئەوەیە ناوی کوردیان

---

والرحالة المسلمين، أطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (أربيل: ٢٠٠٣)، ص ٨٢-١٠٧ .

[1] بۆ ئەو گۆڕانانەی کە بەهاتنی مەغۆل روویاندا بڕوانە: زرار صديق (توفيق): كردستان في القرن الثامن الهجري، (أربيل: ٢٠٠١)، ص ٤٥-٤٦ .

[2] بڕوانە: John Macdonald (Kinneir): A geographical memoir of the Persian empier, (New york – 1973), pp .

[3] مروج الذهب : ج١، ص ٤٣٥ . التنبيه والإشراف، ص٩٤.

[4] مەسعودی دەڵێت کورد دابەشبوون بەسەر «پشتێنەی فارس و کرمان و سەجستان و خوراسان و ئەصبەهان و زەویی شاخاوی ماهەکان ( وەك ماهی کوفە (دینەوەر)، ماهی بەصرە (نەهاوەند)، ماهی سەبزان) و دوو ئیغارەکە کە بریتین لە (البرج) و (كرج أبی دلف)، هەروەها کەوتوونەتە هەمەدان و شارەزوور و دەراباز و صامعان و ئازەربایجان و ئەرمینیاو ئاران و بیلقان و (الباب والأبواب) و جەزیرەو شام و ثە غور»ەوە. التنبیه والإشراف، م . ن. ص .

لکاندووه به چیاکانەوه، بۆیه لەناو هەواڵە جۆراوجۆرەکاندا[1] زۆر دەربڕینی وەك (کورد لە چیاکاندا) دەبینین و بەشێوەیەکی گشتی چیاکان بەشوێنی گوزەران و نیشتەجێبوونی کورد دادەنران[2]. هەر ئەمەش وای کردووه، کە هەرێمی چیا[3] بە وڵاتی کورد بژمێررێت[4]. سەمعانی (٤٦٢ك/١١٦٦ز مردووه) لەکاتی باسکردنی کورددا ئاماژه بەوه دەکات کورد ((کۆمەڵێکن (طائفة) لە عێراقدا))[5]. لێرەشدا، وەك یاقوت حەمەوی دەڵێت، مەبەستی سەمعانی لە عێراق هەرێمی چیایه، چونکه لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا (٤٤٧-٥٩٥ك/ ١١٥٥-١١٩٨ز)[6]، کە ئەم نوسەره تێیدا دەژیا، ناوی عیراق شوێنی هەرێمی چیای گرتەوه و پێی دەوترا عیراقی عەجەم. بەڵام ئەمه مانای ئەوه نییه، کە کورد لە هەموو ناوچەکانی هەرێمی چیادا نیشتەجێ بوون، بەڵکو بەپێی ئەوەی لێکۆڵەرەکان باسیان کردووه بەزۆری لە بەشەکانی رۆژئاوای ئەم هەرێمەدا چڕ بووبوونەوه[7]. مەبەست لە لکاندنی ناوی کوردیش بە چیاکانەوه، خودی هەرێمی چیا

---

[1] بڕوانه: الجاحظ : البيان والتبين، ج١، ص٨٦. أبوحنيفة الدينوري: م . س، ص٣٠. الطبري: م . س، ج٢، ص . إبن الأثير: الكامل: ج١، ص ٢٧٩ .

[2] إبن قتيبة الدينوري: المعارف، ص ٢٧٠ . أبو حنيفة الدينوري: م . ن، ص ٥ ، ١٦ . سبط إبن الجوزي : مرآة الزمان، ج١، ص ٢٥١ . إبن خلدون: المقدمة، ص٥٠ .

[3] هەرێمی چیا (إقليم الجبال): ناوچەیەکی فراوانی وڵاتی ئیسلامه، لە رۆژهەڵاتەوه هاوسنوری خوراسان و هەرێمی فارسەو رۆژئاواشی ئازەربایجانه، باکوریشی هاوسنوری وڵاتی دەیلەم و رەی و قەزوینەو باشوریشی عیراق و خۆزستانه. شاره بەناوبانگەکانیشی بریتین لە هەمەدان و دینەوەرو ئەصبەهان و نەهاوەندو کرمانشاو کەرەج و...هتد. إبن حوقل: صورة الأرض، ط٣ ، (بيروت: ١٩٧٩)، ص ٣٠٤-٣٠٦ . ياقوت الحموي: معجم البلدان، (بيروت: د. ت )، ج٢، ص ١٠٣ .

[4] اليعقوبي: البلدان، (النجف : ١٩٥٧)، ص ٦ .

[5] الأنساب، ج٥ ، ص ٥٤ .

[6] معجم البلدان، ج٢، ص٩٩ . كي لسترنج : البلدان الخلافة الشرقية، ت: بشير فرنسيس و گورگيس عواد، (بغداد: ١٩٥٤) ص ٢٢٠ .

[7] بڕوانه: حسام الدين علي غالب (النقشبندي): الكرد في دينور وشهرزوور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٥) ص٢ بەدواوه.

نییه، بۆ نمونه دەبینین ئیبن فەزلولاّی ئەلعومەری (٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز مردووە)[(1)]كورد بە دانیشتووی ئەو چیایانە دادەنێت، کە دەکەونە نێوان ولاّتی عەرەب و ولاّتی فارسەوەو بە چیاکانی شارەزوور[(2)]و هەمەدان[(3)]دەست پێدەکات و بە قەلاّ شاخاویەکانی ولاّتی

---

نیشتمان بشیر (محمد): الأحوال السياسية والإجتماعية والإقتصادية لغرب إقليم الجبال خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين (أربيل: ١٩٩٤)، ص ١٤-٣٤ . ميرزا: غربي إقليم الجبال، ص ٢٣-٢٧ .

(1) ئیبن فەزلولاّی ئەلعەمری : ناوی شەهابەدین فەزلولاّ ئەحمەد کوڕی یەحیایە، رەچەڵەکی دەچێتەوە سەر عومەری کوڕی خەتاب، ساڵی (٧٠٠ك/١٣٠١ز) لە دیمەشق لەدایکبووە، لە (ديوان الإنشاء)دا کاری کردووەو لە ئەدەب و مێژوو و دارشتندا زۆر لێهاتوو بووە، لە مێژوونوسەکانی مەوسوعەی مێژوویی سەردەمی مەملوکییە. دەیان دانراوی هەیە، کە بەناوبانگترینیان بریتین لە (مسالك الأبصار في ممالك الأمصار) و (التعريف بالمصطلح الشريف) . ساڵی (٧٤٩ك/١٣٤٨ز ) مردووە. إبن شاكر الكتبي: فوات الوفيات والذيل عليها، حققه: إحسان عباس، (بيروت: د. ت)، مج١، ص ص ١٥٧-١٦١ . الزركلي: الاعلام ، ج١، ص٢٥٤ . محمد حسين شمس الدين (مقدمته للتعريف بالمصطلح الشريف، (بيروت: ١٩٨٨)، ص ٣ .

(2) شارەزوور: ناوچەیەکی فراوانی هەرێمی چیایەو دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری هەمەدان و هەولێرەوەو زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردبووە. بەلاّم ئەم شارە تێکچووەو تەنها ناوەکەی ماوەتەوە. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣ ، ص ٣٧٥ . النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص ص ٦٦-٧٢ .

(3) هەمەدان: لە شارە گەورەکانی هەرێمی چیا بووەو دەکەوێتە ناوەڕاستی هەرێمەکەوە. یەکێکە لە شارە کۆنەکان و پایتەختی دەوڵەتی میدیا بووەو لەوکاتەدا پێی دەوترا (ئەکباتانا)، دەکەوتە سەر رێگای حاجی و کاروانە بازرگانیەکان. أبوالفداء الأيوبي: تقويم البلدان، (باريس : ١٨٤٠)، ص ٤١٧ . القلقشندي: صبح الأعشى في صناعة الإنشاء، تحقيق: محمد حسين شمس الدين، (بيروت: ١٩٨٧) ج٤ ، ص٣٧٠ . جمال (رشيد) وفوزي (رشيد): تأريخ الكرد القديم، (أربيل: ١٩٩٠)، ص١١٣-١١٤ .

ئەرمەن کۆتایی دێت[١]. ئیبن خەلدونیش (چیاکانی کورد) بە هەمان واتای وڵاتی کورد و نیشتمانی خێڵەکانیان بەکار دەهێنێت[٢].

بەڵام وشەی (کوردستان) بەدەگمەن لە کتێبە مێژووییە عەرەبیەکاندا بەرچاو دەکەوێت، بۆ یەکەم جار گەڕیدەی بەناوبانگی ئیتالی مارکۆپۆلۆ (Markopolo) (١٣٢٣ز مردووە) لە سەدەی حەوتی کۆچی/ سێزدەی زایینیدا سەردانی کوردستانی کردووە و لە کتێبەکەیدا (Il million) بەکاری هێناوە. دوای ئەمیش ئەو نوسەر و مێژوونوس و وڵاتناسانە بەکاریان هێناوە، کە بە زمانی فارسی دەیاننوسی و بەناوبانگترینیان حەمدوڵای موستەوفیی قەزوینیە (٧٤٠ك/ ١٣٤٩ز مردووە)[٣]. بەڵام بەپێی زانیاری ئێمە لە زانینی مێژوویی ئیسلامی عەرەبیدا زۆر درەنگ بەکار هاتووە و بۆ یەکەم جار غەیاثیی مێژوونوس (دوای ساڵی ٨٩١ك/ ١٤٨٦ز مردووە) لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆی کۆچی/ پازدەی زایینیدا بەکاری هێناوە[٤].

بەکار نەهێنان و ناو نەبردنی ئەم ناوە (کوردستان) لەلایەن ئەو مێژوونوس و وڵاتناسانەی بە عەرەبی دەیاننوسی، بەوە پاساو نادرێتەوە، کە وشەیەکی عەجەمیە و ئەوانەی بە عەرەبی دەیاننوسی لێی تێ نەدەگەیشتن، وەك لێکۆڵەرێك ئاماژە بەمە دەکات[٥]، چونکە ئەوان هەر لە سەرەتاوە زۆر ناوی جیۆگرافییان بەکار دەهێنا، کە لەڕووی داڕشتنەوە وەك ناوی کوردستان وا بوون[٦]. بۆیە ئەگەر سەرەتا لەڕوانگەی باڵادەستیی رۆشنبیریی فارسییەوە - کە ناوی لەم جۆرەی تێدا نەبوو - و دواتر لەڕوانگەی رۆشنبیریی عەرەبییەوە، کە لە ئەنجامی باڵادەستیی کارگێڕی و رامیارییەوە پەیدا بووبوو، لەم مەسەلەیە بڕوانین، دەبینین نەبوونی ناوێکی ئەتنی بۆ

---

(1) مسالك الأبصار في ممالك الأمصار، مخطوط مصور، ج٣، ص ١٢٤-١٢٥ . وينقل عنه القلقشندى : م . ن، ج٤ ، ص٣٧٣ .

(2) المقدمة، ص ٥ .

(3) ماركوبولو : رحلة ماركوبولو، ت: عبدالعزيز جاويد، (مصر: ١٩٧٧) ج٢، ص ٤٥ .

(4) تأريخ الغيثاني، تحقيق: طارق نافع الحمداني، (بغداد: ١٩٧٥) ص ١٨٣ ، ٣٣٦ .

(5) توفيق: م . س، ص ٣٩ .

(6) وەك خوزستان و سەجستان و چەندانی تر، کە لەلایەن مێژوونوسانەوە زۆر بەکار هێنراون.

ئەم وڵاتە، لەچوارچێوەی ئەم ڕۆشنبیرییەدا نەبووەتە ئیشکالیەت. هەموو ئەوەی ڕۆشنبیرییەکە لەسایەی ئەم باڵادەستییەدا چەسپاندوویەتی، دانانی ناوی جیاجیا بووە بۆ ناوچە کارگێڕییەکانی وڵاتی کورد، کە زۆربەیان تایبەتمەندیی نەتەوەیی دانیشتوانی ئەم وڵاتەیان لەخۆ نەدەگرت. هەموو هەوڵەکە لەوەدا چڕ بووبوویەوە، کە چیا بە نیشتمانی کورد دابنرێت و ناو بێت بۆ وڵاتەکەیان و مۆرکی شاخاویبوونی کورد دەربخرێت، بە هەموو ئەو دەلالەتانەوە، کە ئەم مۆرکە لە چوارچێوەی مێژووی عەرەبیی ئیسلامیدا هەیبوو.

ئێمە لێرەدا نامانەوێت سەرزەنشتی مێژوونوس و وڵاتناسەکان بکەین لەسەر ئەوەی ناوێکی رەگەزی ـ ئەتنیی یەکگرتوویان لەم وڵاتە نەناوە، چونکە ـ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ـ ئەم مەسەلەیە بیر لێنەکراوە بووە، جگە لەوەی مەسەلەی گشتێتی و بەشبوونی ئەم کۆمەڵە مرۆڤە پاساوی دانەنانی ناوێکی لەم جۆرە بووە، چونکە کورد ـ وەك ناو و وەك زاراوەش ـ کۆمەڵێك سیفاتی هەیە، کە گشتگیرییەکی زۆریان تێدایە و لەوە دووری دەخەنەوە ببێتە ناوێك و لە میللەتێك یان لە کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو بنرێت. تەنانەت کاتێك واتا گشتگیرەکانی ناوەکە لە بەکارهێنانە ئەتنییەکەدا کۆ دەبێتەوە، دەبن بە (چەند جۆر و رەگەزێك)[1] و (چەند خەڵك و نەتەوەیەك) و (چەند هۆزێکی جۆراوجۆر)ەوە[2]، هەر جۆرێکیشیان لە کوردیدا زارێکی تایبەت بەخۆی هەیە[3]، کە لەویتر جیاوازە. بێگومان ئەمەش وەك دواتر روونی دەکەینەوە، بەهۆی ئامادەیی بەهێزی سیستەمی خێڵایەتی و دیاردەی گەرمیان و کوێستان کردنی تایبەت بە خێڵە کۆچەرەکانەوەیە، کە سیفەتی پەرتی و فرەییان بەکورد دابوو و وادەناسێنران ((رەگەزێکی تایبەتی ناو تومخمێکی گشتین))[4]، بەڵام لە شوێنێکدا کۆ نەبووبوونەوە، بەڵکو لەڕووی جیۆگرافی و مرۆییەوە پەرش و بڵاو بوون. لەوانەیە هەر ئەمەش بووبێتە هۆی ئەوەی مێژوونوسەکان نەتوانن ناوێکی وا لەم

---

[1] المسعودي: مروج الذهب، ج١، ص٤٣٥ .

[2] العمري: التعريف، ص ٥٨ ، ١٤٩ .

[3] المسعودي: م . س، ج١، ص ص ٤٣٥-٤٣٦ .

[4] العمري: مسالك الأبصار، مخطوط ، ج٣ ، ص ١٢٣ .

کۆمەڵانە بنێن لەڕووی جیۆگرافییەوە هەموویان لەخۆبگرێت، وەك ئەوەی لەگەڵ ئیبن خەلدوندا هاوڕا بن، کە نەتەوەکانی تر و لەناویشیاندا کورد بەکێوی ناو دەبات و دەڵێت: ((ئەمانە هیچ نیشتمان و وڵاتێکیان نییە تیایدا بژین، گشت وڵات و نیشتمانەکان سەبارەت بەمان وەك یەکن))[۱].

بەڵام دوای ئەوەی وشەی (کوردستان) دەرکەوت و لە کایەی فارسیدا بەکارهات، چی دەڵێین؟ بۆچی ئەو مێژوونوسانەی بە زمانی عەرەبی دەیاننوسی هەوڵیان نەدا لێیان وەربگرن؟ بە بۆچوونی ئێمە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە زانینی مێژوویی عەرەبی لەدوای قۆناغی یەکەمی دامەزراندنی، بەسەر خۆیدا داخرابوو و نەیدەتوانی کولتوری پێشووی تێپەڕێنێت و لەو کاتەدا هیچ هەوڵێکی بەرچاو نەدرابوو بۆ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی بارودۆخە تازەکاندا سەرلەنوێ ناوەکان دابنرێنەوە و دابڕێژرێن. هەموو ئەوەی مێژوونوسەکانی دوایی کردوویانە دووبارەکردنەوەی ئەوە بووە مێژوونوسەکانی پێشوو وتویانە و مۆرکی شوێنکەوتن و لاساییکردنەوە باڵی بەسەر نوسینەکانیاندا کێشا بوو، ئیبن خەلدون هەستی بەمە کردبوو، بۆیە لەبارەی مێژوونوسەکانی دواییەوە دەڵێت: ((لە بابەتەکانیاندا وەك شوێن پێ هەڵگرتنی پێشینەکان هەواڵە باوەکانی ئەوانیان دووبارە دەکردەوە))[۲]. ئەوەی زیاتر ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت، ئەو دابڕانە بوو لەنێوان زانینی مێژوویی نوسراو بەزمانی عەرەبی و هاوشێوەکانی لە کایەی فارسیدا ڕوویدا، بەتایبەتی دوای گرتنی بەغداد لەلایەن مەغۆلەکانەوە (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) لە تۆمارکردنی مێژوودا دوو قوتابخانەی سەرەکیی جیاواز سەریان هەڵدا : یەکێکیان عەرەبی بوو و بەهەمان ڕێچکەی ڕۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی تەقلیدیدا دەڕۆیشت و شوێنکەوتەی سیستەمی رامیاری مەملوکی بوو لە قاهیرە ـ دیمەشقدا . ئەویتریان بە زمانی فارسی بوو، چونکە ئەم زمانە لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا جێگیربوو و

---

(1) المقدمة، ص ١١٥ .

(2) م . ن، ص ٣ .

مەغۆلەکانیش وەریان گرت و لەچوارچێوەیەکی فراواندا بەکاریان دەهێنا[١]. ئیتر زانینە فارسییەکان ـ بەتایبەتی مێژوویی ـ بوژانەوەیەکی باشیان بەخۆیەوە بینی[٢] و بە پێچەوانەی زانینی مێژوویی نوسراوبە زمانی عەرەبی، بەشێوەیەکی فراوان وشەی (کوردستان)ی بەکار دەهێنا .

بۆ گەڕانەوە سەر پڕۆسەی ناونان و ناساندن دەڵێین: لەم بوارەدا کۆمەڵێك هەوڵی سەرنجڕاکێش هەن، کە ناوی زۆربەی شارو ناوچە کوردییەکانیان دەکرد بە عەرەبی، یاخود هەندێك گۆڕانکارییان تێدا دەکردن بۆ ئەوەی بە عەرەبی گۆ بکرێن. بێگومان ئەم پڕۆسەیە دەچێتە ناو هەوڵێکی سەراپاییەوە و لەوە دەردەچێت تەنها بەرامبەر بە ناوی شوێن و ناوچە کوردییەکان ئەنجام درابێت، زمانەوانەکان ناویان ناوە پڕۆسەی بە عەرەبییکردنی وشەو زاراوەکان، مەبەستیشیان لەمە ئەو وشە بێگانانەیە، کە عەرەبی نەبوون و عەرەب بەکاریان دەهێنان و بەپێی زمانەکەی خۆی گۆی دەکردن و دەی کردن بە عەرەبی[٣]. بۆ ئەمەش چەند ڕێبازێکیان هەبوو: جاری وا هەبوو هەندێك گۆڕانیان لە وشەکەدا دەکرد، چەند دەنگێکیان لێ دەگۆڕی یان چەند دەنگێکیان بۆ وشە ڕەسەنەکە زیاد دەکرد[٤]، تەنانەت جاری واش هەبوو ناوە عەجەمییەکەیان پشتگوێ دەخست و لەجێی ئەو ناوێکی عەرەبییان دادەنا. هەموو ئەمانەیان بەرامبەر بە ناوە

---

[1] بۆ زانیاری لەسەر ئەم دابڕانە بڕوانە: مصطفى : الملامح والميزات العامة للتأريخ في العصر المملوكي ـ المغولي ـ التركماني، المجلة العربية للعلوم الإنسانية، جامعة الكويت، مج١، ع ١ ، لسنة (١٩٨١)، ص ٣٠-٥٣ .

[2] بۆ زانیاری لەبارەی پەرەسەندنی زانستی مێژووی فارسی لەم سەردەمانەی دواییدا بڕوانە: جب : علم التأريخ، ص١٠٣-١٠٩ .

Lewis and holt (ed):- op . cit , p 126 j -151 .

أشبولر (وديگران): تأريخنگاری در ايران، ترجمه وتأليف : يعقوب اژند (تهران: ١٣٨٠هـ . ش)، ص٩٥-١٥٣ .

[3] الجواليقي: المعرب، ص ٥٣ . السيوطي: المزهر في علوم اللغة وأنواعها، شرحه: محمد أحمد جاد المولى وآخرون، ( القاهرة: د. ت)، ج١، ص٢٦٨ .

[4] الجواليقي: م . ن، ص ٥٤ . آدي شير: معجم الألفاظ الفارسية المعربة، (بيروت: ١٩٨٠)، ص ٣ .

کوردییەکانیش کردووە، جاری وا هەیە ناوە کوردیەکەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، بۆ نمونە وشەی(کوێستان)[1]یان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بووە بە (إقليم الجبال)، (رأس العين)[2]یش لە(سەرکانی)[3]وەرگیراوە. جاری واش هەیە هەندێك دەنگی ناوەکەیان گۆڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆ کردنە عەرەبییەکەدا بگونجێت، بۆنمونە (ئاذەرپادکان) یاخود (أتروپاتين)[4]لە عەرەبیدا کراوە بە (آذربايجان)[5]، (کرمانشاهان)[6]کراوە بە (قرمسين)[7]و (گەنجە)[1]کراوە بە (جنزة)[2]. نەك هەر ئەمە،

---

(1) جەمال رەشید (ئەحمەد): لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، (بەغداد: ١٩٨٨) ل ٦٤ .

(2) رأس العين: یەکێك بووە لە شارە گەورەکانی هەرێمی جەزیرە، دەکەوێتە نێوان حەران و نسێبینەوە، بەوە ناسراوە کە ژمارەیەکی زۆر کانیی هەبوو، ئێستا قەزایەکی سەر بە پارێزگای حەسەکەیە لە کوردستانی سوریا . ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣ ، ص ١٣ ، ١٤ . آزاد (ديركي): مدن كردية، ( بيروت: ١٩٨٨)، ص ١٧٥ بە دواوە.

(3) ديركي: م .ن، ص ١٧٦ .

(4) الجواليقي: المعرب، ص ٨٣ . الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ص ٧٠ ـ ٧١ . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: النقشبندي: م . ن، ص ص ٣٤-٣٧ .

(5) ئازەربایجان: هەرێمێکی فراوانە، لەڕۆژهەڵاتەوە هاوسنوری دەیلەم و هەرێمی چیایە، ڕۆژئاواشی ئەرمینیاو باکوری هەرێمی جەزیرەیە، لە باکورەوە هاوسنوری هەرێمی ئارانەو باشوریشی شاخەکانە. لەمڕۆدا بووە بە ئازەربایجانی ئێران، گرنگترین شارەکانیشی بریتین لە: مەراغە، خوی، سەلماس، ورمی، ئەردەبیل ... . بڕوانە: ياقوت: م . ن، ج١، ص ١٢٨ . النقشبندي: آذربايجان ـ دراسة سياسية حضارية، أطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٨٤)ص ٣٧ .

(6) (قرمسين) كرمشان: یەکێکە لە شارەکانی چیا، نزیکەی (١٨٠کم) لە هەمەدانەوە دوورە، دەکەوێتە نێوەن هەمەدان و حەلوانەوە، ئێستا شارۆچکەیەکی پارێزگای کرماشانی کوردستانی ئێرانە. البكري: معجم ما إستعجم، تحقيق: مصطفى السقا، (القاهرة: ١٣٦٨ هـ/ ١٩٤٩ م)، ج٤ ، ص ١٠٦٧ . عەبدولا غەفور: فەرهەنگی جوگرافیای کوردستان، (سلێمانی : ٢٠٠٢)، ل ٩٠ .

(7) السمعاني: الأنساب، ج٤ ، ص ٤٧٩ . أبوالفداء : تقويم البلدان، ص ٤١٣ . النقشبندي: الكرد في دينور وشهرزور، ص٢٢-٢٣ .

بەڵکو هەندێ ناویان گۆڕیوە و بە تەواوی کردوویانە بە عەرەبی، وەك ناوی هەرێمی جەزیرە[3]، دەڵێن بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، چونکە دەکەوێتە نێوان هەردوو روباری دیجلە و فوراتەوە[4] و بەگوێرەی نیشتەجێبوونی خێڵە عەرەبییەکان لەم هەرێمەدا، کراوە بە سێ بەشەوە[5] و ناویان ناون: (دیاربکر) و (دیار ربیعە) و (دیار مضر)[6]: بە هەمان

---

(1) (گەنجە): یەکێکبووە لە شارە گەورەکانی هەرێمی ئاران و ساڵی (٣٦٠ك/٩٧٠ز) بووە بە پایتەختی میرنشینی شەدادی کوردی، ئێستا یەکێکە لە شارەکانی قەوقاز، دەکەوێتە باشوری شاری (یەریڤان)ەوەو نزیکەی (٣٥کم) لێیەوە دوورە. یاقوت: معجم البلدان، ج٢، ص ١٧١ . بارتولد: مادة جنزة، دائرة المعارف الإسلامية، ت: أحمد الشنتاوي وآخرون، (القهرة: ١٩٣٠)، ج٢، ص ١٢٣ . إسماعيل شكر (رسول): الأمارة الشدادية الكردية في بلاد آران، (أربيل: ٢٠٠١)، ص ٤٠ .

(2) بارتولد: تذكرهء جغرافيايى تاريخى إيران، ت: حمزة سرادادور، (تهران: ١٣٧٢ هـ . ش)، ص ٢٢١ . رسول: م . ن، ص ٣٩-٤٠ .

(3) جەزیرە: هەرێمێکی فراوانبووە، لەسێبەش پێکهاتبوو : (دیار ربیعە) و (دیار مضر) و (دیاربکر) . گرنگترین شارەکانی بریتیبوون لە: حەران، رەها، نسێبین، سنجار، (رأس العين)، ماردین، میافارقین، موصل، ئامەد... . سنوری ئەم هەرێمە لە باکورەوە ئەرمینیاو وڵاتی رۆمەو لە رۆژئاواوە وڵاتی شام و لە باشورەوە سەوادو لە رۆژهەڵاتیشەوە ئازەربایجانە. إبن شداد: الأعلاق الخطيرة بذكر أمراء الشام والجزيرة (قسم الجزيرة)، حققه: يحيى عبارة، (دمشق: ١٩٧٨)، ج٣، ق١، ص٤-٥ . محمد جاسم (حمادي): الجزيرة الفراتية والموصل، (بغداد: ١٩٧٧)، ص ٤٥ .

(4) إبن قتيبة: عيون الأخبار، (القاهرة: ١٩٧٣)، ج١، ص ٢١٤ . إبن عبد ربه: العقد الفريد، تحقيق: عبدالمجيد الترحيني، (بيروت: ١٩٩٧)، ج٨ ، ص ٢٧٩ .

(5) البلاذري: فتوح البلدان، ص ٣٢٣ . الأزدي: تأريخ الموصل، تحقيق: علي حبيبة، (القاهرة: ١٩٦٧)، ص٣١٣-٣١٥، ٣٣٢-٣٣٣. قدامة بن جعفر: الخراج وصناعة الكتابة، ص ٣١٥ . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حمادي: م . س، ص١٦٠، ١٧٢.

(6) یاقوت حەمەوی ئەم سێ ناوچەیە دیاریدەکات و دەڵێت: (دیاربکر) ناوچەکانی رۆژئاوای روباری دیجلە دەگرێتەوە تا دەگاتە ئەو شاخانەی بەسەر شاری نسێبیندا دەڕوانن، شارەکانی بریتین لە: حوصنکێف و ئامەد و میافارقین. (دیار ربیعە) ناوچەکانی رۆژئاوای دیاربەکر هەر لە موصڵەوە تا (رأس العين) دەگرێتەوە. شارەکانی بریتین لە موصل و نسێبین و رأس العين و دەنیسەر . (دیار

شێوە جەزیرەی ئیبن عومەر[١]، پێش ئەوەی حەسەنی کوڕی عەمری تەغەللوبی (حسن بن عمر التغلبي) لە سەردەمی خەلیفە مەئموونی عەباسیدا (١٩٨-٢١٨ک/٨١٣-٨٣٢ز) لەنیوەی یەکەمی سەدەی سێی کۆچی/نۆی زایینیدا، ببێتە والیی ئەم شارە و بەڕێوەی ببات[٢]، بە جەزیرەی کوردەکان ناسرابوو. شاری (کەنگەوەر)یش دوای ئەوەی عەرەبە موسڵمانەکان داگیریان کرد و هاتنە ناوی، ئاژەڵەکانیان لێدزرا، بۆیە ناونرا کۆشکی دزەکان (قصر اللصوص)[٣].

ئەوەی باسکرا بەشێکی کەمە لە ناوە بە عەرەبیکراوەکان، هەرچەندە ئێمە بەتەواوی نازانین ئەم پرۆسەی بەعەرەبکردنە کەی دەستی پێکردووە، بەڵام بەدووری نازانین لەکاتی وڵاتگیرییەکانەوە دەستی پێ کردبێت وەك لە ناونانەکەی شاری (کەنگەوەر)دا بینیمان، بەڵام پێمان وایە سەرەتاکانی ئەم پرۆسەیە ئەو کاتە بە تەواوی دەرکەوت و رەگی داکوتا، کە خەلیفەی ئەمەوی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان (٦٥-٨٦ک/٦٨٤-٧٠٥ز) دەستی کرد بە نوسینەوەی تۆماری خەراج (باجی زەوی و زار) بە عەرەبی[٤] و

---

مضر)یش دەشتاییەکانی (مناطق سهلیة) رۆژئاوای فورات تا حەران و (الرقە) و...هتد دەگرێتەوە. معجم البلدان، ج٢، ص ٤٩٤ .

[1] جەزیرەی ئیبن عومەر: شارێکی بچوکە، دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای روباری دیجلەوە و (١٨٠کم) لە باکوری موسڵەوە دوورە. بۆیە ناونراوە جەزیرە، چونکە روباری دیجلە بەشێوەیەکی کەوانەیی دەوریداوە. ئەمڕۆ پێی دەوترێت (جەزیرە) یاخود (جەزیرەی بۆتان) و قەزایەکی سەربە پارێزگای شرناخی کوردستانی تورکیایە. إبن حوقل: صورة الأرض، ص٢٠٤. یاقوت: المشترك وضعا والمفترق صقعا، ١٨٤٦، ص١٤٢. عەبدوڵا غەفور: س. پ، ل ٣٧.

[2] إبن شداد: م . س، ج٣ ، ق١، ص٢١٣. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم ناونانەوە بڕوانە: سلام حسن (طه): جزيرة إبن عمر في القرنين السادس والسابع الهجريين، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (أربيل: ١٩٨٩)، ص ٢٢ ، ٣٠ .

[3] کەنگەوەر: شارێکە دەکەوێتە نێوان کرماشان و هەمەدانەوە، ئێستا قەزایەکی سەربە پارێزگای کرماشانەو نزیکەی (٩٤کم) لێیەوە دوورە. یاقوت: معجم البلدان، ج٤ ، ص ٣٦٣ .

[4] الجهشياري: الوزراء والكتاب، باعتناء مصطفى السقا وآخرون، (القاهرة: ١٩٢٨)، ص ٣٨-٤٠ . البلاذري: م . س، ص ٢٩٤ .

دروستکردنی دراوی عەرەبی. گرنگی ئەم کارە بە تەنها لەلایەنی کارگێڕیدا نامێنێتەوە، چونکە ئەم بەعەرەبکردنە گونجاندنی زمانی عەرەبی و دەوڵەمەندکردنی بوو بە جۆرێك، کە سەرەڕای ئەوەی زمانی ئایین و رامیاری بوو، بوو بە زمانی بەڕێوەبردن و رۆشنبیریش[1]. بەم جۆرە دەسەڵاتی ناونان درا بەزمانی عەرەبی و وەك پێشتر باسمان کرد، بەرەو ئەوە دەچوو ببێتە زمانێکی گەردوونی. ئیتر ئەم زمانە بۆ گوزارشتکردن لە پەیوەندیی بەکارهێنەرەکەی بە جیهانی دەوروبەرییەوە بەکار دەهات و تەنانەت کاری لەسەر گۆڕینی خودی جیهانەکەش دەکرد[2]. پرۆسەی گۆڕینی ناوەکان گوزارشتکردنە لەو تێڕوانینە گۆڕانکارییەی ئەرکەکەی لەوەدا کورت دەبێتەوە شاراوە و نادیاری عەجەمی بکات بە ئاشکرا و دیاری عەرەبی، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەدا بگونجێت، کە دوای دەست بەسەراگرتنی شار و وڵاتە عەجەمییەکان لەلایەن ئەم دەوڵەتە نوێیەوە سەری هەڵدا[3] و لەپشت ئەم پرۆسەی بەعەرەبکردن ـ یەکخستنەوە پرۆسەیەکی بونیاتنان هەبوو و بۆ سەپاندنی بنەما گشتییەکانی گۆشەنیگاکەی پێویستی بەوە بوو بەجۆرێك لە جۆرەکان لەڕووی تیۆرییەوە ناوەکان یەك بخات[4]. کەواتە پرۆسەی ناساندن و ناونان بەم شێوەیە دەچێتە ناو چوارچێوەی ئەرکی رێکخستن لە دەوڵەتدا. بەڵام زانینی مێژوویی بەندی زمانی عەرەبی بوو و یەکێك بوو لە زانستەکانی ئەم زمانە[5] و ئەرکەکەی لەو چوارچێوەیە دەر نەدەچوو،کە دەوڵەت دیاریی

---

(1) الدوري: النظم الإسلامية، (بغداد: ١٩٨٨) ص ١٤٩ . الجابري: تكوين العقل العربي، ط ٧ ، (بيروت: ١٩٨٨) ص ٦٨ .

(2) بڕوانە: مطاع (صفدي): إستراتيجية التسمية في نظام الأنظمة المعرفية، ط ٢ ، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ١٩٢ .

(3) باشترین نموونە، ئەوەیە کە دوای گرتنی ئیسپانیا لە لایەن موسڵمانە عەرەبەکانەوە بەسەر ناوی شارەکانیدا هات، کاتێك ناوی شارەکانیان عەرەباند بۆ ئەوەی لەگەڵ زمانی عەرەبیدا بگونجێن، بۆنموونە: گرانادا (Granada) کرا بە (غەرناطة)، تۆلیدۆ (Toledo) کرا بە (طليطلة)، مەدرید (Madrid) کرا بە (مجريط)، کۆردۆبا (Cordoba) کرا بە (قرطبة) .

(4) بڕوانە: بورديو : أسباب عملية، ص١٣٣.

(5) الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ص٤-٥ .

کردبوو. واته دابڕانێك نەبوو لەنێوان پێدراوەکانی دەوڵەت (لەناساندن و ناوناندا) لەگەڵ کاری مێژوودا وەك زانینێك، کە زیاتر بایەخ بە بەرجەستەکردنی لەخۆوەی کاری دەوڵەت دەدات لە چوارچێوەی بەرجەستەکردنێکی گەورەتردا، کە مێژوو ئەنجامی دەدات، ئەویش بەرجەستەکردنی خودی دەوڵەتە. لەم روانگەوە، دەبینین لە کتێبە مێژووییە ئیسلامییەکاندا ناوی کۆنی شار و هەرێمە کوردییەکان، کە لە زمانی کوردی و فارسی و سریانی و ئەرمەنیدا بەکار دەهاتن، لە بەرامبەر بەکارهێنانە گشتی و زۆرەکانی ناوە تازەکانیان لە رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی باڵادەستدا دەکشێنەوە و دەبنە ناوی تایبەتی و ناوچەیی، تەنانەت ئەم کارە گەیشتبووە ئەوەی کاتێك مێژوونوسەکان هەواڵی ئەو سەردەمەی ئەم شار و هەرێمانەیان تۆمار دەکرد، کە هێشتا ئیسلام نەهاتبوو، هەر ناوە بەعەرەبیکراوەکانی ئەم شار و هەرێمانەیان بەکاردەهێنا[1]، نەك ناوە ئەسڵییەکانیان. واتە ئەم ناوە تازانە لە دەزگای زمانەوانیی زانینی مێژوویدا چەسپێنران.

ئەم زانینە لەپرۆسەی ناونان و ناساندندا لەم سنورەدا رانەوەستاوە، بەڵکو هەوڵی داوە ریشەیەکی مێژوویی قووڵ بۆ ناوی زۆربەی شار و هەرێمەکان بدۆزێتەوە. هەروەك لە باسی ریشە کۆنەکانی ناوی کورددا بینیمان، لێرەشدا بەهەمان شێوە هەندێك هەوڵ دەبینین دەیانەوێت ناوی زۆر لە شار و ناوچەکان ببەستنەوە بە ریشە سەراپاییەکانی مرۆڤایەتییەوە، بەتایبەتیش بەستنەوەیان بە نوح پێغەمبەر و نەوەکانییەوە. بۆنمونە شاری سنجار[2] بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، چونکە کەشتییەکەی نوح بەر لوتکەی چیاکەی

---

(1) بروانە: إبن قتيبة: المعارف، ص ١٩١ ، ٣٨٦ . تأريخ اليعقوبي، مج١، ص ١٦٦-١٦٨ ، ١٧٦-١٧٧ . إبو حنيفة الدينوري: م . س، ص ٤٣ . الطبري: تأريخ، ج٢، ص٤١ .

(2) سنجار: یەکێکبووە لە شارەکانی (ديار ربيعة) لە باشووری نسێبین، بە چیاکەی بەناوبانگە کە یەکێکە لە بەپیتترین چیاکان، لە کۆن و ئێستاشدا سەر بە شاری موصڵە و نزیکەی ١٣٣کم لێیەوە دوورە. کورد بە (شەنگال) یاخود (ژەنگار) ناوی دەبەن. إبن شداد: الأعلاق الخطيرة، ج٣ ، ق ١ ، ص١٦٠ . إبن سعيد المغربي: كتاب الجغرافيا، تحقيق: إسماعيل العربي، (بيروت: ١٩٧٠)، ص ١٥٧ .موسى مصطفى أبراهيم : سنجار (٥٢١-٦٦٠ هـ / ١١٢٥-١٢٦١م) دراسة في تأريخها السياسي والحضاري، ، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين. (أربيل: ١٩٨٩)، ص ١٥ .

ئەم شارە کەوتووە و نوحیش وتویەتی : ((هذا **سن** جبل **جار** علینا))[١](هەردوو وشەی (سن، جار) لە دەربڕینەکەی نوح وەرگیراون و بوون بەناوی ئەم شارە)، هەروەها شاری نەهاوەند[٢]نوح خۆی دروستی کردووە و - بەپێی ئەم گێڕانەوانە - ناوە راستەقینەکەی (نوح آوند) بووە، بەڵام بۆ ئەوەی ئاسان گۆ بکرێت کراوە بە نەهاوەند[٣]، هەروەها ناوی زۆر شاری تری وەك رەها[٤]و هەمەدان دەبرێنەوە سەر کوڕەکانی نوح[٥]، هەندێ شاری تریش هەن ناوەکانیان دەگەیەنرێتەوە سەر ئیبراهیم پێغەمبەر، وەك شاری حەران[٦]، کە

---

(1) الهروي: الإشارات الى معرفة الزيارات، تحقيق: جانين سورديل، (دیمشق: ١٩٥٣)، ص ٦٦ . یاقوت: معجم البلدان، ج٣ ، ص ٢٦٢ . بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ناوی سنجارەوە بڕوانە: مصطفی إبراهیم : م . ن، ص ١٦-١٩ . واتای رستەکەش ئەمەیە: ئەمە لوتکە چیایەکە توشمانبووە.

(2) نەهاوەند: یەکێکە لە شارە گەورەکانی هەرێمی چیا، دەکەوێتە باشووری همەدانەوە و نزیکەی ٨٤کم لێیەوە دوورە و تائێستاش ئاوەدانە. اليعقوبي: البلدان، ص ٣٩ . یاقوت: م . ن، ج٥، ص٣١٣ . النقشبندي: الكرد، ص ١٧ .

(3) إبن الفقيه: مختصر كتاب البلدان، (لندن: ١٣٠٢ هـ/ ١٨٨٥م)، ص ٢٥٨ . السمعاني: م . س، ج٥ ، ص ٥٤١ . القزويني: آثار البلاد وأخبار العباد، (بيروت: ١٩٦٠) ص ٤١٧.

(4) دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی روباری فوڕات لە نزیك شاری حەران، یەکێکە لە شارە کۆنەکان و لای یۆنانیەکان بە (ئەدیسا) ناسراوە. بە دێرو کڵێسا زۆرەکانی بەناوبانگەو ئێستا پێی دەوترێت ئورفەو یەکێکە لە شارەکانی کوردستانی تورکیا . أبو الفداء : تقويم البلدان، ص ٢٧٧ . عبدالرقيب (يوسف) الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، (أربيل: ٢٠٠١) ج٢، ص ١٦٤ .

(5) یاقوت: معجم البلدان، ج٣ ، ص ١٠٦ . ج٥ ، ص ٤١٠ .

(6) حەران: یەکێکە لەشارە بەناوبانگەکانی هەرێمی جەزیرەو (دیارمضر)، دەکەوێتە سەر رێگەی موسڵ و شام لە بەشی رۆژهەڵاتی روباری فوڕات، سەنتەری صابئەکان بوو و لە پێش و لەپاش هاتنی ئیسلامیشدا ناوەندێکی رۆشنبیری گرنگ بووە. ئەمڕۆ قەزایەکی سەر بە پارێزگای رەهایە لە کوردستانی تورکیا . یاقوت: معجم، ج٢، ص٢٣٥. عەبدوڵا غەفور: فەرهەنگی جوگرافیای کوردستان، ل ٤٣ .

بەناوی (هاران کوڕی ئازەر) برای ئیبراهیم پێغەمبەرەوە ناونراوە[1]. دەشوترێت شاری ئامەد[2] و سنجار دوو برا دروستیان کردوون ناویان ئامەد و سنجار بووە و ڕەچەڵەکیان دەچوویەوە سەر ئیبراهیم پێغەمبەر[3]. ناوی زۆر شاریش هەن ڕیشەیەکی عەرەبیی زۆر کۆنیان بۆ دروست کراوە، بۆ نمونە ناوی شاری حەڵوان[4] لە حەلوان کوڕی عومران کوڕی حافی قوضاعەوە هاتووە، کە کاتی خۆی هەندێك پاشای عەجەم ئەم شارەیان پێ بەخشیوە[5]، بەپێی گێڕانەوەی ڕەچەڵەکناسەکان ئەم حەلوانە دەچێتەوە سەر لقی قەحتانیی عەرەبەکان[6]. بەهەمان شێوە ناوی شاری (ئەسەد ئاباد)[7] دەدرێتە پاڵ

---

(1) الجواليقي: المعرب، ص ١٧١ . (سبط إبن جوزي) دەڵێت: ((دەوترێت هارانی خاڵی یەعقوب دروستیکردووەو عەرەب (هـ)ەکەیان گۆڕیوە بە (ح) و بووە بە حەران)). م . س، الفر الأول، ص٧٠.

(2) ئامەد: یەکێکبووە لە شارە هەرە گەورەکانی دیاربکر، دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕوباری دیجلەوە کە وەك کەوانەیەك دەوریداوە. شارێکی دێرینەو بە شورا کۆنەکانی بەناوبانگە. ئەمڕۆ پێی دەوترێت دیاربکر کە ناوێکی تازەیەو لەم سەدانەی دواییدا لێی نراوە. یاقوت: م . ن، ج١، ص ٥٦ . یوسف : الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، (بغداد: ١٩٧٢)، ج١، ص ٧٢-٧٦ .

(3) السمعاني: الأنساب، ج٣ ، ص ٣١٤ . الهروي: م . س، ص ٦٦ . معجم، ج٣ ، ص ٢٦٢ .

(4) حەلوان: هاوسنوری هەرێمی چیایە و دەکەوتە کۆتایی سنوری سەوادەوە لەنێوان بەغدادو هەمەداندا، سەرەتا سەر بە کاروباری عێراق بووەو پاشتر خراوەتە سەر کاروباری چیاکان. دوای ساڵی ٧٩٤ك/١٣٩٣ز بەهۆی جەنگەکانی تەیمورلەنگەوە خاپوورکرا، دواتر ناوچەکە بە (دەرتەنگ) ناسراوە . قدامة بن جعفر: م . س، ص ١٧٣ . ياقوت: معجم البلدان، ج٢، ص ٢٩٠ . محەمەد جەمیل (ڕۆژبەیانی)مێژووی حەسەنەوەیهی و عەییاری، (بەغداد: ١٩٩٦)، ل ٢٥٧-٢٥٨ .

(5) الجواليقي: المعرب، ص١٧٠. الزمخشري: الجبال والأمكنة والبقاع، تحقيق: إبراهيم السامرائي، (بغداد: ١٩٦٨)، ص٧٦. إبن الجوزي: المنتظم، ج١، ص٢٨ . سبط إبن الجوزي: م . س، السفر الأول، ص ٦٨ .

(6) الهمداني: الإكليل، ج١، ص ٢٥٦-٢٥٧ .

(7) ئەسەدئاباد: شارۆچکەیەکە ٤٨کم لە لە شاری هەمەدان و ٤٢کم لە کەنگەوەرەوە دوورە، تا ئێستا شارێکی دیاری ڕۆژئاوای هەمەدانە. إبن حوقل: صورة الأرض، ص ٣٠٦ . شترك : مادة أسدآباد، دائرة المعارف الإسلامية، ج٢، ص١٠٣ .

ئەسەد کوڕی سەرەویی حەمیری (أسد بن ذي السروى الحميري)، کە یەکێکە لە تەبابیعەکان[1] و لەکاتی تێپەڕبوونی بەم ناوچەیەدا شارەکەی ئاوەدان کردووەتەوە، بۆیە بەناوی ئەمەوە ناونراوە[2]. گێڕانەوەیەکیش هەیە دەڵێت ناوی شاری حەران لە یەکێك لە خێڵە حەمیریەکانەوە هاتووە، کە ناوی حەران کوڕی عەوف بووە[3]. ئەم گێڕانەوانە لەگەڵ سەرجەم ئەو حیکایەتە ئەفسانەییانەدا دەگونجێن، کە لەبارەی پاشا حەمیرییە قەحتانیەکانەوە بوون و باسی ئەو داگیرکارییانەیان دەکەن، کە گەیشتبووە وڵاتی چین[4]. بێگومان ئەم حیکایاتانە، وەك لێکۆڵەرێك بۆی چووە، لە بناغەدا بەرهەمی ناکۆکیی رامیاریی نێوان قەحتانی و عەدنانیەکانن[5].

زۆربەی ئەم گێڕانەوانە هی قۆناغی یەکەمی تۆمارکردنی مێژوون و مێژوونوسەکانی دواییش وەریان گرتوون، بۆیە وەك یاقوت حەمەوی باسی دەکات زۆربەی ئەم گێڕانەوانە لە کتێبی (أنساب البلاد)ی مێژوونوس و رەچەڵەکناس هیشام کوری مەحەمەد کوڕی کەلبی[6](٢٠٤ یان ٢٠٦ك/ ٨٢٩ یان ٨٣١ز مردووە) هەن[1]. ئەم کارەش بۆ ئەوەیە

---

[1] تەبابیعە (التبابعة): لە (تبع) کە واتای شوێنکەوتنە هاتووەو نازناوی پاشا حەمیریەکانە، دەوترێت یەکەم پاشایان ئەم ناوەی لێنراوە، چونکە خەڵکی یەمەن شوێنی کەوتن. الخوارزمي: م . س، ص ٦٧ .

[2] مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية، إعتنى بنشرها: و. مينورسكي، (القاهرة: ١٩٥٥)، ص ١٦ . ياقوت: معجم البلدان، ج١، ص ١٧٦ .

[3] السمعاني: الأنساب، ج٢، ص١٩٥ .

[4] بڕوانە ئەو رەخنانەی لەوجۆرە گێڕانەوانە گیراون کە لەبارەی حەمیریەکانەوەن لای : إبن خلدون: المقدمة، ص ٩-١٠ . هەروەها: جواد علي: المفصل من تأريخ العرب قبل الإسلام، (بيروت: ١٩٦٩)، ج٢، ص ٥١٤-٥١٥ .

[5] علي: م . ن، ج٢، ص ٥١٥ .

[6] (هشام بن محمد بن السائب بن بشير الكلبي) ساڵی (٢٠٤ك/٨٢٩ز) یان (٢٠٦ك/٨٣١ز) مردووە. زاناترین کەسی بواری رەچەڵەکناسی و هەواڵی عەرەبی سەردەمی خۆی بووە. لەسەر دەستی باوکی و چەند کەسێکی تر فێری زانستبووە. لە (الحافظ)ە بەناوبانگەکانە، زۆر کتێبی هەبووە، بەڵام زۆربەیان فەوتاون، بەناوبانگترین کتێبی (جمهرة النسب)ە کە باشترین کتێبی بواری

بیرەوەریی شوێنەکان بسڕێتەوە و بیرەوەریەکی تر لەشوێنیاندا دابنێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ سنورەکانی زانینی مێژوویی باو و دەرکەوتنی لە کۆئەندێشەی وەرگری ئەم زانینە مێژوویەدا بگونجێت، لێرەدا وەرگرەکە سەربەو (ئوممەت ـ دەوڵەت)ەیە، کە گشت رەهەندەکانی زانین دیاری دەکات. بۆیە بەلامانەوە سەیر نییە ئەمە لە کۆئەندیشەی دانیشتوانی ئەم شارە کوردیانەشدا رەنگی دابێتەوە[2]. بە کورتی، ئەم لێکدانەوانەی ریشەی ناوەکان رەوایەتی خۆی لە رەوایەتی هەمەکیی زانینی مێژووییەوە وەردەگرێت.

---

رەچەڵەکناسییە. الخطیب البغدادي، تأريخ بغداد، (بيروت: د. ت )، ج١٤ ، ص ٤٥ . إبن النديم : الفهرست، ص ١٠٨. إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٦ ، ص٨٢-٨٣ .

(1) معجم البلدان، ج٣ ، ص١٠٦ .

(2) بۆ نمونە یاقوت حەمەوی دوای باسکردنی سەرگوزشتەی کەشتیەکەی نوح پێغەمبەرو بەرکەوتنی لەگەڵ ئەو شاخەدا کە بەهۆی قسەکەی ئەمەوە ناونرا سنجار دەڵێت: « گەورە و بچوکی ئەم شارە ئەمە دەزانن و لەنێوان خۆیاندا باسی دەکەن» . م . ن، ج٣ ، ص ٢٦٢ .

## پاری دووەم
## ڕیشەی کورد لە نێوان ئەفسانە و مێژوودا

### ١) زانینی ڕەچەڵەکگەری

لە میانەی سەرنجدانمان لە ناونانی کورد لە چوارچێوەی عەرەبی ئیسلامیدا، بینیمان ریشەی کورد رەهەندێکی مێژوویی قووڵی هەیە و پەیوەستە بە ریشەی سەراپای مرۆڤایەتییەوە، بەڵام زانینی مێژوویی ئیسلامی سەبارەت بە ریشەی کورد بەوەندە بەس ناکات، چونکە مەسەلەی ریشە و رەچەڵەك پانتاییەکی بەربلاوی ئەم زانینە داگیر دەکات. ئاشکرایە عەرەب، کە مادەی یەکەمی ئیسلامن، لە پێش ئیسلامیشدا بایەخێکی زۆریان بە رەچەڵەك داوە و مێژوونوسە کۆنەکانیش بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکیەکانی زانیاریان داناوە لە بارەی جاهیلیەتەوە[1]. رەچەڵەك فۆڕمێکە لە فۆڕمەکانی گوزارەی مێژوویی و بەڵگەی بوونی هەستی مێژووییە لای عەرەب، ئەگەرچی هەر لە قۆناغی سەرزاریدا مابوویەوە و تۆمار نەکرابوو[2].

رەچەڵەك واتە زنجیرەی ئەو باوك و باپیرانەی کۆمەڵێکی دیاریکراو لێیانەوە پەیدابوون، ئەم کۆمەڵە شەرعییەتی بوونیان لەو زنجیرە و قووڵایی مێژوویی ئەو زنجیرەیەدا دەبیننەوە. سەبارەت بە عەرەبیش رەچەڵەك «هۆیەکە بۆ یەکتر ناسین و پردێکە بۆ پەیوەندی»[3] و شارەزابوون لێی پێویستییەکی مەعریفییە بۆ ڕەهەندی سیاسیی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی خێڵەکیی باو لە دوورگەی عەرەبیدا و گوزارشت لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی ـ ڕامیارییەکانی نێوان خێڵە جیاوازەکان دەکات. خێڵ وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی تایبەت، پێویستی بە رەچەڵەکە، کە وەك

---

(1) المقدسي: م.س، ج ٢ ، ص ٤ . الشهرستاني : كتاب الملل والنحل، تحقيق: محمد بن فتح الله بدران، ط٣ ، (قم : ١٣٦٤ ه .ش)، ق١ ، ص٢٤٨ . ابو الفداء : م.س، ج١، ص ٩٨-٩٩.

(2) بڕوانە: روزنتال: م.س، ص ص ٣٣-٣٤ . Khalidi :- op . Cit , p5

(3) ابن عبد ربه: العقد الفريد، ج٢، ص٤٩ .

سەرمایەیەکی ڕەمزی[1] بۆ بەهێزکردنی دەمارگیری خێڵەکی[2] و خۆهەڵنان (التباهی) و شانازیکردن و جەختکرنەوە لە تایبەتمەندێتی بەکار دەهێنرێت، جگە لەوەی پاراستن و دڵنیایی دەروونی بۆ ئەوانە دەستەبەر دەکات، کە لەژێر باڵی ئەم خێڵەدان. بەم واتایە ڕەچەڵەك بریتییە لە ڕۆحی کۆمەڵێکی خێڵەکیی داخراو بەسەر خۆیدا، بۆیە ڕەچەڵەکناسی ـ لە سادەترین دەرکەوتنەکانیدا ـ زانینێکی مێژوویییە گوزارشت لەو گیانەو لە داخران دەکات.

بەڵام دوای هاتنی ئایینی ئیسلام، سەرەڕای بەدرۆخستنەوەی ڕەچەڵەکناسەکان[3] لەلایەن پێغەمبەرەوە لەم فەرموودەیەدا ((ڕەچەڵەکناسی زانینێکە سوودی نییە و نەزانینەکیشە زیانی نییە))[4]، بەڵام لە دوای مردنی پێغەمبەر، بایەخدان بە ڕەچەڵەك و تۆمارکردن و پۆلێنکردن و گرنگی پێدانی سەری هەڵدایەوە، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو هەرچەندە ئیسلام خێڵی ملکەچی دەسەڵاتێکی باڵاتر کرد و تێکەڵ بە ئومەتی تازەی کرد، بەڵام ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ـ خێڵەکیی عەرەبی هەڵ نەوەشاندەوە. بۆیە

---

[1] زاراوەی سەرمایەی ڕەمزی La Capital Symbolique لە زانای کۆمەڵناسی فەرەنسی هاوچەرخ پیەر بۆردیۆ Pieer Bourdiue وەرگیراوە، ئەو پێی وایە سەرمایەی ڕەمزی جۆرێکە لە خاوەندارێتی، کە لەلایەن چەند کەسێکی کارای کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگایەکەوە دەرکی پێدەکرێت، پێدراوەکانی ئەم دەرککردنەشیان ڕێگەی زانین و دیاریکردنی ئەو سەرمایە ڕەمزییەیان پێدەدات و چەند بەهایەکی وەك ( ڕەچەڵەك و شەرەف و شتی لەم بابەتە)ی پێدەبەخشن. سەرمایەی ڕەمزی کۆمەڵێکی دیاریکراو پایەیەکی بەرز دەدات بەو کۆمەڵە لە چاو ئەوانیترداو ڕێگەیەکە بۆ دەلالەتکردن لە شکۆمەندییەکی باڵا وەك ڕەهەندێك لە ڕەهەندەکانی دەسەڵات، یاخود ناوێکی تری ڕەوایەتی وەرگرتنە. بوردیو : م.س، ص١٣٦ . و لە ایضا: الرمز والسلطة، ت: عبدالسلام بنعبد العلي، الدار البيضاء، ١٩٩٠ ، ص٧٨ .

[2] بڕوانە: ابن خلدون: المقدمة، ص ١٠٢ .

[3] البلاذري : جمل من انساب الأشراف، تحقيق: سهيل زكار و رياض الزركلي، (بيروت: ١٩٩٦)، ج١، ص ١٧ . المبرد: نسب عدنان وقحطان، تحقيق: عبدالعزيز الميمنى الراجكوتي، (الدوحة: ١٩٨٤)، ص ٩ .

[4] السمعاني : م.س، ص٤٢ .

ڕاستەوخۆ دوای مردنی پێغەمبەر ڕەچەڵەك دینامیکیەتی خۆی وەرگرتەوە، پێداگرتن لەسەرئەوەی دەبێت جێنشینی پێغەمبەر قورەیشی بێت[1] و دابەش کردنی بەخشش و تۆمار کردنی دیوانەکان لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك و خزمایەتی پێغەمبەر[2]، وایان کرد ڕەچەڵەك و زانینی ڕەچەڵەك فاکتەری دەرکەوتن و بوژانەوە بن. ئەوەی زیاتر هانی ئەمەیدا، گەیشتنی ئەمەویەکان (٤١ك ـ ١٣٢ز/٦٦١ك ـ ٧٥٠ز) بوو بە دەسەلات لەڕێگەی دەمارگیریی خێلایەتیەوە و لە فەرمانڕەواییدا پشتیان بەم دەمارگیرییە خێلەکییە دەبەست و ململانێ خێلەکییەکانیان قووڵتر کردەوە، ئەمەش بووە هۆی بایەخدانی زیاتر بە تۆمار کردنی ڕەچەڵەك[3]. هەروەها ئەوەی زیاتر هانی ڕەچەڵەکگەری دەدا، دەرکەوتنی ئەرستۆکراتیەتی تازە بوو لە ئیسلامدا، کە هەوڵی دەدا بە پشتبەستن بەم سەرمایە ڕەمزییە و هاندان بۆ لێکۆڵینەوەی، پلە و پایەی خۆی بچەسپێنێت و شەرعیەت بە فەرمانڕەواییەکەی بدات، بۆیە ڕەچەڵەکناسی بووە زانستی پاشاکان[4] و ئەوەی لە دەسەلاتدا پێگەیەکی هەبوایە نەدەبوو ئەم زانستە پشتگوێ بخات[5]. ئەمە و فەقیهەکانیش لەلایەن خۆیانەوە کاریان لەسەرئەوە دەکرد مۆرکێکی شەرعی بە ڕەچەڵەك بدەن، تەنانەت زانینی هەندێ لایەنی ڕەچەڵەکیان بە گرنگ و بگرە بە پێویستییەکی شەرعی دەزانی[6].

---

[1] الماوردي: الأحكام السلطانية والولايات الدينية، (بغداد: ١٩٨٩)، ص ١٧ ـ ١٨ . ابو يعلى الفراء : الأحكام السلطانية، تصحيح تعليق: محمد حامد الفقي، (القاهرة: ١٩٣٨)، ص٢٠ . إبن خلدون: المقدمة، ١٠٢٠؟

[2] البلاذري: الفتوح، ق٣ ، ص ٥٥ بەدواوە . الطبري: م . س، ج٤ ، ص٢٠٩ — ٢١٠ .

[3] لەبارەی ڕۆڵی ئەمەویەکان لە هاندانی دەمارگیری خێلایەتیدا ، بڕوانە: الهمداني : الأكليل، ج١، ص ١٥٦-١٦٠ . بۆ کاریگەری ئەمە لە تۆمارکردنی ڕەچەڵەکدا بڕوانە: جب : علم التأريخ، ص٥٠ . أبو الضيف : م.س، ص ٥٨ .

[4] ابن عبد ربه: م.س، ج٢، ص٧٧ .

[5] بڕوانە: ابن قتيبة: م.س، ص٣. غرس النعمة: الهفوات النادرة، تحقيق:صالح الأشتر، (دمشق: ١٩٦٧)، ص ٣٧٢-٣٧٣ . بۆ هەمان بۆچوون بڕوانە: Khalidi :- op . Cit , p56

[6] إبن حزم : م.س، ص ٢ . إبن خلدون، تأريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٤-٥ .

لێرەدا دەبینین ڕەچەڵەك بووە بەشێك لە زانینی مێژوویی و تایبەتمەندیی خۆی هەبوو و خاوەنی میتۆدێك بوو لەگەڵ پێویستییە هەنووکەییەکان و چێوەی ئیسلامیی زانینەکاندا دەگونجا . بۆیە ڕەچەڵەك چووە ناو ڕۆحی ئیسلامەوە و لە لێکۆڵینەوەی ڕەچەڵەکدا سەیرکردنێکی نوێ و گۆشەنیگایەکی ـ تاڕادەیەك ـ جیاواز هەبوو. تەنانەت دەتوانین بڵێین هەندێك جار لای عەرەب گۆڕانی ریشەیی لە بونیادی ڕەچەڵەککگەریدا رووی داوە، دیارترینیان پۆلێن کردنی ڕەچەڵەکەکان بوو بەپێی سەنترالیزمی پێغەمبەر، دوای ئەو بەنو هاشم، ئنجا قورەیش و لە تۆمارکردنی ڕەچەڵەکەکاندا ئەمە بووە پنتی دەست پێکردنی ڕەچەڵەکناسی[1]. لەلایەکی ترەوە ئیتر زانستی ڕەچەڵەك تەنها تایبەت نەبوو بە ڕەچەڵەکی عەرەب، بەڵکو ئەم جۆرە زانینە مێژووییە گشتێنرا، بۆ ئەوەی ئەو گەل و نەتەوانەی تریش بگرێتەوە، کە لەگەڵ عەرەبدا لەناو چوارچێوەی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا بوون، بۆیە دەبوو ڕەچەڵەك پێداویستییە ڕەمزییەکانی ململانێی نێوان کەرتە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان و دەستە ناتەباکانی ناو ئەم چوارچێوەیە دەستەبەر بکات. ئیتر ڕەچەڵەکناسی زیاتر فراوان بوو و ڕەچەڵەکی گەل و نەتەوە جیاوازەکانی تری ـ بەکوردیشەوە ـ لەخۆ دەگرت.

ریشە و ڕەچەڵەکی کورد هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی زانینی مێژوویی ئیسلامییەوە بایەخێکی زۆری پێ درابوو، ئەم ریشەیە یەکێك بوو لە بابەتە بارەکان و گەلێ بۆچوون و ڕای جیاواز لە بارەیەوە هەبوو[2]. مێژوونوس و ڕەچەڵەکناسە یەکەمەکانی وەك: وەهەب کوڕی مونەبەه[3]و ئەبو یەقظان نەسابە[1]و هەروەها هیشام

---

[1] إبن سعد: الطبقات الكبرى، حققه: إحسان عباس، (بيروت: د.ت)، ج۱، ص۲۰-۲۵ . المبرد: م.س، ص۳ . ابن حزم : م.ن، ص.

[2] المسعودى : مروج الذهب، ج۱ ص٤٣٥ . المقريزي، المواعظ والأعتبار، ج۲، ص۲۳۲.

[3] (وهب بن منبه) بە ئەسڵ فارسەو لە دەوروبەری ساڵی (۳٤ك/٦٥٤-٦٥٥ز) لە یەمەن لەدایکبووە. لە هەواڵگێڕەوە (الأخباريين)ە یەکەمەکان بوو، بە گێرانەوەی حیکایەتی مێژوویی ناسراوە، زۆر شتی لە کتێبە کۆنەکانەوە دەگواستەوە. لە دانراوەکانی: کتێبی (الملوك المتوجة من حمير)ە کە بنەمایەك بوو بۆ کتێبی (التيجان في ملوك حمير واليمن ) . لە ساڵی ۱۱٤ك / ۷۳۲ز کۆچی دوایی کردووە. إبن قتيبة: م.س، ص۲۰۲ . ياقوت: معجم الأدباء، ج۱۸ ، ص ۲۵۹-۲٦۰

کوڕی موحەمەدی کەلەبی و هی تر، لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوەی گشتیی ڕەچەڵەکەکاندا بایەخیان بەم بابەتە دابوو. نەك هەر ئەمە، بەڵکو مێژوونوسێکی دیاری وەك ئەبو حەنیفەی دینەوەری کتێبێکی تایبەتی لەبارەی ڕیشەی کوردەوە داناوە بەناوی (أنساب الأکراد)[٢]. ئەوەی جێی داخە ـ بەپێی زانیاری ئێمە ـ کتێبی ناوبراو لە کتێبە ونبووەکانە و هیچ ئاسەوار و هەواڵێکی نەماوە[٣]، ئەگەر ئەو کتێبە بمابایە سوودی زۆری دەبوو بۆ شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەو ڕاوبۆچوون و وێناکردنانەی لە سەردەمی ئەبو حەنیفەدا لەبارەی ڕەچەڵەکی کوردەوە هەبوون. هەرچەند لەو باوەڕەداین ئەوەی ئەبو حەنیفە لەو کتێبەدا باسی کردووە بەزۆری لەوە دەرناچێت، کە ئەو و مێژوونوسەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی لەو بوارەدا وتویانە، بەتایبەتی ئەوەی مەسعودی کردوویەتی و لە کتێبەکانیدا، ئەگەر بە کورتیش بێت، لەبارەی ڕیشەو ڕەچەڵەکی کوردەوە زۆر گێڕانەوەی کۆ کردووەتەوە[٤]. لێرەدا ئێمە نامانەوێت بەنێو وردەکاری ئەم گێڕانەوە جیاواز و لێکدژانەدا ڕۆبچین کە لەبارەی ڕیشەی کوردەوەن، چونکە پێش ئێمە، لێکۆڵەری دی ئەم کارەیان کردووە و خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە

---

[1] (أبو اليقظان النسابة) ناوی (سحيم بن حفص ، ياخوود سحيم بن قادم)ە لە هەواڵ (الأخبار)و ڕەچەڵەك شارەزابوو، ئەوەی ئەو لەبارەی هەواڵ (الاخبار)و ڕەچەڵەکەکانەوە دەیگێڕایەوە جێی متمانەی مێژوونوسەکان بوو. خاوەنی کتێبی (النسب الکبیر) و (نسب تمیم) و زۆر کتێبی ترە. ساڵی (١٩٠ ك / ٨٠٥-٨٠٦ز) مردووە. الجاحظ: رسائل الجاحظ، ج٢، ص ٢٢٦-٢٢٧. إبن النديم : الفهرست، ص ١٤٤.

[2] حاجي خليفة: كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، ط فلوكل، ج٣ ، ص ١٠٨ . بهزاد (شرفخان): حول المصادر التأريخية المؤلفة خصيصاً لتأريخ الكرد و كردستان خلال العصور الوسطى، مجلة (شانەدەر)، ع٢ ، (اربيل: ١٩٩٧)، ص ٨٢ .

[3] بڕوانە: شرفخان: م.س، ص ٨٢ .

[4] مروج الذهب، ج١، ص ص ٤٣٥-٤٣٦ . التنبيه والأشراف، ص٩٤ .

بۆ کتێبەکانی ئەوان[1]، هەروەها بە مەبەستی دووبارە نەکردنەوەی وتەکانی ئەوان، ئەوەندە باس لەو گێڕانەوانە دەکەین، کە پەیوەندی بەوەوە هەیە ئێمە دەمانەوێت شیی بکەینەوە و لێی بکۆڵینەوە.

**٢) ریشەی کورد و ململانێی فارس ـ عەرەب**

به شێوەیەکی گشتی لە زانینی ئیسلامیدا سێ چوارچێوەی گشتی هەیە بۆ ریشەی کورد : چوارچێوەی یەکەم لە ریشەی سەراپای کورددا خۆی دەنوێنێت، دەتوانرێت بە ریشەی ئیسرائیلی ناوببرێت، چونکە مێژوونوسەکان لە داڕشتنی ئەم ریشەیەدا ـ پێشتر هەندێك لایەنیمان ڕوون کردەوە ـ پشتیان بە راڤەکانی تەورات و گێڕانەوە ئیسرائیلیەکان بەستووە. ئەوەی لەبارەی سلێمان پێغەمبەرەوە وتمان و بەکوردکردنی (استکراد) ئەوانەی شەیتان لاقەی کردن و دانانی کورد بە جنۆکە، هەموو ئەمانە دەچنە ناو ئەم چوارچێوەیەوە، سەرباری ئەوەی ئەم چوارچێوە ئیسرائیلیەی ریشەی کورد لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا کەس زۆر بۆی بە پەرۆش نەبووە، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم حیکایەتە، واتە ئەوەی کورد لە جنۆکەن، تا ئەم دواییەش لە یادەوەریدا مابوویەوە و لای هەندێك هەر بەکار دەهێنرا[2].

چوارچێوەی دووەم چوارچێوەیەکی فارسییە، کە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە تەنانەت دوای باڵادەستبوونی رۆشنبیریی عەرەبی لەژێر پەردەی ئیسلامدا، رۆشنبیریی فارسی لە کایەی ئیسلامیدا ئامادەییەکی بەهێزی هەبووە. لەم چوارچێوە فارسیەدا

---

[1] تازەترین و دیارترین هەوڵی زانستی بۆ لێکۆڵینەوەی گێڕانەوە ئیسلامیەکان لەبارەی ریشەی کوردەوە، ئەو کارەیە کە لێکۆڵەری ئەرمەنی (ئەرشاك بولادیان) لەنامەی دکتۆراکەیدا سەبارەت بە ریشەی کورد لەسەردەمی ئیسلامیدا کردوویەتی . بولادیان کەسێکە کە گرنگییەکی زۆر بە کورد و مێژووی کورد داوە. بڕوانە: أرشاك بولاديان: الأكراد حسب المصادر العربية، نقله الى العربية: خشادور ها ريان و عبدالكريم أبو زيد، (يريفان: د.ت) ص ص ١٠٤-١٤٠ . دەربارەی ئەوەی لای وڵاتناسەکان و گەڕیدە موسڵمانەکان لەبارەی ئەم بابەتەوە هاتووە بڕوانە: مام بكر، الكرد وبلادهم، ص٢١٤ -٢٢١ .

[2] بۆ نمونە بڕوانە: العمري، مسالك الأبصار، ج٣، ص ١٢٩ .

مێژوونوسەکان ریشەی کورد دەبەستنەوە بە چیرۆکی ئەفسانەیی زوحاکەوە[1]، کە زۆربەیان بە یەکێك لە پاشا کۆنەکانی فارسی دادەنێن و لەباسکردنی هەندێك لایەنی حیکایەتی ئەفسانەیی زوحاکدا جیاوازیان هەیە. وادیارە ئەم حیکایەتە لەناو مێژوونوسەکاندا بە رادەیەك باوبووە کە کەم کتێبی مێژوویی هەیە باسی نەکردبێت. وەك دەگێڕێتەوە زوحاك پاشایەکی زۆردار بووە و دوو زیادە ئێسك[2]، وتراویشە دوو مار[3] لەسەر شانی دەرهاتوون، خواردنیان مێشکی مرۆڤ بووە، بۆیە دەبوو رۆژانە دوو کەس بکوژن، بۆئەوەی مێشکیان دەرخواردی مارەکان بدرێت، بەلاّم چێشتلێنەرەکەی[4]یان ئەو وەزیرەی ئەم کارەی پێ سپێررابوو، هەندێ لە کەسەکانی ئازاد دەکرد و بەدزییەوە دەیناردن بۆ چیا و شوێنە دوورەدەستەکانی ولاّت[5]و لە گوند و ئاوەدانی نزیك نەدەبوونەوە[6]، ئیتر لەوێ بوونە کێوی و منداڵیان بوو و زیادیان کرد، ئەمانە بوونە ریشەی کورد[7]. مەسعودی لەم ئەفسانەیە دەدوێت و دەڵێت:

---

[1] لای فارس پاشا (بیوراسب)ە، بەلاّم خوارزمی دەڵێت وشەی (ضحاك) لە ئەسڵدا (دهاك)ەو لە عەرەبیدا بووە بە (ضحاك)، (دهاك) واتە دە بەلاّ(عشرة آفات)، هەروەها وتراوە بە عەرەبکراوی وشەی (آزدها) واتە ئەژدیهایە. مفاتیح العلوم : ص٦٣ . ئەم بۆچوونە ئەفسانەییە پەسەند دەکەین، هەرچەندە لە لە راستییەوە دوورە.

[2] ابو حنیفة الدینوري: الأخبار الطوال، ص ١٠-١١. الطبري: م.س، ج١، ص١٩٦ . الخوارزمی : م.ن، ص٦٣ . إبن نباتة: سرح العیون في شرح رسالة إبن زیدون، تحقیق: محمد ابوالفضل إبراهیم، (بیروت: ١٩٨٦)، ص ٧٦.

[3] المقدسی : م.س، ج١، ص٢٨١ . إبن حبیب : المحبر، تحقیق: إیزة لیختن شیتز ، (بیروت: د.ت)، ص ٣٩٣ . المسعودی : مروج الذهب، ج١، ص ٤٣٥ . البیرونی: الآثار الباقیة، ص ٢٢٧.

[4] الثعالبي: تأریخ غرر السیر المعروف بسیر ملوك الفرس، (طهران: ١٩٦٣)، ص ٢٤ . المقدسي: م.ن.ص .

[5] ابو حنیفة الدینوري: م.ن، ص٥ . المسعودي: م.ن.ص ٤٣٦ . إبن نباتة: م.ن.ص.

[6] إبن قتیبة: م.ن، ص٧٠ . المسعودي: م.ن، ج١، ص٤٣٦ . الثعالبی : م. ن، ص٢٥ . البیرونی : م.ن، ص ٢٢٧ .

[7] أبو حنیفة الدینوري : م. ن. ص . سبط إبن الجوزي : م.س، ص ٢٥٦ . إبن نباتة: م. ن. ص.

((ئەوەی لەبارەی زوحاکەوە باسمان کرد نە فارسەکان و نە مێژوونوسە دێرینەکان و نە نوێکان نکوڵیی لێ ناکەن))[١]. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم ئەفسانەیە لای مێژوونوسەکان پەسەند بووە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش بزانین ئەفسانەی زوحاك لە کۆن و لە ئێستاشدا لەناو کورد و فارسدا باوە[٢]، سەرەڕای ئەوەی ئەم ئەفسانەیە لەگەڵ ئەفسانە بابلی و یۆنانیەکاندا ڕووی لێکچوونی هەیە و کاریگەریی ئەوانی لەسەرە[٣]، بەڵام ناتوانین ئەوەی لێ دامالین، کە ڕاستییەکی مێژوویی تێدایە[٤].

ئەمە تاکە هەولی فارس نییە بۆ ئەوەی ئینتیمای کورد بدەنە پاڵ خۆیان، بەڵکو سەبارەت بە عەقلیەتی باوی ئەو سەردەمە، لەبارەی ئەم ئینتیمایەوە هەندێك گێڕانەوەی تر هەن بەجێترن، بۆنموونە باسی ئەوە دەکرێت ڕەچەڵەکی کورد دەگەڕێتەوە سەر ئەو پاشا فارسەی هەموو گەلە فارسیەکان لەوەوە هاتوون[٥]. هەندێك مێژوونوس، بەتایبەتی ئەوانەی سەردەمەکانی دواتر، تەنها بەوەندە دەوەستن کورد دەبەنەوە سەر

---

[1] مروج الذهب : ج١، ص٤٣٦ .

[2] بۆ نمونە بڕوانە: مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية، ص ٢٢ . ياقوت: معجم البلدان: ج٤، ص ٣١٦-٣١٧ . حسين مجيب (المصري): الأسطورة بين العرب والفرس والترك، (القاهرة: ٢٠٠٠)، ص ١٠٠- ١٠٢. کورد ئەمڕۆ بە زوحاك ناوی دەبەن و زۆر لەو ئاسەوارە کۆنانەی لە کوردستاندا ماونەتەوە دەدرێنە پاڵ زوحاك . بڕوانە: عبدالرقيب (يوسف): شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سورێن، (هەرێمی کوردستان: ١٩٩٤)، ل ٣١ بەدواوە.

[3] المصري: م.ن، ص٩٤ ، ئەویش وەریگرتووە لە: Cojee :- Studies Shahnama (Bombay), pp 7-8.

[4] دیاکۆنۆف کە پسپۆڕێکی مێژووی ڕۆژهەلاتی کۆنە، دەڵێت: زوحاك کە بە (بیوراسب، استیاگ، ئەستیاجر، ئەژدەهاك، ئەشتومیگۆ، ئیختومیگۆ)ش ناو دەبرێت، لەڕاستیدا دوا پاشای ئیمپراتۆریەتی میدیایە کە لە نێوان سالانی (٥٨٤/٥٨٥ ـ ٥٤٩/٥٥٠ پ م) فەرمانڕەواییکردووەو لەسەر دەستی کورشی ئەخمینی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەخمینی کۆتایی بە فەرمانڕەواییەکەی هێنراوە. بڕوانە: میدیا: وەرگێرانی : بورهان قانیع، (بەغداد: ١٩٨٧)، ل ٥٧٧ .

[5] المسعودی : التنبيه والأشراف، ص ٩٤ . العمري: مسالك الأبصار، ج٣ ، ص ١٣٠ . المقريزي: السلوط ، ج١، ص ٢٣٢ .

فارس، بێ ئەوەی بە وردەکاریەکاندا ڕۆبچن[١]. هەندێك مێژوونوسیش هەن بە چەسپاندنی یەکێتی ریشەی سەراپایی کورد و فارس، یەك ریشەیی ئەو دوو میللەتە دەسەلمێنن[٢].

هاوکات لەگەڵ ئەم جەختکردنەوەیە لە فارسبوونی کورد، جەختکرنێکی بەهێزتر هەیە لەوەی ڕەچەڵەکی کورد عەرەبییە. لەم چوارچێوەیەدا کورد لە خێڵە عەرەبییە عەدنانیەکانن[٣]، بەهۆی ململانێ لەگەڵ خێڵەکانی دی یان بۆ پەیداکردنی لەوەڕگا و ئاو، ناچاربوون بەرەو شاخەکان کۆچ بکەن[٤]. دەشوترێت[٥] لە خێڵە قەحتانیەکانی یەمەنن[٦] و دوای تێکشکانی بەنداوی مەئرەب[٧] یەمەنیان بەجێهێشتووە و بەرە و

---

(1) أبوالفداء الأيوبي : م.س، ج١، ص٨٣ . إبن الوردي: م.س، ج١، ص٧٢ . المقريزي: المواعظ والإعتبار، ج٢، ص ٢٣٢ .

(2) إبن خلدون: تأريخ إبن خلدون، ج١، ص٩ . هەروەها: القلقشندي: قلائد الجمان: ص٣١ .

(3) عەدنانی: نزاریەو (المعدية)شیان پێدەوترێت. دەڵێن ئەمانە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەرن، لەبەرئەوەی چونەتە پاڵ عەرەبی عاربە (العرب العاربة) و عەرەبیان لێوەرگرتوون، بەوە ناسراون کە عەرەبی بەعەرەبکراون (العرب المستعربة) . علي: م.س، ج١، ص ٣٧٥ بەدواوە .

(4) المسعودي: مروج الذهب، مج١، ص٤٣٥ .

(5) الأنصاري: نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، (لايبزك : ١٩٢٣)، ص ٢٥٥ . مرتضى الزبيدي: تاج العروس من جواهر القاموس، (بيروت: د.ت) مج٢، ص ٤٨٤ .

(6) قەحتانی : دەگەڕێنەوە بۆ قەحتانی باپیرەی عەرەبی باشوور، پێشیان دەوترێت یەمانی (اليمانية) . زانا رەچەڵەکناسەکان و هەواڵ گێڕەوەکان (اهل الأخبار) ناوی عەرەبی عارەبە (العرب العاربة)یان لێناون. لەبارەیانەوە بڕوانە: علي: م.ن، ج١، ص ٣٥٤ بەدواوە.

(7) بەنداوی مەئرەب : ئەو بەنداوەیە کە پاشاکانی وڵاتی سەبە (سبأ)ی یەمەن بەمەبەستی پاراستنی شاری مەئرەب لە لافاو، دروستیانکرد، ئەم بەنداوە لەنێوان ساڵانی(٥٣٩ بۆ ٥٦٥ك) تێکشکاوە. ئەم ڕووداوە بە لافاوی بێسنوور یان زیانبەخش (سيل العرم) ناسراوە. بڕوانە: جرجي (زيدان): العرب قبل الأسلام، راجعه وعلق عليه: حسين مؤنس، (مصر: د.ت))، ص١٧٢ ـ ١٧٨.

چیاکان چوون. له هەردوو بارەکەدا چیا بووەتە نشینگەیان و بەتێپەڕبوونی کات زمانی عەرەبیان بیر چووەتەوەو ((زمانەکەیان بووە بە عەجەمی))[١].

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان پێی وایە سووربوونی هەندێك مێژوونوس لەسەر ئەوەی کورد ببەنەوە سەر عەرەب، بەرژەوەندی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامیی لەپشتەوەیە بۆ ڕاکێشانی کوردە بەلای خۆیدا و دەرخستنی ئینتیمایان بۆ عەرەب، ئەمەش لەچوارچێوەی ئەو هەوڵە بەردەوامانەی عەرەبدا دێت بۆ لەخۆگرتنی میللەتەکانی ئەو وڵاتانەی داگیریان دەکردن و دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا دەسەپاندن[٢]. بەڵام ئێمە بۆچوونێك زیاد دەکەین و دەڵێین ئەم سووربوونەیان لەسەر عەرەبێتیی کورد دەرەنجامی ناکۆکیی نێوان عەرەب و فارسە لەسەر ڕیشەی کورد و ئەوەی ئایا کورد دەچێتەوە سەر کام لەم دوو نەتەوەیە. ئەم کێشەیە لە دێڕەشیعرێکدا - خاوەنکەی نەناسراوە - بەرجەستەبووە و لەناو ڕۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامیدا باو بووە و دەڵێت:

لعمرك ما كرد من ابناء فارس　　　　ولكنه كرد بن عمر بن عامر[٣]

واتە: بە ژیانی تۆ کورد نەوەی فارس نین، بەڵکو کوردی کوڕی عومەری کوڕی عامرن.

ئەم گرنگیدانەی زانینی مێژوویی ئیسلامی بە ڕەچەڵەکی کورد و ناکۆکی عەرەب و فارس لەبارەیەوە، بەشێکە لەو ململانێیەی لە سەدە سەرەتاییەکانی کۆچیدا و لە کاتی باڵادەستیی ڕۆشنبیری ئیسلامیدا لە نێوان فارس و عەرەبدا هەبوو و بە بزوتنەوەی شعوبیەت (الحركة الشعوبية)[٤] ناو دەبرا، گرنگترین ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیەش

---

(1) المسعودي مروج، مج١، ص ٤٣٥ .

(2) بولادیان: م.ن، ص١٠٧ .

(3) الأزهري: تهذيب اللغة: ج١، ص ١٠٩ . إبن منظور: لسان العرب : ج٣ ، ص ٢٣٩ . هەروەها وشەی کورد لە نێوەدێڕی یەکەمدا بەشێوەی کۆ واتە (الأكراد)یش هاتووە. بڕوانە: إبن دريد: جمهرة اللغة، ج٢، ص ٢٥٥ . إبن خلكان: وفيات الأعيان: ج٥، ص ٣٥٨ .

(4) بزوتنەوەی شعوبیەت (الحركه الشعوبيه): بزوتنەوەیەکی عەجەمی ڕکابەری دەسەڵاتی ڕامیاری و بەڕێوەبردن و ڕۆشنبیری ڕەهای عەرەبی بوو لەکایەی ئیسلامیدا و لەگەڵ میللەت و نەتەوەکانی تردا سازشیان دەکرد و ڕێك دەکەوتن. هەندێك لەو شعوبیانە لە کەمکردنەوەی پایەی ◄◄

جەختکردنەوە بوو لەسەر رەچەڵەك و ئەوەی کام رەچەڵەکەیان پایەدارترن، عەرەب یان فارس[1]. لە گەرمەی ئەم ململانێیەدا بایەخدان بە رەچەڵەك زیادی کرد. سەبارەت بە عەرەبیش ئەو مشتومڕانەی لەگەڵ شعوبیەکان و بە تایبەتی فارسەکاندا هەیانبوو لەسەر ئەوەی تانەیان لە عەرەب دەداو بەکەم سەیریان دەکردن، بووە هۆی سووربوون لەسەر لێکۆڵینەوەی رەچەڵەك لەلایەن رەچەڵەکناسە عەرەبەکانەوە بەمەبەستی بەرگریکردن لە سەنترالیزم و رۆڵ و پێگەی کۆمەڵایەتییان[2]. فارسەکانیش لای خۆیانەوە بایەخیان بە رەچەڵەك دەدا و دەستیان کرد بە دانانی درەختی رەچەڵەك (شجرة الانساب)ی تایبەت بەخۆیان و دیاردەی خۆبردنەوە سەر پاشا و کەسایەتیە کۆنەکانی فارس لەناویاندا تەشەنەی کرد[3]. لەم روانگەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، هەریەك لەم دوو لایەنە هەوڵی دروستکردن و هەڵبەستنی گێڕانەوەی جیای داوە و لەڕێگەیەوە کوردی بردووەتەوە سەرخۆی تا لەبەرامبەر ئەوی تری نەیاردا پایەی بەرز ببێتەوە. تەنانەت ئەم ململانێیە لەبارەی ریشەی کوردەوە رپشەکانی ئەو گێڕانەوە فارسیەشی گرتەوە، کە باسمان کرد و پەیوەست بوو بە (زوحاك)ەوە، لێرەدا ململانێی نێوانیان لەبارەی ریشەی زوحاکەوە بوو و لەسەر ئەوە ناکۆك بوون زوحاك لە کامیانە[4]،

---

◀◀ عەرەب و باسکردنی کەموکوڕییەکانیدا زیادەڕۆییان دەکرد. بگەڕێوە بۆ : الدوري: الجذور التأريخية للشعوبية، (بيروت: ١٩٦٢) ص ص ٩-٢٧ . محمود (إسماعيل): الحركات السرية في الأسلام ـ رؤية العصرية، (بيروت: ١٩٧٣)، ص ص ٢٠١ – ٢٠٦ .

(1) بڕوانە: إبن قتيبة: كتاب العرب أو الرد على الشعوبية، ضمن كتاب : رسائل البلغاء، إختيار وتصنيف : محمد كَرد علي، (القاهرة: ١٩٥٤) ص ص ٣٥٢ – ٣٥٥. إبن عبد ربه: م.س، ص٣٥١-٣٥٢ . النويري: نهاية الأرب، السفر الثاني، ص ٢٧٦ .

(2) سزكين: تأريخ التراث العربي، ج٤ ، ص ٤٠٦ . الدوري: بحث في نشاءة، ص ١٤٠ . مصطفى : التأريخ العربى، ج١، ص ١٤٠ .

(3) بڕوانە: ذبيح الله (الصفا): حماسة سراي در إيران، (تهران: ١٣٥٢هـ .ش)، ص ٥٧٤ .

(4) المسعودي: مروج، ج١، ص ٤٣ . أبو الفداء : المختصر، ج١، ص٨٣ .

عەرەبەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد زوحاك لەوانە[١] . کەواتە لەم بارەدا دەتوانین بڵێین دروستکردنی ئەم رەچەڵەکە بۆ ئەوە نەبووە خودی کورد بناسن، لەپێناو ئەوەشدا نەبووە لە ڕاستییەکی مێژوویی بکۆڵنەوە بەو چەمکەی ئەمڕۆ هەیە، بەڵکو دەچێتە ناو بەشی هەستانی ئەویتر بە دروستکردنی مێژوویەکی ناڕاست وەك پێویستییەك ، کە دەیەوێت بەهۆیەوە بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆی لەبارەی کارا مێژووییەکانی ئەو گێڕانەوانەوە بسەپێنێت، بەمەبەستی پاکانەکردن بۆ هەڵوێستەکان و بەهێزکردنی پێگە و زیاد کردنی سەرمایەی رەمزی خۆی لەسەر حسابی لایەکەی تر، وەك لەمەو دوا باسی دەکەین.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە جۆرێکی تر لە ناکۆکی لەبارەی ریشەی کوردەوە، ئەوا ئەم مەبەستگەراییەی گێڕانەوەکان رۆشنتر دەبێتەوە، چونکە ناکۆکی لەسەر ریشە و بەکارهێنانی وەك بیانوویەك ، تەنها لەنێوان عەرەب و فارسدا قەتیس نەمابوو، بەڵکو ئەم ناکۆکییە لەنێو عەرەبەکان خۆشیاندا دەبینرێت و لە ململانێ و ناکۆکی نێوان قەحتانی و عەدنانیەکاندا خۆی دەنوێنێت. لێرەدا رەچەڵەك سەرمایەیەکی رەمزی بوو بەدەست هەریەکەیانەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوی دی . ئەم ململانێ خێڵەکییە، کە بنەمایەکی ئابووری و رامیاری هەبوو، هاوکات بوو لەگەڵ تۆمارکردنی رەچەڵەك و چەسپاندنی لەلایەن رەچەڵەکناسە لایەنگرەکانەوە (المتحزبين)، کە پشتگیری دەستەیەکیان دەکرد دژی دەستەیەکی دی و ـ وەك لێکۆڵەرەکان دەڵێن ـ ئەمەش بەئاشکرا کاریگەریی هەبوو لەسەر پرۆسەی تۆمارکردنی رەچەڵەکەکان و دروستکردنی زۆر هەواڵ و حیکایەتی ناواقیعی[٢]. ئەم لایەنانە هەر بەوەندە نەدەوەستان خۆیان بە رەچەڵەکە عەرەبییەکەیانەوە هەڵکێشن، بەڵکو مەسەلەکە ئەمەی تێپەڕاند و هەر دەستەیەك بەوە خۆی هەڵدەکێشا و شانازیی دەکرد، کە نەتەوە دیار و ناسراوەکانیش سەر بە ئەون، بۆنموونە عەدنانیەکان لافی ئەوەیان لێ دەدا فارس و رۆم و ئیسرائیلیەکان

---

(1) الطبري: م.س، ج١، ص ٢٩٤ . الثعالبي: م.س، ص ١٨ . المسعودي: التنبيه والأشراف، ص ٩٢ ـ ٩٣ . إبن الجوزي: م.س، ج١، ص ١٣٥ .

(2) بگەڕێوە بۆ: علي: م.س، ج١، ص ٤٩٤ — ٤٩٥ . الدوري: م.س، ص ١٥ .

لەوانن، قەحتانیەکانیش خۆیان کردبوو بە خزمی یۆنانییەکانیان[١]. بۆیە ئاسایی بوو ئەم ناکۆکیە کوردیش بگرێتەوە[٢].

لە قەحتانییەکان هیشام کوڕی موحەمەدی کەلبی[٣]سەرپەرشتی ناکۆکیەکەی دەکرد، بەڵام لە لایەنەکەی دی ئەبو یەقظان ئەلنەسابە بەرێوەی دەبرد، کە خۆی سەر بە یەکێك لە هۆزە عەدنانییەکان بوو[٤]. ئیبن کەلبی لافی ئەوەی لێ دەدا کورد دەگەرێنەوە سەر (کرد بن عمر مزیقیاء بن عامر ماء السماء)[٥]، زۆربەی مێژوونوسەکان لەسەر زاری ئەم هەواڵگێڕەوە ئەم گێڕانەوەیان هێناوە و باسیان کردووە[٦]، سەرەڕای ئەوەی لەبارەی ریشەی قەحتانی کوردەوە زۆر گێڕانەوەی تر هەن[٧]، بەڵام ئەبو یەقظان لافی ئەوەی لێدەدا کورد لە عەدنانییەکانەوە بەتایبەتیش لە

---

(1) بڕوانە: المسعودي: التنبيه، ص ص ٩٤ – ٩٦. مروج، ج١، ص ٢٠٦ – ٢٠٧ – ٢٤٧. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: علي: م.س، ج١، ص ٤٩٦ – ٥٠٠.

(2) لێکۆڵەری بەناوبانگ (جواد علی) یەکەم کەسە کە تێبینی ئەم بەکارهێنانە پاساوگەریە(الاستخدام التبريری)یەی ریشەو رەچەڵەکی کوردی کردووە لەو ناکۆکیەدا. بڕوانە: م.ن، ج١، ص ٤٩٨.

(3) الهمداني: الأكليل، ج١، ص ٨٤ .

(4) الطبري: م.س، ج٤ ، ص ٤٤٩ .

(5) (عمرو مزيقياء بن عامر ماء السماء بن حارثة الغطريف بن أمرء القيس الأزدي)ە، دوای تێکشکانی بەنداوی مەئرەب بەرەو باکوور رۆیشتن، ناونراوە (مزیقیاء) چونکە هەموو رۆژێك جلێکی نوێی دەدڕاند، دەشوترێت بۆیە بەوە ناونراوە چونکە خوا پارچەچارچەی کردوون (مزقهم) . إبن دريد: الأشتقاق ، تحقيق: عبدالسلام محمد هارون، (القاهرة: ١٩٥٨)، ص٤٣٥. إبن حمدون: التذكرة الحمدونية، تحقيق: إحسان عباس و بكر عباس، (بيروت: ١٩٩٦)، مج٧ ، ص ٣٧١ .

(6) إبن دريد: جمهرة، ج٢، ص ٢٥٥ . الجواليقي: م.س، ص ٣٣٢ . إبن خلكان: م.س، ج٥ ، ص ٣٥٧-٣٥٨ . إبن منظور: لسان العرب : مج ٣ ، ص ٢٣٩ . المقريزي: السلوك، ج١، ص ١٠١ .

(7) إبن خلدون: تأريخ إبن خلدون، ج٥ ، ص ٣٢٦ . المقريزي: م.ن.ص . هەروەها: المواعظ والأعتبار، ج٢، ص ٢٣٢ .

(كرد بن عمر بن عامر)ەوە هاتوون[1]. هەروەها مەسعودی ئاماژە بە چەند گێڕانەوەیەکی عەدنانی سەردەمی خۆی دەکات، دیارترینیان ئەوەیە رەچەڵەکی کورد دەباتەوە سەر موضیر کوڕی نزار یان رەبیعەی کوڕی نزار[2]. بەڵام ئەوەی لەناو خەڵکدا زۆر باو بوو و لە هەموو رەچەڵەکەکانی دی بەڕاستتر دەزانرا ئەوەیە کورد نەوەی رەبیعەی کوڕی نزارن[3].

ئەم گێڕانەوە جیاوازانە و ئەو بۆچوونانەی لێیانەوە شێوەگیر بوو بوون، پەیوەستن بە قۆناغی یەکەمی زانینی ئیسلامییەوە، کە قۆناغی پەرەسەندن یان دامەزراندنە، مێژوونوسەکانی دوای ئەمانیش ـ وەك نەریتێك ـ ئەم گێڕانەوانەیان دەگواستەوە بەبێ رەچاوکردنی ئەو گۆشەنیگایەی ئەم گێڕانەوانەی لە کاتی بەرهەمهێنانیاندا شێوەگیر کردبوو، یان بێ ئەوەی بێن بەپێی سەردەمەکەی خۆیان، کە مەعریفە بە کورد پەرەی سەندبوو و بۆچوونی نوێ دروست بوو بوو، ئەو گۆشەنیگایە بگۆڕن.

لەلایەکی ترەوە، هەریەك لەم گێڕانەوانە و ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەی بیرکردنەوە و گۆشەنیگای ئەم مێژوونوسانە سنوربەند دەکات، شوێنێکیان دەدا بەکورد شوێنی راستەقینەی خۆی نەبوو، بەڵکو شوێنێك بوو مێژوونوس دەیویست و بۆ لێدانی ئەوانی دی یان بۆ دروستکردنی بۆچوونێك لەبارەی کوردەوە پێویستی پێی بوو، یاخود بۆ بە عەقڵانیکردنی گێڕانەوە مێژووییەکانی، کە هەردوو حاڵەتەکەی تر لەخۆ دەگرێت.

---

[1] إبن دريد: جمهرة، ج٢، ص ٢٥٥. الجواليقي: م.ن.ص. الأنصاري: م.س، ٢٥٥. النويري: م.س، السفر الثاني، ص ٢٩٠.

[2] (عمرو بن عامر بن ربيعة بن صعصعة)یە ـ بەپێی رەچەڵەکناسەکان ـ رەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە سەر عەدنانی باپیرەگەورەی عەدنانیەکان. إبن حزم: م.ن، ص٢٦٩. ياقوت الحموي: المقتضب من كتاب جمهرة النسب، تحقيق: ناجي حسن، (بيروت ١٩٨٧)، ص ١٣٨، ١٥١.

[3] ئەمانە دوو بران، رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر عەدنان. البلاذري: أنساب الأشراف، ج١، ص ٢٠، ٢٨. إبن حزم :م.ن، ص ١٠.

### ٣ ـ مەبەستگەرایی گێڕانەوەکان و دیالێکتیکی (ئێمە) و (ئەویتر)

بینیمان لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا جیاوازی هزریی هەبوو لەبارەی ریشەی کوردەوە، هەر لایەك هەوڵی دەدا لە بەرهەمهێنانی زانینی مێژوویی تایبەت بەخۆیدا ئەم جیاوازییە هزرییانە و لەناویاندا بۆچوونی خۆی لەبارەی ریشەی کوردەوە بەرجەستە بکات. لەم بارەدا ئەو گێڕانەوانە قۆستنەوەی کوردن بۆ بەرژەوەندی (ئێمە)ی رکابەر لە بەرامبەر (ئەویتر) ی نزیکدا، واتە ئەو (ئێمە)یەی مێژوو تۆمار دەکات، رەچەڵەك دروست دەکات و دەیەوێت کورد بناسێنێت، بەڵام نەك تەنها لەپێناو زانینێکی پوختدا، واتە نەك لەپێناو کورددا وەك بابەتێك بۆ زانین، هەرچەندە ناتوانین لەم هەوڵانەدا نکوڵی لەم رەهەندە مەعریفیە ـ با ئەفسانەیش بێت ـ بکەین، بەڵام ئەم دەیویست بەمە لەبەرامبەر ئەوی تردا، کە لەگەڵیدا لە ململانێی ڕاستەخۆدابوو (ململانێی فارسی ـ عەرەبی ، ململانێی قەحتانی ـ عەدنانی ) لەسەر پێی خۆی راوەستێت.

زۆربەی ئەو گێڕانەوانەی پەیوەستن بە ریشەی کوردەوە دوالیزمێکی دیاریان تێدایە، کە بریتیە لە دوالیزمی کوردی (پابەند) و کوردی (ناپابەند) پێمانەوە. ئەوەی تەحەکوم بەم دوالیزمە دەکات بریتییە لە پەیوەندیی نێوان (ئێمە)ی بگۆ، کە بەپێی رۆشنبیری و ئینتیماکانمان مێژوو دەنوسینەوە و (ئەویتر)، کە لە رۆشنبیریی و ئینتیمادا لێمان جیایە و بەپێی پێدراوەکانی خۆمان لێی تێدەگەین[1]. بەڵام لەبەرئەوەی کایەی ئیسلامی بەوە جیادەکرێتەوە ـ لە یەك کاتدا ـ هەم یەکێتی و هەم جیاوازیشی تێدایە،

---

[1] چەمکی (ئێمە) و (ئەویتر) دوو چەمکن لەمرۆدا پانتاییەکی فراوانی هزری فەلسەفی و زانستە مرۆڤایەتیەکان پێك دەهێنن و گوزارشت لەو پەیوەندیانە دەکەن کە لە نێوان کۆمەڵە مرۆییە جیاوازەکاندا هەن. (ئێمە) کە ـ زۆربەی جار ـ دەچینەوە سەر رەگەزێکی دیار (عرق متمیز) و پاشخانێکی رۆشنبیری تایبەتمان هەیە، بە ئاگاییەوە لەگەڵ (ئەویتر)ی جیاواز لێمان لەڕووی رۆشنبیریی و رەگەزییەوە مامەڵەدەکەین، ئەم مامەڵەیە زیاتر گوتراوەکان (مقولات)ی دەرککردن و بۆچوونەکانی ئێمە پێکیدەهێنێت، نەك حەقیقەتی ئەویتر خۆی . لەبارەی ئەم دوو چەمکەوە زۆر تۆژینەوەی گرنگ هەن، بۆنمونە بگەڕێوە بۆ: تزیفیتان (تودوروف): نحن والآخرون، ت: ربى حمود، (دمشق:١٩٩٨) . لبیب (المحرر): صورة الآخر . ص ص ٤٥ — ٤٨ .

بۆیە سروشتییە زیاتر لە کەناڵێکی رۆشنبیری هەبێت، کە نوێنەرایەتی زیاتر لە (ئێمە)یەك بکات و هەریەکەیان کار لەسەر دروستکردنی (ئەویتر)ێك بکات بۆ خۆی .
ئەوەی لە چارەسەرکردنی ریشەی کورد لەم بوارەدا هەستمان پێکرد، ئەوەیە هەرلایەك هەوڵ دەدات ئەوە دەربخات کورد لە یەك کاتدا هەم سەر بەوە و هەم لێشی جیاوازە، کورد بەشێکن لە (ئێمە)ی فارس یان عەرەب، قەحتانی یان عەدنانی، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەوان بەتەواوی وەك ئێمەن و لە هەموو روویەکەوە لە ئێمە دەچن، بۆیە سەرەرای ئەوەی کورد بەشێکن لە (ئێمە)ی دروستکەری مێژوو، بەڵام پەیوەندیان بە ئێمەوە تەنها لە رابردوودا بووە، ئەوان بەشە دەرکراو یاخود راکردووەکەی ئێمەن بۆ چیاکان و لەوێ سروشتیان گۆراوە و بوونە کێوی و لە شار و ئاوەدانی نزیك نابنەوە[1]. واتە ئەوان لایەنێکن لە لایەنە گۆراو و کێوییبووەکانی ئێمە، ئەوان ئەویتری ناوەکیی (الاخر الداخلي) ئێمەن بەبێ ئەوەی ئەمە مانای دەست هەڵگرتن بێت لە ئینتیمای کورد بۆ ئێمە، چونکە لە ئێستادا ئەویتری دیکەش هەیە لەسەر ئینتیمای کورد رکابەریمان دەکەن. لەبەرئەمە کورد ئەو (ئەویتر)ەمانە، کە بەپێی دەرککردن و چوارچێوەی تایبەتیی تێگەیشتنمان وێنەمان کێشاوە.

بەم جۆرە کردەی بە ئەویترکردنی کورد سەبارەت بەم لایەنە ناکۆکانە و دوای ئەمان سەبارەت بە مێژوونوسەکان، پرۆسەیەکی قورس و وردە و زانینی مێژوویی بە سادەترین دەربرین و قووڵترین مانا گوزارشتی لێ کردووە و ویستوویەتی بەمە مۆرکێکی ژیرانە و ماقوڵ بدات بەم پرۆسەیەو ئەو پەیوەندیانەی لێیەوە بەرهەمدێن، وەك ئەم مەعریفانە. کە دەڵێین مۆرکێکی ژیرانەی پێ دەدات، مانای ئەوە نییە لەرووی دروستبوون و بونیاتەوە ئەفسانەییبوونی گێرانەوەکان رەت دەکەینەوە. ئەم گێرانەوە هەڵبەستراوانە و ئەوەی لە زانینی مێژووییدا لەبارەی ئینتیمای سەراپایی کۆمەڵە مرۆییەکانەوە باس کران، بەڵگەیەکی روونن لەسەر ئەوە، کە لە کایەی ئیسلامیدا سنورێکی دیار لەنێوان ئەفسانە و مێژوودا نەبووە. واتە لە تۆمارکردنی مێژوو و لێرەش لە تۆمارکردنی رەچەڵەکدا رەهەندێکی ئەفسانەیی بەسەر گۆشەنیگای

---

[1] إبن قتيبة: م.س، ص ٢٧٠ . أبو حنيفة الدينوري: م.س، ص٥ . المسعودي: مروج، مج١، ص ٤٣٥ .

عـەقڵانی و میتـۆدی رەخنەییـدا زاڵـە، ئـەم گێڕانەوانـە لەگـەڵ ئـەوەدا نـاگونجێن، کـە توێژینـــەوە هاوچـــەرخەکان لـــەبارەی ریـــشەی کـــوردەوە دەیڵـــێن. لـــە راستیـــشدا مێژوونوسەکانی ئەوکاتە نەیاندەتوانی ریشەی راستەقینەی میللەتەکان بزانن و پەی بـە زنجیرەی هۆکار و ئەنجامەکانی دەرکـەوتنی کۆمەڵـە مرۆییـە جیاوازەکـان ببـەن، ئـەوان بەڵگـە و هۆکـاری زانـستیی پێویـستیان لـەبەر دەسـتدا نـەبوو، بیرۆکـەکان مـۆرکی لێکۆڵینەوەی زانستیان وەرنەگرتبوو و لەسەر بناغەیەکی جێگیر و پتەو دانەمەزرا بوون و ئەزموونیان نەکردبووە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە راستی[1].

ئەفسانەییبوونی ئەم گێڕانەوانە لەبارەی کوردەوە لەوەدایە، کـە پەیوەسـتە بـە ریشە یاخود یەکەم سەرهەڵدانی ئـەم کۆمەڵـە مرۆییـەوە، ئەمـەش دەکەوێتـە دەرەوەی مێژووەوە و لە یادەوەری مرۆڤدا ـ کە سەرچاوەی سەرەکی مێژووی کۆنـە ـ نامێنێتـەوە و ناتوانێت بیپارێزێت، ئەگەرچی سوودی بۆ ئەو کۆمەڵەیەش هەیە. ئاشکرایە ئەفسانە لـەوێوە دەسنت پێـدەکات، کـە مێـژوو ناتوانێـت دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر رووداو و کەسەکاندا بسەپێنێت و بیانکاتە واقیعی، ئەرکی ئەفسانە بەتاڵکردنـەوەی مێـژووە لـە واقیع و پڕکردنەوەیەتی بە سروشت[2]، کرۆکی ئەفسانە سەرچڵییەکی هزریی مرۆڤـە بـە مەبەستی دۆزینەوە و زانینی حەقیقەتی سەرسوڕهێن، ئەفسانە شێوازێکە لـە زانـین بـۆ کەشفکردن و گەیشتن بە راستیەکان بەمەبەسـتی لێکدانـەوەی جیهـان و تێگەیـشتن لـە دیاردەکـانی و رازیبـوونی مـرۆڤ پێـی[3]. بـەڵام ئەمـەش مانـای دامـاڵینی رەهەنـدی مێژوویی نییە لە حیکایەت و گێڕانەوە ئەفسانەییەکان، چونکە ئەفسانە، هەرچەند هی قۆناغی پێش مێژووی واقیعییـە، بـەڵام گوزارشـت لـە بۆچوونێکی دیـاریکراو دەکـات

---

(1) بڕوانە: محسن محمد (حسين): الكُرد و بعض مصادر تأريخهم الإسلامي، مجلة كاروان ـ القافلة، (بغداد: ١٩٨٤)، ع ٢٤ ، ص ١٣٨ . أحمد عثمان (أبوبكر): ذكر الأكراد وأصولهم في كتابات المسلمين الأوائل، مجلة المجمع العلمي العراقي ـ الهيئة الكردية، مج ١٣ لسنة ١٩٨٥ ، ص ٣٦٣ .

(2) رولان (بارت): الأسطورة اليوم، ت: حسن الغرفي، (بغداد: ١٩٩٠)، ص ٨٦ .

(3) فراس (السواح): مغامرة العقل الأولي ـ دراسة في الأسطورة، ( بيروت: ١٩٨١)، ص ٩ ، ١٧ . بير (غريمال): الأسطورة والأنسان، ت: فاضل السعدوني، مجلة الثقافة الأجنبية، ع٢ ، (بغداد: ١٩٩١)، ص ٣٩ .

سەبارەت بەو مێژووە و بیرکردنەوەیەکی دیاریکراوە سەبارەت بە ژیان و ئەو مەسەلەیەی ئەفسانەکە چارەسەری دەکات و لێی دەدوێت.

ئێمە لێرەدا نامانەوێت ئەفسانەییبوونی ئەو گێڕانەوانە و دوورکەوتنەوەیان لە ریشەی کورد بسەلمێنین، بەڵکو دەمانەوێت لەو سیاقەدا، کە مێژوونوسەکان دروستیان کردووە، مەعقولیەتی ئەم گێڕانەوانە دەرخەین. لێرەدا مەعقولیەت ئەوەیە لە چوارچێوەی کات و شوێنێکی دیاریکراودا وەسفی شتەکان دەکات و هەواڵەکانیان دەگێڕێتەوە[1]. رەچەڵەکناس و مێژوونوسە کۆنەکانیش بڕوایان بە راستی و مێژووییبوونی ئەو گێڕانەوانە کردبوو، کە لەبارەی ریشەی کوردەوەن، واتە باوەڕیان وابوو دەشێ لەڕووی مێژووییەوە هەبن و توانستی بوونیان هەیە، ئەگەرچی لەڕوانگەی ئەمڕۆوە بە ئەفسانە دادەنرێن. بەبۆچوونی ئێمە ئەم مێژوونوس و رەچەڵەکناسانە لەوێوە بڕوایان بە مەعقولیەتی ئەم گێڕانەوانە هێنابوو، کە کۆمەڵێك هەواڵی کاتەکیی بەدوای یەکداهاتوو دەگێڕنەوە[2] و ئەمە بەڵگەبوو لەسەر ئەوەی ئەم بابەتە راست و بەڵگەدارە[3]. ئەگەر لە بەشە راستەقینەکەی ئەم گێڕانەوانە بکۆڵینەوە، یاخود ئەگەر هەوڵماندا لە ناو سیستەمی وێناکردنە تایبەتەکانی دروستکەری ئەم گێڕانەوانەوە، رەهەندەکانی ئەو وێناکردنە بدۆزینەوە، کە لەسەر ئەم گێڕانەوانە دامەزراوە، دەبینین لەوێدا راناوەستێت ریشەی کورد بچەسپێنێت و لەمیانەی پشتبەستن بە بەدوای یەکدا هاتنی رووداوەکان شەرعیەت بدات بەو ریشەیە، بەڵکو لەگەڵ ئەمەدا وێنای واقیعێکی کۆمەڵایەتیی تایبەت دەکات، کە واقیعی کورد و سروشتی پێکهاتنیەتی و بەمە لەشێوەگیر کردنی بۆچوونەکاندا لەبارەی نەتەوە و میللەتە جیاوازەکان بە کوردیشەوە، گوزارشت لە نەزعەی سەنتراڵیزم دەکات.

لێکچوونی ئەنجامی گێڕانەوەکان و ئەوەی بەڕوونی وێنای سروشتی کورد دەکات، بۆچوونەکە ئێمە دەسەلمێنێت و دەتوانرێت بوترێت رایەڵێك هەیە ئەو چوارچێوە

---

[1] العظمة: الكتابة التأريخية، ص ٩ .

[2] بگەڕێوە بۆ دەقی گێڕانەوەکان لای : المسعودي: مروج، ج١، ص ٤٣٥ – ٤٣٦ . التنبيه والإشراف، ص ٩٥ .

[3] بڕوانە: أركون: الفكر الإسلامي، ص ٣٥ .

جیاوازانه بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کە لەبارەی ریشەی کوردەوەن (ریشەی ئیسرائیلی، ریشەی فارسی، ریشەی عەرەبی) وەك لەم هێڵکاریەدا دەردەکەوێت:

| ریشەکان / رەوتی رووداوەکان | ریشەی ئیسرائیلی | ریشەی فارسی | ریشەی عەرەبی |
|---|---|---|---|
| رووداوی سەرەکی | جووتبوونی شەیتان لەگەڵ کەنیزەکانی سلێمان پێغەمبەر | زوحاك و ستەمکاریەکانی لەسەر زەوی | ململانێی خێڵەکی یان تێکشکانی بەندەوای مەئرەب |
| گێڕانەوەی رووداوەکە | دەرکردنی لەدایکبووەکان بۆ چیاکان | شاردنەوەی رزگاربووەکان لە چیاکاندا | کۆچکردنی هەندێك هۆز بۆ چیاکان |
| ئەنجامی رووداوەکە | بەکوردکردن (دەرکەوتنی کورد) | کێوییبوون و دوورکەوتنەوە لە ئاوەدانی (دەرکەوتنی کورد) | بەعەجەمبوون و دراوسێیەتی شارنشینەکان (دەرکەوتنی کورد) |

**هێڵکاریی لەیەکچوونی گێڕانەوەکان لەبارەی ریشەی کورد و نیشتمانەکەیانەوە**

لە هێڵکاریەکەدا ئەوە دەردەکەوێت کورد لە گێڕانەوە جیاوازەکاندا دوای رووداوێکی سەرەکی، پەنا دەبەن یاخوود دەردەکرێن بۆ شاخەکان و لە شارەکان دوور دەکەونەوە. واتە مێژوونوسەکان لە سروشتی کورد و چیانشینیی کوردەوە پێوەرێکی سەرەکیان وەرگرتووە بۆ دانانی بۆچوونەکانیان لەبارەی ریشەی کوردەوە. ئەگەرچی مێژوونوسەکان لەبارەی سەرەتای دەست پێکردنی کوردەوە رێك نەکەوتون، بەڵام لە هەموو بارەکاندا رەگەزە مرۆڤێك دەردەکەوێت چیانشینن و لە ئاوەدانیەوە دوورن.

مەبەستمان لە نەزعەی سەنترالیزم لە شێوەگیربوونی بۆچوونەکاندا نەمانی جیاوازییە لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا، بۆیە وێناکردنی ریشەی کورد بەم شێوەیە دەبێتە مایەی دروستبوونی سستەمێك لە پەیوەندی، کە گێڕانەوە مێژووییەکان تێ دەپەڕێنێت و ئەو پەیوەندییانە لە دەوری ئەوەدا کۆدەبنەوە، کە پێی دەوترێت پەیوەندی ناوەند بە دەوروبەرەوە، چونکە لێرەدا ناوەندێکی دەسەڵاتخوازمان هەیە بۆ ناسینی ئەوەی ئەو بە دەوروبەری خۆی دایدەنێت، کۆمەڵێك زانینی تایبەت بەرهەم دەهێنێت. ناوەند لەبەر ئەوەی ناوەندێکی دەسەڵاتخوازە، پێویستی بە ناسینی دەوروبەرە وەك بوارێکی زیندوو

بۆ فراوانکردنی فەرمانڕەوایی و پیادەکردنی تواناو دەسەڵاتی خۆی. کەواتە ناسینی ریشەی کورد و جەختکردنەوە لە کەنارگیریی کورد، پێویستیەکی دەسەڵاتە و دەیەوێت لەڕێگەی ئەمەوە سەنترالیزمی خۆی بچەسپێنێت بە مەبەستی قۆرخکاریە رامیاری ـ ئابووری ـ مەعریفیەکان و پەراوێزخستنی دەوروبەر و سەپاندنی گۆشەنیگای سەنتەر بەسەریاندا . لێرەدا و لە سەردەمی بەرهەمهێنانی گێڕانەوەکاندا، لەبەرامبەر رووە رەسمی و یاسایی و شارستانیەکەدا، کە لەڕووی رامیاری و رۆشنبیرییەوە دەستەبژێرێکی باڵادەستن، کورد بریتییە لە رووە کێوییەکە[1] .

## ٤) هەڵوێستی کورد لە ریشەی خۆی

ئایا هەڵوێستی کورد بەرامبەر ئەم گێڕانەوانە چییە؟ کورد چۆن ئەم گێڕانەوانەیان لەبارەی ریشەی خۆیانەوە وەرگرتووە؟ مەسعودی بەڕوونی وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە، ئەو ئاماژە بەوە دەکات کورد خۆیان بەجۆرێك لە جۆرەکان لە دروستکردنی ئەم گێڕانەوانە و برەو پێدانیاندا بەشدارییان کردووە. بەپێی ئەوەی مەسعودی باسی دەکات کورد بە هەڵبژاردنی رەچەڵەکی عەرەبی بۆخۆیان رازی بوون[2] و ئەوەیان هەڵبژاردووە بچنەوە سەر لقی عەدنانی . لەسەردەمی ئەم مێژوونوسەدا هەندێك لە خێڵە کوردەکان لافی ئەوەیان لێدەدا لە رەبیعەی کوڕی نزار کەوتوونەتەوە، هەندێکی تریش لە موضر کوڕی نزاری برای کەوتوونەتەوە[3]، هەندێکیشیان پێیان وایە لە رەبیعەو لە بەکری کوڕی وائیلن[4]، یان دەچنەوە سەر رەچەڵەکە هەڵبەستراوەکانی تر،

---

[1] لێرەدا سوودمان لە هەندێ بۆچوونی بیرمەند موحەمەد ئەرکون بینیوە کە لەبارەی سەنتەرو دەوروبەر لە کایەی ئیسلامیدا دەریبڕیوە. سەنتەر بریتییە لە پێکهاتەی دەوڵەت و دەستەبژێری خوێندەوارو رۆشنبیریی رەسمی، دەوروبەریش بریتییە لە کۆمەڵگە خێڵەکیە بەشبەشەکان و ئاستێکی نزمی رۆشنبیری . أركون: قضايا في نقد العقل الديني ـ كيف نفهم الإسلام اليوم؟ ، ت: هاشم صالح، (بيروت ١٩٩٨)، ص ٧٨ – ٧٩ .

[2] مروج الذهب، ج١، ص ٤٣٦ .

[3] هـ . س، هـ . ل .

[4] التنبيه والأشراف، ص ٩٤.

کە هەموویان لە عەدناندا کۆتاییان دێت. ئەوەی بەڵگەیە لەسەر رازیبوونی کورد بە رەچەڵەکی عەرەبی، ئەوەیە هەندێکیان خۆیان دەبردەوە سەر کەسانێك مەسعودی گوتەنی، نەوەیان لەدوا بەجێ نەماوە[1]. لە سەردەمی دوای ئەم مێژوونوسەشدا هەندێك لە کوردەکان هەوڵی ئەوە دەدەن رەچەڵەکی عەرەبی ـ عەدنانیی دیکە بۆ خۆیان دابنێن، وەك خۆبردنەوە سەر بنەماڵەی ئەمەوی، کە لەو رۆژگارەدا لە هەندێك ناوەندی کوردیدا باو بووە[2].

ئەم هەڵوێستەی خۆبردنەوە سەر عەرەب لەلایەن کوردەوە، بەپێی ئەوەی وڵاتناس و مێژوونوسەکان باسیان کردووە ـ بەلایەنی کەمەوە ـ لە ناوەڕاستی سەدەی چواری کۆچی/دەی زاینییەوە سەری هەڵداوە[3]، کە دەکاتە سەرەتای دەرکەوتنی دیاردەی پێکهێنانی قەوارە رامیارییە کوردییەکان لە هەرێمەکانیاندا. لەم کاتەدا لەلایەن ئەوانەوە، کە مەسعودی بە شارەزایانی کورد ناویان دەبات، برەو دان بەم ریشە دروستکراوە دەستی پێکرد[4]. لەو کاتەدا ئەمانە نوێنەرایەتیی دەستەبژێری کوردیان دەکرد و بەزمانی عەرەبی دەدوان و چوو بوونە ریزی ئەو دەستەبژێرە روناکبیرەی کایەی ئیسلامییەوە، کە گرنگیان بە هەموو زانینەکان دەدا، یەکێك لەو زانینانەش ریشەی میللەت و نەتەوەکان بوو. بێگومان ئەم دەستەبژێرەی کورد هەستیان بەوە کردبوو خۆ بردنەوە سەر عەرەب دینامیکیەتی رامیاری و سوودی کۆمەڵایەتی زۆری هەیە بۆگەیشتن بە پلەوپایە لای چینە دەستڕۆیشتووەکەی دەسەڵاتی باڵا، بۆیە هیچ لەوە دوودڵ نەبوون سەبارەت بە ریشەیان لە پێدراوە عەرەبییەکاندا بتوێننەوە و هەوڵی ئەوە بدەن خۆیان بە عەرەبەوە بلکێنن. واتە ئەمان لە میانەی (ئەویتر)ی عەرەبی و پێدراوەکانیەوە هەستیان بە ماهیەتی خۆیان دەکرد.

---

[1] هـ. س، هـ. ل.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: العمري: مسالك الأبصار، ج٣ ، ص ١٣١ . المقريزي: السلوك، ج١، ص ١٠١ . المواعظ والإعتبار، ج٢، ص ٢٣٢.

[3] الأصطخري: المسالك الممالك، (ليدن: ١٩٢٧)، ص ١١٥ . المسعودي: مروج، ج١، ص ٤٣٦ . إبن حوقل: صورة الأرض، ص ٢٦٩.

[4] التنبيه والإشراف، ص ٩٤.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر بمانەوێت لە هۆکارەکانی کاریگەری و کارلێك کردن، یان لەو هۆیانە بکۆڵینەوە پاڵیان بە کوردەوە ناوە لەناو ڕەچەڵەکەکاندا ڕەچەڵەکی عەرەبی ـ عەدنانی پەسەند بکەن، ئەوا سەرچاوە مێژووییەکان کۆمەڵێك زانیاریی باشمان پێ دەبەخشن. وا دیارە هەڵبژاردنی ڕەچەڵەك لای کورد بە کاریگەریی خێڵە عەرەبییە عەدنانییەکان بووە، کە هاتوونەتە کوردستان، بە تایبەتی ناوچەی جەزیرە و شارەزوور و تیایدا نیشتەجێ بوون[1]. کوردیش لەڕێگەی پەیوەندیی خزمایەتییەوە پێوەیان بەستران و ئەمەش ڕێگەی پێدەدان ڕەچەڵەکی خۆیان بەرنەوە سەر ئەوان و بچنە ناویان و لە سەرمایە ڕەمزییەکەیاندا بەشدار بن.

بەنو شەیبان[2] لەو خێڵە عەرەبییە عەدنانییانەن هاوسێیەتی کوردیان کردووە و پەیوەندیی جۆراوجۆریان لەگەڵدا بەستوون، ئەم خێڵە هاتوونەتە شارەزوور و هەندێك ناوچەی جەزیرەی فورات و تیایاندا نیشتەجێبوون و تا ناوچەی خوراسان تەنها کورد لەگەڵیاندا ژیاوە[3]، کۆمەڵێك پەیوەندیی رامیاری و ئابوری و خزمایەتی کۆمەڵایەتی هەردوولای پێکەوە دەبەست[4]. جگە لەمە کورد لەگەڵ ئەمەوییە عەدنانییەکاندا

---

(1) الأزدي: تأريخ الموصل، ص٣١٣، ٣١٥، ٣٣٢-٣٣٣. الهمداني: صفة جزيرة العرب، تحقيق: محمد بن علي الأكوع، (صنعاء: ١٩٨٣) ص٢٧٥-٢٧٦. إبن حوقل: صورة الأرض، ص١٩٥. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: محمود ياسين (التكريتي): الدور السياسي للقبائل العربية في بلاد الشام والجزيرة الفراتية، بحث منشور في مجلة آداب الرافدين، (الموصل: ١٩٧٦)، ع٧، ص١٦٧-١٦٩.

(2) بەنو شیبان: تیرەیەکن لە تیرەکانی خێڵی بەکری کوڕی وائیل کە لە خێڵەکانی ڕەبیعەی عەدنانین. لەڕووداوە رامیاریەکانی پێش ئیسلام و دوای ئیسلامدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە. ابن حزم : جمهرة، ص ٣٠٢ . إبن الأثير: اللباب، ج٢، ص ص ٣٦-٣٧ . بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: محمود عبدالله إبراهيم (العبيدي): بنو شيبان و دورهم في التأريخ العربي الإسلامي حتى مطلع العصر الراشدي، (بغداد: ١٩٨٤) .

(3) الهمداني: م. س، ص٢٤٧. هەروەها بڕوانە: مؤلف مجهول: العيون والحدائق في اخبار الحقائق، تحقيق: نبيلة عبدالمنعم داود، (النجف الأشرف: ١٩٧٢)، ج٤، ق١، ص ١٣٩.

(4) الطبري: م.س، ج٩ ص٣١٧. مسكويه: تجارب الأمم: ج٢، ص ٣٩٨. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص ٧٠٢. مؤلف مجهول: م. ن، ج ٤، ق ٢، ص١٩٨-١٩٩.

پەیوەندییان هەبووە، لە دووتوێی سەرچاوەکاندا ئەو ئاماژەیە دەبینین کورد مەیلی بۆ هەندێك لە خەلیفەکانی بەنی ئومەییە هەبووە[١]، هەروەها دایکی مەروانی کوڕی موحومەد (١٢٧-١٣٢ك/٧٤٤-٧٤٩ز)ی دواخەلیفەی بەنی ئومەییە لە وڵاتی شام، کورد بووە[٢]، ئەمەش مایەی گاڵتەجاڕیی عەرەب بووە[٣]. بەڵام ئێمە ئەوە بەدوور نازانین ئەم خزمایەتیە رۆڵی هەبوو بێت لەوەدا بەشێك لە کورد خۆیان بەرنەوە سەر ئەم خێزانە. هەروەها کورد لەگەڵ بەنی حەمداندا[٤] پەیوەندییان هەبووە، کە فەرمانڕەوایی هەندێك ناوچەی کوردیان کردووە و لەگەڵ کورددا پەیوەندی رامیاری و کۆمەڵایەتی بەهێزیان بەستووە[٥].

هەرچۆنێك بێت، گەڕاندنەوەی رەچەڵەکی کورد بۆ عەرەب وا لە پەیوەندی نێوان ئەم دوو لایەنە دەکات، سەبارەت بەکورد پەیوەندی یەکگرتن و تێکەڵبوون بێت و

---

[1] الوهراني: منامات الوهراني ومقاماته ورسائله، تحقيق: إبراهيم شعلان و محمد نعش، (القاهرة: ١٩٦٨)، ص ٥٤-٥٥. الذهبي: تأريخ الإسلام و وفيات المشاهير والإعلام، حوادث (٦٥١-٦٦٦هـ)، (بيروت: ١٩٩٩)، ص ٩٣ . بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم پەیوەندیە گەرمەوە بگەڕێوە بۆ: عزت: الكُرد في صدر الإسلام، ص١٢٥-١٣٠ .

[2] البلاذري: أنساب الأشراف، ج٩ ، ص ٢١٧ . المقدسي: البدء والتأريخ، ج٢، ص ٢١٦ . الطبري: م . ن، ج٧ ، ص ٤٤٧ . إبن حبيب : م . س، ص ٣٢ . الكازروني: مختصر التأريخ، تحقيق: مصطفى جواد، (بغداد: ١٩٧٠)، ص ١٠٥ .

[3] المقدسي: م. س، ص ٣٢.

[4] حەمدانیەکان: تیرەیەکن لە تیرەکانی (بني تغلب بن وائل)ی عەدنانی، رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر (ربيعة بن نزار)، لەنێوان ساڵانی (٢٩٣-٣٩٢ ك / ٩٠٥-١٠٠١ ز) فەرمانڕەوایی موسڵ و حەڵەب و زۆر ناوچەی کوردییان لە هەرێمی جەزیرە کردووە. السمعاني: الأنساب، ص١٠٧. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەیانەوە بگەڕێوە بۆ: فيصل (السامر): الدولة الحمدانية في الموصل وحلب، (بغداد ١٩٧١)، ج١، ص ص ٣٨-٤٤ .

[5] القرطبي: صلة تأريخ الطبري، تحقيق: محمد أبوالفضل إبراهيم، (القاهرة: ١٩٨٢)، ص٤٤. التنوخي: الفرج بعد الشدة، تحقيق: عبود الشالجي، (بيروت: ١٩٧٨)، ج٢، ص ١٧٠. مسكويه: تجارب، ج١، ص ٢٩٢-٢٩٣.

بەرژەوەندییەکی هەنووکەیی لە پشتەوەیە. ئێمە پێمان وایە کورد هەمان ئەو مەغزایەیان نەداوە بە رەچەڵەکە عەرەبییەکەیان، کە رەچەڵەك و رەچەڵەکگەری لەکایەی عەرەبیدا هەڵی دەگرت و جەختی لە جیاکاری و جیاوازی دەکردەوە، بەڵکو کورد هەوڵیان دەدا لەرێگەی وەرگرتنی ئەو رەچەڵەکانەوە جیاوازیی خۆیان لەگەڵ (ئەویتر)ی فەرمانڕەوا و باڵادەست لەڕووی رامیاری و ئایینی و رۆشنبیرییەوە کەم بکەنەوە. جەختکردنەوە لە ریشەی عەرەبی جۆرێکە لە هەستکردن بە ئینتیما بۆ ئەو کۆمەڵە مرۆییە تایبەتەی شادەماری (ئوممەت ـ دەوڵەت)ی ئیسلامی پێك دەهێنێت. سەبارەت بەکورد ئەم رەچەڵەك دروستکردنە بە قۆناغێکی گرنگ لە قۆناغەکانی موسڵمانبوون و تەماهیکردن لە عەقیدەدا دادەنرێت. لەو کاتەدا خۆ بردنەوە سەر عەرەب پێگەی کۆمەڵایەتیی کەسەکەی بەرز دەکردەوە، بۆیە وەرگرتنی ریشەی عەرەبی لەلایەن بەشێك لە کوردەکانەوە دەمانخاتە بەردەم قۆناغێکی نوێ لە قۆناغەکانی کەینونەی کورد و پێکهاتنیان و گەڕان بەدوای خوددا لەناو پێدراوەکانی (ئەویتر)ی باڵادەست و یادەوەرییە مێژووییەکەیدا. واتە ئەم هەوڵدانە وەك هێنانەئارای جۆرە مێژوویبوونێکی کەسێتیی کوردییە تا بێتە ناو بارە نوێیەکەوە، بەوپێیەی کردەیەکی ئاگایانەیە بۆ دیاریکردنی ماهیەتیان بەپێی (ئەویتر) و زانینە مێژووییەکەی و پاشان تێکەڵبوونە لەگەڵ ئەو (ئەویتر)ەو بەشداریکردنیەتی لە ئەندێشەیدا.

بە هەمان شێوە توانەوەی کوردەکان لە ریشەی عەرەبیدا هەوڵێکە بۆ دەرچوون لە پەراوێز و چوونە پاڵ ئەو بوارەی دەسەڵاتی ناوەندیی خاوەن رەهەندی ئاینیی تێدایە. بۆیە دەتوانرێ بوترێت ئەم هەوڵەی کورد رەهەندێکی رامیاریشی هەیە و دەیەوێت بەهۆیەوە لە جەرگەی رووداو و دەسەڵاتە رامیارییە جیاوازەکاندا شەرعیەت بدات بە دەسەڵاتی کوردی و بوونی کورد، لێرەدا پڕۆسەی رەچەڵەکگەری کردەیەکی کوردانەیە و دەستە خوێندەوارەکە بە ئاگاداری و ئاگاییەوە لەهەوڵێکدا بۆ سەلماندنی بوونیان و دەستەبەرکردنی داننان بە شەرعیەتی ئەم بوونەدا، ئەنجامیان داوە.

گەڕان بە دوای شەرعیەتدا، بەلای ئێمەوە وادەرناکەوێت، کارێکی کۆمەڵایەتی بوویێت و لە سنوورێکی فراواندا ئەنجام درابێت، هەموو ئەوەی مێژوونوسەکان باسی دەکەن ئەوەیە خۆبردنەوە سەر عەرەب بە پلەی یەکەم ئامانجی دەستەبژێری سیاسیی

کوردبووە، واتە ئامانجی ئەوانە بووە، کە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی کوردیان کردووە و لە پەیوەندییەکی راستەوخۆدا بوون لەگەڵ ئەویتری رکابەر، کە خاوەنی رەچەڵەکی خۆیەتی. لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی بوونی کورد لە مێژووی ئیسلامیدا کۆمەڵێك بەڵگە هەن ئەمە دەسەلمێنن، بۆیە دەبینین ئەو کوردانەی خزمایەتییان لەگەڵ عەرەبدا هەبووە و چوونەتەوە سەرئەوان، لە دەسەڵاتدا بوون، یان لە دەسەڵاتە کوردییە جۆراوجۆرەکاندا لەکاردا بوون. ئەوەتە حوسەینی کوڕی داودی فێنکی[1]، کە شاعیرێکی کوردە و لەسەردەمی میر (باد کوڕی دۆستەك)ی دامەزرێنەری میرنشینی دۆستەکی ـ مەروانی کوردیدا ( ٣٧٣؟-٤٨٩ ك / ٩٨٣؟-١٠٩٦ ز) ژیاوە و بەشیعر پیایدا هەڵداوە ـ دوای پیاهەڵدانی باد و یەکێك لەشەرەکانی ـ شانازی بەوەوە دەکات رەچەڵەکی کورد دەچێتەوە سەر عەرەب و دەڵێت:

مفاخر الكرد في جدودي و نخوة العرب في انتسابي

هەروەها لە دێڕێکی تردا دەڵێت:

نحن الذؤابة من كرد بن صعصعة من نسل قيس لنا في المجد طول[2]

واتە: شانازیەکانی کورد لە باپیرانمایەو جوامێری عەرەب لە رەچەڵەکما .

ئێمە هەڵبژاردەیەکین لە کوردی کوڕی صەعصەعەی نەوەی قەیس و لە شکۆمەندیدا دەستێکی بالآمان هەیە.

دەشوترێت مەروانییەکان لەدوای (باد)ی خاڵیان فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەیان کردووە، رەچەڵەکی خۆیان دەبردەوە سەر عەرەب[3]. هەروەها قەطرانی

---

[1] حوسەینی کوڕی داودی فێنکی : لە شاعیرە کلاسیکیەکانی کوردە، لەسەردەمی میر (باد)ی کوردیدا ژیاوەو بە یەکێك لە شاعیرەکانی ئەو دەژمێررێت. دەچێتەوە سەر خێڵی بەشنەوی (البشنوية) کوردی کە لە جەزیرەی فورات بووە. باس لەوە دەکرێت کە ئەم شاعیرە زۆر دانراوی هەیە، بەلاّم تەنها بەشێك لە شیعرەکانی ماونەتەوە. إبن الأثير: الكامل، ج ٧، ص١٤٢-١٤٣. عبدالرقيب (يوسف): الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، (أربيل: ٢٠٠١) ج٢، ص

[2] عمادالدين الأصبهاني: خريدة القصر، ج٢، ص ٥٤١ .

[3] المقريزي: السلوك، ج١، ص ١٠١ .

تەبریزی[1]، کە شاعیرێکی ترە، بە یەکێك لە میرەکانی میرنشینی ڕەوادی کوردیدا (٣٣٧؟ -٤٦٣ك / ١٠٤٨؟-١٠٧١ ز) هەڵدەدات، ئەویش میر مەملانی کوڕی وەهسوزانە و دەڵێت:

حَبش أز عجم وقدوء شاهان عجم

نسبش أز عرب و قبيله ميزان عرب[2]

واتە: خۆشەویستیەکەی لە عەجەمەوەیە و پێشەوای پاشایانی عەجەمە. لە ڕەچەڵەکی عەرەبە و رووگەی دادپەروەریی عەرەبە.

هەندێك لە میرو کەسایەتییە هەکاریەکانی[3] کورد لافی ئەوەیان لێدەدا لە ڕەچەڵەکی عەرەبن، هەندێکیان دەبرێنەوە سەر ئەمەوییەکان بەتایبەتی عەتەبەی کوڕی سوفیانی کوری حەربی کوڕی ئومەییە[4]، بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم ڕەچەڵەکەش هەوڵیان داوە بەڵگەی مێژوویی بدۆزنەوە، یاخود هەوڵیانداوە مۆرکێکی ماقوڵ بەم ڕەچەڵەکە هەڵبەستراوە بدەن، بۆیە دەوترێت هەندێك لە ئەمەوییەکان پەنایان بردە بەر

---

(1) قەترانی تەبریزی : (٤٢٥-٤٦٥ ك/١٠٣٤-١٠٧٢ ز) ناوی (شرف الزمان أبو منصور قطران التبريزي)یە، بەوە ناسراوە کە شیعری بەسەر میرە کوردەکانی هەردوو میرنشینی (شەدادی و ڕەوادی)دا وتووە. چەندین کتێب و دیوانێکی شیعری چاپکراوی هەیە. صفا: تأريخ ادبيات در إيران، (تهران: ١٣٧٠ ه . ش)، ج٢، ص٤٢١-٤٣٠ .

(2) أحمد (كسروي): شهرياران گمنام، (تهران: ١٣٧٠ هـ . ش)، ص١٨١ . حوسێن حوزنی (موکریانی): کوردستانی موکریان یان ئاترۆپاتین، (رەواندز : ١٩٣٨)، ل ٢٥٤ .

(3) هەکاری: خێڵێکی کوردی بەناوبانگن، بەناوی ناوچەکەیانەوە ناسراون کە (هەکاری)یەو لە چەند شارو ناحیەو گوندێك پێکهاتووەو دەکەوێتە جەزیرەی ئیبن عومەر لە سەرووی موسڵەوە. السمعاني: م . س، ج ٥ ، ص ٥٩٠ . ياقوت: معجم البلدان، ج٥ ، ص ٤٠٨ . هەکاریەکان لە مێژووی رامیاری و شارستانی کورددا لە سەردەمی ئیسلامی کلاسیکیدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە. بۆ زانیاری لەبارەی ئەو ڕۆڵەیانەوە بڕوانە: نبز مجيد (أمين): المشطوب الهكاري ـ دراسة عن دور الهكاريين في الحروب الصليبية، (السليمانية: ٢٠٠٢) .

(4) الذهبي: م . س، حوادث ٦٥١-٦٦٥ ه، ص٣٥١-٣٥٢ . العمري: التعريف بالمصطلح الشريف، ص ٥٨ . المقريزي: السلوك، ج١، ص ١٠١ . المواعظ ، ج٢، ص ٢٣٣ .

شاخەکان ((کاتێك زۆریان بۆ هات، بۆ خۆپاراستن لە دوژمنەکانیان و دەربازبوون لە دەست درێژیەکان تێکەڵی خەڵك بوون و چوونە ناو کوردەکانەوە و لەکاتی بەکارهێنانی هێزدا سوودیان لە هاریکاریان وەرگرت و رزگاریان بوو))[1]. تەنانەت هەندێك لە هەکاریەکان لافی رەچەڵەکێکیان لێدەدا زۆر ئایینی بوو و دەیانوت لە نەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبن[2].

نەزعەی بردنەوەی رەچەڵەکی کورد بۆ سەر عەرەب، لەو قۆناغە مێژووییەدا زیاتر بووژایەوە و گفتوگۆ لەبارەیەوە گەیشتە لوتکە، کە کورد بەرزترین پلەی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەوەی لە دەستە تێکۆشەر (مجاهد)و بەرگریکەرەکەی خاکی ئیسلام بوون، لە روانگەی خەڵکە رەشۆکی و تایبەتیەکەشدا بوونە دەسەڵاتداری باڵا، مەبەستیشمان لەو قۆناغە سەردەمی ئەیوبییە کوردەکان یاخود سەردەمی دەسەڵاتداریەتیی کوردە، کە سەڵاحەدینی ئەیوبی ( ٥٣٢-٥٨٩ ك/ ١١٣٧-١١٩٣ ز) دیارترین روخساری ئەم دەسەڵاتە بوو.

هەرچەندە مێژوونووسەکان[3] لەوەدا هاوڕان ئەیوبییەکان لە ریشەدا کوردن[4]، بەڵام لەم قۆناغەدا رەچەڵەکی کورد لای مێژوونوسەکان و تەنانەت لای خودی ئەیوبییەکانیش بووە جێی پرسیار، چونکە ئەم دەسەڵاتە تازەیە ـ بەپێی گۆشەنیگای گشتی ـ لەپاڵ ئەو شەرعیەتە ئایینیەی دەسەڵاتەکەیاندا، کە بووبووە مایەی مانەوەی

---

(1) العمري: مسالك الأبصار، ج٣ ، ص ١٣١ .

(2) إبن خلكان: م . س، ج٣ ، ص ٤٩٧ .

(3) اليونيني: ذيل مرآة الزمان، (حيدرآباد/ الدكن: ١٩٥٤) مج١، ص ٣٨ . اليافعي: مرآة الجنان وعبرة اليقضان في معرفة ما يعتبر من حوادث الزمان، وضع حواشيه: خليل منصور، (بيروت: ١٩٩٧) ج ٣ ، ص ٣٣٣ .

(4) إبن الأثير: الكامل، ج ٤ ، ص ٣٤١ . إبن خلكان: م .س، ج ٧ ، ص ١٣٩ . أبو شامة: الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: محمد حلمي محمد، (القاهرة: ١٩٦٢)، ج١، ق١، ص ٣٢٩ . اليونيني: م . ن. ص . اليافعي: م . ن. ص . إبن خلدون: التعريف بإبن خلدون، ص ٣٤٧ . المقريزي: المواعظ والإعتبار، ج٣ ، ص ٨٤ . الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق: ناظم رشيد، (بغداد: ١٩٧٨)، ص ٢٣ .

بالادەستیی رامیاری و ئیدارییان، پێویستیان بە (شەرعیەتی رەچەڵەك)یش بوو، هەربۆیە چەند ئەندامێکی بنەماڵەی ئەیوبییەکان هەستیان بە گرنگیی رەچەڵەکی عەرەبی کردبوو. ئەمەش لە قسەی یەکێك لە ئەندامەکانی ئەم بنەماڵەیەدا دەردەکەوێت، کە لە گەرمەی هەوڵەکاندا بۆ کردنیان بە عەرەب، کردبووی و پێی وابووە: ئەگەر سەلاحەدین قورەیشی بوایە خەلافەتی دەگرتە دەست، چونکە ((جگە لە رەچەڵەك هەموو مەرجەکانی دیکەی خەلیفایەتی تێدابوو))[1]، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك نەوەی ئەم بنەماڵە کوردە لافی رەچەڵەکی عەرەبییان لێدەداو نکوڵییان لەوە دەکرد رەچەڵەکیان کوردبێت، پاساویشیان ئەوەبوو کە دەیانگوت: (( ئێمە عەرەبین، ئەوەندە هەیە لاماندوەتە لای کوردو ژنمان لێهێناون)).[2] مێژوونوسەکانیش لەلایەن خۆیانەوە، بەتایبەتی ئەوانەیان کە هاوچاخی ئەیوبییەکان بوون، لە نوسینەکانیاندا کاریان لەسەرئەوە دەکرد کە بیسەلمێنن رەچەڵەکی ئەیوبییەکان عەرەبە[3]. هەم ئەیوبییەکان و هەم کوردەکانی تریش ، بەتایبەتی هەکاریەکان هانی ئەوەیان دەدا رەچەڵەکی عەرەبی ساختە دروستبکرێت.

لەم مەسەلەیەدا مێژوونوسەکان زیاتر گرنگییان بە (المعز إسماعیل بن سیف الإسلام)ی پاشای یەمەن دەدا کە خۆی ئەیوبی بوو و لافی ئەوەی لێدەدا کە لە بەنی ئومەییەیەو[4] لە نەوەی خەلیفە مەروانی کوڕی موحەمەدی[5] ئومەوییە کە وەك پێشتر باسمانکرد دایکی کورد بووە. تەنانەت هەر بەمە نەوەستا، بەڵکو وازی لە گوێڕایەڵی

---

(1) اليونيني: م . ن، ج١، ص ٣٩ .

(2) إبن واصل: مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، تحقيق: جمال الدين الشيال، (القاهرة: ١٩٥٣)، ج١، ص ٣ .

(3) إبن خلكان: م . س، ج ٧ ، ص١٤٠-١٤١ . إبن واصل: م . ن، ج١، ص ٤ .

(4) إبن خلكان: م . ن، ج ٥ ، ص ٥٢٤ . ج٧ ، ص ١٤١ . إبن واصل: م . ن، ص٣-٤ . اليونيني: م . ن، ص٣٩. المقريزي: السلوك، ج١، ص١٤٨. الخزرجي: العقود اللؤلؤية في تأريخ الدولة الرسولية، تحقيق: محمد علي الأكوع، (بيروت: ١٩٨٣) ج١، ص ٣٨ .

(5) أبو شامة: م . س، ج١، ق ٢ ، ص ٥٣٤ . إبن الساعي: الجامع المختصر في عنوان التواريخ وعيون السير، تحقيق: مصطفى جواد، (بغداد: ١٩٣٤)، ج ٩ ، ص ٩٧ .

عەباسیەکانیش هێناو خەلیفایەتی خۆی راکەیاند[1]. لەوانەیە هەر ئەم لاقلێدانەی رەچەڵەك و شپرزەییە عەقڵیەکەی، وایان لەو میرە کوردانە کردبێت کە لە یەمەن لەگەڵی بوون لە ساڵی (٥٩٨ ك/ ١٢١١ز)دا بیکوژن[2]. نەك هەرئەمە؛ بەڵکو زۆربەی ئەیوبییەکان بەم رەچەڵەکە رازی نەبوون و لە بەدرۆ خستنەوەی ئیسماعیلدا یەکدەنگ بوون[3] . مەلیك عادلی برای سەلاحەدین لە توندترین بەرهەڵستکارانی ئەم رەچەڵەکە بوو، بۆیە ئیسماعیلی بەڕاست نەدەزانی و نامەیەکی بۆ نارد تیایدا لۆمە و سەرزەنشتی کرد و فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە سەر رەچەڵەکی راستەقینەی خۆی[4].

ئەم سەرزەنشت و لۆمەکردنە، چ لەو سەردەمە و چ دواتریش، نەبوونە رێگر لەبەردەم ئەوەی هەندێك کورد خۆیان بە رەچەڵەکی عەرەبەوە ببەستن[5]. ئەوەتە ئیبن خەلدون سەرەڕای ئەوەی ریشەیەکی فارسی ـ عەجەمی بەکورد دەدات[6]، کەچی دەڵێت گێڕانەوەی رەچەڵەکی کورد بۆ عەرەب ((قسەیەکی پەسەند بووە))[7]. ئەمە لە کاتێکدا دێت، کە مەعریفە بە کورد لە کایەی ئیسلامیدا زیادی کردبوو و دیاریکردنی ریشەیان سنوردارتر کرابوو و وا پێناسە دەکران چەشنێکی تایبەتی ناو توخمێکی گشتین و[8] زانینی مێژوویی دوودڵ بوو لەوەی بە عەرەبیان دابنێت و[1] پێی وابوو عەجەمن و

---

(1) أبو شامة: م . ن، ج١، ق ٢ ، ص ٥٣٥ . إبن خلكان: م . س، ج ٥ ، ص ٥٢٤ . إبن واصل: م . س، ج٣ ، ص ١٣٧ . المقريزي: السلوك، ج١، ص ٢٧٢ .

(2) إسماعيل: م . س، ص٤٧ .

(3) أبو شامة: م . س، ج١، ق ٢ ، ص ٥٣٤-٥٣٥ .

(4) إبن واصل: م . ن، ج ١، ص ٤ . ج٣ ، ص ١٣٧ . إبن خلكان: م . ن، ج٥ ، ص ٥٢٥ . اليونيني: م . س، ج١، ص ٣٩ . المقريزي: م . ن، ج١، ص ٢٧٢ . الحنبلي: م . س، ص ٢٧٢ .

(5) اليونيني: م . س، ج ٢ ، ص ٢٢١ . إبن بطوطة: رحلة إبن بطوطة، تحقيق: عبدالهادي التازي، (الرباط : ١٩٩٧)، ج٢، ص ١٨ .

(6) مرتضى الزبيدي: م . س، مج، ص ٤٨٤ . وله ايضا: ترويح القلوب في ذكر ملوك بني أيوب، تحقيق: صلاحالدين المنجد، (دمشق: ١٩٧١)، ص ٣٧ .

(7) تأريخ إبن خلدون: ج ٢ ، ص ٩ ، ١٨١ .

(8) العمري: التعريف، ص ٥٨ .

پێی لەسەر ئەوە دادەگرت خزمایەتیان لەگەڵ فارس زیاترە تا عەرەب[٢] و ئەم خزمایەتیە لە هاوشێوەیی زمانەکەیاندا دەردەکەوێت، جگە لەوەی، دواتریش لێکۆڵینەوە نوێکان ئەوەیان سەلماند لەڕووی ڕەگەزیشەوە خزمایەتییان هەیە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، کەچی بەشێك لە کوردەکان تا ئەم سەردەمانەی دوایش دەستیان بەم ڕەچەڵەکە عەرەبییە هەڵبەستراوەوە گرتبوو و لە تۆمارکردنی مێژووی خۆیاندا جەختیان لەوە دەکردەوە، کە بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر عەرەب[٣].

گفتوگۆی هەندێك کورد لەسەر شوناس و وەرگرتن یان وەرنەگرتنی ئەو شوناسە و یاری کردنیان بە شوناسیان بەو جۆرەی باسکرا، دەلالەت لە دووبارە بنیاتنانەوەی واقیعی کۆمەڵایەتییان دەکات، بەتایبەتی واقیعی دەسەڵاتدارەکانیان، بۆئەوەی لەگەڵ بنەمای دابەشکردن و گۆشەنیگای باوی ئەو فەزا کۆمەڵایەتیەدا بگونجێت، کە (ئوممەت - دەوڵەت)ی ئیسلامی دروستی کردبوو. خۆ بردنەوە سەر عەرەب بەرهەمی زانینێکی پەسەندە و چەسپاندنی زانینی باوی قبوڵکردن و شکۆمەندییە لەناو چوارچێوە گشتییەکەدا . سەبارەت بە کوردیش لەناوەڕۆکدا سەرمایەیەکی ڕەمزی کردەی

---

[1] أبوالفداء : م .س، ج١، ص٨٣ . إبن الوردي: م.س، ج١، ص٧٢ . إبن خلدون: تأريخ إبن خلدون، ج١، ص ١٨١ .

[2] أبوالفداء : م.ن.ص . المقريزي: المواعظ والإعتبار، ج٢، ص٢٣٢ .

[3] ئەوەی چاو بە لاپەڕەکانی کتێبی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسیدا (١٠١٠ ك/ ١٦٠١ ز مردووە) بخشێنێت، ئەوە دەبینێت کە زۆربەی میرەکانی میرنشینە کوردیەکان لافی ئەوە لێدەدەن کە ریشەیان دەچێتەوە سەر عەرەب. بڕوانە: شرفنامە، ت: محمد جميل الروژبياني، (أربيل: ٢٠٠١)، ص ٢٦٩ . ٣٢٧، ٣٤٣ ، ٤٢٩ ، ٤٤١ ، ٥١٣ ... ئەم حاڵەتە تا دوای شەرەفخانیش بەردەوام دەبێت، ئەوەتە لە سەدەی نۆزدەدا مەلا مەحمودی بایەزیدی کە مێژوونوسێکی تری کوردە (١٨٥٧ مردووە) پێ لەسەرئەوە دادەگرێت کە هەموو کورد لە عەرەبن، بەلام بەهۆی ئەوەی لە ولاتی خۆیان کۆچیانکردووە زمانەکەیان گۆڕاوە. بگەڕێوە بۆ: داب ونەریتی کوردەکان، وەرگێڕانی : شوکریە ڕەسول، (بەغداد: ١٩٨٤)، ل ١٩ .

دەسەڵاتخوازییە، چونکە ڕەچەڵەك دەسەڵاتێکی ڕەمزی نەبینراوە[١] و دەخرێتە سەر دەسەڵاتی کردەیی کەسەکە و بەمە لای خەڵك گەورە دەبێت و دانی پێدا دەنێن. ئەمەش لەبەرئەوەیە ڕەچەڵەك هۆکاری دان پیانانی شکۆ و ڕەوایەتییە و لە ئاستی ناوخۆ (واتە ئاستی کوردی) و ئاستی دەرەوەدا ( واتە کایەی ئیسلامی) شەرعیەت دەدات بە دەسەڵات و پارێزگاری مانەوەی دەکات.

بەڵام لێرەدا زۆربەی کات کاری زانینی مێژوویی لە مەراییکردندا چڕ دەبێتەوە، چونکە دروستکردنی ئەم ڕەچەڵەکە هەڵبەستراوانە، مەراییکردنە بۆ دەسەڵاتدارانی کورد و بەڵگە هێنانەوەیە بۆ ڕەچەڵەکە تازەکەیان. مەقریزیی مێژوونوس (٨٤٥ ك / ١١٤١ز مردووە) لە شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیەدا جەخت لەمە دەکاتەوە و پێی وایە ئەم گێڕانەوانە لەبارەی عەرەبایەتیی کوردەوە بریتین لە ((وتەی فەقیهەکان بۆ پاشاکان، بۆئەوەی پێگەیەك بۆخۆیان دەستەبەر بکەن))[٢].

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بەوە بکەین خۆ بردنەوە سەر عەرەب مانای بە عەرەبکردنی کورد و ئینتیمای تەواوەتی نەبووە بۆ عەرەب، بە بۆچوونی ئێمە کورد لەسەردەمی ئیسلامی کلاسیکیدا پێی وا بووە کوردێتیەکەی تەواوکەری خۆ بردنەوەیەتی بۆسەر عەرەب، ئەو لە عەرەبە، بەڵام لە (ئێستا ـ رابردوودا) کوردبوونی خۆی بەهەند دەگرێت و بەلایەوە بایەخی خۆی هەیە. باشترین گوزارشتیش لەم حاڵەتە دێڕەشیعرەکەی (فێنکی)ی شاعیرە، کە پێشتر هێنامانەوە، چونکە ئەو وا دەبینێت شانازیەکانی کورد لە باپیرانیدا دژ ناوەستێتەوە لەگەڵ شکۆمەندی عەرەب لە ڕەچەڵەکیدا[٣]. ئەمەش گوزارشتکردنە لە گۆشەنیگای کورد بۆ ریشە عەرەبییە هەڵبەستراوەکەیان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ پێدراوەکانی ئەویتردا لەبارەی ریشەیانەوە.

---

(1) لێرەدا دیسان سوود لە بۆچوونەکانی بۆردیۆ وەردەگرین. بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانەی بۆردیۆ: بعبارة أُخرى ـ محاولات بإتجاه سوسيولوجيا إنعكاسية، ت: أحمد حسان، (القاهرة: ٢٠٠٢)، ص٢٢٢

(2) المواعظ والإعتبار، ج٢، ص ٢٣٢ .

(3) عمادالدين الأصبهاني: خريدة القصر، ج٢، ص ٥٤١ .

## پاری سێیەم
## وێناکردنی سروشتی کورد لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا

### ١ـ لە خێڵایەتییەوە بۆ کۆچەرایەتی

زانینی مێژوویی ئیسلامی لە تۆمارکردنی مێژووی کۆمەڵە مرۆییەکاندا بەردەوام جەختی لە لایەنی رامیاری و کارگێڕی دەکردەوە و بەنێو وردەکاری کایە کۆمەڵایەتییەکاندا رۆ نەدەچوو، بۆیە لێکۆڵەر ناتوانێت بە پشتبەستن بەم زانینە، سروشتی کورد و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی دیاری بکات. جگە لەمە مۆرکی گێڕانەوەیی ئەم زانینە، رێگر بوو لەبەردەم تەرکیز کردنە سەر وردەکاری لایەنی کۆمەڵایەتی، کە پێویستی بە بیرکردنەوەی قووڵ و تێگەیشتنی فراوانی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە. بۆیە مێژوونوسەکان خۆیان لەم لایەنە نەداوە، تەنها ئەو بەشە کەمەیان نەبێت، کە شارەزای ئەم بابەتە بوون و ئەوانیش بە شێوەیەکی گشتی وەریان گرتووە و هەوڵیان داوە لە فەزای کۆمەڵایەتیی رەوتی رووداوەکان تێ بگەن. دیارترینیشیان مەسعودی و ئیبن خەلدونن.

لە راستیدا داواکردنی ئەوە لە مێژوونوسە موسڵمانەکان، کە بۆ لەوە نەدواون ئەمڕۆ بە مێژووی کۆمەڵایەتی ناودەبرێت، جۆرە زیادەڕەوییەکی تیایە، چونکە ئەو کاتە لە تۆمارکردنی مێژوودا، باسکردنی لایەنە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بە کەمی جێی بایەخی مێژوونوسەکان بووە و ئەم بابەتە زیاتر لە زانینی نوێدا بایەخی پێدراوە[1]. لەوانەیە بیر نەکردنەوە لەم لایەنانە بەهۆی پێگەی کۆمەڵایەتیی مێژوونوسانیشەوە بێت لە کایەی ئیسلامیدا، چونکە لەو کاتەدا کۆمەڵگەی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی لە دوو چین پێك هاتبوو[2]: چینی تایبەت، کە توانای نوسین و بیرکردنەوە و بەرهەمهێنانی

---

[1] أركون: نزعة الأنسنة في الفكر العربي ـ جيل مسكويه والتوحيدي، ت: هاشم سالح، (بيروت : ١٩٩٧)، ص ٥٧٤-٥٧٥.

[2] بڕوانە: الصابي: رسوم دار الخلافة، تحقيق: ميخائيل عواد ، (بغداد: ١٩٦٤)، ص ٢١.

رۆشنبیری و کاری رامیاری و کارگێڕی و ئاینییان هەبوو. لەگەڵ چینە رەشۆکییەکەی خەڵك، کە وەك هەندێك نوسەری[1] سەر بە چینە تایبەتەکەی ئەو سەردەمە باسیان دەکەن، بەشی زۆری کۆمەڵگە بوون و بە سەرچاوەی نەزانی و گێرەشێوێنی دادەنران و بەڵای دنیا بوون، راست و چەوتیان لەیەك جیا نەدەکردەوەو بایەخیان بە زانست و زانین نەدەدا. لێرەدا مێژوونوسەکان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە سەر بە چینە تایبەتەکەی کۆمەڵگە بوون، واتە لەڕیزی دەسەڵاتدارەکان (وەزیر و نوسەر و میر و قازی...هتد)[2] و کەسایەتییە بەرزەکاندا بوون، ئەمەش مانای ئەوەیە ـ لە هەرەمی کۆمەڵایەتیدا ـ پلەیان لە خەڵکە رەشۆکییەکە بەرزتر بووە[3].

بۆیە ئاسایی بوو هێڵێکی جیاکەرەوە هەبێت لەنێوان ئەو ناوچەیەدا، کە مێژوونوس لە چوارچێوەیدا بیردەکاتەوە، وەك لایەنە سیاسیەکان، لەگەڵ ئەو ناوچەیەدا، کە مێژوونوس لە دەرەوەی بیرکردنەوەیدا دەیهێڵێتەوە، وەك لایەنە کۆمەڵایەتییەکان. لێرەدا بەپێی ئەم دابەشکردنە کۆمەڵایەتییە، چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی ئەم بیرکردنەوەیە سنوربەند دەکات و ـ لە تۆمارکردنی مێژوودا ـ بەرەو پانتاییەکی دیاریکراو دەیبات، وەك لە دەستپێکی ئەم لێکۆڵینەوەیدا باسمان کرد. مێژوونوس لە

---

(1) بەشە هەرە زۆرەکەی کۆمەڵگە بە چینی گشتی ناودەبران «چونکە ئەوەندە زۆربوون چاو پەی پێنەدەبردن ، ئەوسەریان دیارنەبوو». الصفدي: نكث الهميان في نكت العميان، طبعه: أحمد زكي بك، (القاهرة: ١٩١١)، ص١٠.

(2) تێبینیمان هەیە لەسەر بەکارهێنانی زاراوەی چین (الطبقة) لە جیاکردنەوەی چینی تایبەت و چینی گشتیی خەڵکدا، چونکە ئەم زاراوەیە لەو سەردەمەدا ئەو واتایەی نەبووە کە ئێستا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانداو بە تایبەتیش لە زانستی کۆمەڵناسیدا هەیەتی.

(3) بڕوانە: الخوارزمي: رسائل الخوارزمي، تقديم: الشيخ نسيب وهيبة الخازن، (بيروت: ١٩٧٠)، ص ١٥٠. أبو حيان التوحيدي: الإمتاع و المؤانسة، تحقيق: أحمد أمين وأحمد الزين، (القاهرة: ١٩٥٣)، ج٢، ص ٤١. إبن الجوزي: تلبيس إبليس، (بغداد: ١٩٨٣)، ص ٣٨٨ بە دواوە. الخالدي: دراسات في تأريخ الفكر العربي الإسلامي، ط٢، (بيروت: ١٩٧٩)، ص ١٦. سەبارەت بە چینی گشتیی خەڵك، بە تایبەتی لە بەغداد، بگەڕێوە بۆ: بدري محمد (فهد): العامة ببغداد في القرن الخامس الهجري، (بغداد: ١٩٦٧)،ص١١ بە دواوە.

نەزعەی دەستەبژێرییەوە تەماشای ڕووداوەکانی دەکرد، بۆیە نیگاری ئاراستەی چینە تایبەتەکە دەکرد و چینە ڕەشۆکییەکەی پشتگوێ دەخست. ئەم حاڵەتی غایبکردنەی چینە ڕەشۆکییەکە لە مێژوودا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەندامەکانی کارای مێژوویی نین، لەڕوانگەی زانینی مێژوویی ئیسلامییەوەش - زۆربەی جار - کارای مێژوویی ئەوەیە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی هەبێت[1]، واتە سەر بە چینە تایبەتەکە بێت. جا لەبەر ئەوەی کورد بەلای هەندێك نوسەرەوە لە ئاستی چینە ڕەشۆکییەکە یاخود نزمترن[2]، لێکۆڵەر ناتوانێت لەوانەوە وێنەیەکی هەمەلایەنەی سروشت و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کوردی دەست بکەوێت. بۆیە کاری ئێمە ئەوە دەبێت لێکدان و پێکهێنانێك بکەین لەنێوان ئەوەی مێژوونوسەکان لە چوارچێوەی هەواڵەکاندا باسی دەکەن، لەگەڵ ئەوەی وڵاتناس و ئەدیب و فەیلەسوف و زاناکان لێرە و لەوێ لەبارەی سروشتی کورد لەڕووی کۆمەڵایەتی و جەستەییەوە باسیان کردووە، بۆ ئەوەی بتوانین وێنەیەکی هەمەلایەنەی ئەم سروشتە بەدەست بهێنین.

لە میانەی چاوخشاندن بە کتێبە مێژووییە ئیسلامییەکاندا، سەرەتا تێبینی ئەوە دەکرێت مۆرکی خێڵایەتی باڵی بەسەر کورددا کێشاوە و بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی ئەم ڕێکخستنە خێڵەکیەیان تێ نەپەڕاندووە[3]. بێگومان دۆزینەوەی سروشتی خێڵەکیی میللەتەکە، خۆی لە خۆیدا مانای دۆزینەوەی شێوازی ژیان و بەرهەمیانە، کە بریتییە لە پشت بەستن بە ئاژەڵداری و گەڕان بە دوای ئاو و لەوەڕگادا و جاری واش هەیە لە هەندێك ناوچەی دیاریکراودا جێگیر دەبن و پشت بەکشتوکاڵ

---

[1] سەبارەت بە غایبکردنی چینی گشتی لە مێژوودا بڕوانە: أركون: نزعة الأنسنة، ص ٥٧٨-٥٧٩. سەبارەت بە کارای مێژوویش لە ڕوانگەی زانینی مێژووییەوە سەیری بەشی سێیەمی نامەکە بکە.

[2] بڕوانە: البيان والتبين، ص ٨٦. الآبي، نثر الدرّ، حققه: منير محمد المدني، (القاهرة: ١٩٩٠)، ج٧، ص٧٢. البغدادي: الفَرق بين الفِرق، تحقيق: لجنة إحياء التراث العربي، (بيروت: ١٩٨٧)، ص٢٨٥. إبن الجوزي: المنتظم، ج٧، ٣٤٨٤.

[3] بڕوانە: المسعودي: مروج الذهب، مج١، ص٤٣٦. التنبيه والإشراف، ص٩٤. النويري: نهاية الارب، السفر الثاني، ص٢٩٠. العمري: مسالك الأبصار، ج٣، ص١٢٤ بە دواوە. المقريزي: السلوك، ج١، ص١٠١.

دەبەستن. پێکهاتەی خێڵەکی، واتە جۆرێك لە پەیوەندی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو، چ لەسەر ئاستی ناوخۆ لەنێوان ئەندامەکانی خێڵدا بێت، یان لەسەر ئاستی پەیوەندی دەرەکی نێوان خودی خێڵ و کۆمەڵەکانی تردا بێت.

کاتێك مێژوونوسەکان جەخت لە خێڵایەتیی کورد دەکەنەوە، بەمە ئەو بەها تایبەتیانەی خێڵ دەدەن بە کورد، کە وەك چەمکێکی گشتگیر لە کایەی ئیسلامیدا هەبوون. نمونەی خێڵەکیی باویش لە زانینی مێژووییدا بریتیە لە نمونەی خێڵی عەرەبی لەڕووی پێکهاتە و سیستەمی پەیوەندییەکانیەوە. ئێمە پێمان وایە سەبارەت بە کورد، جۆرە گشتاندنێکی پێکهاتەی خێڵەکی عەرەبی و سیستەمەکەی لەڕووی ریزبەندیی خێڵەکی و رەفتارەکانیەوە بەسەر کۆمەڵە خێڵەکیەکانی تردا ئەنجام دراوە و لەوانەیە خۆ بردنەوە سەر کەسێکی دیاریکراو، کە بە بابەگەورەی کۆمەڵێکی دیاریکراو دادەنرێت، یەکێك بێت لەو گشتاندنە دیارانە. بەڵگەش بۆ ئەمە بەکارهێنانی چەمك و زاراوە عەرەبیەکانە بۆ ناساندن و ناونانی شێوازی خێڵایەتیی کورد و لقەکانی، وەك قەبیلە، عەشیرەت، تایەفە، کە خەیاڵگەی کوردی دوای پابەندبوونی بەکایەی ئیسلامییەوە وەری گرتوون و بۆ ناساندن و جیاکاری لەنێوان ریزبەندییە کۆمەڵایەتی و رەفتاریەکاندا[1] لە چوارچێوەیەکی فراواندا بەکاری هێناون.

هەروەها حاڵەتێکی تری چواندنی کورد بە عەرەب، یان راستتر بە ئەعراب، بوونی جۆرێك هاوواتاییە لەنێوان ئەکراد* و ئەعرابدا. ئەمەش کاتێك دەستی پێکرد، کە ناوی (ئەعراب) بۆ ناساندنی (ئەکراد) و ناوی کورد بۆ ناساندنی عەرەب بەکار دەهات[2]، وەك باسمان کرد. ئەم هاوواتاییەی ئەکراد و ئەعراب لەو حاڵەتانەدا دەردەکەوێت، کە

---

[1] بگەڕێوە بۆ: برونەسن: ئاغاو شێخ، بەرگی یەکەم،ل٨٠-٨٣.

* لێرەدا بە ئەنقەست لە جیاتی وشەی کورد وشەی ئەکراد (الاكراد)مان داناوە، بۆ ئەوەی رووی لێکچوونەکەی لەگەڵ وشەی ئەعرابدا دیار بێت.

[2] الجاحظ: رسائل الجاحظ، ج١، ص١٠. الطبري: م.س، ج١، ص٢٤٠-٢٤١. الأصفهاني: تاريخ سني ملوك الأرض، ص١٧٣. إبن الأثير: الكامل، ج١، ص٩٨. أبو الفداء: المختصر، ج١، ص١٣.

ئەم دوو کۆمەڵە مرۆڤە لە ڕووداوێکدا بەشدار دەبن[١]، یان کاتێك هەمان سیفەت و شەقڵ و ڕەفتاری هاوبەشیان دەبێت[٢]. ئەم حاڵەتی هاوواتاییەی ئەکراد و ئەعراب تەنها لە زانینی مێژووییدا بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو لە زۆر زانینی تری ئیسلامیی وەك (فەلسەفە[٣]و جیۆگرافیا[٤]و فیقە[٥]و...هتد)دا بەرچاو دەکەوێت. کەواتە ئەم حاڵەتی لێکچوون و هاوواتاییە، گشتگیرە و لە یادەوەریی ئیسلامیدا جێی خۆی کردووەتەوە. ئەو پرۆسەیە، کە پێشتر بە پرۆسەی پێوان و بینین (القیاس والمشاهده) ناومان برد، بەڵگەی کەم و کوڕیی زانینە ئیسلامییەکانە لە بینینی جەوهەری کۆمەڵە مرۆییەکاندا، کە لەناو خۆیاندا لێك جیاوازن، بەڵام ئەم وەك یەك دەیانبینێت. ئەوەی دەبینرێت هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی بینراوی زانراو، کە دەتوانرێت لە ڕێگەی لێکچواندنەوە، وێنای ئەویتری نەزانراوی بکرێت. ئەو وێناکردنەی بۆ کورد و خێڵایەتییەکەی هەیە چەند بنەما و پێشینەیەکی خێڵەکیی هەیە و بەجۆرێك لە جۆرەکان تەحەکوم بەم وێناکردنە و میکانیزمی ئیشکردنی زانینی مێژووییەوە دەکەن وەك گشتێك.

بۆ ئەوەی زیاتر لە خێڵایەتیی کورد بگەین، پێویستە بیبەستینەوە بە ڕەهەندی شوێنەکیی ئەم پێکهاتەوە، واتە مرۆڤی کورد ببەستینەوە بەو زەویەی لەسەری دەژی (کوردستان). لەڕاستیدا ئەگەر بماوێت وێنەیەکی ڕوونی مرۆڤ و

---

(1) الطبري: م.ن، ج١٠، ص٣٧. إبن حمدون: م.س، مج٢، ص١٩٦-١٩٧. إبن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٣٣٥، ٤٤٦٥، ٤٦٤٣. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص١٦٣.

(2) إبن قتيبة: عيون الأخبار، مج٢، ص٦٣. إبن عبد ربه: العقد الفريد، ج٧-٨، ص٢٥٧. التنوخي: نشوار المحاضرة وأخبار المذاكرة، تحقيق: عبود الشالجي، (بيروت:١٩٧١)، ج١، ص ٨٩-٩٠. غرس النعمة: الهفوات، ص١٦٢. إبن حمدون: م.ن، مج٩، ص٤١٩. الذهبي: المشتبه، ج١، ص٥٤٩.

(3) أبوبكر الرازي: رسائل فلسفية، ط٢، (بيروت: ١٩٩٧)، ص٩٢.

(4) الأصطخري: المسالك والممالك، ص١١٥. إبن حوقل: صورة الأرض، ص٢٢٠-٢٤٠.

(5) الغزالي: احياء علوم الدين، ط٣، (بيروت:١٩٩١)، مج٢، ص٣٧٠-٣٧١. إبن تيمية: السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية، راجعه وحققه: علي سامي النشار وأحمد عطية، (القاهرة:١٩٥١)، ص٨٢.

کۆمەڵەکەی پێك بهێنین، ئەوا ناتوانین مرۆڤ و خاکەکەی لەیەك دابڕین. یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم پێکهاتنە خێڵەکییەی کورد، یان ئەوەی بە کۆمەڵگەی پەرت ناودەبرێت، ژینگەی جیۆگرافیی وڵاتەکەیانە، کە رێگر بووە لەبەردەم دروستبوونی خێڵێکی (نەتەوەیی ـ ئەتنی) گەورە لەم وڵاتەدا[1]. ئەمە ئەو ئاڕاستەیە، کە زانینی مێژوویی ئیسلامی لە بەستنەوەی رووداوە مرۆییەکاندا بە ژینگەی سروشتیەوە گرتبوویە بەر، چونکە لە رۆشنبیریی ئیسلامیدا، پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان زانینی مێژوویی و زانینی جیۆگرافیدا[2].

دیارە مێژوو و جیۆگرافیا لە پێکهاتە سەرەکییەکانی بوونی مرۆڤدا رەگیان داکوتاوە و وەکو دوو بواری لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن هاوشێوەن، لێکۆڵەرێك باسی ئەمە دەکات و دەڵێت: ئەم دوو لقەی زانین زۆر پشت بەیەك دەبەستن، وەك لە هەندێ دوانەی هاوواتای وەك (فەزاو زەمەن ، شوێن و رووداو) دا بەرجەستە دەبێت، هەر بۆیە لێك دابڕانی ئەم دووانەییانە ئاسان نییە[3].

بەر لەوەی باسی کاریگەری ژینگەی سروشتی بکەین لە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کورد، پێویستە ئاماژە بەمەسەلەیەکی تر بکەین، کە پەیوەستە بەم بابەتەوە و لە کاریگەری ژینگە لەسەر رووداو و میللەتەکان لە پێشترە، ئەویش مەسەلەی لکاندنی ناوی کوردە بە شوێنگەیەکی دیاریکراو لە گەردووندا، کە یەکێك لە بورجە ئاسمانییەکانە، ئەوەتە ئاماژە بەوە دەکرێت کورد لە (بورجی گا)ن[4]، بەپێی زانستی ئەستێرەناسی، ئەمە دەلالەت لەوە دەکات ئەم بورجە کاریگەریی لەسەر سیفات و نەریتی ئەم کۆمەڵە و تەنانەت لەسەر پاشەڕۆژیشیان هەیە. بە واتایەکی تر، دەتوانرێت لەڕێگەی ئەم بورجەوە، نهێنییەکانی ئەم کۆمەڵە مرۆییە ئاشکرا بکرێت و

---

(1) بروانە: شاکر (خصباك): الأکراد ـ دراسة جغرافية اثنوغرافية، (بغداد:١٩٧٢)، ص٣٤٨.

(2) بۆ ئەم پەیوەندییە بڕوانە: روزنتال: علم التأريخ، ص١٤٨-١٥٥.

(3) Kathwrine clark: between geography and history – Hellenistic construction of the roman world, (oxford: 1999), p.5.

(4) یاقوت: معجم البلدان، ج١، ص ٣٣. سبط إبن جوزي: مرآة الزمان، السفر الأول، ص ١٤١.

سروشتێکی ناسراوی پیێ بدرێت، هەروەها دەتوانرێت لەڕێگەی ئەم بورجەوە پێشبینیی چارەنوس و بەختیان بکرێت.

لەڕاستیدا ئەم پەیوەستکردنەی کورد بە (بورجی گا)وە، رەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییەیە، کە لە نێوان زانستی ئەستێرەناسی و زانینە ئیسلامییەکان و لەناویشیاندا زانینی مێژووییدا هەبوو، چونکە هەندێ جار مێژوونوسەکان لێکدانەوەی مێژووی دنیا و رووداوە جیاوازەکانیان لە ئەستێرەناس و گەردوونناسەکانەوە وەردەگرت[1]. تەنانەت هەندێك مێژوونوس باسی سەرەتای هەر سەردەمێك بە بەخت و نزیك بوونەوەی ئەستێرەکان لەیەکتر دەست پێدەکەن[2]، بۆیە لکاندنی کورد بە (بورجی گا)وە شتێکی سروشتییە، هەرچەندە لەوە ناچێت کاریگەریی ئەستێرەکان لەسەر سروشتی کورد برەوێکی باشی هەبوبێت، بە بەراورد لەگەڵ مەسەلەی کاریگەریی ژینگەی سروشتی لەسەر رەفتار و نەریتیان، کە لەلایەن مێژوونوسە گەورەکانی وەك مەسعودی و ئیبن خەلدونەوە گرنگییەکی زۆری پێ درابوو، وەك لەمەو دوا روونی دەکەینەوە.

لە نێو کولتوری ئیسلامیدا، زۆربەی بیرمەندەکان لەو باوەڕەدا بوون مرۆڤ دروستکراوی ژینگەکەیەتی و دەتوانرێت لەڕێگەی کەشف کردنی ژینگەوە پەی بە سیما سەرەکییەکانی کەسێتیی مرۆڤ ببرێت. بۆ نمونە لە روانگەی فەلسەفییەوە سروشت کار دەکاتە سەر توانای ژیریی مرۆڤ، کەسێك لە شوێنە دوورە دەستەکاندا بژی، ژیریی لاوازە و کەسێکی بەستەزمانە، بەڵام ئەو کەسەی لەناو هەرێمە ئاوەدانەکاندا دەژی، کەسێکی تێگەیشتوو و زانایە[3]. وا دیارە رۆشنبیری ئیسلامیش لەم بوارەدا سوودی لە شارستانێتییەکانی پێش خۆی وەرگرتووە، بە تایبەتی سودی لەو کولتورە یۆنانییە

---

[1] بۆ نمونە : لە بارەی ئەو قسەیەی ئەستێرەناسەکان کە ئیسلام بەسەر هەموو ئایین و شەریعەتەکاندا سەردەکەوێت بڕوانە: الأصفهاني: تاريخ سني ملوك الارض، ص ١٢٦-١٢٧.

[2] وەك: اليعقوبي: ج١، ص١٨٩. المقدسي: البدء والتاريخ، ج٢، ص١٥٥.

[3] مسكويه: تهذيب الأخلاق وتطهير الاعراق، حققه وشرحه: إبن الخطيب، (مصر: د.ت)، ص٥٧. إبن رشد: الضروري في السياسة ـ مختصر كتاب السياسة لأفلاطون، ت: أحمد شحلان، (بيروت: ١٩٩٨)، ص٨٣.

وەرگرتووە، کە هێنرا بوویە ناو کایەی ئیسلامییەوە[١]. فەیلەسوف و بیرمەندەکانی یۆنان باوەڕێکی پتەویان بەوە هەبووە ژینگە کاریگەریی لەسەر ڕەوشت و پێکهاتەی جەستەیی مرۆڤ هەیە، ئەوان بە وردبوونەوە لە بارودۆخی جیۆگرافی و کەش و هەوا، مێژوو و گۆڕانی ڕووداوە مێژووییەکانیان لێك دەدایەوە[٢].

جیۆگرافیناسەکان زەوییان بەسەر حەوت هەرێمدا دابەش کردبوو، وڵاتی کورد دەکەوتە ناو هەرێمی چوارەم و کەنارەکانی هەرێمی سێیەم و پێنجەمەوە[٣]. هەرێمی چوارەم دەکەوێتە نێوان ناوچە سارد و گەرمەکانەوە و بە باشترین هەرێم دادەنرێت و ئاو و هەواکەی مامناوەندییە[٤]. ئیبن خەلدونیش جەخت لەمە دەکاتەوە و هەرێمی چوارەم بە باشترین هەرێم دادەنێت، چونکە کەنارەکانی دەکەونە ناو هەرێمەکانی سێیەم و پێنجەمەوە و لە مامناوەندێتییەوە نزیکە و دەڵێت: ((دانیشتوانەکەشی باشترین جەستە و ڕەنگ و ڕوویان هەیە و زۆر ئایینداران))[٥]. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هەموو دانیشتوانی ئەم ناوچانە خاوەنی هەمان سیفەتن، زۆربەی ئەم ناوچانە پیت و فەڕیان تیا نییە و دانیشتوانەکەشی خۆشگوزەران نین[٦]، چونکە هەندێك بەشی ئەم ناوچانە بیابانە، وەك (وڵاتی عەرەب) و هەندێ ناوچەی تریشی شاخاوییە، وەك (وڵاتی کورد)،

---

[1] روزنتال: م.س، ص١٥٤.

[2] لەبارەی پەیوەندی جیۆگرافیا بە مێژووەوە، بە تایبەتی لە کولتوری یۆنانی - هیلینیدا، بگەڕێوە بۆ: Clark: op. cit

[3] المقدسي: م.س، ج٢، ص٤-٥. الادريسي: نزهة المشتاق في اختراق الافاق، (د.م.ت)، ص٢٢٨-٢٤١، ٢٨٥. بە گواستنەوە لەم سەرچاوەیە، بڕوانە: ابن خلدون: المقدمة، ص٥٠-٦١. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەوەی کە وڵاتناسەکان سەبارەت بە شوێنی وڵاتی کورد لەنێوان حەوت هەرێمەکەدا دەیڵێن، بگەڕێوە بۆ: مام بكر: الكرد وبلادهم، ص٨١-٨٢.

[4] ((بارودۆخی هەرێمی چوارەم لە هەموو هەرێمەکان پەسەندترەو دانیشتوانەکەی خاوەنی کۆمەڵێك شکۆمەندی و چاکەو پیاوەتین کە بەهۆیانەوە لەوانیتر جیادەبنەوە...)). المسعودي: التنبيه والإشراف، ص٤٨.

[5] المقدمة: ص٦٥.

[6] م.ن، ص٦٩.

زۆربەی ئەو هەرێمانەی ئەم وڵاتەی بەسەردا دابەش بووە چیای بەرز و سەختی لێیە، وەك: هەرێمی چیا[١]، هەرێمی ئازەربایجان[٢]، جەزیرە[٣]، بۆیە چیاکان بوونەتە ژینگەی کورد و تیایاندا کۆ بوونەوە[٤]. هەندێ مێژوونوس بایەخ بە کاریگەریی ئەم مۆرکە چیاییە دەدەن لەسەر پێکهاتەی جەستەیی و دەروونیی میللەتەکە، کە بووەتە هۆی ئەوەی مرۆڤی کورد ((زۆر دڵڕەق بێت))[٥]، چونکە وەك مەسعودی دەڵێت بەهۆی ئەوەی وڵاتەکەیان پێکهاتەیەکی سەختی هەیە ((جەستەی مرۆڤ زبر و بەهێز دەکات، تێگەیشتن لاواز دەکات و نایهێڵێت و خەون و هیواو ئاوات لەناو دەبات))[٦]، ڕەوشتی کورد و خەڵکی چیاکان بەگشتی لەگەڵ ناوچەکانیان تەبایە، کە بەرزو نزمیی تێدایە، ئەمانە بەوە دەناسرێنەوە ڕەفتاریان وشکە و توند و تیژن[٧].

ناتوانرێت لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا کورد لە چیا داببڕێت، چیا سیماکانی کەسایەتییان دیاری دەکات و کاریگەریی لەسەر ڕەفتاریان هەیە، بۆیە سروشتییە سیفەتی شاخاویبوون بدرێتە پاڵیان و بەوە بناسرێن سروشتێکی شاخاوییان هەیە و زانینی مێژوویش لەم ڕوانگەوە بۆچوونەکانی خۆی لەبارەیانەوە داڕێژێت. بیرۆکەی کاریگەریی سروشت لەسەر مرۆڤ لە قاڵبە ئیسلامییەکەیدا، کرۆکە یۆنانییەکەی خۆی پاراستبوو، کە تەماشاکردنی ئەوانی ترە بە چاوێکی سووك. چونکە لای یۆنانییەکان جەختکردنەوە لە کاریگەریی سروشت لەسەر مرۆڤ بەو مەبەستە بوو خۆیان لە میللەتە

---

(1) إبن حوقل: صورة الأرض، ص٣١٥.

(2) م.ن، ص٢٨٨.

(3) سوادي (عبد محمد): الأحوال الإجتماعية والإقتصادية في بلاد الجزيرة الفراتية، (بغداد: ١٩٨٩)، ص٣٧٥.

(4) الجاحظ: البيان والتبين، ج١، ص٨٦. أبو حنيفة الدينوري: الأخبار الاطول، ص٣٠. ياقوت: معجم البلدان، ج١، ص٣٣. الذهبي: المشتبه، ج١، ص٥٤٩. العمري: مسالك الأبصار، ج٣، ص١٢٤.

(5) اليعقوبي: البلدان، ص٦.

(6) مروج النهب، مج١، ص٣٨١.

(7) م.ن، مج١، ص٤٣٣.

((نەزان)) و ((بەربەرییەکان)) جیا بکەنەوە، بەوەی تەنها خۆیان خاوەنی شارستانیەتن[1].
زانینی ئیسلامیش بۆچوونی خۆی سەبارەت بە خود و ئەویتر ، لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا گونجاندبوو. مەسعودییش لەم گۆشەنیگا سەراپاگیرەوە، کە مەبەست لێی، پێدانی سروستێکی نەگۆڕە بە کۆمەڵە مرۆییەکان، جەخت لە کاریگەریی ژینگە لەسەر کورد دەکاتەوە. ئەم بۆچوونە ئەوەندەی بۆ چەسپاندنی دیالێکتیکی (ئێمە)و (ئەویتر)ە، ئەوەندە بۆ وەسفکردنی دیاردەکان نییە وەك خۆیان[2]. لەم روانگەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت مەبەست لە لکاندنی کورد بە چیاوە و کاریگەریی چیا لەسەر سروشتیان ئەوەیە، کە هەندێك مێژوونوس لەکاتی باسکردنی ریشەی کوردا بەڕاشکاوی دەریان بڕیوە و باس لەوە دەکەن کورد لە عەرەب بن یان لە فارس یان لە هەر ریشەیەکی تر بن، نیشتەجێی چیاکانن و لە شار و ئاوەدانی و میللەتە خاوەن شارستانیەتەکان دوور کەوتوونەتەوە[3]، واتە ئەوانە هەر لە یەکەم دروستبوونیانەوە کۆمەڵە مرۆڤێکی ناشارستانین، چونکە بەپێی گێڕانەوەکان، ناچاربوون چیاکان هەڵبژێرن و تیایاندا نیشتەجێ بن و لە شار و ئاوەدانی نزیك نەبنەوە.

لەبەر ئەوەی کورد شارستانی نین، بەپێی لۆجیکی دوالیزمە لێکدژەکان، دەبێت سەر بە کۆمەڵگەی کۆچەری بن، هەر لەبەر ئەمەشە لەڕیزی میللەتە کۆچەرەکاندا پۆلێن دەکرێت. مەسعودی یەکەم کەسە مەسەلەی کۆچەرایەتیی کوردی وروژاندووە، ئەو بە راشکاوی کۆچەری و دانیشتووانی چیاکانی بە یەك واتا بەکار دەهێنا و کوردی بە یەکێك لەو نەتەوانە دادەنا، کە مۆرکێکی کۆچەریانەیان هەیە[4].

---

[1] حسين (مؤنس): الحضارة ـ دراسة في اصول وعوامل قيامها وتطورها، ط٢، (الكويت:١٩٩٨)، ص٣١٨.

[2] بڕوانە: ابراهيم: المركزية الإسلامية، ص٦٠-٦١. سەبارەت بە رەخنە لە تیۆریی کاریگەریی رەهای ژینگە لەسەر مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی، بڕوانە: مؤنس م.ن، ص٣١-٤٣.

[3] إبن قتيبة: المعارف، ص٢٧. ابو حنيفة الدينوري: م.س، ص٥. المسعودي: مروج الذهب، مج١، ص٤٣٦. ابن نباتة: سرح العيون، ص٧٦.

[4] مروج، مج١، ص٤٣١. التنبيه والإشراف، ص٩٥. هەروەها بڕوانە: الغزالي: م.س، مج٢، ص٣٧٠-٣٧١.

ئەم مێژوونوسە وا دەبینێت کورد و دانیشتوانی چیاکان، بەهۆی کاریگەریی ژینگەکەیانەوە، کۆچەرین و زۆر لە عەرەب وشکتر و توند و تیژترن[١]. کۆچەرایەتیش بە واتا تەسکەکەی، بریتییە لە کۆچکردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەدوای لەوەڕگادا[٢]. ئەم پێناسەیە ئەوەمان بۆ ئاسان دەکات، کە بۆچی مەسعودی و کەسانی تریش کوردیان بە کۆچەر داناوە، دیارە زۆربەی کورد بە شێوەی کۆمەڵی شوانکارەیی کۆچەر و نیمچە کۆچەر ژیاون، ئەمەش بەروونی لەنەخشەکەی هەرێمی چیای ئیبن حەوقەلی نسێبینیدا (٣٦٧ك/٩٧٧ز مردووە) دەردەکەوێت، تیایدا بەشێکی زۆری ڕۆژئاوای هەرێمەکە وەك شوێنی گەرمیان و کوێستانی کوردەکان دەستنیشان کراوە[٣]. هەروەها دەگوترێت خێڵە کوردەکانی شارەزووریش کۆچەر بوون و ئەم ناوچەیە ((زستانە هەواری شەست هەزارماڵی خێڵە جیاوازەکانی کورد بووە))[٤]. جگە لەمانە ئەو ناوچەیەی دەکەوتە نێوان هەرێمی عێراق و هەرێمی چیا زۆربەی دانیشتوانەکەی کورد و عەرەب بوون و کردبوویان بە لەوەڕگای ئاژەڵەکانیان[٥]. بەهەمان شێوە لە هەرێمی جەزیرەش کوردەکانی دەوروبەری موسڵ گەرمیان و کوێستانیان دەکرد[٦] و ناوچەی نێوان زێی گەورە و زێی بچوك زستانە هەواریان بوو[٧]. کوردەکانی هەرێمی ئازەربایجانیش، کە هەزبانییەکان[٨] گەورەترین خێڵ بوون تیایدا، لە ناوچەکەدا گەرمیان

---

[1] مروج، ص٤٣٧.

[2] فون (فسمان): تأريخ أصل البداوة من وجهة الجغرافية، دائرة المعارف الإسلامية، مج٦، ص٤٣٧.

[3] صورة الأرض ، ص٣٠٥.

[4] الرسالة الثانية، ص١٠.

[5] الاصطخري: م.س، ص٨٧.

[6] إبن حوقل: م.ن، ص١٩٥.

[7] م.ن، ص٢٠٣، ٢٠٥.

[8] هەزبانی: لە خێڵە ناسراوەکانی سەردەمی ئیسلامی کلاسیکین، لە زۆربەی شارو هەرێمەکانی وەك هەرێمی جەزیرەو شاری هەولێرو دەوروبەری و هەرێمی ئازەربایجاندا بڵاوبووبوونەوە. زۆر تیرەیان هەبوو کە بەناوبانگترینیان ڕەوادی و شەددادی بوون. بگەڕێوە بۆ: النقشبندي: أذربيجان، ◄◄

و کوێستانیان دەکرد[1]. هەروەها ئاماژە بۆ ئەوەش دەکرێت کوردەکانی هەرێمی فارس وەك عەرەب و بەربەرەکان گەرمیان و کوێستانیان دەکرد[2]. بێگومان هەموو ئەمانە وایان لە مەسعودی و کەسانی تریش کردبوو کورد بە یەکێك لە میللەتە کۆچەرەکان دابنێن.

واتای کۆچەر و دانانی کورد بەکۆچەر، لای ئیبن خەلدون روونترە. بەڵام سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین واتای کۆچەرایەتی (البداوة) لای ئەم مێژوونوسە، جیاوازە لەو واتایەی ئەمرۆ کۆچەرایەتی هەیەتی و لکاندنی حاڵەتی کۆچەرییە بە بیابانەوە. لای ئیبن خەلدون چەمکی کۆچەری زۆر لەمە فراوانترو گشتگیرترە، بەجۆرێك کۆچەری لای ئەو لە کەنار و دەوروبەر و چیاو لەوەڕگا و چۆڵەوانی و لاپاڵەکاندا دەبێت[3]. لە کۆمەڵگە چیانشینەکانی وەك کۆمەڵگەی کوردیشدا، دەمارگیری خێڵایەتی، کە دروشمی کۆچەرایەتییە[4] هەمان ئەو رۆڵە دەبینێت، کە لە کۆمەڵگە بیابانشینەکاندا هەیەتی، هەردوو لایان وەك یەك بە دەمارگیرییەوە جۆش دراون، چونکە سەختیی ناوچە شاخاویەکان و بەربەستە سروشتییەکانی، وایان کردووە دەوڵەت ـ ناوەند بە ئاسانی دەستی پێیان ڕانەگات و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی دەماگیری لەناویاندا بەهێز بێت[5].

هەرچۆنێك بێت، ئیبن خەلدون کورد بە کۆچەر (البدو) دادەنێت و[6]پێی وایە هەمان سیفەتی نەتەوە و کۆمەڵە کۆچەرەکانی هەیە. لای ئەو یەکێك لە سیما دیارەکانی

---

◄◄ ص١٠٩-١١٧. أحمد عبدالعزيز (محمود): الامارة الهذبانية الكردية في أذربيجان واربيل والجزيرة الفراتية، (اربيل:٢٠٠٢).

(1) إبن حوقل: م.س، ص٢٨٩.

(2) الأصطخري: م.س، ص٩٩.

(3) المقدمة، ص٣٢.

(4) بۆ نموونە بڕوانە: م.ن، ص١٠١، ٢٣٠.

(5) علي (او مليل): مصادر التنظير عند إبن خلدون، مجلة الفكر العربي، (بيروت: ١٩٨٠)، ع (١٦)، السنة الثالثة، ص٧٢.

(6) المقدمة: ص٩٧، ١١٥، ٢١٤.

کۆچەر ئەوەیە بەردەوام لە گەڕان و سوڕانەوەدان، بۆ گوزەرانی خۆیان پشت بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵ دەبەستن، لە رەشماڵدا نیشتەجێ دەبن، یان لە بەرد و قوڕ خانوو دروست دەکەن، لەناوماڵیشدا تەنها ئەو کەلوپەلانەیان هەیە، کە زۆر پێویستن[١]. لای ئەم بیرمەندە سێ جۆر سیستەمی کۆچەری هەن، جۆری سێیەمیان پشت بە حوشتر بەخێوکردن دەبەستن، ئەمانە زۆر کێوین و ((بەلای شارنشینەکانەوە وەك درِندەن و کەس پێیان ناوێرێت))[٢]، عەرەب و بەربەر و کورد و تورکمان لەم جۆرەن.

تێبینیی ئێمە لەسەر ئەوەی ئیبن خەلدون دەیلێت ئەوەیە، کورد بایەخی بە حوشتر نەداوە تا ببێتە ناونیشان بۆ کۆچەرایەتییەکەی، هیچ دەقێکمان نییە باسی ئەوە بکات، ئەگەر لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکیشدا بێت، ئەم میللەتە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا حوشتری بەخێو کردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێ لە وڵاتناسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کورد حوشتریان زۆر کەمبووە[٣]، بێگومان ئەمەش پەیوەندیی بە سروشتی وڵاتەکەیانەوە هەیە. ئیبن خەلدونیش بە زیرەکیی خۆی هەستی بەمە کردووە، بۆیە دواتر دەگەڕێتەوە سەر بابەتەکە و دەڵێت لەنێوان ئەم نەتەوانەدا عەرەب لە هەموویان کۆچەریترن، چونکە ئەمان تەنها پشت بە حوشتر بەخێوکردن دەبەستن، بەڵام ئەوانیتر جگە لە حوشتر پشت بە مەڕ و ماڵات و مانگاش دەبەستن[٤]. لەلایەکی ترەوە ئیبن خەلدون پێی وایە ئەم جۆرە کۆچەریانە بۆ گوزەرانیان تەنها پشت بە ئاژەڵداری دەبەستن، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەوە بسەلمێنین هەموو کورد خەریکی ئاژەڵداری بوون، بەڵکو زۆر کورد هەن خەریکی کشتوکاڵ بوون، چونکە لەنێوان چیاکانی ناوچە کوردییەکاندا دەشتی بەپیت هەیە بۆ کشتوکاڵ کردن دەست دەدات[٥]. تەنانەت

---

[1] م.ن، ص٩٥-٩٦.

[2] م.ن، ص٩٦-٩٧.

[3] الأصطخري: م.س، ص١١٥. إبن حوقل:م.س، ص٢٤٠.

[4] المقدمة: ص٩٧.

[5] بۆ چالاکیی کشتوکاڵی لە هەرێمە جیاوازەکانی وڵاتی کورددا بگەڕێوە بۆ: عبد محمد: م.س، ص١٢١-١٢٣. محمود: م.س، ص١٤٠-١٤٤. بشير: الأحوال السياسية والإجتماعية، ص١١٩-١٢٣. توفيق: كردستان، ص٢٩٢-٢٩٩.

هەندێك خێڵی کۆچەر لەپاڵ ئاژەڵداری و راوکردندا کشتوکاڵیشیان دەکرد، گەڕیدەیەك لەبارەی خێڵەکانی شارەزوورەوە دەڵێت: ((لەوێدا زۆر کێڵگەی کشتوکاڵییان هەبوو))[1]، بەڵام بەو چەمکەی لای ئیبن خەلدون بۆ کۆچەری هەبوو، ئەمە سیفەتی کۆچەرییان لێ داناماڵێت، چونکە بە رای وی کشتوکاڵکردنیش بەشێك بووە لە گوزەرانی کۆچەر، ئەگەرچی تەنها کەسە لاواز و بێدەسەڵاتەکان دەیان کرد[2].

بەم جۆرە دەبینین دووان لە بەناوبانگترین رەمزەکانی زانینی مێژوویی، مەسعودی و ئیبن خەلدون، کاریان لەسەر ناساندنی سروشتی کورد کردووە و هەوڵیان داوە کورد بناسن و وێنەیەکی پێ بدەن لەڕووی سیما گشتییەکانیەوە لە کۆچەر ـ بەدو بچێت بە واتای تەسکی وشەکە. کاری ئەم زانینە مێژووییە و گەڕان بەدوای ریشەکانی ئەم کۆمەڵە مرۆڤەدا و هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنیان بەپێی ئەوانی تر، بەتایبەتی عەرەب، لای ئیبن خەلدون بەڵگەن لەسەر ئەوەی کورد کۆچەرە یان سیفەتی کۆچەری هەیە و پێی وایە دەتوانرێت لە ریزی ئەو نەتەوە کۆچەرییانەدا پۆلێن بکرێت، کە گرنگیی بە لێکۆڵینەوەیان داوە، واتە پێی وایە دەشێ تیۆرەکانی لەبارەی ئەم نەتەوانە و رۆڵی مێژووییان، کوردیش بگرێتەوە، وەك لە جێگایەکی تری ئەم نامەیەدا زیاتر روونی دەکەینەوە.

### ٢ ـ رەفتاری کۆمەڵایەتیی کورد ـ رێگری وەك نمونەیەك

مێژوونوسەکان بە شێوای هەندێك سیمای بونیادی کۆمەڵایەتیی کوردیان دیاری کردووە و تیشکێکی کزیان ئاڕاستە کردووە، ئەمەش یارمەتیمان نادات بۆ بینینی رەهەندە جیاوازەکانی ئەم بونیادە. بۆیە ناتوانین بە ئاسانی لە دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم بونیادە بکۆڵینەوە. بەڵام ئەمە مانای نائومێدبوون نییە لە زانینی مێژوویی ئیسلامی، چونکە ئەم زانینە و زانینە ئیسلامییەکانی تر هەندێ رەفتاری کوردیان دیاری کردووە و ئەم دیاریکردنە لەچوارچێوەی گشتیی ئەم زانینانە، بە تایبەتی زانینی مێژوویی دەر نەچووبوو، چونکە زانینی مێژوویی بە سروشتی خۆی

---

(1) الرسالة الثانية: ص١٠.

(2) المقدمة: ص٣١٢-٣١٣.

چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێت لە دیاریکردنی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی میللەت و کۆمەڵە جیاوازەکاندا قوڵ ببێتەوە یان بە فراوانی باسی بکات.

ڕێگری وەك ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتیی کورد، سەرنجی زانینە ئیسلامییە جیاوازەکانی ڕاکێشاوە و لێیان کۆڵیوەتەوە و لێکدانەوەی جیاوازیان هەبووە بۆی. لە ڕاستیدا ئەگەر زیادەڕەوی نەبێت، توێژەر دەتوانێت مێژوویەکی دوور و درێژ لەسەر ئەم ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەی کورد بنوسێتەوە، بێ ئەوەی ئەمە کار بکاتە سەر بەدوادا چوونی ((بوون))ی کورد لە مێژووی سەردەمی ئیسلامی کلاسیکیدا، وەك لە بەشی دواتردا باسی دەکەین. ڕێگری لای کورد لەسەروو هەموو قۆناغە مێژووییەکانەوەیە و مێژوونوسەکان لە سەردەمە جیاوازەکاندا جەختیان لەم ڕەفتارەی کورد کردووەتەوە.

ئەم مێژووی ڕێگرییە، لە ڕووە ئیسلامییەکەیدا لە زۆر کۆنەوە دەستی پێکردووە، بەلایەنی کەمەوە لەسەردەمی ئەمەویەکانەوە هەبووە، چونکە لەوسەردەمەدا هەندێك کورد سەرانەی ڕێگایان وەردەگرت[1]. لە سەردەمی عەباسیشدا هەر لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوون و هەوڵە ڕێگرییەکانیان چڕتر کردەوە[2]، دەسەڵاتی فەرمیش نەیدەتوانی بەرەنگاریان ببێتەوە، بۆیە دەستیان بەسەر پارەیەکی زۆری بازرگانەکاندا دەگرت[3]. تەنانەت ڕێیان لە کاروانی حاجیەکانیش دەگرت[4]. ئەو کاتانەش دەسەڵات بە بارودۆخێکی خراپدا تێ دەپەڕی، بە تایبەتی لە سەدەی چواری کۆچی/دەی زاییندا، چالاکییەکانیان لەم بوارەدا زیادی دەکرد و دەبووە واقیعێکی سەپێنراو بەسەر

---

[1] إبن سعد ، الطبقات الكبرى، ج٥، ص٣٩٢.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: المسعودي: التنبيه والاشراف، ص٣٢٤. الاصبهاني: كتاب الأغاني، ط٢، (بيروت: ١٩٩٧)، ج٩، ص٧٥. القرطبـي: صلة، ص١٢٧-١٢٨. إبن حمدون: التذكرة، مج٢، ص٤٦٠. إبن خلكان: وفيات، مج٤، ص٧٥.

[3] الصولي: اخبار الراضي بالله والمتقي لله، حققه: ج. هيورث دن، ط٢، (بيروت: ١٩٧٩)، ص١٩٢-١٩٣. ابن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص٢١-٣٩.

[4] أبو بكر الخوارزمي: رسائل، ص١٠٠. مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص٢٠٣.

دەوڵەتدا[1]. تەنانەت هەندێ لەو ڕێگرە کوردانە توانیبوویان قەوارەی سیاسی بۆ خۆیان دروست بکەن[2]. لەم سەردەمە و سەردەمەکانی دواتریشدا ئەم کۆمەڵە کوردییانە لەسەر ئەم ڕەفتارە بەردەوام بوون، واتە خەریکی ڕێگری و تاڵان و بڕۆ و ترساندنی ڕێبوارەکان بوون[3].

هەموو ئەمانە وامان لێ دەکەن بڵێین، بەپێی زانینی مێژوویی، سروشتی کورد زۆر بە کەمی دەگۆڕێت، ئەم کۆمەڵە مرۆڤە جەوهەرێکی نەگۆڕیان هەیە، کە مۆرکێکی تایبەتیان دەداتێ ، بێگومان ئەم مۆرکە بەم واتایە جۆرە بەشتکردنێکی کوردە، کە توانای گۆڕان و پەرەسەندنیان لێ دادەماڵێت. لای هەندێك نوسەر ڕێگری بووە بە پەندێکی با و وەك نمونە دەهێنرایەوە[4]، ئەمانە بەو ڕێگرییەیان بووبوونە بەڵای وڵات ((لەسەر زەوی خراپەیان بڵاو دەکردەوە...خواش یارمەتی فەرمانڕەواکانی نەدا بوو سەرکوتیان بکەن و ڕایان بگرن))[5].

یاقوت حەمەوی کاتێك بە شارەزووردا تێپەڕ دەبێت، گوزارشت لەم جەوهەرە نەگۆڕەی کورد دەکات، ئەویش کاتێك باس لە خراپیی بارودۆخی ئەم وڵاتە دەکات لەڕووی دەسەڵات و کارگێڕییەوە، بە ڕاشکاوی ئاماژە بەم سروشتە چەسپاو و نەگۆڕەی کورد دەکات و دەڵێت: ((بەڵام کورد لە چیاکانی ئەم ناوچانەدا لەسەر نەریتی خۆیان بەردەوامن، کە ترساندنی خەڵك وپارە وەرگرتن و دزییە))، پاشان هۆکاری ئەمە باس

---

(1) التنوخي: الفرج بعد الشدة، ج٢، ص١٠٧. مسكويه: م.ن، ج٢، ص٢٨١. إبن حمدون: م.ن، مج١، ص٤٦٤. هەروەها بگەڕێوە بۆ: آدم (متز): الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري، ت: محمد عبدالهادي ابو ريدة، ط٤، (بيروت: ١٩٦٧)، مج٢، ص٤٠٠.

(2) الفارقي: تأريخ الفارقي، تحقيق: بدوي عبداللطيف عوض، (القاهرة: ١٩٥٩)، ص٥٠-٥١.

(3) بۆ نمونە بگەڕێوە بۆ: مسعود بن نامدار: فصول من تاريخ الباب وشيروان، اعتنى بنشرها: مينورسكي، (كامبردج: ١٩٥٨)،ص١١، ٢٤. ابن جبير: رحلة ابن جبر، (بيروت: ١٩٦٨)، ص١٩٢-١٩٣. ابن الأثير: الكامل، (حوادث سنة ٦٢٤هـ). ابن الساعي: الجامع المختصر، ج٩، ص١٥. العمري: التعريف، ص٥٩-٦٠.

(4) ابو بكر الخوارزمي: م.س، ص١٠٠.

(5) ابن جبير: م.ن، ص.

دەکات و دەڵێت: ((ئەمە سروشتی کوردە و پێی ناسراون و وەك مۆرێکە بە ناوچاوانیانەوە))[١].

هەر ئەم ڕێگرییە وای لە هەندێك شاعیر کردووە شیعری داشۆرین لەسەر کورد بڵێن و بە کەسانی ناپاك ناویان بەرن[٢]، یان بە کەسانێکیان دابنێن، کە کاریان ناپاکی کردنە[٣]. تەنانەت وڵاتی کورد لای شاعیری عاشق وەك تەحەددایەکە و ئامادەیە لە پێناو بینینی یارەکەیدا، بەو چیایانەدا بڕوات کوردیان تێدایە[٤]. لێرەوە مێژوونوسەکان لەبارەی ڕێگریی کورد و تاڵان و بڕۆکانیەوە زۆر حیکایەتیان دەگێڕایەوە[٥]، حیکایەت هەیە لەبارەی کوردێکەوەیە، کە ڕێگرەو دوایی تەوبە دەکات و پەشیمان دەبێتەوە[٦]. بێگومان ئەم حیکایەتە بۆ ئەوەیە کەسانی تر چاوی لێ بکەن. تەنانەت هەندێکیان زۆر بە زیادەڕۆییەوە باسی کورد و ڕێگری دەکەن و ئەو ئایەتە دەگۆڕن لەسەر ئەعراب هاتووەتە خوارەوە و دەفەرمویت ﴿الأعراب اشد کفرا ونفاقا﴾[٧]ئەوان بە ((الأکراد اشد

---

[1] معجم البلدان: ج٣، ص٣٧٦.

[2] ابن قتيبة: المعارف، ص١٨٥. البلاذري: انساب الاشراف، ج٤، ص٢٧٣. المقدسي: البدء والتاريخ ، ج٢، ص١٨٦-١٨٧.

[3] عماد الدين الاصبهاني: خريدة القصر وجريدة العصر، حققه وشرحه: محمد بهجة الاثري، (بغداد: ١٩٧٣)، ج٤، مج٢، ص٥٣٥.

[4] ولـو اصبحت بنت القطاي دونها　　　جبال بها الأكراد صم صخورها
لباشرت ثوب الخوف حتى ازورها　　　بنفس اذا كانت بأرض تزورها

واتاکەی ئەوەیە: ئەگەر ئەو شاخانەی کە کوردیان لێیەو سەخت و بەرداوین لەبەردەم ئەو شوێنەدا بن کە یارەکەمی لێیە، ئەوا بەرگی ترس دەپۆشم و سەردانی دەکەم.

[5] المقريزي: نحل عبر النحل، دراسة و تحقيق: عبدالمجيد الدياب، (القاهرة:١٩٩٧)، ص٥٤. هەروەها بڕوانە: ابن الجوزي: اخبار الأذكياء، حققه: محمد مرسي الخولي، (القاهرة: ١٩٧٠)، ص١١٥-١١٦.

[6] موفق الدين المقدسي: كتاب التوابين، حققه: عبدالقادر الأرناؤوط، (بغداد:١٩٨٩)، ص٢٢٢-٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة في الدولة الظاهرية، تحقيق: وليم برينر، (بيركلي: د.ت)، ص٢٣١-٢٣٢.

[7] سورة التوبة: الآية (٩٦)

کفرا ونفاقا))[1]دەیخوێننەوە، چونکە بەلای ئەو توندڕەوانەوە کورد وەکو ئەعرابن و کاریان ڕێگرییە[2].

بێگومان لێرەدا خەیاڵگەی کۆمەڵایەتی، ئەم ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەی تایەفە کوردییەکان لێك دەداتەوە و کار لەسەرئەوە دەکات مەعقولیەت بدات بە لێکدانەوەکەی و بەمەش بەردەوامی بدات بە گۆڕینی ئایەتە قورئانیەکە[3]. ئەم خەیاڵگەیە وا نابینێت بە گۆڕینی ئەو ئایەتە قورئانیە کوفری کردووە یان لە دین دەرچووە، چونکە متمانەی بە چونیەکیی ئەکراد و ئەعراب هەیە، بەوەی ڕەفتاری کۆمەڵایەتییان وەك یەکەو ئەمەش وا دەکات هاوواتایی ئەم دوانە پەسەند بێت. کاتێك ئەم خەیاڵگەیە ناوی ئەکراد دەخاتە شوێنی ناوی ئەعراب، مەبەستی لەم کارە گۆڕینی ئایەتە قورئانیەکە نییە، بەڵکو دەیەوێت جەخت لە هاوواتایی و چونیەکیی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی ئەم دوو کۆمەڵە بکاتەوە، بەتایبەتی لە ڕێگریدا. واتە، لە لایەکەوە دەیەوێت بڕیارێك لەسەر کورد بدات و ئەم بڕیارە وەك ئەو بڕیارە بێت، کە لە ئەسڵدا لەسەر ئەعراب دراوە، لە لایەکی تریشەوە ئەم بڕیارە و گۆڕینی ئایەتەکە لەخۆوە نەهاتووە، بەڵکو پاڵپشتی شەرعیی خۆی هەیە، ئەم پاڵپشتە بۆ گۆڕینی ئایەتەکە نییە، بەڵکو بۆ پڕۆتستۆ کردنی ڕێگرییە، کە ڕەفتارێکی خراپە، وەك لە چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیەدا لای فوقەهاکان دەیبینین.

فەقیهەکان دەڵێن ئەوانەی ڕێگری دەکەن و چەك بەڕووی ڕێبواردا بەرز دەکەنەوە و دەست بەسەر پارەو سامانیاندا دەگرن و خەڵك دەکوژن، قورئان بە

---

[1] الآبي : م.س، ج٧، ص٣٧٩-٣٨٠. ابن حمدون: م.س، مج٩، ص٤١٩. ياقوت: معجم البلدان، ج٣، ص٣٧٦.

[2] ابن حمدون: م.ن، ص.

[3] گۆڕینی ئایەتە قورئانیەکە، بەلایەنی کەمەوە لە سەدەی پێنجەمەوە کە (الآبي)(٤٢١ك/١٠٣٠ مردووە) تیایدا ژیاوە تا سەدەی حەوت کە یاقوت حەمەوی (٦٢٦ك/١٢٢٩) تیایدا ژیاوە بەردەوامبووە.

شەڕخواز[1]ناویان دەبات، وەك لە سورەتی (المائدة) هاتووە: ﴿انما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الأرض فسادا ان يقتلوا او يصلبوا او تقطع ايديهم وارجلهم من خلاف او ينفوا من الأرض﴾[2] واتە: ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەر دەکەن و لەسەر زەویدا خراپە دەکەن، دەبێ بکوژرێن یان لەدار بدرێن یاخود راست و چەپ دەست و قاچیان ببڕرێت، یان نەفی بکرێن. بەپێی لێکدانەوەی فوقەهاکان ئەم حوکمە قورئانیە لەسەر رێگرەکانە، ئەمەش رێی بۆ مێژوونوسەکان خۆش کرد تەرکیز بکەنە سەر رێگری لای کورد، بەو پێیەی ئەمە دیاریکردنی رەفتارێکە پێچەوانەی بنەماکانی عەقیدەی ئیسلامییە، لەسەر زانینی مێژوویی پابەند بەم عەقیدەوە پێویست بوو هەواڵی رێگرەکان تۆمار بکات، چونکە ئەمانە لە خاکی ئیسلامدا خەریکی خراپە کردنن، بۆیە پێویستە باس بکرێن، بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە دەسەڵات و شەرع پەرچەکردارێکیان بەرامبەر ئەم رەفتارە ناڕەوایە هەبێت. ئەوانەی سەرەڕێ لە خەڵك دەگرن ((بۆ ئەوەی بە ئاشکرا پارەیان لێ بسەنن، عەرەب و تورکمان و کوردن))و وەك ئیبن تەیمیە (٧٢٨ك/١٣٢٧ز مردووە) دەڵێت: ((ئەمانە وەك ئاژەڵی دڕندەن لەناو موسڵمانەکاندا، پێویستە بکوژرێن و لەناو ببرێن و تالان بکرێن))[3].

تا ئێرە بۆچوونێکی یەك لایەنە هەیە لەسەر کورد وەك رێگر، ئەمەش بۆچوونی (مێژوونوس و گەڕیدە و وڵاتناس و فەقیە و شاعیر و ...هتد.)ە، واتە بۆچوونی ئەوانەیە توانای نوسین و تۆمارکردن و مافی قسەکردنیان هەیە. بەڵام ئێمە ئاگامان لە بۆچوونی ئەویتری (کوردی) و تێگەیشتنی لەم رەفتارە کۆمەڵایەتییە نییە، کە هەندێك لە کۆمەڵەکانی ئەنجامی دەدەن. ئەمەش یەکێکە لە سیماکانی زانینی ئیسلامیی بەشێوەیەکی گشتی و زانینی مێژوویی بەشێوەیەکی تایبەتی، کاتێك بەرهەمهێنەرەکانی لەبارەی کورد و کۆمەڵگەکانی ترەوە دەدوێن، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵگانەی بە کۆمەڵگەی خێڵەکیی کۆچەر ناو دەبرێن، زۆربەی جار لێدوانەکانیان

---

[1] سەبارەت بە رای مەزهەبە فیقهیە جیاوازەکان لەسەر ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: الماوردي: م.س، ص١٠٦-١٠٩.

[2] سورة المائدة، الآية (٣٣).

[3] السياسة الشرعية، ص٨٢-٨٣.

لەبارەیانەوە سەلبییە و ((بە کۆسپێکیان دادەنێن، کە پێویستە ملکەچ بکزێن، یان بە سەرپێچیکارانێکی دڕندەیان دادەنێن))[1]، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، ئەوەی دەدوێت لە چینە تایبەتەکەیە و ئەوەیشی بەم دوان و نوسینانە حوکمی بەسەردا دەدرێت چینە رەشۆکییەکەی خەڵکە. ئێمە لەبارەی رێگریی کوردەوە کۆمەڵێك گێڕانەوەمان هەیە هەڵگری گۆشەنیگای گێڕەرەوەکانیانن، واتە لە هێنانی گێڕانەوەکاندا نەزعەیەکی خودی هەیە، کە خەریکە لە تێڕوانینی ئەم دیاردەیە و بڕیاردان لەسەری، دەبێتە نەزعەیەکی گشتی، وەك لای ئیبن تەیمییە بینیمان حوکمدانەکەی لەو تێگەیشتنە هاوبەشەوە هەڵقوڵاوە، کە لەبارەی کورد و رەفتاری کوردەوە هەبووە.

رێگری، وەك لە زاراوەکەدا دەردەکەوێت، پێویستی بە کۆمەڵێ رێگا هەیە، کە بە وڵاتی کورددا بڕوات و ئەم کەسانە بیگرن، ئەگەر ئەم رێگایانە نەبوونایە، ئەوا رێگری لای کورد نەدەبووە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی. لە راستیدا تۆڕێکی فراوانی رێگاوبان بە کوردستاندا دەڕۆیشت و بۆ کاروباری بازرگانی و ئایینی بەکار دەهات[2]، چونکە کاروانی حاجیەکان پیایدا تێ دەپەڕین، بایەخە بازرگانییەکەشی لە پێگەی ئەم وڵاتەدا دەردەکەوت، کە کەوتبووە نێوان عێراق و دەوڵەتی بێزەنتییەوە، لەلایەکەوە ناوچەکانی خوراسان و باکوری وڵاتی فارس (ئێرانی ئێستا) و ناوەڕاستی ئاسیای بە عێراق و شامەوە دەبەست، لەلایەکی تریشەوە دەیبەستن بە دەوڵەتی بێزەنتی و مەملەکەتە نائیسلامییەکانی باکوور[3]، گرنگترین رێگاشیان، رێگای

---

[1] محمد (اركون): قضايا، ص٩٧، هامش الرقم (١).

[2] زۆر کەس لەبارەی ئەو رێگایانەیان نوسیوە کە لەسەردەمی ئیسلامدا بە وڵاتی کورددا تێدەپەڕین، بە تایبەتی بگەڕێوە بۆ: النقشبندي: الكرد، ص٢٩٨-٣٠٤. عبد محمد: م.س، ص٣٠١-٣٠٨. يوسف: الدولة الدوستكية، ج٢، ص٢٣٠-٢٤٤. رسول: م.س، ص١٢٦. محمود: م.س، ص١٤٦-١٤٨. توفيق: كردستان، ص٣١٢-٣١٦.

[3] قادر محمد (حسن): الامارات الكردية في العهد البويهي - دراسة في علاقاتها السياسية والاقتصادية، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة الصلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٩)، ص١٥٦.

خوراسانی[1] بازرگانی بوو، که عێراق و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی پێکەوە دەبەست، وەك سەرچاوە مێژووییەکانیش باسی دەکەن کوردەکان ئەم ڕێگەیان دەگرت[2].

لەم ڕوانگەوە پێمان وایە، ئەو هۆکارانەی وایان کردبوو زانینی مێژوویی تەرکیز لەسەر ئەم دیاردەیە بکات لای کورد، بوونی ئەم ڕێگایانە بووە لە وڵاتی کورددا، کە لای دەوڵەت جێی بایەخ بوون و مێژوونوسیش زۆربەی جار لەبەرژەوەندیی دەوڵەتدا قسەی دەکرد. دەسەڵاتی ناوەندی بایەخی بە ئارامیی ئەم ڕێگایانە و ئەو کاروانە بازرگانیانە دەدا، کە بەم ڕێگایانەدا تێ دەپەڕین. بۆ نمونە سەبارەت بە ڕێگای خوراسان تێبینیی ئەمە دەکرێت، ئەوەتە دەبینین لەکاتی ئاژاوە و پشێویدا، بەتایبەتی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی میری میراندا (إمرة الأمراء) (٣٢٤-٣٣٤ك/٩٣٦-٩٤٦ز)، کە خەلافەتی عەباسی زۆر لاوازبوو و سەرکردە تورکەکان دەستیان بەسەر بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا گرتبوو، دەسەڵات چەند بەرپرسێکی لەسەر ئەم ڕێگایانە دادەنا بۆ ئەوەی پارێزگاری لە کاروانە بازرگانیەکان بکەن[3]. کاتێکیش دەوڵەت نەیتوانیایە پارێزگاری ڕێگاکە بکات، ئەم کارەی دەسپارد بە خودی کوردەکان[4]. ئەو میرە کوردەی بیتوانیایە پارێزگاری ئەم ڕێگایە بکات و گرنگی بە ئاوەدانکردنەوەی بدات، پەسەند دەکراو مایەی سەرسامیی مێژوونوس بوو[5].

---

[1] ڕێگەی خوراسان: بەرێگەی حەریریش ناسراوە، بەغداو خوراسان و پاشان شارەکانی ئەودیو رووباری بەیەکەوە دەبەست و تا سنورەکانی چین درێژدەبوویەوە. بگەڕێوە بۆ: قحطان عبد الستار (الحديثي): طريق خراسان، بحث منشور في مجلة كلية الآداب، (جامعة البصرة: ١٩٩١)، ع (٢٢)، ص٩ بەدواوە.

[2] الصولي: م.س، ص١٩٢-١٩٣. مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص٢٠٣. ابن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص٣٩٢١.

[3] بۆ نمونە بڕوانە: الصولي: م.ن، ص١٩٢، ٢٠٤. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: تقي الدين عارف (الدوري): عصر إمرة الامراء في العراق (٣٢٤-٣٣٤هـ/٩٣٦-٩٤٦م) ـ دراسة سياسية اقتصادية اجتماعية، (بغداد: ١٩٧٥)، ص٢٢٤-٢٢٥.

[4] مسكويه: م.ن، ج٢، ص١٣٩. ابن الاثير: الكامل، ج١، ص٢٢٥.

[5] ابن الجوزي: م.ن، ج٩، ص٤٣٦٠-٤٣٦١.

بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە گرنگیی ڕێگاکان تاکە پاڵنەری مێژوونوسەکان بووە بۆ دیاریکردنی ئەم دیاردەیە لای کورد، چونکە ئەنجامدانی ڕێگری لە لایەن هەندێ کوردەوە، گوزارشتی لەو گیانە خێڵگەرییەی دەکرد، کە بەهیچ جۆرێك حەزی لەوە نەبوو ملکەچی یاساکانی دەسەڵاتی ناوەندی ببێت. لەبەرئەمە دەشێ ڕێگری کارێکی سیاسی بێت لەلایەن کۆمەڵە کوردییە نەیارەکەوە، کە دەیویست دەسەڵاتداریی خۆی بەسەر وڵاتەکەیدا بسەلمێنێت، ئیتر چ بە سەپاندنی باج بێت بەسەر کاروانەکاندا بۆ ئەوەی ڕێگەیان بدات بە سەلامەتی بڕۆن[1]، یان بەوە بێت ئەو کاروانانە تاڵان بکات، وەك گوزارشتکردنێك لەم گیانە خێڵەکییە. لێرەدا ڕێگری لای کورد و میللەتە کۆچەرییەکان، کارێکی خراپ نییە و بەلایانەوە مایەی شانازییە و بەڵگەی ئازایەتی و سوارچاکییە[2]. لەوانەیشە ئەم ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە ڕەنگدانەوەی بارودۆخی سەختی تایبەت بە سروشتی کوردستان بێت، چونکە ئەم ڕەفتارە، واتە بردنی ئەوەی لای کەسانی ترە، بە بەراورد بە شوانی و کشتوکاڵکردن، ئاسانترین ڕێگەی پەیداکردنی دارایی و پارە و سامانە[3].

تا ئێرە و بە هەڵێنجان لەو بۆچوون و هەڵوێستانەی باس کران،ـفەزای کۆمەڵایەتیی کورد لە خێڵگەری ـ کۆچەرایەتییەکی کاریگەر بە ژینگەی سروشتی ـ چیاکاندا چڕ دەبێتەوە، لە ماوەیەکی مێژوویی درێژیشدا ڕەفتاری خێڵەکیی کورد لە ڕێگریدا دەردەکەوێت، ئەمەش بە ئاڕاستەیەکی بازنەییە، کە تیایدا خێڵگەری و چیانشینی و ڕێگری پێکەوە بەستراون، وەك لەم هێڵکاریەدا روون دەبێتەوە:

---

[1] بڕوانە: ابراهيم (حركات): المجتمع الإسلامي والسلطة في العصر الوسيط، (الدار البيضاء:١٩٩٨)، ص٢٠٩.

[2] علي (الوردي): منطق ابن خلدون في ضوء حضارته وشخصيته، (قم: ١٩٩٧)، ص٢٧٥.

[3] «شارەزوور... بە درێژایی چەندین ساڵ، بۆ بەنی شەیبان و کوردەکان کۆگای پارەو کاڵابوو کە بەهۆی ڕێگری و پەلاماردانی کاروانەکانەوە دەستیان دەکەوت». مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص١٩٨-١٩٩.




**پەیوەندیی نێوان چیانشینی و خێڵگەریی کورد و ڕێگری**

ئەمەش وامان لێدەکات بڵێین زانینی مێژوویی لە تێڕوانین و شێوەگیرکردنی کۆمەڵگەکاندا بە بنەماکانیەوە پابەندە، لێرەشدا ئەم زانینە، کە مامەڵە لەگەڵ کورددا دەکات، دەیەوێت لە میانەی ئەم پرۆسەیەوە مومارەسەی دەسەڵاتی مەعریفیی خۆی بکات، کە جۆرە باڵابوونێکی مێژووییە بۆ پێکهێنانی هەستێکی هاوبەش لە چوارچێوەی گشتیی و ئاساییدا بۆ تێڕوانین و جیاکردنەوەی کۆمەڵەکان لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا. بە واتایەکی تر، زانینی مێژوویی کاتێك ئەوە دەگێڕێتەوە، کە سیمای نەتەوەکان دیاری دەکات، سوورە لەسەر جەختکردنەوە لە بەداهەتی ئەو سیمایانە و مەعقولیەتیان، هەروەها لە میانەی ئەو گشتگیرییەوە، کە شێوازی گێڕانەوەکەی یان گۆشەنیگاکەی لەگێڕانەوەی ڕووداوەکاندا پێی دەناسرێتەوە، جەخت لە ڕاستیەتی (ڕەوایی) خۆی دەکاتەوە.

### ٣- کورد لە نێوان ئارەزوو و عەقڵدا

بینیمان لە زانینی مێژووییدا ڕێگری ڕوویەکی خراپی کۆمەڵگەی کوردییە، بەڵام تاکە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی نییە، کە گوزارشت لە سروشت و تایبەتمەندی کەسێتیی کورد بکات.

ئازایەتی لەو سیفەتانەیە کوردی پێ ناسراوە و بەهۆیەوە ناوبانگی دەرکردووە، ئەگەر لە ڕوانگەی ئیبن خەلدونەوە سەیری کورد بکەین بێگومان ئەمە شتێکی

سروشتییه، چونکه نەتەوە کۆچەرییەکان و لەناویاندا کورد، بەشێوەیەکی گشتی بەوە جیا دەکرێنەوە ئازا و بەهێزن و دەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، ئەمانە هەمیشە چەکیان پێیە، توانا و ئازایەتی بووەتە بەشێك لە سروشتیان و کاتێك کەسێك پەنایان بۆ دەبات، پەنای دەدەن[1]. کورد ئەگەر ئازا و بەهێز نەبوونایە، نەیاندەتوانی رێگری بکەن و رێبوار بترسێنن. لەم روانگەوە، رێگری ئەنجامی ئازایەتی و چاونەترسیی کوردە[2]. لەبارەی ئەم ئازایەتییەوە چەندین ئەفسانە و داستان دەگێڕرانەوە، بۆ نمونە دەگوترێت لە شارەزوور شارێك هەیە: ((داود و سلێمان پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێ بێت) دۆعای سەرکەوتنیان بۆ ئەم شارە و خەڵکەکەی کردووە، بۆیە کەس ناتوانێت داگیری بکات... تەنانەت ئەسکەندەریش[3]نەیتوانی بەسەریدا سەربکەوێت و خەڵکەکەی پێشوازییان نەکرد، موسڵمانەکانیش نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن، بەڵکو خەڵکەکە خۆیان هاتنە ناو ئیسلامەوە))[4].

ئەوەی لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی ئیسلامیدا بەدوادا چوونێك بۆ هەواڵەکانی تایبەت بە کورد بکات، هەست بە رۆڵی یەکلاکەرەوەی ئازایەتیی دەکات لەم هەواڵانەدا، زۆربەی جار ئازایەتی بزوێنەری سەرەکیی ئەو رووداوانەیە کورد ئەنجامیان دەدەن، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە کاتی شەڕی خاچپەرستەکاندا بوونی مێژوویی کورد دەبێتە بوونێکی جیهادی، ئازایەتی دەبێتە مۆرکێك و کوردی پێ دەناسرێتەوە. لەو کاتەدا مێژوونوسەکان لە دەرخستنی سیفەتی ئازایەتیی کورددا راشکاو بوون[5] و

---

(1) المقدمة، ص٩٩.

(2) بۆ نمونە بڕوانە: الصولي: م.س، ص١٩٢.

(3) مەبەستی ئەسکەندەری مەکەدۆنییە.

(4) مسعر بن مهلهل: م.س، ص١١-١٢. یاقوت معجم البلدان.

(5) بۆ نمونە بڕوانە ئەو چیرۆکانەی کە (اسامة بن منقذ) (٥٨٤ك/١٢٨٨زمردووە) لەبارەی ئازایەتی کوردو رۆڵی پاڵەوانانەیان لە شەڕی خاچپەرستەکاندا دەیانگێڕێتەوە. کتاب الاعتبار، حرره: فیلیب حتي، (الولایات المتحدة: ١٩٣٠)، ص٤٩-٥٠، ٩٥-٩٧، ١١٦، ١٥٠. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محسن محمد (حسین): دور الکرد القیادي في جیش صلاح الدین، مجلة المتین، (دهۆك: ١٩٩٥)، ع (٥٢)، ص٩٧-١٠٥. هەروەها بڕوانە پاری سێیەم لەبەشی دووەمی ئەم نامەیەدا.

ئازایەتی بووبووە شۆرەت و ناونیشانی کورد[1]. ئەوەتە فەزلولڵلای ئەلعومەری بە کورددا هەڵدەدات و دەڵێت: ((ئەگەر دووبەرەکیی لەنێوانیاندا نەبوایە...دەستیان بەسەر وڵاتدا دەگرت و دەبوونە خاوەنی))[2]، کارەکە دەگاتە ئەوەی ئەم مێژوونوسە مەوسوعیە بڵێت کورد ئازاترین گەلی ئیسلامن و ((دەوترێت لەناو موسڵماندا کورد و لەناو مەسیحیشدا گورجەکان ئازاترین گەلن))[3].

بەڵام لەدوای ئازایەتی چی هەیە؟ با بەشێوەیەکی تر پرسیارەکە بکەین، کاتێك کۆمەڵە مرۆڤێك بە ئازایەتی و هێز و توند و تیژی دەناسرێنەوە، چی لەدەست دەدەن؟ لەوانەیە وەڵامێکی رازیکەری ئەم پرسیارە و پرسیاری تری لەم جۆرە سەبارەت بە زانینی مێژوویی گران بێت، چونکە ئەو ـ زۆربەی جارـ ئاوڕ لەوە ناداتەوە، کە لەگەڵ گێڕانەوەکەیدا پێچەوانەیە. ئەگەر بمانەوێت وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەست بکەوێت، دەبێ پەنابەرینە بەر ئەو کایە مەعریفیە ئیسلامیانەی تر، کە هەوڵیان داوە لەڕێگەی بەراوردکردنەوە یان جیاکاریی لەنێوان نەتەوەکاندا، سروشت و ئەزموونەکانیان دیاری بکەن[4]. باشترین زانینش لەم بوارەدا یارمەتیمان بدات فەلسەفەی ئیسلامییە.

لە لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە سروشت و دەروونی مرۆڤەوە، فەلسەفە شیکردنەوەی قووڵ و نیگای فراوانی هەبووە. ئەوەی مێژوو دەیەوێت لەڕێگەی گێڕانەوەکانیەوە پێمان بڵێت، فەلسەفەی ئیسلامی بەشێوەیەکی روونتر، بەڵام بە زاراوەی تایبەتی خۆی، پێمان دەڵێت.

فەیلەسوفە موسڵمانەکان لەپێناو کورد خۆیدا باسی کوردیان نەکردووە، بەڵکو وەك نمونە هێناویانەتەوە بۆ ئەوەی بیر و بۆچوونە فەلسەفییەکانی خۆیانی پێ بسەلمێنن. بەکارهێنانی کورد وەك نمونە لەلایەن فەیلەسوفەوە لەخۆوە نەبووە، بەڵکو لە سەرنجدانی ئەم کۆمەڵە مرۆڤە و سیفەتە دیارەکانییەوە بووە، بۆ ئەوەی عەقڵی فەلسەفیی

---

[1] العباسي: آثار الأول في ترتيب الدول، (مصر: ١٢٥٩هـ)، ص١٤٧. الذهبي: المشتبه، ج١، ص٥٤٩. ابن بطوطة: م.س، مج٢، ص٨٥.

[2] التعریف، ص٥٨.

[3] م.ن، ص٧٨. گورج ، جۆرجیەکانی ئێستان.

[4] بڕوانە بەشی سێیەمی نامەکە.

نمونەیەکی گونجاو بدۆزێتەوە بۆ ئەو بیرۆکەیەی لێی دەکۆڵێتەوە و دەیەوێت تیایدا قووڵ ببێتەوە. ئەبوبەکر محمد کوڕی زەکەریای رازی (٢٥٠-٣٢٠ك/ ٨٦٤-٩٣٢ز) یەکەم فەیلەسوفە لە کتێبەکەیدا بەناوی (الطب الروحاني)، لە بەراوردکردنی سروشتی مرۆڤەکاندا، کوردی بەنموونە هێناوەتەوە. رازی لەم کتێبەدا لە مەسەلەیەکی فەلسەفیی گرنگ دەکۆڵێتەوە، ئەویش مەسەلەی نەفسی مرۆڤە[1] و لە لێکۆڵینەوەکەیدا پەیڕەوی ئەوەی کردووە ئەفلاتون لەبارەی نەفس و بەشەکانیەوە باسی کردووە[2]. ئەفلاتون سێ جۆر نەفس یان سێ هێز وەك بەشە راستەقینەکانی نەفس دیاری دەکات: نەفسی یەکەم، نەفسی قسەکەرە، کە سەرچاوەی زانین و بیرکردنەوەیە، دووەم نەفسی شەهوانییە، کە مۆرکێکی هەستیی هەیە و تایبەتە بە چێژەکان و شەهوەتەوە، سێیەم نەفسی توڕەییە ( النفس الغضبية)، کە دەبێتە هۆی ئازایەتی و دەست بەسەردا گرتن و دەسەڵات پەیداکردن بەسەر ئەوانی تردا[3]. باسکردنی ئەم دابەشکردنە بۆ ئەوەیە، لە مەبەستی رازی لە نوسینی کتێبی (الطب الروحاني) و ئەو سیاقە تێبگەین، کە تیایدا باسی سروشتی کوردی کردووە.

ئەم کتێبەی رازی لەبارەی چۆنیەتی سەرکوتکردنی ئارەزوو - یان نەفسی شەهوانی - و رامکردن و ملکەچکردنیەتی بۆ عەقڵی مرۆڤ (نەفسی قسەکەر)[4]، ئەو باس لە میانڕەویی مرۆڤ دەکات، ئەمەش بەوە دەبێت نەفسی شەهوانی ملکەچی

---

(1) نەفس لای فەیلەسوفە موسڵمانەکان زۆر پێناسەی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی، نەفس بریتیە لە کەماڵی یەکەمی ئەو جەستە ئامێریەی کە بە هێز زیندووە (ذي الحياة بالقوة)، زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن کە نەفس جەوهەرێکی گیانیەو بە خۆیەوە پەیوەستە (القائم بذاته). محمود (قاسم): في النفس والعقل الفلاسفة الإغريق الاسلام، (القاهرة: ١٩٦٩)، ص٧٢. بۆ پێناسەی تری نەفس لای فەیلەسوفەکان بڕوانە: م.ن، ص٧٣-١١٩.

(2) رسائل فلسفية، ص٢٧-٢٨.

(3) بڕوانە: جمهورية الافلاطون، ت: فؤاد زكريا، (القاهرة: ١٩٧٤)، ص٣٢٦-٣٣٦.

(4) رسائل فلسفية، ص٢٠.

فەرمانی عەقڵ بکرێت، کە بەخششێکی خواییە[١]. ئەم ملکەچکردنەش کارێکی ئاسان نییە، چونکە بەهۆی نیشانە و دیاردە خراپەکانی نەفسەوە، ناتوانرێت بەئاسانی ئارەزوو سەرکوت بکرێت، یەکێك لەو دیاردانەش عیشقە، کە بەڵایەکە و تووشی سروشتی مرۆڤ و غەریزەکانی دەبێت. لای رازی عیشق چەمکێکی فراوانی هەیە و ئەو چەمکە باوە تێ دەپەڕێنێت، کە عاشقبوونە بە ئافرەت. بەڵکو عیشقی فەرمانڕەوایی و خاوەنداری و هەموو ئەو شتانەش لەخۆ دەگرێت، کە دەشێ نەفسی مرۆڤ حەزیان لێ بکات و ئاواتی بە دەستهێنانیان بخوازێت[٢].

لێرەدا دەچینە ناو کرۆکی باسەکەمانەوە، لای رازی نەتەوەی وا هەن بە سروشت ئامادەیی عیشقیان تێدایە، هەیشە ئامادەیی بیرکردنەوەی تێدایە، بەتایبەتی بیرکردنەوەی فەلسەفی. رازی باوەڕی وایە کورد لەو نەتەوانەن بەردەوام خوویان بەعیشقەوە گرتووە[٣]. چونکە عیشق ((ئەوانە دادەگرێت، کە سروشتیان توندەو گەمژەن، ئەوەی کالفام بێت، خۆی دەداتە دەست نەفس و ئارەزووەکانی))[٤]. مادەم کورد و نەتەوەکانی تر عیشق دایان دەگرێت، بەپێی لێکدانەوەی رازی خاوەنی ئەو سیفەتانەن باسکران، لەبەرامبەر ئەمانیشدا یۆنان هەیە، کە زیرەکترین و داناترین گەلن[٥]. کەواتە لێرەدا لێکدژییەکە لەنێوان عەقڵ و ئارەزوودایە. شایەنی باسە بە تەنها رازی باوەڕی بەم لێکدژییە نەبووە، بەڵکو زۆر لەو زانا ئاینی و فەیلەسوفانەیش، کە عەقڵیان بەلاوە پەسەندتر بوو ئارەزوو و سەرکوتکردنی ئارەزوویان بە پێویست دەزانی، هەمان باوەڕیان هەبوو[٦]. واتە ئەم بیرۆکەیە شتێکی باو بووە و بووبووە هۆی

---

(1) بڕوانە: الجابري: العقل الاخلاقي العربي - دراسة تحليلية نقدية لنظم القيم في الثقافة العربية، (بيروت: ٢٠٠١)، ص٢٩٦.

(2) رسائل، ص٢٨.

(3) م.ن، ص٤٢.

(4) م.ن، ص٢٢-٢٣.

(5) م.ن، ص٤٢.

(6) سەبارەت بەم بۆچوونانە ، بڕوانە: السيد: الامة والجماعة، ص١٩٤-١٩٥.

جیاکاری کردن لەنێوان نەتەوەکاندا. بەپێی لۆجیك یان دیدگای رازی، بەچاوێکی سووك سەیری ئەو نەتەوانەیان دەکرد، کە وەك کوردن و ئارەزوو بەسەریاندا زاڵە.

تەنها رازی بەم جۆرە سەیری کوردی نەکردووە، ئەوەی ئەو بەشێوەیەکی فەلسەفی دەیڵێت، زۆر مێژوونوس و کەسانی تریش بە دەربڕین و شێوازی خۆیان گوزارشتیان لێکردووە: دەوترێت داناکان کۆکن لەسەر ئەوەی کورد سەرژنانین[١]، لە دە جۆری غیرە نۆیان لە کورددا هەن[٢]. لە خراپەدا وەکو شوانکارەکان وان[٣]، تەنانەت لای هەندێك هاوواتایی هەیە لەنێوان کورد و ئەو کۆمەڵە مرۆڤانەدا، کە دوورن لەبیرکردنەوە و توانای عەقڵییان لاوازە، بۆ نمونە کورد وەك چەتە[٤]و شێت و کۆیلە رەشپێستەکان تەماشا دەکرێن[٥]. کورد وەك ئـەمانە نەزانن ـ واتە نەفسی قسەکەریان لاوازە ـ بۆیە ((عـەقڵیشیان لاوازە و گێلی و گەمژەیی بەسەریاندا زاڵە و لە هیچ زانستێك نازانن))[٦]. تەنانەت ئەم جۆرە تێڕوانینە لە کورد، باوەڕە ئاینییەکانیشی گرتبوویەوە، ئەوەتە زانایەکی وەك ئەبو حامد ئەلغەزالی (٥٠٥ك/ ١١١١ز مردووە) داوای لە زانا ئاینیەکان دەکرد روو بکەنە خەڵکە کۆچەرییەکان لە ((کورد و ئەعراب))

---

(1) ابن قتیبة: عیون الاخبار، مج٢، ص٦٣. ابن عبد ربە: م.س، ج٧-٨، ص٢٥٧. (خنث) بە کەسێك دەوترێت کە (کثیرا التثني والتکسر اي کثیر الارتداد والعداوة، والاختلاف في الطباع)

(2) النویري: م.س، السفر الثاني، ص٢٩٣.

(3) البیهقي: المحاسن والمساوئ، تحقیق: محمد ابو الفضل ابراهیم، (القاهرة: د.ت)، ج٢، ص٧١. الآبي: م.س، ج٧، ص٧٢.

(4) بۆ نمونە بڕوانە: البلاذري: فتوح البلدان، ص٣٠٣-٣٠٤. الطبري: م.س، ج٩، ص٢٦٢، ٥٢٧. مسکویە: تجارب الامم، ج١، ص٣٩٩.

(5) ابن قتیبة: م.س، مج٢، ص٦٣. ابن عبد ربە: م.ن، ج٧-٨، ص٢٥٧. الآبي: م.س، ج٧، ص٧٢. یحیی ابنٌ مسعدة: رسالة یحیی بن مسعدة ردا علی الشعوبیة، ضمن: نوادر المخطوطات، بتحقیق: عبد السلام هارون، ط٢، (القاهرة: ١٩٧٣)، ج١، ص٢٧٥. ابن الجوزي: المنتظم، ج٢، ص٣٤٨٤ز ج٩، ص٤٤٩٩.

(6) البغدادي: م.س، ص٢٨٥. ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٣٤٨٤.

بۆ ئەوەی فێری بنەما ڕاستەکانی عەقیدەیان بکەن[1]. ئەمەش لەو باوەڕەوە هاتووە، کە خورافات لەناو ئەمانەدا تەشەنەی سەندوە و ـ بەپێی دەبڕینی هەندێ مێژوونوس ـ گەیشتبووە ڕادەی دەبەنگی[2].

ئەم بڕیار و هەڵوێستانە لەبارەی کوردەوە، تاکەکەسین، چونکە زۆربەی گێڕانەوەکان تاکەکەسین یان بە گێڕانەوەی تاکەکەسی ناسراون و لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژووییدا ئەم جۆرە گێڕانەوانە پەسەند ناکرێت، بۆیە ناتوانرێ پشتیان پێ ببەسترێت و بەڕاست دابنرێت[3]. سەرجەم ئەم گێڕانەوانە تایبەتن بە وێناکردنی سروشتی کورد، ئەم وێناکردنانەش زۆر لەوە دەرناچن، کە ڕازی سەبارەت بە کورد دەیگوت و پێی وابوو عیشق و ئارەزوو بەسەر نەفسی کورددا باڵادەستن و کورد گوێ بە عەقڵ نادەن، بۆیە توانای بیرکردنەوەیان لاوازە.

ئیبن ڕوشد (٥٩٥ك/١١٩٨زمردووە)، کە لە بەناوبانگترین فەیلەسوفە موسڵمانەکانە، ڕایەکی هەیە لەسەر کورد، لەڕووی پێشینەی هزریەوە نەك لە ڕووی ئەنجام و حوکمدانەوە، لە ڕای پێشووتر جیاوازە. ئیبن ڕوشد لە ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا ژیاوە و سەرەڕای دوورییەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، کە کورد تێیدا دەژی، لەناو کتێبە فەلسەفیەکانیدا باسی کوردی کردووە. ئەم بەپێچەوانەی (ڕازی)یەوە باوەڕی بەوە نییە تەنها ڕەگەزێکی دیاریکراو ئامادەیی ئەوەی تێدایە شتە بەرزە مرۆییەکان، بە تایبەتی شتی عەقڵی بەرهەم بهێنێت، بۆ نمونە ئەو وا نابینێت فەلسەفە تەنها تایبەتە بە یۆنانییەکان و کەسی تر ناتوانێت فەلسەفە بەرهەم بهێنێت. بەڵام دواتر دەڵێت هەندێ نەتەوە هەن بە سروشت ئامادەیی ئەوەیان تێدایە جۆرە فەزیلەیەکی دیاریکراو تیایاندا بەرهەم بێت، بۆیە سروشتیە بەشی تیۆریی نەفس ـ واتە بەشی بەرهەمهێنەری دانایی ـ لای یۆنان باڵادەست بێت و بەشی توڕەیی نەفس ـ بەتایبەتی

---

[1] احیاء علوم الدین، مج٢، ص٣٧٠-٣٧١.

[2] ابن الجوزي: م.س، ج٩، ص٤٦٤٧. ابن الأثیر: الکامل، ج١٠، ص٤١-٤٢.

[3] بۆ گێڕانەوەی یەککەسی بڕوانە: حسن (عثمان): منهج البحث التأریخي، ط٤، (القاهرة ١٩٧٦)، ص١٤٧.

بەرهەمهێنەری ئازایی ـ لای کورد بەهێز بێت[1]. ئەم دابەشبوونەی فەزیلەکانیش، بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەنجامی کاریگەریی ژینگەی سروشتییە بەسەر مرۆڤەوە[2].

ئیبن روشد لە نزیکەوە کوردی نەناسیوە، پێمان وایە ئەم بۆچوونەشی لەسەر کورد، بە کاریگەریی ئامادەیی بەهێزی کورد بووە ـ لەسەردەمی ئەودا ـ لە کایەی ئیسلامیدا، کە بەسەرکردایەتی ئەیوبییەکان دژی خاچییەکان دەجەنگان. بۆیە ـ وەك باسمانکرد ـ لەو قۆناغەدا ئازایەتی بووە دیارترین سیفەتی کورد و ناوبانگێکی فراوانیان پێ دەرکرد.

هەرچۆنێك بێت، جیاوازییەکی بەرچاو هەیە لەنێوان ئەم فەیلەسوفە و رازی لە تێڕوانینیاندا بۆ سروشتی کورد، ئەم پێی وایە هێز و توانای نەفسی توڕەیی خراپ نییە، چونکە ئەوەی توڕەیی تێدا نەبێت، ناتوانێت رووبەڕووی دوژمنەکانی ببێتەوە[3]. پێمان وایە بەشێوەیەکی گشتی ئیبن روشد لە هێنانەوەی کورددا بەنمونە، لە رازی وردترە. بیرکردنەوەی ئیبن روشد لە ئارەزووەوە دوورە و بڕیاری ئەوە بەسەر کورددا نادات سروشتیان توندە و بێ مێشکن[4]، چونکە لای ئەم فەزیلەی ئازایەتیی پێگەیەکی بەرزی هەیە و لەگەڵ بەشی قسەکەری نەفسی مرۆییدا یەکتر تەواو دەکەن. لەمەشدا ئیبن روشد پابەندە بە ئەفلاتونەوە، چونکە ئەفلاتون پێی وا بوو نەفسی توڕەیی زیاتر بە نەفسی قسەکەرەوە بەستراوە وەك لە نەفسی شەهوانی، توڕەیی عەقڵ پەسەند دەکات نەك شەهوە و نابێتە هاوپەیمانی ئارەزوو[5]. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئیبن روشد لە فەزای کایەی ئیسلامی دەرباز نەبووە و کاتێك بانگەشەی ئەوە دەکات کورد بە سروشت ئامادەیی فەزیلەی ئازایەتییان تیایە، ئەمە مانای ئەوەیە ـ بەهەڵێنجان ـ کورد ئەو توانایەی نییە، کە یۆنان هەیەتی و بریتییە لە داهێنانی هزری، یاخود ئەگەر هەیشی بووبێت زۆر کەم بووە.

---

[1] الضروري في السياسة، ص٨٢.

[2] م.ن، ص٨٣.

[3] م.ن، ص٨٤.

[4] الرازي: م.ن، ص٤٢-٤٣.

[5] افلاطون: م.س، ص٣٣٥-٣٣٦. هەروەها بڕوانە: قاسم: م.س، ص٦٣.

ئەم بڕیارەی فەیلەسوف و مێژوونوس و... هتد لەسەر ئەم کۆمەڵە مرۆڤە، سەبارەت بەو کاریگەرییە بەرچاوەی لە ژیانی رۆشنبیری و زانستیی کایەی ئیسلامیدا هەیانبووە، ئەو بڕیارە ستەمێکی راستەقینەیە و لێیان دەکرێت، چونکە تاکەکانی بەشدارییەکی گەورەیان کردووە لە زانست و زانینە جۆراو جۆرەکاندا. ئەم کۆمەڵە چەندین زانا و بیرمەندی بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوتووە، هەندێ لە شارە کوردییەکان چالاکی زانستی و رۆشنبیریی فراوانیان تیابووە، وەك شاری دینەوەر و حەلوان و ئامەد و کرمانشا و هەولێر و...هتد، کە بووبوونە مەڵبەندی زانست و زانا و قوتابی لە هەموو لایەکەوە روویان تێ دەکردن[1]. هەموو ئەمانە ئەو بۆچوونەی فەیلەسوفەکان رەت دەکەنەوە، کە پێیان وابوو لەناو کورددا نەفسی شەهوانی باڵادەستە یان تەنها فەزیلەی ئازایەتییان تێدایە. یاقوت حەمەوی هەستی بەمە کردووە، بۆیە دوای ئەوەی باسی خراپەکانی کورد و رێگرییەکانیان دەکات لەشارەزووردا و ئایەتەکەی پێشوو دێنێتەوە کە باسمان کرد، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات و دەڵێت: « بەڵام لەم ناوچەیەدا ئەوەندە پیاوماقوڵ و پێشەوا و زانا و دادوەر و فەقیە هەڵکەوتوون لە ژماردن نایەن...»[2].

بەڵام ئەوەی روویداوە ئەوەیە، رووە کێوییەکەی کورد رووە شارستانیەکەی داپۆشیوە، مێژوونوس و فەیلەسوفەکانیش ئەمەیان ویستووە، جا چ بۆ بەکەم زانینی کورد بێت، کە ئەمە بەپلەی یەکەم ئامانجی دەسەڵات بووە، چ بۆ شانازیکردن بێت بەم

---

[1] لەبارەی چالاکی کوردو وڵاتەکەیان لە کایەی رۆشنبیریدا بڕوانە: حسين: اربيل في العهد الاتابكي، (بغداد: ١٩٧٦)، ص٢٦٨-٣٠٣. رسول: م.س، ص١٣٤-١٣٩. محمود: م.س، ص١٦٠-١٧٢. يوسف: م،س، ج٢، ص٢٥٣-٢٧٠. هەروەها بڕوانە ئەم بابەتانەی کە سەبارەت بەم چالاکیە نوسراون: مهدي قادر (خضر): الحياة الفكرية والعلمية في غربي اقليم الجبالفي القرنين الرابع والخامس للهجرة، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩٤). آكو برهان (محمد): الحياة العلمية في ديار بكر وجزيرة ابن عمر من القرن ٥-٧هـ/١١-١٣م، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٠)، ص١٠٦-١٧٦.

[2] معجم البلدان: ج٣، ص٣٧٦.

رووەیانەوە لەکاتی پێویستدا، بە تایبەتی جەختکردنەوە لەسەر توانا و ئازایەتییان لەو قۆناغەدا، کە بوونێکی مێژوویی جیهادییان هەبووە، وەك لەمە و دوا دەیبینین.

لە لایەکی ترەوە دووفلیقانەیی زانینی مێژوویی لە تەماشاکردنی کارای کۆیی کورد (واتە هەموو کورد) و تاکی کارای کورد (واتە تاکەکانی ئەم کۆمەڵە)دا، زۆر بەکەمی بواری ئەوەمان دەدات ئەم دوو جۆرە کارایە پێکەوە ببەستین، وەك لەمەودوا باسی دەکەین. کورد وەك کۆمەڵ تاوانبارن و عەقڵیان نییە، بەڵام تاکە داهێنەرەکانی و ئەو شارە کوردییانەی خاوەنی چالاکیی رۆشنبیرین، بەشێکن لە قەوارەی رۆشنبیری و شارستانیی خانەی ئیسلام.

## بوونی کورد لە مێژووی ئیسلامیدا

لـە دەستپێکی ئەم نامەیەدا ئاماژەمان بەو پەیوەندییە ئۆرگانییە کرد، کە لەنێوان دەسەڵاتی سیاسی و سەرهەڵدانی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا هەبوو. مەسەلەی دەسەڵات و ئەوەی دەستی دەگرت بەسەر دەسەڵاتدا دەگرێت، لەو مەسەلانە یە ، کە دەمەقاڵە و گفتوگۆیەکی زۆری لەنێوان فەقیە و زانا موسڵمانەکاندا دەوروژاند[1] و بۆتە هۆی ئەوەی لە کایەی ئیسلامیدا جەخت بخرێتە سەر دەسەڵات و دەرکەوتە جیاوازەکانی، بەهۆی باڵادەستی و خۆسەپاندنی دەسەڵات بەسەر زۆربەی لقەکانی ئەو زانینانەی تایبەت بوون پێی، زۆربەی مێژوونوسەکان نەیانتوانیوە خۆیان لە پاشماوەی (مێژوویی) قورسی دەسەڵات رزگاربکەن. بۆیە ئەوەی مێژوونوس دەینوسی، پاساوهێنانەوە بوو بۆ بوونی دەسەڵات و کار گەیشتبووە ئەوەی دەرخستنی رۆڵی سوڵتان ئەرکی سەرەکیی زانینی مێژوویی ئیسلامی بوو، تەنانەت پەیوەندی سوڵتان تەحەکومی بە خودی گێڕانەوەی مێژووییەوە دەکرد[2].

لەم بەشەدا مامەڵە لەگەڵ ئەو زانینە مێژووییەدا دەکەین، کە دەسەڵاتی سیاسی بەرجەستە دەکات. کارەکەشمان لە دوو ئاستدا دەبێت:

**ئاستی یەکەم:** ئەو دەسەڵاتەیە، کە بەپێی ئەو، بوونی سیاسی گۆڕەپانی مێژوونوس دیاری دەکرێت، یان ئەو کایەیە، کە مێژوونوس رێ بەخۆی دەدات مێژووی تیا تۆمار بکات.

**ئاستی دووەم:** بوونی کورد و وڵاتەکەیانە لەم گۆڕەپانە و لەم مێژووە تۆمارکراوەدا.

---

[1] بۆنمونە بڕوانە: الأشعري: مقالات الإسلاميين وإختلاف المصليين، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، (القاهرة: ١٩٥٠)، ج١، ص٣٩. الشهرستاني: الملل والنحل، ق١، ص٣٠-٣١.

[2] العظمة: الكتابة التأريخية، ص١٣٥.

کەواتە پرسیارەکە لەبارەی بوونە لە مێژوودا، ئەم پرسیارە سروشتێکی فەلسەفیی هەیە و لە زۆر وێستگەی هزری فەلسەفیدا باس کراوە. بەڵام لێرەدا (بوون) ئەرکێکی دیاریکراوی هەیە و مەبەست لێی حاڵەتی (بوونی کورد)ە لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، ئایا کورد بوونێکی سەربەخۆیان هەیە، یان بوونیان بەستراوە بە کۆمەڵێك مەرجی پێشوەختەی دیاریکراوەوە، کە ئەم زانینە پشتی پێبەستوون بۆ ئەوەی بوونیان پێ بدات بە رووداوەکان. واتە ئەو بوونەی لێی دەدوێین، بوونێکی نوسراوە نەك بوونێکی کارەکی و لەوانەیە ئەم بوونە وەك حەقیقەتی کورد نەبێت لەو سەردەمە (مێژوویی)یەدا، کە مێژوونوس تیایدا باسی ئەم بوونە دەکات.

کاتێك دەڵێین (بوون لە مێژوودا)، مەبەستمان واتای بوونەکەیە، بۆیە کارەکە پەیوەست نییە بە مێژووەوە وەك زانینێکی بەرهەمهێن یان وەك بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە، بەڵکو پەیوەستە بە مێژووەوە لەو رووەوەی شێوازێکی بوونە، واتە جۆرێکە لە جوڵەو پەرەسەندن[1]. لێرەدا (بوون) وەك چەمکێکی پەتی بەکاردەهێنین، کە سەربەخۆ نییە و بەستراوە بە چەمکێکی ترەوە، ئەویش چەمکی دەسەڵاتە لە دەرکەوتنە جیاوازەکانیدا لەناو کایەی ئیسلامیدا[2]، ئێمە لەچوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی ـ هزریی دیاریکراودا مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکەین و ئەو واتایانەی دراون بەم چەمکە بەپێی ئەم چوارچێوەیە دیاری دەکرێن. کاتێك بوون دەبەستین بە دەسەڵاتەوە، بۆ ئەوەیە راستەخۆ باس لە چەمکی بوون نەکەین و واتایەکی سنوردارتری بدەینێ، بەجۆرێك بوونی راستەقینە دەبێتە ئەو بوونەی لەناو دەسەڵاتدایە یان بەلایەنی کەمەوە لەگەڵ دەسەڵاتدایە و ئەو بوونەی لەدەرەوەی دەسەڵاتدا بێت بوونێکی ناتەواوە.

مەبەستیشمان لە دەسەڵات، ئەو دەسەڵاتەیە لە لایەن مێژووەوە وەك بوونێك ئەولەویەتی پێ دەدرێت، واتە ئەو دەسەڵاتە مێژووییەی، کە زانینی مێژوویی لە زۆربەی

---

[1] بڕوانە: هربرت (ماركوز): نظرية الوجود عند هيجل ـ اساس الفلسفة التاريخية، ت: إبراهيم فتحي، (القاهرة: ١٩٩٠)، ص٣٩.

[2] کاتێك لە بوون دەدوێین ، نامانەوێت لەبارەی ئەوەوە قسە بکەین کە بە تیۆری بوون (ئەنتۆلۆجیا) ناسراوەو مێژووی پێ لێکبدەینەوە، وەك ئەوەی هیگڵ کردوویەتی و دەیەوێت چەکێکی نوێ بە خودی بوون بدات. بڕوانە ئەو تێزەی مارکۆزە لەم کایەدا پێشکەشیکردووە: م.ن، ص٦٦ بەدواوە.

دەرکەوتنەکانیدا لەدەوری کۆ دەبێتەوە و دەبێتە ئەو ناوەندەی، رووداو و هەوڵە مێژووییە جیاوازەکانی پێ دەپێورێت. ئەم واتایە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا دەگونجێت، کە لە ئیسلامدا رەوایەتیی پێدراوە و خاوەنی هەیمەنەیەکی کۆمەڵایەتیی فراوانە و پێویستە خەڵك گوێڕایەڵیی بکەن[1]. ئەوەتە دەبینین لەزۆربەی قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامیدا، خەلیفە یان میر یان سوڵتان دەسەڵاتیان بەسەر مێژوونوساندا هەبووە و ئەگەر مێژوونوس راستەوخۆش سەر بە دەرباری سوڵتان نەبوو بێت، ئەوا ناڕاستەخۆ و بەبێ ئەوەی هەستبکات ئینتیمای بۆ سوڵتان هەبووە، ئەم ئینتیمایەشی لەسەر ئاستی شێوەگیر بوونی زەینیدایە، چونکە مێژوونوس کاتێك مێژوو دەنوسێتەوە، سەنترالیزمی ئەو سوڵتانە مێژووییەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات بە هەند دەگرێت[2] و ئەولەویەت دەدات بە دەسەڵاتی ئەو سوڵتانە، ئیتر ئەو دەسەڵاتە تایبەت بێت بە کەسی خەلیفە خۆی، یان بەوانەی لەگەڵ ئەون و خاوەن دەسەڵاتن، یان لەسەر ئاستی گشتیی دەسەڵاتدا بێت وەك خەلافەت و میرنشین و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تر.

---

[1] سەبارەت بەم تیۆرە رەعەویەی دەسەڵات بڕوانە: الجويلي: الزعيم السياسي في المخيال الاسلامي، ص٦٩-٩٥.

[2] بڕوانە ئەوەی لە دەستپێکدا نوسیومانە سەبارەت بەوەی مێژوونوسەکان لە پێشەکیی کتێبەکانیاندا دەیڵێن، ل ٢٥-٢٦.

# پاری یەکەم
# قۆناغی بوونی کورد لە دەرەوەی دەسەڵاتدا

## ١ـ سروشتی قۆناغەکە و سەرەتای ناسینی بوونی کورد

لەم قۆناغەدا کورد لە پەراوێزی مێژوودایە و تۆمارکەرەکانی هەواڵ بایەخیان بە هەواڵەکانی کورد نەداوە. ئەم قۆناغە لەو سەردەمەوە دەست پێدەکات، کە عەرەبە وڵاتگرەکان لەگەڵ کورد رووبەروو بوونەوە و بە دروستکردنی یەکەم قەوارەی سیاسی لە وڵاتەکەیاندا، لە نیوەی دووەمی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زاینی، کۆتایی دێت. ئەم قۆناغە قۆناغی دامەزراندن و پەرەسەندنی زانینی مێژوویی و رەگ داکوتانی بنەما و شێوەگیربوونی میتۆدەکانیەتی. بوون لە دەرەوەی دەسەڵاتدا ئەو بوونەیە، کە دەسەڵاتی ناوەندی قبوڵی نییە، ئەو بوونەش پەسەندە، کە بە سیستەمی دەسەڵاتی ناوەندییەوە بەسترا بێتەوە، وەك بوونی فارس، پاشان بوونی تورك، کە توانیبوویان لەسەردەمی عەباسی و لە زۆر سەردەمی تریشدا، جڵەوی فەرمانڕەوایی بگرنە دەست و لەڕێگەی هێزەوە بوونی خۆیان بەسەر دەسەڵاتی ناوەندیدا بسەپێنن. بۆیە بوونی ئەمانە ناچاری بووە و عەباسیەکان ـ لەگەڵیاندا مێژوونوسەکانیش ـ نەیاندەتوانی رەتی بکەنەوە، یان نەهێڵن لە فەرمانڕەواییدا بەشدار بن. بەڵام کورد، بەزۆری لە وڵاتی خۆیاندا بوون و بوونی خۆیان بەسەر دەسەڵاتدا نەسەپاندووە و بەشداریکردنیان لە کاروباری دەوڵەتدا بەڕێژەیەکی زۆر کەم بووە و لە رۆڵی هەندێ خانەوادە و ئەو کەسایەتییە کوردانە تێ نەپەڕیوە، کە لەسەردەمی عەباسیدا هەندێ کاروباریان بەڕێوە بردووە[1].

---

[1] بۆ ئەم بەشداریکردنە بڕوانە: توفيق: الكرد في العصر العباسي حتى مجيء البويهيين، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤)، ص٥٢-٦٤. جورجی زەیدان لە باسکردنی هۆی کەمی بەشداریکردنی کورد لە دەسەڵاتدا دەڵێت: ((لەبەر ئەوەی کورد کۆچەر بوون، دەوڵەتی عەباسی زۆر بە کەمی خزمەتی کردوون، بۆیە پیاوی ئیداریی سەربەخۆ یاخود پیاوی سیاسی و فەرمانڕەوایان تێدا هەڵنەکەوتووە...)) . تأريخ التمدن الاسلامي، (بيروت: د.ت)، ج٤، ص٤٧٤. بەڵام ئێمە لە وەرگرتنی ئەم جۆرە قسەیەدا دوودڵین.

لەم حاڵەتەدا، مێژوونوس پابەند بووە بە قۆناغ و چوارچێوە هزرییەکەی خۆیەوە، بۆیە تەرکیزی کردووەتە سەر ناوەندی دەسەڵاتدار ـ کە لەم قۆناغەدا ـ هەوڵی دەدا دەسەڵاتی خۆی بەسەر کورد و وڵاتەکەیدا بسەپێنێت، چ لەڕێگەی ئەو ئینتیمایەوە بێت کورد بۆ ئومەتی ئیسلام هەیبوو و لە ئینتیمای دینی ـ عەقیدەییدا بۆ ڕەمزەکانی ئەو فەرمانڕەواییە و دەرکەوتە جیاوازەکانی خۆی دەنواند[1]، یان وەك زۆربەی جار ڕوویدەدا، لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزو ملکەچ کردنەوە بووە. ئەگەر خەلافەتی ئەمەوی بەهۆی ئەوەوە ـ کە بەپلەی یەکەم ـ پشتی بە زۆرداری و توند و تیژی بەستبوو، پێویستی بەوە نەبوو بێت لەبەرامبەر کورد و نەتەوە ژێردەستەکانی تردا، جەخت لە سەنترالیزمی ـ عەقیدەیی و ڕۆشنبیری ـ خۆی بکاتەوە[2]، ئەوا خەلافەتی عەباسی، کە سەردەمی ئەو سەردەمی زێڕینی تۆمارکردنی مێژوو بوو، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕکابەرە دەمارگیرەکانی، بە تایبەتی ڕکابەرە ئەتنییەکانی، پێویستی بەمە بوو. کاریگەریی ئەمەش لە بەرهەمە هزرییەکانی فەقیھ و نوسەران لەبارەی خەلافەت و پێویستیی گوێڕایەڵی کردنی پێشەوا چ باش بێت چ خراپ، ڕەنگی دابوویەوە.

بەمجۆرە لەو کاتەدا، دەسەڵاتی سیاسی (خەلافەت) سیستەمە سیاسییەکەی خۆی بەسەر خاکی ئیسلامدا دەسەپاند، زانینی مێژووییش ئەولەویەتی بەم دەسەڵاتە دەدا و پاساوی بۆ شەرعیەتی بوونی ئەم دەسەڵاتە دەهێنایەوە و هەوڵی دەدا زامنی بەردەوامیی ئەم بوونەی دەسەڵات بکات[3]، دەسەڵاتی سیاسیش، بۆ ڕەنگرێژکردن و پەسەندکردن و ڕوونکردنەوەی دەسەڵاتی باڵای خۆی و سەپاندنی بەسەر هێز و لایەنە نەیارەکانیدا، پێویستی بەم زانینە مێژووییە بوو[4]. بێگومان قۆرخکردنی شەرعیەتی حوکم لەلایەن خەلافەتەوە ڕێی پێدەدا ئەو میتۆدە دیاری بکات، کە دەبوو مێژوونوس لە هەڵبژاردنی

---

[1] بڕوانە: إبن سعد: الطبقات، ج٧، ص٢٨٠.

[2] إبن سعد: م.ن، ج٥، ص٣٩٢. خليفة بن خياط: تاريخ، ص٢٨٨. إبن قتيبة: عيون الاخبار، ج١، ص٢٢٩. إبن الجوزي: المنتظم، ج٤، ص١٧٨٤.

[3] بۆنمونە خەلیفە تا دەمرد، مێژوونوسەکان ژمارەیەك لاپەڕەی زۆری کتێبەکانیان تایبەت دەکرد بەو.

[4] بڕوانە: اركون: الفكر الاسلامي، ص١٦٨.

کێڕانەوەکاندا پەیڕەوی بکات و (بوون) بدات بەو رووداوانەی، کە بە مێژووییان دادەنێت، چونکە مێژوونوس لەکاتی نوسینی مێژوودا تەنها بیر لەو ناوەندە دەکاتەوە لێی دەدوێت و رایەڵەکانی رووداوەکەی پێوە دەبەستێت، واتە مێژوونوس لە ناو چوارچێوەی شێوە و گوتراوە سەپێنراوەکانی ئەم ناوەندە بەسەر تێگەیشتنیدا، جووڵە دەکات و بنەمای مەعریفیی زەینی خۆی بنیات دەنێت.

بوونی کورد لەمێژووی نوێدا، لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسەی وڵاتگیری لە سەردەمی راشیدیندا، بە تایبەتی لەسەردەمی هەریەك لە عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففاندا (١٣-٣٢ك/ ٦٣٤-٦٥٢ز)، دەست پێدەکات[1]. دیارە بوونی کورد لەو سەردەمەدا ئەوەندە بەهێز بووە، کاریگەریی لەسەر یادگەی رزگارکەرەکان بەجێ هێشتووە، بۆیە لەبارەی کوردەوە ئەوەندە گێڕانەوەیان لابووە، بەشی ئەوەی کردووە یەکێك لە ئەخبارییە یەکەمینەکان، کە ناوی (عەلی کوڕی موحەمەدی مەدائینی)[2]یە، کتێبێکی تەواو لەسەر کورد و گرتنی وڵاتەکەیان بنوسێت، ئەم نوسەرە بەوە ناسراوە لەبارەی وڵاتگیرییەکانەوە زۆر کتێبی هەیە، کتێبی (القلاع والأكراد) یەکێکە لەو کتێبانە[3]، کە وەك زۆر لە کتێبەکانی تری مەدائینی، لەڕیزی کتێبە ونبووەکانە. سەبارەت بە گرنگیی ئەم کتێبە، ئەوە دوویات دەکەینەوە پێشتر سەبارەت بە کتێبەکەی دینەوەری، کە تایبەت بوو بە ریشەی کورد، وتمان و دەڵێین: ئەگەر ئەم کتێبە بمایە، سوودی زۆری دەبوو بۆ لێکۆڵینەوەی وردی کورد لەو ماوە یەکلاییکەرەوەی پەیوەندی

---

(1) لەبارەی ئەم بوونەوە بڕوانە: البلاذري: فتوح، ص٣١٧-٣٢٣، ٣٢٥، ٣٧١، ٣٧٧. الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ٤، ص٣٣، ٧٦، ٧٨، ١٨٣، ١٨٦...هتد. قدامة بن جعفر: الخراج، ص٣٢٨، ٣٧٨، ٣٨١، ٣٨٥. إبن الأثير: الكامل، ج٣، ص٤٢-٤٨، ٨٢-٨٥، ٩٩-١٠٠.

(2) ئەبولحەسەن عەلی کوڕی موحەمەد کوڕی عەبدوڵلا ئەلمەدائینی، ساڵی (١٣٥ك-٧٥٢ز) لە بەسرە لە دایکبووەو لە مەوالیەکانە. لە بەغداد جێگیر بووە، ساڵی(٢٢٥ك/٨٣٩ز) لە بەغداد مردووە. بەوە ناسراوە کە ژمارەیەکی زۆر دانراوی هەیە. دیارترین ئەو دانراوەی کە ماوەتەوە کتێبی (نسب قريش)ە. إبن النديم: الفهرست، ص١٥٣-١٥٨. ياقوت الحموي: معجم الأدباء، ج١٤، ص١٢٤-١٣٩. بدري محمد (فهد): شيخ الأخباريين أبو الحسن المدائني، (النجف: ١٩٧٥)، ص١٦ بە دواوە.

(3) إبن النديم: م.ن، ص١٥٦. ياقوت: م.ن، ج١٤، ص١٣٥.

کورد بە موسڵمانە عەرەبەکانەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەوە بەدوور نازانین مێژوونوسەکانی دواتر پەنایان بردبێتە بەر هەندێ لەوەی لەم کتێبەدا هاتووە، بەتایبەتی ئەگەر زانیمان کتێبەکانی مەدائینی بەگشتی، سەرچاوەی سەرەکیی زۆر مێژوونوس بوون و زۆر شتیان لێ وەرگرتوون و متمانەیان بە گێڕانەوەکانی هەبووە[1].

ئەوەی لەم سەرەتا دامەزرێنەرەی بوونی کورد لە مێژووی ئیسلامدا بۆ ئێمە گرنگە، ئەو تێڕوانینە ناوەندییە ـ دەسەڵاتخوازەیە، کە ئەم بوونەی بەرجەستە کردووە، لێرەدا ناوەندێکی ئیسلامی هەیە هەواڵەکان تۆماردەکات و سیمایەکی ئیسلامی دەدات بە حەقیقەتە مێژووییەکان، بۆیە زۆربەی ئەوەی لەبارەی کورد و وڵاتەکەیانەوە دەیزانین، بەتایبەتی لەکاتی وڵاتگیرییە ئیسلامییەکاندا، لە مێژوونوسە موسڵمانەکان و ئەو کتێبانەیانەوە وەرگیراوە کە لەبارەی ئەم پرۆسە چارەنوسسازەوەیە سەبارەت بەو گەل و نەتەوانەی وورده ورده دەهاتنە ناو ئیسلامەوە. مێژووی گرتنی ئەو وڵاتانە، مێژووی بوونی کارەکیی ـ ئەو گەل و نەتەوانەیە ـ لەناو عەقیدەی نوێ و دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەدا. بەڵام ئەوەی لەم مێژووە وردبێتەوە، دەبینێت مێژووییەکە گوزارشت لە گۆشەنیگای رزگارکەرە سەرکەوتووەکە، لە سەرکردەکانی، لە شەڕەکانی، لە سەرکەوتنەکانی بەسەر کورد و گەلانی تردا دەکات. (سەنتراڵیزمی مێژوویی) بەر ئەم سەرکەوتووە کەوتووە، کە جیهادی کردووە و دژی کوردە (بەرگریکەرەکان) جەنگاوە و[2]پاشان لە زۆر شوێندا شەڕی ئەو کوردانەشی کردووە، کە ((یاخی بوون))[3]. ئەم ((رزگارکەرانە)) بزوێنەری مێژوون و وڵاتی (ئەویتر) ی دوژمنی خۆیان و عەقیدەکەیان دەگرن.

---

[1] دیارترین ئەو مێژوونوسانە، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتیان پێدەبەستین، بریتین لە: البلاذري ، اليعقوبي، الطبري، إبن الأثير، إبن كثير، ...هتد. بڕوانە: فهد: م.ن، ص١٤١، ١٨٩. لە زۆر شوێنی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پێناسەکانی زۆربەی ئەو مێژوونوسانە دەبینیت.

[2] البلاذري: الفتوح، ص٣٢٢-٣٢٣. الطبري: م.س، ج٤، ص٣٣، ٧٦، ٧٨. قدامة بن جعفر: م.س، ص ٣٢٨، ٣٨١. إبن الجوزي: المنتظم، ج٣، ص٢١٩. إبن الأثير: الكامل، ج٣، ص٤٦-٤٨، ٨٢-٨٥.

[3] البلاذري‌م.ن، ص٣١٩-٣٧١. الطبري: م.ن، ج٤، ص١٨٣، ١٨٦، ج٥، ص٢٠١. قدامة: م.ن، ص٣٨٥. إبن الجوزي: م.ن، ج٣، ص١١٨٣. إبن الأثير: م.ن، ج٣، ص٩٩-١٠٠.

ئەم سەنترالیزمە لە بینینی رووداوەکاندا، بەئەندازەیەك تەحەکومی بە مێژوونوس دەکرد، ئاساییە کتێبێکی تایبەت بە گرتنی ولاتی کوردان ببینین بەهیچ جۆرێك باسی کورد و تەنانەت ناوی کوردی تێدا نەهاتبێت، وەك لای واقیدی[1] و لە کتێبەکەیدا لەبارەی گرتنی جەزیرە و ناوچە کوردیەکان[2] ئەمە دەبینین. بە بۆچوونی ئێمە، هەموو ئەمانە رێیان بۆ زۆر مێژوونوس خۆش کرد، کە لەم قۆناغەدا کورد لە مێژوو بکەنە دەرەوە یان کورد بە مەوجودێکی (نا مێژوویی) دابنێن، وەك ئەوەی ولاتەکەیان کەسی تێدا نەبێت.

## ٢ ـ پەراوێزخستنی کورد لە مێژوودا

سیمایەکی دیاری نوسینەوەی مێژووی ئیسلامی لەم قۆناغەدا، کەمی هەواڵە لەبارەی کورد و بوونی سیاسییان لە کایەی ئیسلامیدا. هەموو ئەوەی هەیە هەندێك هەواڵی پەرت و بلاوە و لە یەك چوارچێوەی مێژووییدا کۆ نابنەوە. بۆیە لێکۆڵەر لە کاتی وردبوونەوە لە بەرهەمە مێژووییەکانی ئەو سەردەمەدا، هەست دەکات کورد لە مێژوودا غایب کراوە، بە دەربڕینێکی وردتر، کورد لەو سیاقە مێژووییەدا، کە مێژوونوس کاری لەسەر تۆمارکردنی دەکرد، پەراوێز خراوە.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەمە، وەك نمونەیەك بۆ ئەو مێژوونوسانەی لە مێژوودا چارەسەری ئامادەیی یان نائامادەیی کوردیان کردووە، مێژوونوسێك وەردەگرین و لێی

---

[1] الواقدي: (ئەبو عەبدولا محمد کوڕی عەمر ئەلواقدی)یە، لە مەوالیەکانەو مەیلی بەلای مەزهەبی شیعەدا هەبووە. ساڵی (١٣٠ك/٧٤٧ز) لە مەدینە لەدایکبووە، ساڵی (٢٠٧ك/٨٢٣ز) لە بەغداد مردووە. لە دەسەلاتداەکانەوە نزیکبووە، باس وهەواڵی شەڕەکانی دەگێڕایەوە، زۆر کتێبی بەناوبانگی هەیە، وەك (کتاب المغازي) و (فتوح الشام) و ...هتد. إبن النديم: م.س، ص١٥٠-١٥١. الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، ج٣، ص١٩٦. ياقوت الحموي: معجم الأدباء، ج٧، ص٥٦.

[2] تاريخ فتح الجزيرة والخابور ودياربكر والعراق، تحقيق: عبدالعزيز فياض حرفوش، (دمشق: ١٩٩٦). (محقق)ی ئەم کتێبە لە (تحقيق)کردنەکەیدا پشتی بە یەك دەستنوس بەستووە، هەروەها لە کتێبەکەدا زۆر زانیاری و رووداو هەن ـ کە بەشێوازی چیرۆك گێڕراونەتەوە ـ و لای هیچ کام لەو مێژوونوسانەی تر نایانبینین کە باسی ولاتگیرییەکانیان کردووە، ئەمەش وادەکات گومان لە هەندێکیان بکەین. وەك ئیبن خەلدون دەڵێت کتێبەکانی واقیدی زۆر شتی سەرپێیی و تانەلێدەریان تێدایە. بڕوانە: المقدمة، ص٣.

دەکۆڵینەوە. ئەویش (ئیبن واضح)ی مێژوونوس و وڵاتناسە، کە بە یەعقوبی (دوای ساڵی ۲۹۲ک/۹۰۵ز مردووە) ناسراوە[١]. بەڕای ئێمە مێژووەکەی بۆ ئەم بابەتە نمونەیەکی باشە، چونکە یەعقوبی بە هۆی گەڕانە زۆرەکانیەوە، لە نزیکەوە کوردی ناسیوە. لە کتێبە جوگرافیەکەیدا، کە بە ناوی (البلدان)ەوەیە تێبینیی ئەمە دەکرێت، چونکە چەند جارێك باسی کورد دەکات، هەروەها باسی شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکات بەتایبەتی لە هەرێمی چیادا[٢]، لە سەرەتای کتێبەکەیدا وا دەردەکەوێت لە نزیکەوە سەرنجی کوردی داوە، بۆیە حوکمێکی ئینتیباعییان بەسەردا دەدات و بە (دڵڕەق)[٣] وەسفیان دەکات.

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە کتێبی (تاریخ الیعقوبی)یەکەیەتی و کردوویەتی بە دوو بەشی سەرەکییەوە: بەشی یەکەم، باسی مێژووی جیهان و نوسەرە دیارەکانی پێش سەرهەڵدانی ئیسلام دەکات. بەشی دەووەمیش، تایبەتە بە مێژووی ئیسلام و رووداوەکانی، تا ساڵی (۲۵۹ک/۸۷۲ز)، کە بە خەلیفە (المعتمد علی الله)ی عەبباسی (۲۵٦-۲۷۹ک/ ۸٦۹-۸۹۲ز) کۆتایی پێ هێناوە. ئەم کتێبە، بە گەواهی یەعقوبی خۆی، کۆکەرەوەی هەموو وتار و گێڕانەوەکانی پێش خۆیەتی، هەموو ئەوانەی تیا کۆکردووەتەوە، کە لای گێڕەرەوەکانی پێش خۆی هەبوون: «ویستمان هەموو ئەوانە کۆبکەینەوە، کە کەسانی پێش ئێمە باسیان کردووە»[٤]. بەڵام ئایا لەناو هەموو ئەو گێڕانەوانەدا شوێنی کورد کامەیە؟ لەراستیدا لەبەشی یەکەمدا، کە سەبارەت بە مێژووی جیهانە، بەهیچ جۆرێك باسی کورد نەکراوە. لەمەشدا سەرزەنشتی یەعقوبی ناکەین،

---

[1] (أحمد بن أبي یعقوب اسحاق بن جعفر بن وهب بن واضح العباسي)، مێژوونوس و جوگرافیناسە. باپیرەی مەوالیی خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور بووە، لەو نوسەرانەیە کە لە دەسەڵاتەوە نزیکبووە. هەروەها یەعقوبی لە رۆژهەڵات پەیوەندی بە خێزانی تاهیرییەکانەوە هەبووە. بەناوبانگترین کتێبەکانی بریتین لە: (التاریخ الکبیر) کە بە (تاریخ الیعقوبی) ناسراوە، (کتاب البلدان) ، (مشاکلة الناس لزمانهم)، ...هتد. یاقوت الحموي: مجم الأدباء، ج٥، ص١٥٣-١٥٤. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: یاسین ابراهیم علي (الجعفري): الیعقوبي المؤرخ والجغرافي، (بغداد: ۱۹۸۰)، ص۱۹ بەدواوە.

[2] البلدان، ص٣٤-٣٥، ٣٩.

[3] م.ن، ص٦.

[4] تاریخ الیعقوبي، ج٢، ص٥.

ئەمەی ئەو بەوە پاساو دەدرێتەوە ئەو بەپێی ئەو گۆشەنیگایە مێژووی نوسیوە، کە لەو کاتەدا لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا سەبارەت بە مێژووی جیهان هەبووە و بۆ تۆمارکردنی مێژووی نەتەوەکان کۆمەڵێك مەرج دانرابوو و ئەو نەتەوانەی لەو مێژووەدا چالاکییان نەبوو بێت، مێژوویان تۆمار نەکراوە[1].

بەڵام لە مێژووی ئیسلامیدا، کە بەلای ئێمەوە گرنگە، کورد تەنها لە دوو گێڕانەوەدا ئامادەییان هەیە: لە گێڕانەوەی یەکەمدا یەعقوبی تەنها باسی یەك کەسایەتیی کورد دەکات، ئەویش (جیلویەی کوردی)یەو وا دەردەکەوێت لە ململانێی خەلیفە ئەمینی عەبباسی (١٩٣/١٩٨ك/ ٨٠٩-٨١٤ز) لەگەڵ مەئمونی برایدا، ئەم لایەنگری خەلیفە ئەمین بووە. هەموو ئەوەی یەعقوبی سەبارەت بە جیلویە پێمان دەڵێت ئەوەیە جیلویە لەگەڵ ئەمیندارەکەی ئەهوازدا ساڵی (١٩٦ك/٨١١ز) کوژراوە[2].

گێڕانەوەی دووەمیش لەبارەی میر (عیصمەتی کوردی)یە[3]، کە فەرمانڕەوای شاری مەرەند[4]بووە. ئەم کوردە خزمەتی بزوتنەوەکەی بابەکی خوڕەمی کردووە (٢٠١-٢٢٣ك/ ٨١٦-٨٣٨ز)[5]، ئەم بزوتنەوەیە خەلافەتی عەباسیی هەراسان کردبوو، عەباسیەکان زۆر بە زەحمەت توانیان سەرکوتی بکەن و لەناوی بەرن. یەعقوبی لە گێڕانەوەکەیدا باسی گرتنی ئەم میرە کوردە دەکات لەلایەن خەلیفەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لە ئازەربایجان یەکێك لە سەرکردەکان فێڵی لێ کرد و گرتی و بردی بۆ خەلیفە موعتەصەم (٢١٨-٢٢٧ك/ ٨٣٣-٨٤٢ز)[6].

---

[1] بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم نامەیە لە بارەی پاساوی غاییکردنی کوردو ناکارابیان لە چوارچێوەی(مێژووی جیهاندا) ل

[2] م.ن، ج٢، ص٤٤٠. لەبارەی جیلویە بڕوانە: توفیق: الكرد في العصر العباسي، ص٥٥-٥٦.

[3] تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٤٧٣.

[4] مەرەند: یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی ئازەربایجان و دەکەوێتە باکوری دەریاچەی ورمێوە. یاقوت معجم البلدان، ج٥، ص١١٠.

[5] تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٤٧٣. هەروەها بڕوانە: الطبري: م.س، ج٩، ص١٢. إبن الأثير: الكامل، ج٥، ص٢٣٤. حسين قاسم (العزيز): البابكية أو إنتفاضة الشعب الأذربيجاني ضد الخلافة العباسية، (بيروت:١٩٩٦)، ص٢١١.

[6] تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٤٧٣.

بەدەر لەم دوو گێڕانەوەیە، کورد لە (تاریخ الیعقوبی)دا بوونیان نییە، بۆیە لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین: ئایا بوونی کورد تەنها لەم دوو گێڕانەوەدا کورت دەبێتەوە؟ ئایا کورد جموجوڵی تریان نەبووە (ئەگەر باوەڕمان بەوە هەبێت کە مێژوو، مێژوویەکی جوڵاوە نەك وەستاو)؟ لەوانەیە بە گەڕانەوە بۆ پێشەکیی کتێبەکە بتوانین جۆرە وەڵامێکی ئەم پرسیارانەمان دەست بکەوێت، چونکە یەعقوبی باس لەوە دەکات لە ترسی درێژدادڕی هەندێ هەواڵی لابردووە و هەندێکیشی کورت کردووەتەوە[1]. ئێمە دەمانەوێت تیشك بخەینە سەر ئەم خاڵە، واتە تیشك بخەینە سەر ئەو هەواڵانەی یەعقوبی لایبردوون و بەشایەنی ئەوەی نەزانیون تۆماریان بکات و چۆنیەتی کورتکردنەوەی هەواڵەکان. بێگومان زانینی لابراو و کورتکراوەکان کارێکی قورسە و تەنها بە لێکۆڵینەوە لەوەی یەعقوبی لە کتێبەکەیدا تەرکیزی کردووەتە سەر، دەتوانین رووە راستەقینەکەی ئەم هەواڵە لابراو و کورتکراوانە ببینین، چونکە خوێندنەوەی ئەو هەواڵانەی لە مێژووەکەیدا هێشتوونیەتەوەو لای نەبردوون، یارمەتیمان دەدات ئەو هەواڵانە بزانین، کە لای بردوون. کەواتە لێرەدا، مەسەلەکە ئەو مێژووەوەیە، کە مێژوونوس دەینوسێت و قەناعەتی بە نوسینی هەیە، پاشان ئەو مێژووەی ناینوسێت و قەناعەتی بە نوسینی نییە، چونکە پاڵنەرێك نادۆزێتەوە بۆ نوسینی و لەکاتی تۆمارکردنی هەواڵەکاندا لە دەرەوەی بیرکردنەوە یان گرنگی پێدانی ئەودایە.

یەعقوبی لە پرۆسەی تۆمارکردندا، بیر لە مێژوویەکی تایبەت دەکاتەوە، ئەویش مێژووی ناوەندێکی دەسەڵاتخوازە، کە بە پلەی یەکەم خەلیفە نوێنەرایەتیی دەکات و بە پلەی دووەمیش پێشەواکانی شیعە، چونکە یەعقوبی هەواداریان بووە[2]. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە مێژوو بەگشتی لەگەڵ باوەڕی یەعقوبی بە مەرکەزیەتی دەسەڵاتی ئیسلامی دەگونجێت. ئەو یەکێك لە کتێبەکانی بۆ چۆنیەتی چاولێکەری خەڵك (مشاکلة الناس) بۆ خەلیفەی سەردەمەکەیان و لاساییکردنەوەی تەرخاندەکات، خەڵك ((رێی

---

[1] م.ن، ج٢، ص٦.

[2] بڕوانە: مارجلیوث: دراسات عن المؤرخین، ص١٤٠. الدوري: بحث في نشأة علم التأريخ، ص٥٢-٥٣.

خەلیفەکەیان دەگرن و لەسەر مەزهەبی ئەو دەڕۆن))[١]. ئەم بۆچوونەی یەعقوبی لە کتێبی (البلدان)ەکەیدا زیاتر روون دەبێتەوە، کاتێك لە سەرەتاکەیدا باس لەوە دەکات بە عێراق ـ ناوەندی خەلافەی عەباسی ـ دەست پێدەکات، چونکە بە بۆچوونی ئەو عێراق چەق و ناوەندی دنیایە[٢]. شایەنی باسە تەنها یەعقوبی ئەم بۆچوونەی نەبووە، کە دەچێتە ناو بۆچوونی گشتیی باوی ئەو قۆناغە لەبارەی ناوەندییەتی عێراق و پاشان بەغداد وەك ناوەندی خەلافەت، لەو کاتەدا عێراق بە (جەرگەی دنیا)[٣]و (باشترین زەوی)[٤]دادەنرا. هەروەها زۆر دەقی دانراو هەن پیرۆزی و پلەیەکی بەرز دەدەن بە عێراق لای خوا و پێغەمبەر[٥]، هەمان شت لەبارەی بەغدادیشەوە دەوترێت، کە لەو کاتەدا بە ناوەڕاستی دنیا و بەهەشتی سەر زەمین دادەنرا[٦]. کاتێك یەعقوبی مێژوو تۆماردەکات، هەموو ئەمبانەی لە پێش چاوە و بەپێی زنجیرەی بەدوای یەکداهاتنی خەلیفەکان بابەتەکەی دەخاتەڕوو، واتە بە پلەی یەکەم گرنگی دەدات بە دەسەڵاتی ناوەندی و ئەوەی پێیەوە پەیوەستە و هەموو هەواڵەکانی تری جگە لەمە کورت دەکاتەوە. کتێبەکانی یەعقوبی بە نمونەیەکی باشی ئەم جۆرە نوسینانە دادەنرێن[٧]. لێرەدا پەراوێزخستنی کورد و پشتگوێخستنی هەواڵەکانیان لە مێژوودا سەبارەت بە مێژوونوس پاساوی خۆی هەیە، چونکە ئەم پەراوێزخستنە، رەوایەتی خۆی لەو مەرکەزیەتەی نوسینەوەی مێژوودا دەدۆزێتەوە، کە یەعقوبی لەکاتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیەدا، پێوەی پابەندبوو. یەعقوبی

---

(1) مشاكلة الناس لزمانهم، تحقيق: وليم ملورد، (بيروت:١٩٦٢)، ص٩.

(2) البلدان، ص٣. خەلیفە (المتقي لله)ی عەباسی (٢٣٩-٣٣٣ك/٩٤١-٩٤٤ك) لە وەسفی عێراقدا هەمان دەربڕین بەکاردەهێنێت. بڕوانە: الصفدي: نُكث الهميان في نُكت العميان، ص٨٧-٨٨.

(3) إبن قتيبة: عيون الأخبار، ج١، ص٢٢٢.

(4) أبو حنيفة الدينوري: الأخبار الكوال، ص١.

(5) الخطيب البغدادي: م.س، ج١، ص٢٤-٢٥. سبط إبن الجوزي: مرآة الزمان، السفر الأول، ص٢٦٩.

(6) الثعالبي: ثمار القلوب في المضاف والمنسوب، تحقيق: محمد أبو الفضل، (القاهرة: ١٩٦٥)، ص٥١٢. الثعالبي: لطائف المعارف، تحقيق: إبارهيم الأبياري، (القاهرة: د.ت)، ص١٧٠

(7) بڕوانە: روزنتال: علم التأريخ، ص٦٧. مصطفى: التأريخ العربي والمؤرخون، ج١، ص٢٥٢. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الجعفري: م.س، ص٦٢-٦٦.

راستەوخۆ و بێ لێکدانەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەم مەرکەزیەتەدا دەکرد، ئەمەش میکانیزمێکی خستبووە بەردەست یەعقوبی بۆ دوورخستنەوەی ئەوانەی پەیوەندیی بەهێزیان بە دەسەڵاتی ناوەندییەوە نەبوو و کوردیش لەپێش هەموو ئەمانەوە دەهات.

لە نوسینەوەی مێژوودا، ئەوەی لەبارەی یەعقوبییەوە وتمان، بەسەر مێژوونوسەکانی تری وەك (ئیبن قوتەیبە[1] و ئەبو حەنیفە[2] و مەسعودی[3] و...هتد[4])دا دەچەسپێت، ئەوانیش کوردیان غایب کردووە و پانتاییەکی کەمیان بۆ تەرخان کردووە، تەنها جارێك یان چەند جارێك بەسەرپێیەوە ئاماژەیان بە بوونی کورد کردووە. ئەو هەواڵانەی ئەم مێژوونوسانە لەبارەی کوردەوە بە ئێمەیان گەیاندووە کورت و ناتەواون، بۆیە لێکۆڵەر ناتوانێت مێژوویەکی زنجیرەیی و بەیەکەوە بەستراوی ئەو سەردەمەیان لێ پێك بهێنێت، ناتوانێت بە هۆیانەوە وێنەیەکی روونی ئەم سەرکردە یان ئەو سەرکردەی کورد، ئەم کۆمەڵ یان ئەو کۆمەڵ، خێڵێك لە خێڵە کوردیەکان، وردەکاری و پاڵنەری ئەو بزوتنەوانەی کورد بەرپایان کردوون، یان ئەو سەرکردە ناوچەییانەی دروست بوون،...هتد ناتوانین وێنەیەکی روونی هیچ کام لەمانەیان لێوە بەدەست بهێنین.

بەڵام کاتێك باس لە غایبکردنی کورد دەکەین لە نوسینەوەی مێژووی ئیسلامیدا، مانای ئەوە نییە ئەڵتەرناتیفێکمان هەیە ئامادەیی کورد دەچەسپێنێت و هەندێ نەزانراوی مێژووی کارەکیی ئەم قۆناغەی کوردمان بۆ روون دەکاتەوە، ئەگەرچی نکوڵی بوونی هەواڵی کورت ناکەین لەسەر کورد لە سەرچاوە نا ئیسلامییە تۆمارکراوە سریانی و ئەرمەنی و بیزەنتیەکاندا[5]، بەڵام بەراورد بە مێژوونوسە موسڵمانەکانی تۆمارکەری

---

[1] عیون الأخبار، ج١، ص٢٢٩. الإمامة والسياسة، تحقيق: علي شيري، (قم: ١٩٩٠)، (باسی کوردی تێدا نەکراوە)

[2] الأخبار الطوال، ص٣٦٧.

[3] مروج الذهب، ج٢، ص ، التنبيه والإشراف، ص٣٢٤.

[4] وەك: خليفة بن خياط: تأريخ خليفة بن خياط، ص٢٢٨. إبن أعثم الكوفي: كتاب الفتوح، (بيروت: د.ت). المقدسي: البدء والتأريخ، ج٢، ص٢٨٦، ٣٠٤.

[5] جێی داخە ئەم تۆمارکراوانە و ئەو هەواڵانەی لەبارەی کوردەوە تیایاندا هەیە ـ هەرچەند کەمن ـ تا ئێستا بەشێوەیەکی تێرو تەسەل لێیان نەکۆڵراوەتەوە، بۆ ئەوەی وێنەیەکی کوردمان ◄◄

هەواڵەکانی ئەو (ئوممەت ـ دەوڵەت)ەی کورد بەشێك بووە لێی، کورد کرۆکی بایەخدانی مێژوونوسەکانی ئەم نەتەوانە نەبووە.

## ٣ ـ وڵاتی کورد وەك مەوجودێکی دەسەڵاتییانە

پەراوێزخستنی کورد لە مێژوودا، واتای غایبکردنی وڵاتەکەیان و ئەو هەرێمانە نییە، کە لەو سەردەمەدا تیایاندا نیشتەجێبوون، چونکە ئەم هەرێمانە: یەکەم: بەشێك بوون لە (خانەی ئیسلام) و دووەمیش: بەشێك بوون لە سەرمایەی دەسەڵاتی ناوەندی. بۆیە بایەخدان بە هەواڵەکانی ئەم وڵاتە کرۆکی کاری ئەو مێژوونوسەیە، کە مێژووی ناوەند دەنوسێتەوە. زانینی مێژوویی ئیسلامیش دەیەوێت لە میانەی گێڕانەوەکانییەوە ئەوەمان پێ بڵێت ئەم وڵاتە کایەیەکی جیۆگرافی ـ سروشتیی سەر بە خەلافەتە و لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە، چونکە خەلافەت ئەو دەسەڵاتەیە، کە گوزارشت لە رووە رەسمیەکەی (ئوممەت ـ دەوڵەت)ی ئیسلامی دەکات.

ئەوەی ئێمە دەیبینین، ئەوەیە ئەم وڵاتە زۆر رەهەندی هەبووە، دیارترینیان رەهەندی کارگێڕی ـ ئابورییە، لێرەدا مێژوونوس ئەو روانگە دەسەڵاتخوازییە بەرجەستە دەکات، کە داوای بەڕێوەبردنی زەوی و زار و کۆکردنەوەی باجی دەکرد لە فۆڕمێکی ناوەندیدا. لەبەرئەمە کاتێك مێژوونوس ئەو هەواڵانە تۆماردەکات، کە پەیوەستن بە دەسەڵاتی ناوەندییەوە، جار جارێك باسی دانانی کاربەدەستەکان و گۆڕینیان دەکات لەلایەن دەسەڵاتەوە[1] یان لەلایەن ئەوانەی کرابوون بە فەرمانڕەوای ئەم وڵاتە[2]، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت دەوڵەت خاوەنی ئەم وڵاتە بووە و بە ئارەزووی خۆی دەستکاریی کردووە

---

◄◄ پێبدەن جیاوازییێت لەو وێنەیەی کە لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا سەبارەت بە کورد هەیە. ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرە بکرێت ، دەتوانرێت بوترێت لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنتر دەبێت.

(1) بۆ نمونە بڕوانە: خليفة بن خياط: م.س، ص١٥٥-١٥٦، ٢٠٠، ٢٩٦، ٣٤٥. البلاذري: فتوح، ص٢٠٣-٢٠٤، ٣٠١. أبو حنيفة الدينوري: م.س، ص١٤٤.

(2) اليعقوبي: تأريخ اليعقوبي، ج٢، ص٩٥، ١٨٥، ٢٠٠، زۆر شوێنی تر. هەروەها لای مێژوونوسە بەناوبانگەکانی تری وەك (الطبري ، إبن الجوزي، إبن الأثير)و...هتد زۆر زانیاری هەیە لەبارەی دانان و لابردنی کاربەدەستەکان و کارەکانیانەوە لە وڵاتی کورد. بەڵام ئێمە لە ترسی درێژدادڕی بەپێویستمان نەزانی باسیان بکەین.

و دەسەڵاتێکی ڕەهای هەبووە - بۆنمونە - لە تێکدانی شارە یاخییەکانی ئەم وڵاتەدا، یان دەرکردنی فەرمانی لەم جۆرە[1]، هەروەها دەوڵەت دەیتوانی شار و هەرێمەکان بدات بە کەسانێك لە بەرامبەر ڕێژەیەك پارەدا[2] - ئەمە بە ئیقتاعی دەوڵەتی ناوەندی ناو دەبرا[3] - یان تەنانەت لەبەرامبەر چەند دێڕە شیعرێکدا[4]. بە بۆچوونی ئێمە کۆکردنەوەی باجی زەوی و زار، واتە پاڵنەری ئابوری، لە پشت ئەم جەختکردنەوەیە لە خاوەنداریەتیی دەوڵەت بۆ زەوی و زار، چونکە ئەم زەویانە سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی ئابوریی دەوڵەتی ئیسلامی بوون، بەتایبەتی دوای قۆناغی وڵاتگیرییەکان، کە لەڕووی ئابوریەوە قۆناغی پشت بەستن بوو بە تاڵانی و دەسکەوت (الغنيمة و الفيء). دەوڵەت بەپێی هەندێك مەرج و یاسای شەرعیی دیاریکراو شەرعیەتی تەحەکومکردنی هەبوو بەم زەویانە.

لەم ڕوانگەوە دەتوانین لەو میتۆدە بدوێین، کە فەقیه و مێژوونوسەکان گرتبوویانە بەر بۆ تۆمارکردنی ئەو هەواڵانەی پەیوەستن بە دەست بەسەردا گرتنی زەوی و زار - چ بە ئاشتی بێت چ بە زۆر- و بڕی خەراجی سەپێنراو بەسەر وڵات و هەرێمەکاندا و باس کردنی زانیارییەکان، ئەمە بۆ خزمەتی دەسەڵاتی ناوەندی بووە لە بەڕێوەبردنی سەرچاوە ئابورییەکانیدا[5]. بۆیە فەقیه و مێژوونوسەکان لە کتێبەکانیاندا، لە چوارچێوەی

---

[1] أبو الحنيفة الدينوري: م.ن، ص٢٦٨-٢٦٩. إبن خلدون: تاريخ، ج٣، ص٣١.

[2] البلاذري: فتوح البلدان، باسی خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور (١٣٦-١٥٨ك/٧٥٣-٧٧٤ز) دەکات کە فەرمانیداوە ((جگە لە حەران، هەموو شارەکانی تری جەزیرە خاپوور بکرێن)) ئەمەش بە هۆی زاڵبوونی بزوتنەوە یاخیگەرییەکانەوە بووە بەسەر ئەو شارانەدا.

[3] لەبارەی ئەم جۆرە (الإقطاع)و گرنگترین تایبەتمەندیەکانی، لە کایەی ئیسلامیدا بڕوانە: فؤاد (خليل): الإقطاع الشرقي - بين العلاقات الملكية ونظام التوزيع، (بيروت: ١٩٩٦)، ص١١٩ بەدواوە.

[4] ئیبن قوتەیبە باس لەوە دەکات کە خەلیفە مەئمون (١٩٨-٢١٨ك/ ٨١٤-٨٣٣ز) لە بەرامبەر دوو دێڕە شیعردا کە پێی سەرسامبووە، شاری هەمەدان و دینەوەری هەرێمی چیای داوە بە شاعیرێك. بڕوانە: عيون الأخبار، ج٤، ص٣٦.

[5] کتێبی (الخراج) کە ئەبی یوسف (١٨٢ك/٧٩٨ز مردووە) لەسەر داوای خەلیفە هارونە ڕەشید (١٧٠-١٩٣ك/ ٧٨٦-٨٠٩ز) لەبارەی ئەم مەسەلەو سنوری شەرعی و ئەوەی پەیوەستە بەم بابەتەوە نوسیویەتی، باشترین نمونەیە بۆ ئەمە . بڕوانە: كتاب الخراج، ضمن: في التراث الإقتصادي الإسلامي، (بيروت:١٩٩٠)، ص٩٦.

پرۆسەکانی وڵاتگیری و چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسانەدا، باسی زەوی و زاری وڵاتی کوردیان کردووە[1]. نەك هەرئەمە، تەنانەت جاری وا هەیە هەندێکیان باسی ئەو برە باجەیان کردووە، کە لەسەردەمێکی دیاریکراودا بەسەر ئەم وڵاتەدا سەپێنراوە، وەك یەعقوبی لە باسکردنی بڕی باجی سەپێنراو بەسەر هەرێم و ناوچە کوردییەکاندا لەسەردەمی خەلیفە معاویەی کوڕی ئەبی سوفیانی ئەمەویدا (٤٠-٦٠ك/٦٦٠-٦٧٩ز)، ئەمەی کردووە[2]. لێرەوە نوسینەوەی مێژووی ئیسلامی مۆرکێکی رەسمی وەردەگرێت و خزمەتی دەسەڵاتی ناوەندی دەکات و وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەداتەوە، کە پەیوەستن بە زەوی و زار و مەسەلەی لەم جۆرەوە. ئەوەی چاوێك بە کتێبی (فتوح البلدان)ی بلازریدا (٢٧٩ك/٨٩٢ز مردووە)[3] بخشێنێت، کە بەپێی هەڵسەنگاندنی مەسعودی بە باشترین کتێبی بواری وڵاتگیری دادەنرێت[4]، تێبینی ئەمە دەکات. بلازری ئەم کتێبەی تایبەت کردووە بە هەواڵی وڵاتگیرییەکان و لەناویشیاندا باسی چۆنیەتی گرتنی وڵاتی کورد دەکات[5]، هەروەها باسی هەڵوێستی رامیاری و ئابوری و کارگێڕی دەکات بەرامبەر ئەم وڵاتە[6]، جگە لەوەی باسی رێژەی ساڵانەی ئەو باج و سەرانەیەش دەکات، کە بەسەر

---

(1) أبو يوسف: م.ن، ص١٤٣-١٤٦. البلاذري: فتوح، ص١٧٥-١٧٦، ٣١٧-٣١٨. الطبري: م.س، ج٤، ص ٣٤-٣٧، ٥٤-٥٦، ١٤٦-١٤٩. قدامة بن جعفر: م.س، ص٣١٢-٣٣٦، ٣٧٠-٣٨٦. لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تر.

(2) تأريخ اليعقوبي، ج٢، ص٢٣٣. هەروەها بڕوانە سەرژمێرییەکان لە سەردەمە جیاوازەکاندا لەم سەرچاوانەدا: إبن سعد: م.س، ج٣، ص٢٨٢. الجهشياري: الوزراء والكتاب، ص٢٢٨. قدامة بن جعفر: م.س، ص١٣٦-١٤٩. إبن خلدون: المقدمة، ص١٤١-١٤٢.

(3) ناوی (أبو الحسن أحمد بن يحيى بن داود البلاذري)یە، لە دەرباری عەباسیەوە نزیکبووە، بەتایبەتی لە سەردەمی خەلیفە موتەوەکیل (٢٣٢-٢٤٧ك/ ٨٤٦-٨٦١ز) و خەلیفە موستەعیندا (٢٤٨-٢٥٢ك/ ٨٦٢-٨٦٦ز)، بەردەوام لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا بووە. زۆر کتێبی هەیە کە بەناوبانگترینیان (الأنساب الأشراف) و ئەم کتێبەیەتی. إبن النديم: الفهرست، ص١٧٠.إبن خلكان: وفيات الأعيان، مج٦، ص٢٤.

(4) مروج الذهب، ج١، ص١٢.

(5) فتوح البلدان، ص١٧٥-١٧٦، ٣١٧-٣١٨.

(6) م.ن، ص٢٦٣-٢٦٤، ٣٢٥.

کورد و وڵاتەکەیاندا سەپێنرابوو[١]. بۆیە ئەم کتێبە، وەك یەکێك لە لێکۆڵەرەکان دەڵێت، نمونەیەکە لە مێژووی رەسمی، دەوڵەتیش بۆ دانانی ئەو پلان و حوکمانەی، کە پەیوەستبوون بە کاروباری باج و زەویی کشتوکاڵی و شتی لەم بابەتەوە، پشتی پێ دەبەست[٢].

هەموو ئەمانە وامان لێدەکەن بڵێین وڵاتی کورد لە زانینی مێژوویی ئەو سەردەمەدا، بەشێك بووە لە کایەی دەسەڵاتی ناوەندی، واتە لەناو دەسەڵاتدا ئامادەیی هەبووە و وەك دانیشتوانەکەی (کورد) لە دەرەوەی دەسەڵاتدا نەبووە. ئەمەش مانای ئەوەیە ـ لەم زانینەدا ـ مێژوونوسەکان مرۆڤ و خاکەکەیان لەیەك دابڕیوە، ئەم دابڕانەش لەو باوەڕەوە هاتووە، ئەگەر مرۆڤ پابەند نەبێت بەوەی لەبەرامبەر دەوڵەتدا لەسەر شانیەتی، ئەوا خاوەنی ئەو زەوییە نییە، کە لەسەری دەژی. لەلایەکی ترەوە سەنتراڵیزمی بەڕێوەبردن پێویستی بە زانینی مێژووی خاك و رەوشەکەیەتی، هەر بۆیە ئەو مرۆڤەی لەسەر ئەو خاکەیە، بوونی نییە ئەو کاتە نەبێت، کە لە دەوڵەت یاخی دەبێت، یان کاتێك هێزێکی نەیار دێتە ناو ئەو خاکە.

ئەوەی وتمان بەرەو رەهەندێکی تری وڵاتی کورد دەمان بات، ئەویش رەهەندی جیهادیی ئەم خاکەیە. دیارە وڵاتی کورد، بەتایبەتی ناوچەکانی باکور و باکوری رۆژئاوای هاوسنوری خانەی کوفر یان شەڕ و کۆمەڵە ناموسڵمانەکانی بیزەنتی (رۆم) و ئەرمەن و روس و خەزەر و کەرەج (جۆرجی) و زۆر نەتەوەی تری دەرەوەی خانەی ئیسلامن، کە بەردەوام هەڕەشە لە سەروەریی دەسەڵاتی ناوەندی دەکەن لەم خانەیەدا. بۆیە مێژوونوس پەرۆشی تۆمارکردنی ئەم هێرشانە بوو بۆ سەر وڵاتی کورد و باسی بەرگری و بەرپەرچدانەوەی ئەم هێرشانەی دەکرد لەلایەن خەڵکی ئەم وڵاتە و سوپای خەلافەتەوە[٣].

---

[1] م.ن، ص١٧٧، ٢٦٦-٢٦٧.

[2] الخالدي: دراسات في تاريخ الفكر العربي الإسلامي، ط٣، (بيروت: ١٩٧٩)، ص٥٢.

[3] بۆنمونە بڕوانە: خليفة بن خياط: م.س، ص٣٠٣، ٣٢٠، ٣٤٢. اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٤٢٧-٤٢٨، ٤٩٦. الطبري: م.س، ج٨، ص٢٧٠، ج٩، ص٢٤٢، ٢٦١، ٥٤٩. الصولي: أخبار الراضي بالله، ص٢٣٢-٢٣٣، ٢٥١. الهمداني: تكملة، ص٣٤٥-٣٤٦، ٤٢٨-٤٢٩. مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص٦٣-٦٧، ٢١٠، ٢١٥.

لە زانینی مێژووییدا، ئەم رەهەندە جیهادیە لەگەڵ رەهەندێکی تری گرنگی ئەم وڵاتەدا یەك دەگرێتەوە، ئەویش رەهەندی سیاسییە، لەم وڵاتەدا زۆر جوڵانەوەی نەیار بە خەلافەت سەریان هەڵدابوو و بووبووە بنکەیەکی سەرەکیی زۆر لەو جوڵانەوانەی بەدرێژایی ئەم قۆناغە کورد تیایاندا بەشداربوو. بە مەبەستی دووبارە نەکردنەوەی ئەوەی لێکۆڵەرەکانی ئەم بوارە وتویانە، ناچینە ناو وردەکاریی ئەم بابەتەوە[1] و بەوەندە دەوەستین ئاماژە بە یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو بزوتنەوانە بکەین، کە لە وڵاتی کورددا چالاکیی بەردەوامی هەبووە و کوردیش رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە تیایدا، ئەویش جوڵانەوەی خەواریجە[2]. ئەمانە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە زۆر بە توندی دژی دەسەڵاتی ناوەندی بوون و لەوەدا یەکڕا بوون دەرچوون لە فەرمانی پێشەوا یان سوڵتانی زۆردار واجبە[3]، لەمەشدا مەبەستیان خەلیفە بوو. بۆیە بەبێ ترس و راشکاوانە دژایەتیی دەسەڵاتیان دەکرد و لەگەڵیدا کەوتنە ململانێیەکی دوور و درێژەوە و شەڕێکی درێژخایەنیان لەگەڵدا هەڵگیرساند، وەك زانراوە ئەم جوڵانەوانە کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لە لاواز کردنی خەلافەتی ئەمەویدا. دوای ڕوخانی خەلافەتی ئەمەویش تا سەردەمی عەبباسیەکان لە جوڵانەوەکانیان بەردەوام بوون، بۆیە بەدرێژایی مێژوویان یەکێك بوون لە هێزە ئۆپۆزسیۆنە سیاسی - ئاینییە موسڵمانەکانی دەوڵەتی خەلافەت[4].

---

[1] لەبارەی ڕۆڵی کورد لە جوڵانەوەکانی سەرەتای ئیسلام و سەرەتای سەردەمی عەباسیدا بڕوانە: عزت: الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور، ص١١١-١٢٤. توفيق: الكورد في العصر العباسي، ص٨٤-١٢٣. ميرزا: غربي إقليم الجبال في صدر الأسلام، ص١٢٣-١٣٢.

[2] خەواریج: ئەوانە بوون کە لە فەرمانڕەوایی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەرچوون ودژی مەسەلەی ناوبژیکردن (تحكيم) بوون لە شەڕی (صفين)دا(٣٧ك/٦٥٧ز) دروشمی (لا حكم الاَ لله)یان بەرزکردبوویەوە، هەروەها (الحرورية)شیان پێدەوترێت چونکە یەکەم جار لەم شوێنەدا دابەزین (حروراء گوندێکە لە بەردەم کوفەدا)، ئەمانە خۆیان ناونابوو (الشراة) چونکە خۆیان فرۆشتبووە خوا. الأشعري: مقالات الإسلاميين، ج١، ص١٩١. الشهرستاني: الملل والنحل، ق١، ص١٠٥-١٠٦.

[3] البغدادي: الفرق بين الفرق، ص٥٥. الشهرستاني: م.ن، ق١، ص١٠٦.

[4] بۆ ئەمە بڕوانە: يوليوس (فلهاوزن): أحزاب المعارضة السياسيية الدينية في صدر الإسلام. الخوارج والشيعة، ت: عبد الرحمن بدوي، (الكويت: د.ت)، ص١٩ بەدواوە.

هەر لەسەرەتای دەرکەوتنی ئەم جولانەوەیەوە ولاتی کورد بووە پەناگەیەکی گرنگی کەس و سەرکردەکانی[1] و خالی دەرچوونیان بوو بۆ ناوچەکانی تر، بۆیە بە تێپەڕبوونی کات زۆربەی ناوچەکانی ئەم ولاتە بووە پێگەی جولانەوەکانیان و شوێنی ڕێبازەکەیان[2]، بەتایبەتی هەرێمی جەزیرەی فورات[3]، بۆیە بەم هەرێمە دەوترا ((حرورية شارية وخارجية مارقة))[4]. کارەکە هەر لەمەدا ناوەستێت، بەڵکو ئاماژە بەوە دەکرێت کورد پشتگیرییەکی فراوانی ئەم جولانەوانەیان کردووە و تیایاندا بەشدار بوون، بۆیە ((تیایاندایە هاوڕای خەواریجن و خۆیان لە عوسمان و عەلی بێبەری دەکەن))[5]، هەروەها هەندێ خێڵی کوردیش چوونە سەر ڕێبازی خەواریج[6] و تەنانەت کەسی وایان تێدا هەڵکەوتبوو سەرکردایەتیی ئەم جولانەوانەی دەکرد[7]، هەندێ بەشی ئەم ولاتە، بەهۆی بالادەستبوونی ئەم ڕێبازە تێیدا، پێی دەوترا شورات (الشراة)[8]، هەندێ لە شارەکانیش[9] تا ناوەڕاستی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زاینی شوێنکەوتەی ئەم ڕێبازە بوون و دواتر وردە وردە وازیان لەم ڕێبازە هێنا[10].

---

[1] الكوفي: الفتوح، ج٤، ص١٣٢-١٣٣. البغدادي: م.س، ص٦١. الشهرستاني: م.س، ق١، ص١٠٧. إبن الأثير: الكامل، ج٣، ص١٦٩.

[2] المسعودي: مروج، ج٢، ص . إبن النديم: م.س، ص٣٤٣.

[3] إبنَ عبد ربه: العقد الفريد، ج٧-٨، ص٢٧٩. الأشعري: م.س، ج١، ص١٩١.

[4] الجاحظ: رسائل الجاحظ، ج١، ص١٦. إبن قتيبة، عيون الأخبار، ج٢، ص٢٠٤.

[5] المسعودي: م.ن، ج١، ص٤٣٦.

[6] إبن الأثير: الكامل، ج٧، ص٤٢٣.

[7] مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص٣٣. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤،ق٢، ص٨٥. إبن الأثير: م.ن، ج٧، ص٣٥٩-٣٦٠. إبن خلدون : تأريخ، ج٣، ص٤١٨.

[8] الهمداني: صفة جزيرة العرب، ص٢٤٧.

[9] ئیبن حەوقەلی نصیبینی (٣٦٧ك/ ٩٨٧ز مردووە) دەڵێت خەڵکی شاری سوهرەوەردی هەرێمی چیا کە زۆربەیان کوردن، لە سەر ڕێبازی خەواریج بوون. صورة الأرض، ص٣٠٧.

[10] بۆنمونە بڕوانە: المسعودي: م.ن، ج٢، ص. إبن حوقل: م.ن، ص.

خەواریجەکان رای تایبەتیی خۆیان هەبوو سەبارەت بەو دەسەلاتەی کاروباری (ئوممەت - دەولەت)ی ئیسلامی بەڕێوە دەبرد. ئەوان لەم مەسەلەیەدا بۆچوونێکی سەراپاگیریان هەبوو و لە گۆشەنیگایەکی فراوانەوە لەم مەسەلەیان دەڕوانی و پێیان وابوو، دروستە جگە لە قورەیش کەسانی تریش ببن بە پێشەوا[1] و لەمەدا جەختیان لە رادەدەی ئایندارییی ئەو کەسە دەکردەوە، کە ئەم دەسەلاتە دەگرێتە دەست. بەمە، وەك لێکۆلەرێك دەلێت، مەسەلەی فەرمانڕەواییان لە چوارچێوە خێلەکییە - عەرەبییەکەوە گواستەوە بۆ چوارچێوەی عەقیدە[2]، لەوانەیە ئەمە پالنەرێکی بەهێز بووبێت بۆئەوەی کورد و نەتەوەکانی تر بچنە ریزیانەوە و بەو شێوە فراوانە بەشداری جولانەوەکانیان بکەن[3].

هەرچۆنێك بێت، ئەم خەواریجانە لەڕووی عەقیدەیی و رامیارییەوە لەهەموو سەردەمەکاندا لەلایەن خەلافەتی ئیسلامییەوە رەت دەکرانەوە و بە یاخیبوو دادەنران لەو ئیمامە راستەی کۆمەلی موسلمانان لەسەری رێککەوتوون[4]. واتە ئەمانە لە دەسەلاتی ناوەندی دەرچوون و لە ئامادەیی ئەم دەسەلاتەدا، ئەوان (بوون)یان نابێت، ئەمانە هەر لەسەردەمی ئەمەوییەوە بە (دوژمنی خوا) دادەنران و ئەوانەی لەگەلیانن گێرەشێوێنەکانی سەر زەوین و رێز و حورمەتی ئیسلام دەشکێنن[5]. لەبەرئەمە خەواریج لە نوسراوەکانی مێژووی ئیسلامیدا پەسەند نین، روانینی مێژوونوس بۆیان وەك روانینی دەسەلاتە لە دوژمنێکی ئۆپۆزسیۆن. مێژووی خەواریج، مێژووی دەسەلاتی ناوەندی و هێرشە سەربازییەکانیەتی دژی بالادەستی و ستەمکاریی ئەمان لەناوچە جیاوازەکانی

---

(1) الأشعري: م.س، ج٢، ص١٣٤، الشهرستاني: م.س، ق١، ص١٠٧.

(2) الجابري: العقل السياسي الإسلامي، ص٢٣٩-٢٤٠.

(3) لەبارەی بەشداریکردنی کورد لە سەرجەم جولانەوەکانی خەواریجدا لە سەرەتای ئیسلام و سەرەتای سەردەمی عەباسیداو ئەو هۆکارانەی پالنەری ئەم بەشداریکردنەیان بوون بڕوانە: عزت: م.س، ص١١٠ بەدواوە. توفیق: م.س، ص٩٢ بەدواوە.

(4) الشهرستاني: م.س، ق١، ص١٠٥.

(5) عبد الحميد الكاتب: رسالة في نصيحة ولي العهد عبدالله بن مروان بن محمد، ضمن: رسائل البلغاء، ص١٧٣.

ولاّتی کورد و ولاّتانی تردا[1]. مێژوونوسەکان بەرامبەر ئەم بزوتنەوەیە و ئەوانەی بەشدارییان تێدا کردووە وەك کورد، بیّ ویژدان بوون، چونکە زۆربەی نوسراوە مێژووییە ئیسلامییەکان دەچنە ناو چوارچێوە سوننی یان شیعییەکەی رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامییەوە. لە ئەنجامی سەرکەوتنی ئەم دوو مەزهەبەش لە زۆربەی ناوچەکانی خانەی ئیسلامدا، نوسینە مێژوویی و ئاینییەکانیشیان سەرکەوتن و بەشی زۆری کەلتوری نوسراوی ئەمان لە کایەی ئیسلامیدا مایەوە، لەکاتێکدا پاشماوەی لق و ئاینزا ئۆپۆزسیۆنەکانی ئەم کەلتورە فەرمییە، بەتایبەتی خەواریج، توشی ونبوون و لەناوبردن بوونەوە و کەس نەبوو بیانپارێزێت. بێگومان ئەم خەواریجانە و بزوتنەوە ئۆپۆزسیۆنەکانی تر، کە کورد رۆڵی هەبووە تیایاندا و بەشداریی کردوون، مێژوویەکی جیاوازیان هەیە لەو مێژووەی مێژوونوسەکانی دەسەلاّت بەپێی روانین و چوارچێوەی هزریی زانینەکەیان تۆماریان کردووە. خەواریج کتێبی خۆیان هەبووە، بەلاّم پێناچێت مێژوونوسە نەیارەکانی ئاینزاکەیان پشتیان بەم کتێبانەیان بەستبێت و شتیان لێوە وەرگرتبێ، کتێبەکانیان بە شاراوەیی مابوونەوە، چونکە ((خەڵك چارەیان نەدەویستن و بە خراپە لێیان دەدوان))[2].

ئەمرۆ ناتوانین بگەینە مێژووی راستەقینەی خەواریجەکان، کە مێژوویەکی نەنوسراوەیە و بێگومان جیاوازە لەو مێژووەی لەبارەیانەوە نوسراوە. ئەم بزوتنەوە و مەزهەبە ئاینییە، لە روانگەی خەواریجەکان خۆیانەوە، هەرگیز مێژووی یاخیبوو یان سەرپێچیکەر یان دەرچوو لە ریزی جەماعەت و ئوممەت نییە. بە بۆچوونی ئێمە، ئەگەر ئەم مێژووە بدۆزرێتەوە، بەپێی ئەو چەمکەی ئەوان داویانە بە ئوممەت ـ دەوڵەتی ئیسلامی، بوونی ئەمانە بوونێکی سەلبی نییە. ئەوە دەسەلاّتی ناوەندی بووە ئەم بوونە

---

[1] لەبارەی هەندێك لە جولاّنەکانیانەوە بڕوانە: خليفة بن خياط: م.س، ص٣٧١-٣٨٣، ٤٥١-٤٥٦. هەروەها سەبارەت بە هەندێ هەواڵیان بڕوانە: البلاذري: أنساب الأشراف، ج٥، ص١٦٩-١٩٥، ج٧، ص٤٠٧-٤٦٤. إبن خلدون: تاريخ، ج٣، ١٨٧-٢٠٠.

[2] إبن النديم: م.س، ص١٣٤. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە خەواریجەکان لە ولاّتی عومان و مەغریب کۆمەڵێك دەستنوسیان هەیە کە مێژوونوسەکانیان نوسیویانە، هەندێ لێکۆڵەر لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کردوون، بەلاّم ئێمە نەمانتوانیوە ئەو دەستنوسانەو ئەو ئەنجامانەشمان دەستکەوێت کە لێکۆڵەرەکان لەم بوارەدا پێی گەیشتوون.

سەلبییەی داوە بەوان و نوسینی مێژوویی فەرمیش، لەپشتەوە کاری لەسەر دەرخستنی کردووە، بۆ ئەوەی بەمە رەوایەتی بدات بەم دەسەڵاتە تا ئەو بزوتنەوەیە سەرکوت بکات و لەناوی بەرێت. لەبەر ئەوەی ئەو کتێبانەی بەناوی ئەم بزوتنەوەوە دەدوێن زۆربەیان نەماون، ئاسان نییە رووی راستەقینەی ئەم بزوتنەوەیە بگەڕێنینەوە[1]، سەبارەت بەمان و بەکوردیش، تەنها ئەو وێنەمان بۆ ماوەتەوە، کە مێژووی فەرمی کێشاویەتی و دەسەڵاتی ناوەندیش ئەو وێنەیەی ویستووە، ئەویش وێنەی (دەرچوو لە دەسەڵاتی شەرعی)یە.

## ٤ـ وێنەی بەرهەڵستکاری یاخی و ستەمکاریی دەوڵەت

پێشتر ئەوەمان روونکردەوە چۆن مێژوونوسەکان لەم قۆناغەدا کوردیان لە مێژوو دوورخستۆتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم مێژوونوسانە لە کتێبەکانیاندا چەند پەراوێزێکیان تایبەت کردووە بە تۆمارکردنی هەندێ لە هەواڵەکانی کورد. بەڵام ئەگەر بە وردی سەیری ئەم تۆمارکراوانە بکەین، دەبینین مێژوونوس بەندی ئەو میتۆدەیە، کە لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا پەیڕەوی دەکات، هەروەها بەندی ئەو چوارچێوەیە، کە سەپێنراوە بەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەودا لە مێژوو. ئەو لەنوسینەوەی ئەم گێڕانەوانەدا، سەلبییەتی بوون و ئامادەیی کورد لە گۆڕەپانەکەیدا دەسەلمێنێت و بەشێوەیەکی شاراوە یان ئاشکرا پشتگیریی دەسەڵاتی ناوەندی دەکات و جەخت لە ئینتیمای خۆی دەکاتەوە بۆ ئەم ناوەندە.

وا دیارە لەم قۆناغە و قۆناغەکانی تریشدا، بەشی زۆری کورد بەتەواوەتی ملکەچی ناوەند نەبوون، یان بەپێی ویستی ئەو نەجوڵاونەتەوە. ئەم هەڵوێستە رەنگدانەوەی ئەو سروشتە خێڵەکییەیانە، کە وایان لێدەکات لە هەڵسوکەوتیاندا سەربەست بن، ئەمەش پاڵی بە هەندێکیانەوە ناوە سەرپێچیی خەلیفەکان بکەن و سەریان بۆ دانەنەوێنن[2]، بۆیە ئەمانە ((چێژیان لە سەرپێچی و یاخیبوون دەکرد))[3]. بەپێی لۆجیکی خێڵ، باجدان وەك لە دەستدانی سەربەخۆیی بوو، باج کۆکردنەوە پێوەری هێز و دەسەڵاتی دەوڵەت بوو

---

[1] بروانە: کاهن: تاریخ العرب والشعوب الإسلامیة، ص٤٦.

[2] مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانیة، ص١٠.

[3] م.ن،ص.

بەسەر خێڵدا، دەمارگیریی خێڵیش بە سەردانەواندن بۆ دەسەلاتی دەوڵەت لاواز دەبوو[١]، بۆیە بەردەوام سەرپێچییان دەکرد و خۆیان لە ناوەند دوور دەگرت، چونکە ناوەند مانای باجدان و لەدەستدانی سەربەستی و خودە خێڵەکییەکەیان بوو. لەوانەیە هەر ئەم سەربەستییەی هەڵسوکەوت پاڵی بە مێژوونوسەوە نابێت وێنەی بەهەڵستکارێکی تەواو یاخییان بداتێ.

بۆ تیشك خستنە سەر ئەم وێنەیە دەڵێین، بەشداریکردنی کورد لە بزوتنەوە ئۆپۆزسیۆنە جیاوازەکان و جوڵانەوە خودییەکانیاندا، سیمایەکی تایبەتی دابوو بە مێژووەکەیان، ئەویش مێژووی ئەوی تری بەرهەڵستکارە، کە دژایەتی دەسەڵات دەکات و کێشە و گێروگرفت دەنێتەوە. لای مێژوونوسە دوورو نزیکەکان کورد بە سەختگیر[٢] ناسراون و کۆمەڵە جوڵانەوەیەك ئەنجام دەدەن جەوهەرەکەی «دەستگرتن بەسەر وڵات و ترساندنی ڕێبوار و کوشتن و بڕینە»، ئەمانە «وڵات وێران دەکەن و ئافرەت هەتك دەکەن»[٣]، ئەمانە کەسانی هێرشبەر و دڕندە و خراپەکارن[٤]. هەر هەرێمێك دەستی کوردی پێ بگات، وەك هەرێمی چیا، کە نشینگەی خۆیانە[٥]، تووشی وێرانی و کاولکاری

---

[1] إبن خلدون: المقدمة، ص١١٢. لە بارەی حاڵەتی باج نەدانی کورد و بەکارهێنانی هێز لەلایەن دەسەڵاتەوە دژیان، بڕوانە: مسكويه: تجارب الأمم، ج١، ص٢٠٢. ماري بن سليمان: أخبار فطاركة الكرسي المشرق من كتاب المجدل، (رومية الكبرى:١٨٩٩)، ص٩٢. الهمداني: تكملة، ص٢٦٤. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص١٩٨-١٩٩.

[2] مؤلف مجهول: اخبار مجموعة في فتح الأندلس وذكر امرانها، (مدريد: ١٨٦٧)، ص٢. الهمداني: م.ن، ص٢٦٤.

[3] أبو حنيفة الدينوري: م.س، ص٣٦٧. المسعودي: التنبيه والإشراف، ق٢، ص١٩٩. إبن الجوزي: المنتظم، ج٤، ص١٧٨٤، ج٨، ٣٠٨٠.

[4] إبن سعد: الطبقات، ج٥، ص٣٩٢. الطبري: م.س، ج٨، ص٥٥. الأزدي: تاريخ الموصل، ص٢٠٧-٢٠٨. الصولي: اخبار الراضي، ص١٩٢-١٩٣. البيهقي: المحاسن والمساوئ، ج٢، ص٤. إبن الجوزي: م.ن، ج٨، ص٣٩٢١.

[5] اليعقوبي: البلدان، ص٦.

دەبێت[١]، بە هەموو ئەمانە بەس ناکەن و هاریکاری ئەوانەش دەکەن، کە پێچەوانەی سوڵتان دەجوڵێنەوە و دژایەتیی دەکەن[٢].

هەموو ئەمانە بەس بوون بۆ بەرجەستە کردنی ئەو وێنەیەی کورد، کە ناومان نا وێنەی بەرهەڵستکاری یاخی، ئەمە وێنەیەکی شێوەگرتووە و هەموو سیفەتێکی مرۆیی لەو کۆمەڵە دەرچووانە دادەماڵێت، ئەم وێنەیە ئەو کاتە شێوەگیر دەبێت، کە پێمان وابێت (ئێمە) لە ریشەوە لەم کۆمەڵانە (ئەویتر) جیاوازین[٣]، ئێمەی نوێنەری دەسەڵاتی شەرعی، وێنای ئەویتری سەرزەنشتکراو دەکەین، چونکە ئەو دژایەتیی ئەم دەسەڵاتە شەرعییە دەکات، یان لای ئێمە وا دەردەکەوێت دژایەتیی دەسەڵات دەکات، بۆیە تا دژایەتیمان بکات و لەگەڵمان نەبێت، هەر ئەم وێنەیەی دەردەکەوێت و بواری ئەوەمان نادات بەشێوەیەکی گشتگیرانەتر ببینین. بۆ روونکردنەوەی ئەمە، دەکرێ ئاماژە بە مەسەلەیەك بکەین لە بارەی ئامادەیی ئەم وێنەیە لای ناوەند، ئەویش مەسەلەی ریشەی ئەبو موسلیمی خوراسانییە ـ کە بڕبڕەی پشتی بانگەوازی عەباسی بووە لەسەرەتای دەرکەوتنیەوە ـ ئەم پیاوە ((پیاوی دەوڵەت بووە، خاوەنی بانگەوازبووە و سەرکەوتن لەسەر دەستی ئەم بووە))[٤]، واتە ئەو کاتە ئەبو موسلیم لە دەسەڵاتدا کارایەکی مێژوویی دیارو پۆزەتیف بووە، بەڵام کاتێك خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور لە دەسەڵات وەدەری دەنێت و ساڵی (١٣٧ك/٨٣٩ز) بە تۆمەتی ناپاکی و گوێڕایەڵی نەکردن و دژایەتیکردنی، دەیکوژێت[٥]، ئیتر بانگەشەی ئەوە دەکەن ریشەی ئەبو موسلیم کوردە و کوردیش

---

[1] إبن حمدون: التذكرة، مج٢، ص١٩٦.

[2] البلاذري: انساب الأشراف، ج٧، ص٣٤٦. القرطبي: م.س، ص٢٥، ٥٥.

[3] الطاهر لبيب (محرر): صورة الأرض، ص٥٤-٥٥.

[4] إبن الطقطقي: الفخري في الآداب السلطانية، (القاهرة:١٩٦٢)، ص١٠٨.

[5] إبن قتيبة: الإمامة والسياسة، ص١٨٣-١٨٥. أبو حنيفة الدينوري، م.س، ص٣٤٨-٣٥٠. اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٣٦٧. الطبري: م.س، ج٧، ص٤٩١. إبن خلكان: وفيات، ج٣، ص١٥٤.

ناپاکن، وەك لەم شیعرەی شاعیری ناسراوی دەرباری عەبباسی ئەبو دولامەدا[١] دەیبینین، کە دەڵێت:

أبـا مجرم مـا غير الله نعمة | عـلى عبده حتى يغيره العبد
أفي دولة المنصور حاولت غدره | ألا أن أهل الغدر آباؤك الكرد[٢]

واتە: باوکی تاوانبار خوا نیعمەتی خۆی بۆ بەندەکانی ناگۆڕێت، ئەگەر بێت و ئەو بەندەیە خۆی نەیگۆڕێت، هەوڵت دا لە ناو دەوڵەتەکەی مەنصوردا، ناپاکیی لێ بکەی، ئەمەش ئاساییە چونکە تۆ باوك و باپیرە کوردەکانیشت ناپاك بوون.

ئەم وێنەیە ـ بەشێوەیەکی شاراوە ـ سەلماندنی هێشتنەوەی کوردە لە دەرەوەی دەسەڵاتدا تا ئەو رادەیەی، کە تەنانەت لە کۆئەندێشەی باوی ئەو قۆناغەدا ئەم هەڵوێستەی لێ کەوتۆتەوە. لەبەر ئەوەی کورد بەوە نەناسراون، کە دەستیان بەسەر دەوڵەتدا گرتبێت و بەڕێوەیان بردبێت، بۆیە لەم بوارەدا لای خەڵك بووبوونە نموونەی گاڵتە پێکردن، بۆنموونە بەگاڵتەوە دەوترا: کەسی کوردی گاڵتە بەسەرباز ناکات[٣]، کەس ئاواتی ئەوە ناخوازێت ترسنۆکێکی کورد ببێتە کەسێکی ئازا[٤]، هەروەها کاتێك کوردێك پلەیەکی کارگێریی دەگرتە دەست و لەگەڵ دەوڵەتدا دەبوو، خەیاڵگەکە ئەم بوونەی رەت دەکردەوە و خەڵکەکەش گوێڕایەڵیی کوردیان بەسەر شۆڕی دەزانی، شاعیرێك بەڕوونی گوزارشت لەمە دەکات و کاتێك کوردێك بەناوی (عەلی کوڕی داود کوڕی روهزاد)

---

[1] ناوی زەند کوڕی جونە، لە مەوالیە رەشپێستەکانە، لە کۆتایی فەرمانڕەوایی ئەمەوی و سەرەتای فەرمانڕەوایی عەباسیدا ژیاوە، هاوچەرخی خەلیفەکانی سەرەتای عەباسی بووە وەك ئەبو جەعفەری مەنصورو مەهدی و شاعیری دەرباریان بووە. إبن قتيبة: الشاعر والشعراء، (بيروت: د.ت)، ج٢، ص٦٦٠.

[2] مؤلف مجهول: أخبار الدولة العباسية ـ أخبار العباس و ولده، تحقيق: عبد العزيز الدوري و عبد الجبار المطلبـي، (بيروت: ١٩٧١)، ص٢٥٦. إبن قتيبة: المعارف، ص١٨٥. إبن خلكان: م.س، ج٣، ص١٥٥.

[3] التوحيدي: الإمتاع والمؤانسة، ج١، ص١٠.

[4] م.ن، ج٥، ص٤٩.

لەسەردەمی خەلیفە ئەلموعتەمەددا (٢٥٦-٢٧٩ك/ ٨٦٩-٨٩٢ز) دەبێتە بەرپرسی شاری موصڵ، دەڵێت:

ما رأى الناس لهذه الد ... هر مُذ كانوا شبيها
ذلّــت المــوصل حتى ... أُمِــرَ الأكــرادُ فيها[1]

واتە: خەڵك لەوەتەی هەن شتی وایان نەبینیوە ، موصڵ تا ئەو رادەیە سەرشۆڕ بووە کورد فەرمانڕەوایی تیا دەکەن.

ئەم وێنەیە پاکییەتی (نزاهة) و بێلایەنیی مێژوونوس لە تۆمارکردنی مێژوودا، دەخاتە سەنگی مەحەکەوە و ئەم پاکیەتییە دەبێتە مەسەلەیەکی رێژەیی و مایەی رەخنە و گفتوگۆ. ئەمە بەڕوونی لای مێژوونوسی گەورە (موحەمەدی کوڕی جەریری طەبەری) دەردەکەوێت، کە لەوانی دی زیاتر بە پاکی و دوورکەوتنەوە لەدنیا و وەرنەگرتنی دیاری ناسراوە و ئەو پلە و پایانەی رەت کردووەتەوە، کە پێی دراون[2]. واتە هەوڵی داوە لەژێرکاریگەریی دەسەڵات و گوشارەکانیدا نەبێت، بۆئەوەی لەرووی هزرییەوە سەربەست و لە نوسینەوەی مێژوودا بابەتی بێت. بەڵام طەبەری فەقیە و شارەزا لە مێژوو، وەك مێژوونوسەکانی تر بڕوای بە یەکێتی کۆمەڵی ئیسلامی هەیە و لەپێشەکیی کتێبەکەیدا بەڕاشکاوی باسی ئەوە دەکات ئەو رێبازەی لە تۆمارکردنی مێژوودا گرتوویەتیە بەر لەڕوانگەی دەسەڵاتەوەیە، ئاماژە بەوەش دەکات، کە لە کتێبەکەیدا تەنها باسی پێغەمبەران و پاشاو خەلیفەکان دەکات ((هەموو ئەوانەی لە کتێبەکەمدا باسم کردوون بەستوومن بە سەردەمی خۆیان و ئەو کارانەی لە رۆژگاری ئەواندا روویان داوە))[3]. واتە ئەوەی لەسەردەمی خەلیفەیەکدا باسی دەکات، بەستراوە بە بوونی ئەو خەلیفەوە، یان

---

[1] إبن الأثير: الكامل، ج٦، ص٧٣. سعيد الديوهجي: تاريخ الموصل، (بغداد: ١٩٨٢)، ج١، ص٧٤.

[2] ياقوت: معجم الأدباء، ج١٨، ص٦٠. السبكي: طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق: محمد محمود الطناحي و عبد الفتاح محمد الحلو، (القاهرة: ١٩٦٥)، ج٣، ص١٣٧. هەروەها بڕوانە: عبد الرحمن (العزاوي): الطبري ـ السيرة والتاريخ، (بغداد: ١٩٨٩)، ص٣٣-٣٤.

[3] تاريخ الرسل والملوك، ج١، س٦.

پاشایەوە، یان پێغەمبەرەوە، بەمەش پەراوێزخستنی ئەوانی تر و هەواڵەکانیان لەبەرامبەر ناوەندا دەچەسپێنێت و لەچاو ناوەندا وێنەیەکی نزمیان پێدەدات.

ئەم پێشەکیە دەمانخاتە ناو جەرگەی بابەتەکەوە، کە چۆنیەتی تۆمارکردنی هەواڵەکانی کوردە لەلایەن طەبەرییەوە. بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان لەبارەی ئەم مێژوونوسەوە بابەتی بێت، بەشەکانی کۆتایی کتێبەکەی وەردەگرین، چونکە ئەو رووداوانەی لێرەدا باسیان دەکات هی سەردەمی خۆین و راستەوخۆ سەرنجیداون. لێرەدا دەبینین کورد سەرکردایەتی جوڵانەوە بەرهەڵستکارییەکان دەکات و راستەوخۆ جارێ دژایەتی کردنی دەسەڵاتی خەلافەت دەدات[1]، خەلافەتیش ناچار دەبێت سەرکردەکانی بنێرێت بۆ ئەوەی سەرکوتیان بکەن[2]. جاری واش هەیە خەلیفە خۆی ئەم کارە ئەنجام دەدات[3]. ئەمانە پشتگیریی جوڵانەوە بەرهەڵستکارەکانی تر دەکەن و لەگەڵیاندا دژایەتی خۆیان بۆ سوڵتان دەردەبڕن[4]و بەشداری ململانێی هێزە دەسەڵاتدارەکان دەکەن[5].

لە زۆربەی ئەم گێڕانەوانەدا، طەبەری بە بیلایەنانە لە ناوەند دەدوێت، بەڵام کاتێك باسی بەرهەڵستکارەکانی ئەم ناوەندە دەکات، کە لێرەدا کوردن، واز لە بیلایەنییەکەی دێنێت. چونکە لەشێوەی دوژمن و دەرچوو لە دەسەڵات پیشانیان دەدات، یان وا پیشانیان دەدات ئەمە مێژووی پەیوەندیی دەسەڵاتە لەگەڵیاندا. ئەگەر لە روانگەیەکی کوردانەوە، واتە روانگەی ئەو کەسەی طەبەری مێژووەکەی تۆمار دەکات، سەیری ئەو مێژووەی کورد بکەین، کە طەبەری دەینوسێتەوە، دەبینین لە زۆربەی گێڕانەوەکانیدا ناتەواوی و کەموکوڕی هەیە. لێرەدا رووداوێك وەردەگرین، کە طەبەری لەناو رووداوەکانی ساڵی (٢٥٨ك/٨٧٢ز)دا باسی دەکات: ((تیایدا مەسروری بەڵخی، شەڕی کوردە

---

[1] م.ن، ج٩، ص٤٩٠. ج١٠، ص٣٧-٣٨.

[2] م.ن، ج٩، ص١٤٠.

[3] م.ن، ج١٠، ص٤٠.

[4] م.ن، ج٩، ص١٤٠، ٣١٧. ج١٠، ص٦٥، ٩٨، ١٣٧.

[5] بۆ نمونە بڕوانە: م.ن، ج٩، ص٥١٤، ٥٢٧-٥٢٩، ٥٥٤-٥٥٦.

یەعقوبیەکان دەکات و تێکیان دەشکێنێت و زۆریان لیّ بریندار دەکات»[1]. دوو لایەن ئەم هەواڵەیان پێکهێناوە و بوونێکی مێژووییان پێداوە، لایەنی یەکەمیان، کە خاوەن دەسەڵاتە، سەرکردەیەکی تورکە و ناوی مەسروری بەڵخیە و لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی ئەلموعتەمەددایە(٢٥٦-٢٧٩ك/ ٨٦٩-٨٩٢ز)، لایەنی دووەمیش کوردە یەعقوبیەکانن[2]، کە وا دەردەکەوێت لە فەرمانڕەوایی سوڵتان دەرچوون. بەم جۆرە لەم هەواڵەی طەبەری تێدەگەین و لە شوێنێکی تردا ئەمە روونتر دەکاتەوە، کاتێك باسی ئەوە دەکات مەسروری بەڵخی لە دەوروبەری موسڵ دژی یەکێك لە سەرکردەکانی خەواریج دەجەنگا[3]. بەڵام لێرەدا پرسیارێك رووبەڕووی طەبەری دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەم کوردانە کێن و چییان کردووە؟ گێڕانەوەکانی طەبەری هیچ وەڵامێکمان نادەنەوە، تەنها ئاماژە بەوە دەکەن سەرکردەیەکی تری تورك چووە بەگژیاندا و بەزاندوونی و پارەو داراییەکەیانی بردووە، بەمە ئەم سەرکردەیە لە ململانێی ئەوانی تردا بەهێز بووە و لێی ترساون[4]. ئەمەش وێنەی ئەو بەرهەڵستکارە یاخییە قوڵتر دەکاتەوە، کە لە گێڕانەوەکەی یەکەمدا درابوو بە یەعقوبیەکان.

ئێمە کاتێك ئەمە دەڵێین، هەرگیز مانای ئەوە نییە سەرکۆنەی طەبەری دەکەین و داوای شتێکی لێدەکەین، کە ئەو نەیدەتوانی بیری لیّ بکاتەوە، ئێمە ناتوانین لەسەر ئەوە سەرزەنشتی بکەین ـ کە لە گۆشەنیگای کوردەوە ـ بەرامبەر بەکورد دادپەروەر نەبووە و حەقی خۆی نەداوە بەو هەواڵانەی لە بارەی کوردەوەن. وەك وتمان، طەبەری تەنها مێژوونوس و فەقیهێکە و لە فەزایەکدا بیر دەکاتەوە، کە ئەم روانینە بۆ مێژوو و چۆنیەتی تۆمارکردنی ئەو مێژووەی بەسەردا دەسەپێنێت. بۆیە ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ لەو

---

(1) م.ن، ج٩، ص٤٩٠.

(2) کوردە یەعقوبیەکان: لە هۆزە کوردەکانی دانیشتووی ناوچەی مێرگ (المرج)ی رۆژهەڵاتی شاری موسڵن، (مەسعودی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە مەسیحین، بەڵام مەسیحی نەبوون) و ئەندامەکانی هەواداری خەواریج بوون. ئەم هۆزە دژی دەوڵەتی عەباسی و سەرکردەکانی دەجوڵایەوە. المسعودي: مروج، ج١، ص٤٣٦. إبن الأثير: الكامل، ج٧، ص٢٥٧، ٤٢٣. النقشبندي: الكرد في الدينور شهرزور، ص٩٤-٩٥.

(3) الطبري: م.ن، ج٩، ص٥٥١.

(4) م.ن، ج٩، ص٥٥١.

گێڕانەوانەدا بە کەموکوڕی و ناتەواویی دایان دەنێین، سەبارەت بە گێڕەرەوەکە، کە بە پلەی یەکەم مێژوویەك بۆ ناوەند دەنوسێت، بەم جۆرە نەبووە، ئەو دەیەوێت بەم گێڕانەوەیە و هاوشێوەکانی، جەخت لەم سەنترالیزمە بکاتەوە و سەبارەت بە پەراوێزیش وێنە باسکراوەکەی پێشوو زەق بکاتەوە، ئەو وێنەیەش طبەری بەرجەستەی دەکات بەتەواوی لەگەڵ هەڵوێستی ناوەندا دەگونجێت و رەنگدانەوەی گوتاری فەرمیی خەلافەتە لە مامەڵەکردن لەگەڵ رووداوە کوردییەکاندا. نوسراوێکی رەسمی خەلیفە (المعتضد)ی عەباسی (٢٧٩-٢٨٩ك/ ٨٩٢-٩٠١ز)، کە لەبارەی شەڕێکیەوەیەتی لەگەڵ کورد و ئەعرابدا و بۆ یەکێك لە نزیکەکانی ناردووە و باسی سەرکوت کردنی جولانەوەکانیان دەکات، بەراشکاوی گوزارشت لەمە دەکات و تیایدا دەڵێت: ((سوپاس بۆ خوا بەسەر کورد و ئەعرابدا سەرکەوتین، هەندێکیانمان بە خاو و خێزانەوە بەدیل گرت، بۆیە دەتبینی مەڕ و ماڵاتمان پێش خۆمان دابوو... بەردەوام رم و شمشێرەکانمان بە جەستەیاندا رۆ دەچوون ... زۆر سوپاس بۆخوا هیچ هەواڵێکیان نەما))[1]. کەواتە لێرەدا یاخییەك هەیە خەلیفە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و بۆی هەیە لە بەرامبەریدا توندوتیژی بەکار بهێنێت و ئەمە شتێکی رەوایە. طبەری و مێژوونوسەکانی تریش لە تۆمارکردنی هەواڵی جولانەوەکانی کورددا، زمانێکی ئاوا توندوتیژیان بەکارهێناوە[2]، ئەگەرچی ئەم توندوتیژییە رەمزییەو لە بەکارهێنانە زمانیەکەی تێناپەڕێت. ئەم توندوتیژییە بەرهەم و دەرکەوتەی ئەو وێنەیە، کە دراوە بە کورد، بۆیە لە زۆربەی ئەو گێڕانەوانەدا توندوتیژییەك هەیە کورد مومارەسەی دەکات و توندوتیژیی دەوروبەرە، توندوتیژییەکیش هەیە ناوەند بەڕووی ئەم کۆمەڵەدا یان بەرووی ئەوەدا، کە لێی یاخیبووە پیادەی دەکات. لێرەدا شتێکی بەڵگە نەویستە ئەو توندوتیژییەی کورد مومارەسەی دەکات ناڕەوایە و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو توندوتیژییە رەوایەی دەوڵەت دژیان بەکاری دەهێنێت، ئەمەش ئەو توندوتیژییەیە، کە بەردەوام مێژوونوسی سەر بە ناوەند لێی دەدوێت، ئەگەرچی مۆرکی گێڕانەوەیی ئەم

---

(1) م.ن، ج١٠، ص٣٧.

(2) بۆنمونە بڕوانە: م.ن، ج٩، ص١٤٠. هەروەها بڕوانە: القرطبي: صلة، ص٦٤. إبن الجوزي: المنتظم، ج٧، ص٣٠٨٠.

نوسینەوەیە[1] زۆر بوار بە مێژوونوس نادات رای خۆی دەربڕێت و بەوەندە دەوەستێت لەژێر پەردەی شەرعیەتدا پاساو بۆ ئەم توندوتیژییە بهێنێتەوە و بەپێی بیرکردنەوەی ئەو، دەبێت تەنها دەسەڵاتی ناوەند، بۆ پاراستنی شکۆمەندیی خۆی بەکاری بهێنێت. لە کۆتایدا بەکارهێنانی توندوتیژی و لێدانی گێرەشێوێنەکان و ئەوانەی لە سوڵتان یاخی بوون و پاراستنی دەوروبەر ئەرکی سەرەکیی خەلیفەیە[2]. بۆنمونە، لەناوبردنی بزوتنەوەکەی جەعفەری کوڕی میر حەسەنی فەهرجەشی کوردی (٢٢٤-٢٢٧ك/ ٨٣٩-٨٤٢ز)، کە یەکێك بووە لە بزوتنەوە بەهێزەکانی کورد لە سەردەمی یەکەمی عەبباسیدا[3]، لەلایەن خەلیفە موعتەصەمەوە، دەبێتە یەکێك لە وڵاتگیرییە گەورەکانی خەلیفە و هیچ خەلیفەیەکی تر شەرەفی ئەنجامدانی جۆرە وڵاتگیرییەکی وای پێ نەبڕاوە[4]. ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر قۆرخکردنی توندوتیژیی شەرعی لەلایەن خەلیفەوە و پاساو هێنانەوەی زانینی مێژوویی بۆ ئەم توندوتیژییە، ئەم حاڵەتە بەردەوام دەبێت تا ئەو سەردەمەی خەلیفە دەسەڵاتی کارەکیی خۆی لەدەست دەدات، ئیتر لێرەوە پێناسەی تر بۆ توندوتیژی و بۆ شەرعیەت سەر هەڵدەدات، وەك لەمەو دوا دەبینین.

---

(1) لەبارەی مۆرکی گێڕانەوەیی لە نوسینەوەی مێژوودا ، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە کوردەوە، بڕوانە بەشی سێیەمی لێکۆڵینەوەکە، ل.

(2) بۆ ئەمە بڕوانە: الماوردي: الأحكام السلطانية، ص٣٠، ١٠٦-١٠٩.

(3) لەبارەی ئەم بزوتنەوەیە بڕوانە: الطبري: م.س، ج٩، ص١١٨. الأزدي: تاريخ الموصل، ص٤٣٠-٤٣١. إبن الأثير: الكامل، ج٦، ص٥٠٦-٥٠٧. توفيق: الكرد، ص١٣٤-١٣٦.

(4) أبو حنيفة الدينوري: الأخبار الطوال، ص٣٦٧. المسعودي: التنبيه والإشراف، ص٣٢٣-٣٢٤ إبن دحية: النبراس في تاريخ خلفاء بني العباس، حققه و وضع حواشيه: عباس العزاوي، (بغداد: ١٩٤٦)، ص٧٣.

## پاری دووەم
## بوونی کورد لەگەڵ دەسەڵاتدا

### ١- سروشتی ئەم قۆناغە و هەڵوێستی مێژوونوسانی سەرەتای قۆناغەکە

لەم قۆناغەدا، کورد لە چەند بەشێکی وڵاتەکەیاندا کۆمەڵێك قەوارەی سیاسیی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆیان دامەزراندبوو. هەر لەسەرەتای سەدەی چواری کۆچی/دەی زاینییەوە لەم بوارەدا کۆمەڵێك هەوڵیان هەبوو، وەك دەسەڵاتی عیشانیەکان (٣٠٠-٣٥٠ك /٩١٢-٩٦١ز) لە ناوچەی شارەزوور[١]، کە هەمیشە ناوچەیەکی نەیار بە دەسەڵات بووە[٢]. هەروەها هەوڵی میر دەیسەم کوڕی ئیبراهیم کوردی (٣١٥-٣٤٥ك/ ٩٢٦-٩٥٦ز) لە دەوروبەری ئازەربایجان[٣]، کە دەسەڵاتێکی بەهێزی هەبوو و دراوی تایبەتیی بەناوی خۆیەوە دەرکردبوو[٤].

بەڵام ئەو هەوڵانەی لەپاش ئەمان دران، پێگەیشتووتر بوون و چانسی مانەوە و ڕەگ داکوتانیان زیاتر بوو، ئەوەبوو کۆمەڵێك میرنشینی کوردی سەریان هەڵدا، گرنگترینیان میرنشینی (شەددادی)یە، کە چەند تیرەیەکی خێڵی هەزبانیی کوردی لە هەرێمی ئاران[٥] دایان مەزراند و لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٠ك/٩٥١ز) تا ساڵی

---

(1) بڕوانە: إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص٧٠٥-٧٠٦. إبن خلدون: تاريخ إبن خلدون، ج٤، ص٦٨٧-٦٨٨. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: توفيق: الكرد في العصر العباسي، ص١٤٩-٣٥١.

(2) مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية، ص١٠. مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص١٩٨،١٥٩. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص١٩٨-١٩٩. ياقوت: معجم البلدان، ج٣، ص٣٧٥-٣٧٦.

(3) بڕوانە: مسكويه: م.ن، ج١، ص٣٩٨-٤٠٤. ج٢، ص٣١-٣٦. إبن الأثير: م.ن، ج٦، ص٢٦٧-٢٦٨، ٢٨٦-٢٨٧، ٣٤٣، ٣٥٢. حسن: الإمارات الكردية، ص١٣-٢٣.

(4) بولادیان: م.س، ص٦٢.

(5) ئاران: ویلایەتێکی فراوانە لە دەوروبەری ئەرمینیا، ڕوباری ئاراس لە ئازەربایجان دایدەبڕێت. ياقوت: معجم البلدان، ج١، ص١٣٦.

(٥٩٥ك/١١٩٩ز) فەرمانڕەوایی کرد[1]. هەروەها بنەماڵەی ڕەوادیی هەزبانی، لە ئازەربایجان میرنشینێکیان دامەزراند لە ساڵی (٣٤٣ك/٩٥٤ز) تا ساڵی (٤٦٩ك/١٠٧٧ز) فەرمانڕەوایی کرد[2]. سەرەڕای ئەمانە، هەزبانیەکان لە هەولێریش میرنشینێکیان هەبوو (٤٢٠-٥٢٦ك/ ١٠٢٦-١١٣١ز)[3]. جگە لەمانە، چەند میرنشینێکی تری کوردی هەبوون، وەك میرنشینی (بەنی حەسنەوەیە)، کە لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٨ك/٩٥٩ز) سەری هەڵدا و تا ساڵی (٤٠٦ك/١٠١٥ز) بەردەوام بوو و میرنشینی (بەنی عەنازی) (٣٨١-٥١١ك/ ٩٩١-١١١٧ز)، ئەم دوو میرنشینە فەرمانڕەوایی ناوچە کوردییەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیایان دەکرد[4]. هەروەها میرنشینی دۆستەکی - مەروانی لە دیاربەکر و جەزیرە سەری هەڵدا و زیاتر لە سەدەیەك فەرمانڕەوایی کرد، واتە لە ساڵی (٣٧٢ك/٩٨٢ز) تا ساڵی (٤٧٨ك/ ١٠٨٥ز)[5]. سەرەڕای ئەمانە زۆر سەرۆك خێڵی کورد سەرکردایەتی هەندێك ناوچەی تریان کردووە.

بە گوزارشتی (کلود کاهن)ی ڕۆژهەڵاتناس، کورد لەم قۆناغەدا ((سەرکردایەتیی باکور و باکوری ڕۆژئاوای چیاکانی ئێرانیان کردووە))[6]. ئەم سەرکردایەتی کردنەش

---

[1] لەبارەی ئەم میرنشینەوە بڕوانە: منجم باشي: جامع الدول - باب في الشدادية، تحقيق: مينورسكي، (كمبرج: ١٩٥٨). كسروي: شهرياران، ص٢٦٠-٣١٨.
Minorsky: Studies in Caucasian History, (London: 1953), pp33-106.
رسول: الإمارة الشدادية، ص٦٧ بەدواوە.

[2] كسروي: شهرياران، ص١٦٤-٢٢٥. زكي: تاريخ الدول والإمارات الكردية في العهد الإسلامي، عرّبه وراجعه:محمد علي عوني، (بغداد:١٩٤٥)،ص٢٩-٤٨. النقشبندي: آذربيجان، ص١٣٢-١٧٧.

[3] محمود: الإمارة الهذبانية، ص٦١ بەدواوە.

[4] النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص١٣٠-٢٥٠.

[5] الفارقي: تاريخ الفارقي، ص٤٩ بەدواوە. هەروەها بڕوانە کتێبەکەی عەبدولرەقیب یوسف لەبارەی ئەم میرنشینەوە کە دوو بەرگە. هەروەها بڕوانە: محمود ياسين (التكريتي): الإمارة المروانية في دياربكر والجزيرة، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٠)، ص٥٦-١٠٨.

[6] تاريخ العرب والشعوب الإسلامية، ص٢٠٩. مینۆرسکی ئەم قۆناغەی ناوناوە سەردەمی دابڕانی ئێران (المعترضة الزمنية الإيرانية)، ئەمە ئەو ماوە کورتەیە کە تیایدا کوردو دەیلەم لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا پێگەی ڕامیاری و سەربازی بەرزیان هەبووە. مینۆڕسکی دەڵێت ئەم ◄◄

لەخۆوە نەهاتووە، بەڵکو لە ئەنجامی ئەو حاڵەتە گشتی و بارودۆخە سیاسییەوە هاتووە، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زاینیدا سەراپای خانەی ئیسلام ـ بەتایبەتی دامەزراوەی خەلافەت ـ ی گرتبووەوە، هەروەها لە ئەنجامی ئەوەوە هاتووە خەلیفە لە سوپادا پشتی بە سەربازی تورکی بەستبوو، دواتر ئەم تورکانە دەستیان بەسەر خەلافەت و فەرمانڕەواییدا گرت. لەسەردەمی خەلیفە (المقتدر بالله)وە (٢٩٥-٣٢٠ك/٩٠٧-٩٣٢ز) بەڕوونی نیشانەی لاوازی و پەشێوی لەم دامەزراوەدا دەرکەوتبوو، چونکە ئەم خەلیفەیە لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا فەرمانڕەوایی گرتە دەست، واتە منداڵ بوو، ئەمەش ڕێی بۆ دەست و پێوەند و سەرکردە و ژن و کەنیزەکانی خۆش کرد دەست لە کاروباری فەرمانڕەوایی وەردەن[١]، بەهۆی ئەمەوە لەناو دەزگای بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا گەندەڵی گەیشتبووە ئاستێکی ترسناك، هەروەها ماوەی فەرمانڕەواییە زۆرەکەی ئەم خەلیفەیە سەرەتای جیابوونەوەی ویلایەتەکان بوو لە جەستەی خەلافەت[٢] و تەنها ئەو ناوچەیە لە دەست خەلیفەدا مابوویەوە، کە کەوتبووە نێوان بەغداد و واسطەوە، خەلافەتیش ڕێز و شکۆمەندیی خۆی لەدەست دابوو و تەنها وەك ڕەمزێکی ئاینی مابوویەوە. خەلیفە و نوێنەرەکانی نەیان دەتوانی ئەو هێزە سیاسییانە سەرکوت بکەن، کە تازە دەرکەوتبوون و لە وڵات و هەرێمەکاندا، لەناویاندا وڵاتی کورد، ململانێی دەسەڵاتی خەلیفەیان دەکرد. زۆر هەوڵ لە ئارادابوو بۆ دەست گرتن بەسەر وڵات و هەرێمە جیاوازەکان و بەڕێوەبردنیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ[٣]، وڵاتی کورد، کە بەلای ئێمەوە گرنگە، بووبووە گۆڕەپانێکی

---

◄◄ قۆناغە دابڕانە، چونکە لەنێوان سەردەمی دەسەڵاتی عەرەبی و سەردەمی دەسەڵاتی تورکیدا هاتووە. بڕوانە: Minorsky: Ibid, p2, 33.

(1) المسعودي: التنبيه والإشراف، ص٣٤٤. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق١، ص٢٣٩. إبن دحية: النبراس، ص١٠٩.

Willim (Mure): The Caliphat – its rise decline and full, (Beirut:1963), (2)p.597.

(3) حمدان عبد المجيد (الكبيسي): عصر الخليفة المقتدر بالله، (النجف الأشرف: ١٩٧٤)، ص٥٤٢.

بۆ نمونە بڕوانە: الصولي: أخبار الراضي والمتقي، ص٢٨٤-٢٨٥. الثعالبي: لطائف المعارف، ص٨٤. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص٨٤. إبن الطقطقي: الفخري، ص٢٢٦. أبو الفداء: المختصر، ج٢، ص٨٤.

کراوەی ململانێی هێزە رامیاریەکانی وەك حەمدانی و بووەیهی[١] و ...هتد، ئەمەش بووە هۆی شپرزەبوونی بارودۆخی رامیاری و ئابووریی ئەم ولاتە[٢]، دەسەڵاتی ناوەندیش لە ئارادا نەمابوو تا بتوانێت چارەسەری ئەم هەموو ناکۆکی و جیاوازیانە بکات.

هەموو ئەم مەترسیانە پاڵیان بە خێڵە کوردەکانەوە نا، کار بۆ دەمەزراندنی ئەو قەوارە رامیاریانە بکەن، کە پێشتر باس کران. بەڕای ئێمە لە بەرامبەر ئەم مەترسیانەدا دەمارگیرییەکەیان بەهێزتر دەبوو، چونکە هەستکردن بە ئینتیما بۆ دەمارگیرییەکی دیاریکراو، کاتێك روون و چالاکە، کە مەترسییەکی دەرەکی هەبێت و هەڕەشەی لەناو بردنی ئەم دەمارگیرییە یاخود قەوارە مادی و مەعنەویەکەی بکات، چونکە وەك ئیبن خەلدون ئەمە لێك دەداتەوە، ئەمانە بەمە«شان و شەوکەتیان بەهێز دەبێت و خەڵك لێیان دەترسێت»[٣]. لێرەدا ئەم چالاکییانەی میر و خێڵە کوردەکان، هەولێك بووە بۆ پاراستنی قەوارە و دەمارگیریی خێڵایەتییان لەو مەترسییە دەرەکییانەی دەوری دابوون، لەمەشدا بەپلەی یەکەم، سودیان لەو سیاسەتە وەردەگرت، کە بووەیهییەکان گرتبوویانە بەر و زیاتر لە سەدەیەك (٣٣٤-٤٤٧ك/ ٩٤٥-١٠٥٥ز) دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەلافەتدا

---

[1] بووەیهیەکان: دەگەڕێنەوە سەر ئەبو شوجاع کوڕی بووەیە و بەناوی ئەوەوە ناونراون، ئەبو شوجاع سەرکردەیەکی بەناوبانگی ولاتی دەیلەمی پشت دەریای قەزوین بووە. خۆیان لافی ئەوە لێدەدەن کە دەچنەوە سەر یەکێك لە پاشا ساسانیەکان. کوڕەکانی ئەبو شوجاع (عەلی، حەسەن، ئەحمەد) توانییان ئەو پشێویە بقۆزنەوە کە باڵی کێشابوو بەسەر ولاتی ئیسلامداو دەوڵەتێکیان بۆ خۆیان دامەزراند کە ناوچەیەکی فراوانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی گرتەوەو تەنانەت دەستیانگرت بەسەر بەغدادی پایتەختی خەلافەتیشدا. لە ساڵی (٣٣٤ك/ ٩٤٦ز) تا ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) فەرمانڕەواییانکرد. هلال الصابي: المنتزع من كتاب التاجي، تحقيق وشرح: محمد حسين الزبيدي، (بغداد: ١٩٧٧)، ص٣٢-٢٢. مسكويه: تجارب الأمم، ج١، ص٢٩٨، ٣٧٨، ج٢، ص٧٦-٧٨.

[2] بڕوانە: حمزة الأصفهاني: تاريخ سني ملوك الأرض، ص١٥٩. مسكويه: تجارب الأمم، ج١، ص٧٥، ج٢، ص١٢٣، ١٢٦، ١٢٩. الهمداني: التكملة، ص٢٦٥. مؤلف مجهول: م.ن، ج٤، ق١، ص٣٥٣، ق٢، ص١٩٠-١٩١، ٢٨٩، ٣٤٢. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص٣١٢، ٣٨٨، ٤٨٦-٤٨٧. أبو الفداء: م.ن، ج٢، ص٨٣.

[3] المقدمة، ص١٠١.

سەپاندبوو و لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا، لەناویشیاندا وڵاتی کورد، پەیڕەوی سیاسەتی لامەرکەزیەتیان دەکرد[1].

میرە دامەزرێنەرەکان بەوە جیا دەکرانەوە بەهێز و ئازابوون و سوودیان لەو بارودۆخە وەرگرت، کە هاتە پێشیان[2]، ئەگەر ئەم سیفەتانەیان تیا نەبووایە نەیاندەتوانی ئەم میرنشینانە دابمەزرێنن. ئەوەی زیاتر لەمەدا یارمەتیی دان توانای دەستگرتن بوو بەسەر دەمارگیریی خێڵە کوردەکانی هاوسێیاندا، بەمە دەمارگیرییەکەیان بەهێزتر بوو و سەرکەوتوو بوون و توانییان ئەم میرنشینانە دامەزرێنن[3]. هەروەها سودیان لە سیاسەتی هەڵەی خەلافەت و پیاوەکانی وەرگرت، بە تایبەتی لەڕووی ئابورییەوە، چونکە فەرمانڕەواکان بە ناڕەواو زۆردارانە باج و سەرانەیان لەخەڵك دەسەند و دەیاننارده پایتەختی خەلافەت[4]. لەلایەکی ترەوە، بەهۆی ئەم سیاسەتە و لاوازیی خەلافەتەوە، میرە کوردەکان دەستیان کرد بە دەست بەسەردا گرتن و سوود وەرگرتن لە سەرچاوە داراییەکانی ناوچەکانیان، ئەمەش یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆ چەسپاندنی پایەی میرنشینەکان و دەسەڵاتی سیاسییان. هەموو ئەمانە لە سەرهەڵدانی میرنشینی حەسنەوەیهی[5] و میرنشینی دۆستەکی ـ مەروانی[6] و هەروەها عەنازیەدا[7]، دەبینرێن.

---

[1] لەبارەی بووەیهی و ئەم سیاسەتەیانەوە بڕوانە: کاهن: بنو بویه، دائرة المعارف الإسلامية، ج٨، ص٤٦٤-٤٧٨.

[2] مسكويه: تجارب الأمم، ج٢، ص٣٦٥-٣٦٦. الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٨٤. الفارقي: تاريخ الفارقي، ص٥٨. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص٦-٧، ج٩، ص١٣٦. منجم باشي: باب في الشدادية، ص٣.

[3] بۆنمونە بڕوانە: مسكويه: م.ن، ج٢، ص٣٦٥. الصابي: تاريخ هلال الصابي، اُلحق بذيل الروذراوري، عنى بتصحيحه: هـ. ف. آمدروز وبعده د. س. مرجليوث، (القاهرة: ١٩١٩)، ج٤، ص٤٢٢. الروذراوري: م.ن، ج٣، ص١٧٦-١٧٧. إبن الأثير: م.ن، ج٩، ص٧٠.

[4] بڕوانە: النقشبندي: الكرد في الدينور، ص١١٥.

[5] مسكويه: م.ن، ج٢، ص٢٧٠-٢٧١، ٢٧٤.

[6] الفارقي: تاريخ الفارقي: ص٥٠. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٣٦. إبن خلدون: تاريخ إبن خلدون، ج٤، ص٤١٠-٤١١.

[7] الصولي: م.س، ص١٩٢. إبن الأثير: م.ن، ج٨، ص٥٥٥.

مەبەستمان لە گێڕانەوەی ئەم پەرەسەندن و ڕووداوانەی کایەی ئیسلامی بە تایبەتی لە وڵاتی کورددا ئەوەیە، تیشك بخەینە سەر دوو مەسەلەی سەرەکی، یەکەمیان سروشتی سەرهەڵدانی ئەم میرنشینانەیە بەپێی ئەو چوارچێوە گشتییەی تەحەکومی بە ڕووداوەکان دەکرد. دووەمیان ـ کە دەمانەوێت لەسەری بوەستین ـ ئەوەیە لە سەرەتادا ئەم ئامادەییەی کورد لە کایەی ئیسلامیدا شتێکی سروشتی نەبووە، چونکە لەگەڵ گۆشەنیگای ئاینی ـ ڕامیاریی باو بۆ چەمکی دەسەڵات و ناوەندێتیی دەسەڵاتدا نەدەگونجا. بەڵام وەك بینیمان کورد بوونێکی کارەکییان هەبوو، بۆیە سروشتییە ئەم بوونەیان خۆی سەپاندبێت بەسەر زانینی مێژوویی ئیسلامی و ئەو کایەیەی مێژوونوس تیایدا بیر دەکاتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا وا دیارە بۆ مێژوونوسانی سەرەتای سەرهەڵدانی قەوارە ڕامیارییە کوردییەکان ئاسان نەبووە ئەم بوونە قبوڵ بکەن و وەك ڕاستییەك مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

ئەم حاڵەتە بەڕوونی لای ئەبو عەلی مەسکەویەی[1] فەیلەسوف و مێژوونوس تێبینی دەکرێت، مەسکەویە یەکێکە لەو مێژوونوسانەی هاوچاخی ئەم (پشێویە ڕامیاریە) بووە و لە گۆشەنیگایەکی ناوەندی و لە نزیکەوە سەرنجی ڕووداوەکانی داوە و لە کتێبی (تجارب الأمم)ەکەیدا بەجوانترین شێوە گوزارشتی لەم پشێوییەی سەردەمەکەی کردووە. ئەم کتێبەی دەچێتە ریزبەندی مێژووی گشتییەوە و بوارە زەمەنیەکەی لە ساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز)دا کۆتایی دێت. لەڕاستیدا کتێبی (تجارب الأمم) سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە مێژووییەی کەمێك پێشتر باسمان کرد، باشترین

---

[1] ناوی ئەبو عەلی ئەحمەد کوڕی موحومەد کوڕی یەعقوبەو بە مەسکەویە ناسراوە. سەرچاوەکان هیچ شتێکمان لەبارەی لەدایکبوون و گەورەبوونیەوە پێنالێن، ئەوەی لەبارەیەوە زانراوە ئەوەیە لە بەغداد لەژێر سێبەری بووەیهیەکاندا ژیاوەو بووە بە خەزنەداریان، ساڵی (٤٢١ك/١٠٣٠ز) مردووە. مەسکەویە یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی ، لە زۆر بواری مەعریفی وەك مێژوو و فەلسەفەو پزیشکی و ڕەوشتناسی و ...هتد. نوسراوی هەیە. زۆر دانراوی هەیە، وەك (تهذیب الأخلاق وتطهیر الأعراق) و (الحكمة الخالدة)و کتێبە بەناوبانگە مێژووییەکەی (تجارب الأمم وتعاقب الهمم). بڕوانە: یاقوت: معجم الأدباء، ج٥، ص٥-٧. القفطي: تاریخ الحكماء من كتاب أخبار العلماء بأخبار الحكماء، (لیبزك: ١٩٠٣)، ص٣٣٠-٣٣٢.

کتێبە. یەکێك لە باشییەکانی ئەوەیە هەموو ئەو هەواڵانەی تێدایە، کە پەیوەستن بە سەردەمی پێش سەرهەڵدانی میرنشینە کوردییەکان و سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە. مەسکەویە زۆر گێڕانەوەی لەبارەی وڵات و خێڵ و میر و سەرکردە کوردەکانەوە پێشکەش کردووە، هەروەها باسی ململانێی هێزە سیاسییەکانی کردووە لەسەر ئەم وڵاتە، بەتایبەتی ململانێی حەمدانی[١] و بووەیهیەکان[٢]. لێرەدا ئەم کتێبە زۆر بەسودە بۆ ئەو کەسەی لێکۆڵینەوە لەم هێزانە و هەوڵە فراوانخوازییەکانیان دەکات لەسەر حسابی کورد، لەلایەکی تریشەوە زانیاری باشی تیایە لە بارەی هەڵویستی کورد و جوڵانەوە سیاسییەکانی بۆ دامەزراندنی ئەو قەوارە سیاسییە کوردییانەی هاوشانی ئەم هێزانە بوون و دەیانویست دەست بگرن بەسەر بارودۆخی شێواوی وڵاتەکەیاندا.

لە گەرمەی ئەم رووداوانەدا، مەسکەویە پابەندە بە گۆشەنیگای تەقلیدی و سەنترالیزمی دەسەڵاتی ئیسلامیەوە، ئەو باوەڕی وایە سیستەمی دەوڵەت و ئارامیی ئەم سیستەمە بەهایەکی رەهای هەیە و مایەی گفتوگۆکردن نییە، ئەوەی ئارامی بشلەقێنێت و هانی ئاژاوە و ناکۆکی بدات و کێشە و گیروگرفت بنێتەوە، دەبێ بە چاوێکی سووک سەیر بکرێت و رسوا بکرێت، روانینی مەسکەویە لە مرۆڤ و ریزبەند کردنی رەوشتیانەی ئەفرێندراوەکان وەك ئەوەی ئەو لێی کۆڵیونەتەوە، ئەمە دەسەلمێنێت[٣]. ئەو لە گەرمەی پشێوییە کارگێڕییەکان و ئەو گەندەڵیانەی دامەزراوەکانی دەوڵەتیان خەوشدار کردبوو، لە رێگەی هێنانی ئەو هەواڵانەی لەبارەی کوردەوەن، گوزارشت لەم مەرکەزیەتەی بینین دەکات. ئەوەتە باس لەوە دەکات لە کۆتاییەکانی سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زاینی، ئەبو عەلی موحەمەد کوڕی عوبەیدوڵڵای خاقانی (٣٠١ك/٩١٣ز مردووە)، کە یەکێك بووە لە وەزیرەکانی ئەلموقتەدیر، بۆ ماوەی بیست رۆژ، بیست والیی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری

(1) تجارب الأمم، ج١، ص٧٥، ١١٥، ٤٠٤، ٤٠٨.

(2) م.ن، ج٢، ص٢٠٤-٢٠٦، ٣٦٧-٣٩٧.

(3) بۆ ئەمە بڕوانە: تهذيب الأخلاق، ص٧٩بەدواوە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی گۆشەنیگای ناوەندگەرای مەسکەوییەوە بڕوانە: أركون: نزعة الأنسنة، ص٥٧٩-٥٨١.

ماهی کوفه[١] داناوە، ئەم والییانە لە حەلوان لە خانێکدا کۆبوونەتەوە، بە هەمان شێوە لە یەك ڕۆژدا پێنج والی کاروباری هەردوو گوندی قردێ و بازبدێ (القردی والبزبدی)[٢] یان گرتووەتە دەست[٣]. مەسکەویە بۆیە ئەم هەواڵانە دێنێت، بۆ ئەوەی بەمە خراپیی ئەم وەزیرە بسەلمێنێت، چونکە ئاگای لە خزمەت کردنی سوڵتان نەماوە و دڵی دوژمنەکانی سوڵتان ڕادەگرێت[٤] و پارێزگاری لە شکۆمەندی و یەکێتیی دەسەڵاتی ناوەندی ناکات.

بەڵام سەبارەت بە بوون و پێگەی کورد لە کتێبی (تجارب الامم)دا، لە زۆر شوێندا جۆرە نەیارییەك بەرامبەر بە کورد هەست پێ دەکرێت، بە تایبەتی لەو گێڕانەوانەدا، کە پەیوەستن بە پەیوەندی کورد بە بووەیهیەکانەوە ـ کە لێرەدا نوێنەری دەسەڵاتی ناوەندین ـ و مەسکەویە لە ژێر سایەیاندا بووە و پلەیەکی کارگێڕیی بەرزیان پێدابوو[٥]، دەبینین بە ئاشکرا لایەنی ئەوانی گرتووە و وێنەیەکی شپرزە و ناڕوونی کوردی کێشاوە، لای ئەو زۆربەی کات کورد ناپاك و خراپەکارن[٦]، دز و جەردە و ڕێگرن[٧]، خەریکی تاڵانی و ڕاو و ڕوت و پیاو کوشتنن[٨].

لەباسی هەواڵی میر حەسنەوەیهی کوڕی حوسێنی بەرزیکانیی (٣٤٨-٣٦٩ك/ ٩٥٩-٩٧٩ز) دامەزرێنەری میرنشینی حەسنەوەیهیدا ئەم هەڵوێستەی مەسکەویە روونتر دەبێتەوە، ئەم میرە بە هەوڵ و تێکۆشانی تایبەتی خۆی و سود وەرگرتن لە بارودۆخەکان،

---

[1] ماهی کوفە: ناوی شاری دینەوەرە کە شارێکی کوردییەو سەر بە کاروباری هەرێمی چیا بووە، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە ئەو باجەی لەم شارە کۆدەکرایەوە دەدرا بە دانیشتوانی شاری کوفە. البكري: معجم ما استعجم، ج٣، ص١٧٧. ياقوت: معجم البلدان، ج٥، ص٤٩.

[2] قەردی و بەزبەدی: دوو گوندی گەورەی هەرێمی جەزیرەن کە سەربە کاروباری جەزیرەی ئیبن عومەر (جەزیرەی بۆتان) بوون. گوندی قەردی کە (باقەردی)شی پێ دەوترێت دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دجلەوە و گوندی بەزبەدیش دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕوباری دیجلە و بەرامبەر قەردیە.

[3] تجارب الأمم، ج١، ص٢٣.

[4] م.ن، ص٢٠-٢٢.

[5] ياقوت: معجم الأدباء، ج٥، ص٥. مارجليوث: دراسات عن المؤرخين، ص١٤٣.

[6] تجارب الأمم، ج٢، ص١٤٠، ١٥٦.

[7] م.ن، ج٢، ص٢٠٣، ٢٨١.

[8] م.ن، ج٢، ص٣٦٩، ٣٨١.

توانی لە رۆژئاوای هەرێمی چیا میرنشینێکی بەهێز دابمەزرێنێت و میرنشینەکە بەناوی خۆیەوە ناسرا[1]، بە تایبەت دوای ئەوەی دەستی گرت بەسەر شاری دینەوەر و نەهاوەند و هەمەداندا[2] و لەم ناوچانەدا بوونی سیاسیی خۆی سەلماند. بەڵام مەسکەویە بە چاوێکی سوك و رق و کینەوە سەیری ئەم میرە دەکات و لەبارەیەوە دەڵێت: ((حەزدەکات خۆشەویستەکان لەیەك بکات و دووبەرەکی بنێتەوە، چونکە سیستەمی فەرمانڕەواییەکەی پەرت کردنی کاری ئەمانەیە - مەبەستی بووەیهیەکانە -))[3] بۆیە بە شەیتان وەسفی دەکات[4].

کەواتە سروشتییە مەسکەویە رەخنەی توند لە میری بووەیهی (رکن الدولة)[5] بگرێت و سەرزەنشتی بکات، چونکە ئەم میرە بەرامبەر بە کورد نەرمیی دەنواند و هەوڵی دەدا لێیان نزیك ببێتەوە و باوەڕی وابوو دەوڵەتەکەی بەستراوە بە دەوڵەتی کوردانەوە[6]، بۆیە ((رێ لە گێرەشێوێنییان ناگرێت و بوار بە پاسەوانانی دەوروبەر نادات چاریان بکەن))[7] واتە (توندوتیژیی شەرعی) بەکار ناهێنێت دژیان، لەکاتێکدا بەپێی لۆجیکی مێژوونوس دەبوایە ئەمەی بکردایە. لەبەرامبەر ئەمەشدا، زۆر بەسەر (عضد الدولة)ی

---

[1] بۆ ئەمە بڕوانە: إبن خلدون: تاريخ إبن خلدون، ج٤، ص٦٨٧ بەدواوە. استانلي (لين بول): الدول الإسلامية، ت: محمد صبحي فرزات، (دمشق: ١٩٧٣)، ق١، ص٢٨١. زامباور: معجم الأنساب والأسرات الحاكمة في التاريخ الإسلامي، أخرجه: زكي محمد حسن بك و حسن أحمد محمود، (القاهرة: ١٩٥٢)، ج٢، ص٣٢١.

[2] إبن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص٤١٤٢. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص٦-٧. إبن كثير: البداية والنهاية في التاريخ، (القاهرة:د.ت)، ج١١، ص٢٩٦. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: النقشبندي: الكرد في الدينور، ص١٢٥-١٤٠.

[3] تجارب الأمم، ج٢، ص٣٦٥-٣٦٦.

[4] م.ن، ج٢، ص٤١٥.

[5] (ركن الدولة)ی بووەیهی: ناوی ئەبو عەلی حەسەن کوڕی بووەیە کوڕی فەناخەسرەوی دەیلەمی میری بووەیهیە، خاوەنی هەمەدان و ئەصبەهان و رەیَ بووە، ساڵی (٣٦٦ك/ ٩٨٧ز) دوای چل و چوار ساڵ فەرمانڕەوایی مردووە. إبن خلكان: وفيات الأعيان، مج٢، ص١١٧-١١٩.

[6] لەوانەیە هەر مەبەستی میرنشینی حەسنەوەیهی بێت.

[7] مسكويه: م.ن، ج٢، ص٢٨١.

بووەیهیدا[1] هەڵ دەدات، چونکە ((دەوروبەری دەپاراست و دوژمنی لەناو دەبرد)) و ((جۆش و خرۆشی کوردی دادەمرکاندەوە)) و ((ڕێورەسمی کۆنی پاشایەتی گەڕاندەوە))[2].

شایەنی باسە مەسکەویە لە نزیکەوە کوردی ناسیوە و بەشداریی هەندێك لەو ڕووداوانەی کردووە، کە پەیوەستن بە پەیوەندی میر حەسنەوەیە بە بووەیهیەکانەوە، هەروەها لە (ئیبن عەمید)ی[3] هاوڕێیەوە زانیاری تری لەبارەی کوردەوە وەرگرتووە، ئەم ئیبن عەمیدە سەرۆکی ئەو سوپایەی بووەیهیەکان بووە، کە هێرشی کردووەتە سەر میرنشینی حەسنەوەیە، بۆیە لەگەڵ کورددا ئەزمونی هەبووە و زۆر شتی لەبارەی کورد و خراپەکارییەکانی کورد بۆ مەسکەویە گێڕاوەتەوە. مەسکەویەش متمانەی پێکردووە و بۆ هەواڵەکانی سەردەمی خۆی پشتی پێبەستووە[4].

هێنانی ئەم زانیارییانە بۆ ئەوەیە بڵێین ئەم بڕیارانەی مەسکەوی لەسەر کورد، لەوێوە نین، کە زانیاری لەبارەی کوردەوە نەبووە، بەڵکو ، بەڕای ئێمە، ڕەنگدانەوەی بۆچوونی ئەون لەسەر ناوەندێتی، پاشان ئەگەرچی مەسکەویە سەر بە کایەی ئیسلامی بوو، بەڵام توانای بینینی ئەو گۆڕانانەی نەبوو، کە لە کایەکەدا ڕوویان دەدا، پەرەسەندنەکان زۆر لەوە خێراتر و قووڵتر بوون زانینی مێژوویی ئیسلامی بتوانێت گوێیان .ێ نەدات و تاهەتایە دەست بە ناوەندێتی و یەکێتی خانەی ئیسلامەوە بگرێت، ئەستەم .و ئەم مێژوونوسە و مێژوونوسانی تریش بتوانن ئەوە ببینن ئەو مەرکەزیەتەی باوەڕیان پێیەتی، تووشی لێکترازان بووە و چەمکی ناوەندێتی و یەکێتی خانەی ئیسلام لە جۆرێك ئینتیمای ئایینیدا کورت بووەتەوە و تەنانەت فەقیهەکانیش وازیان لەم باوەڕە هێناوە.

---

[1] (عضد الدولة)ی بووەیهی: کوڕی (رکن الدولة)یە، دوای باوکی لە ساڵی (٣٦٦ك/٩٧٨ز) فەرمانڕەوایی گرتەدەست، فەرمانڕەواییەکەی تا ساڵی (٣٧٢ك/ ٩٨٢ز) بەردەوامبووە. بەناوبانگترین میری بووەیهیەو هیچکامیان بە ئەندازەی ئەم خاوەنی موڵك و دەسەڵات نەبوون. إبن خلكان: م.س، ج٤، ص٥٠-٥٥.

[2] م.ن، ج٢، ص٢٨٢.

[3] ئیبن عەمید: ناوی محەمەد کوڕی حسێن حەمید کوڕی محمد ئەبو فەزلە، نوسەرێکی دیارو سیاسییەکی بەتوانا بووە. وەزیری (رکن الدولة)ی بووەیهی بووە، لەو کاتەدا کە بە ڕێگاوە بووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی میر حەسنەوەیە، لە هەمەدان مردووە. إبن خلكان: م.ن، ج٤، ص١٨٩-١٩٧.

[4] مسکویە: م.س، ج٢، ص١٣٦-١٣٧، ١٤٠.

ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو، پەرەسەندنەکان زۆر لەوە خێراتر و قوڵتربوون زانینی مێژوویی ئیسلامی بتوانێت پشتگوێیان بخات و تاهەتایە دەست بە ناوەندێتی و یەکێتی خانەی ئیسلامەوە بگرێت.

هەرچەند مەسکەویە، لە بینینی بوونی کورد لە مێژوودا، دەستبەرداری تێڕوانینە ناوەندییەکەی نەبوو، بەڵام ئەو مێژوونوسانەی دوای ئەو هاتن، وازیان لەم تێروانینە هێنا، یاخود ڕەهەندێکی گشتگیرانەتریان پێدا. بۆیە ئەو هەڵوێستەی مەسکەویە بەرامبەر میر حەسنەوەیه وەری گرتبوو، لای ئەمان دەگۆڕێت و بە پێی زنجیرەی ڕووداوەکانی دواتر بوونی ئەویان بە سروشتی دەزانی. بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەو میرنشینەی حەسنەوەیه بناغەکەی دانابوو، لە تۆمارکردنی مێژووی دوای قۆناغی مەسکەویەدا دەبێتە واقیعێکی مێژوویی. بە گوزارشتی مەسکەویە، حەسنەوەیه شەیتانە، بەڵام لای ئەو مێژوونوسانەی تر، کە لە دەرەوەی باڵادەستی ناوەندێتیی تایبەت بە سەردەمی مەسکەویەوە دەدوێن، حەسنەوەیه «شکۆمەندە و ژیانی پاکە و بە چاکی سیاسەتی کردووە» و «پارەیەکی بێشومار دەکات بەخێر»[1]، واتە لەرووی سیاسی و ئاینییەوە، دەبێتە کەسایەتیەکی پەسەند و ئەو مێژوونوسەی مێژووی سەردەمی ئەم میرە دەنوسێتەوە، ناتوانێت پشتگوێی بخات یان لە مێژوو غاییبی بکات. بێ ئەوەی ئەمە مانای ئەوە بێت ئەم میرە و ئەوانی تریش بوونێکی ڕەها و بێ مەرجیان هەبووە.

## ٢ ـ شەرعیەتی بوونی کورد لەنێوان فەقیە و مێژوونوسدا

مێژوونوس نەیدەتوانی لە مێژوودا بوونی کورد لەبەر چاو نەگرێت، ئەم بوونەش لە میرنشینەکاندا بەرجەستە دەبوو، بەتایبەتی ئەومیرنشینانەی کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان هەبوو لەسەر ئەو کایەی مێژوونوس مێژووەکەی تۆمار دەکرد، وەك میرنشینی حەسنەوەیه و عەنازی و میرنشینی دۆستەکی ـ مەروانی، ئەم میرنشینانە بەهێز (بوون)یان هەبووە و لای ئیبن خەلدون، سەردەمەکەیان، سەردەمێکی کوردیانەی

---

[1] بڕوانە: إبن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص٤١٤٢. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ص٧٠٦. إبن كثير: م.س، ج١١، ص٢٩٦. إبن خلدون: تاريخ إبن خلدون، ج٤، ص٦٨٨.

پەتییە[1] و بوونی خۆیان سەپاند بوو بەسەر خەلیفە و ئەوەی نوێنەرایەتی دەسەڵاتی خەلیفەی دەکرد، کە بووەیهییەکان بوون، بۆیە لەسەر زانینی مێژوویی پێویست بوو، دان بەم بوونەدا بنێت و بە دوای هەواڵی میرە کوردەکاندا بگەڕێت، واتە مێژوونوس لە واقیعی ژیانەوە ڕووداوەکان تۆمار بکات. بەڵام ئایا ئەو هەواڵانە چین، کە مێژوونوس تۆماری کردوون؟ ئایا لەپشت ئەم پرۆسەی تۆمارکردنەوە بڕیارێکی پێشوەختە هەبووە، کە مێژوونوس باوەڕی پێی هەبێت و لە چوارچێوەیدا بیر بکاتەوە؟ کەواتە پرسیارەکە لەبارەی ئەو مەرجانەوەیە، کە مێژوونوس بەپێی ئەوان هەواڵێك تۆمار دەکات یان تۆماری ناکات.

پێشتر وتمان زۆربەی زۆری مێژووی نوسراو، مێژووی دەسەڵاتە. کەچی لەم قۆناغە مێژووییەدا دەبینین جۆرێك دەرچوون هەیە لە تێڕوانینی ـ باو ـ بۆ دەسەڵات، کە خەلیفە نوێنەرایەتیی دەکرد، لێرەدا ئەگەرچی خەلیفە وەك کرۆکی دەسەڵاتی ئیسلامی و دابەشکەری ئەم دەسەڵاتە هێڵرا بوویەوە، بەڵام لەرێگەی ڕەوایەتی دان بە دەسەڵاتی میر و سوڵتانەکانی ترەوە، زیاتر لە نوێنەرێکی دەسەڵات هەبوو، ئیتر ـ وەك پێشتر ـ خەلیفە دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای وڵاتی ئیسلامدا نەمابوو، تەنها دەسەڵاتێکی ڕەمزی مابوو و لە دان پیانانێکی شکڵی و مافی بەخشینی نازناو و پەیمانی فەرمانڕەواییدا بەرجەستە دەبوو، بەرامبەر ئەمە لە وتاری هەینیدا ناوی خەلیفە دەهێنرا، هەروەها ناوی لەسەر دراوی ناوخۆیش دەنوسرا، بەم پێیە کاری خەلافەت تەنها چەسپاندنی ئەو دەسەڵاتە ڕەمزییە بوو بۆی مابوویەوە. بەڵام ئەمە هەرگیز مانای دەرکردنی خەلیفە نییە ـ ئەگەرچی دەسەڵاتە فراواناکەی لێ داماڵرابوو ـ لە مێژوو و ژیانی سیاسی و ئەو ناوەندێتییەی هەیبوو، ئەو لە تێڕوانینی خەڵکە ڕەشۆکی و تایبەتەکەشدا، هێشتا نوێنەری دەسەڵاتی شەرعی و باڵایە. بۆیە دەبوو، لەلایەکەوە چوارچێوەیەکی فیقهیی نوێ بۆ ئەم شەرعەیەتە بدۆزرێتەوە، لەلایەکی تریشەوە ڕەوایەتی بدرێ بە دەسەڵاتی ئەوانی تر لەناویشیاندا میرنشینە کوردییەکان، فەقیهەکان هەوڵیان دەدا تیۆریزەی بکەن، مێژوونوسانیش ـ لەلایەن خۆیانەوە ـ لە نوسینەکانیاندا، کاریان لەسەر بەرجەستەکردن و برەو پێدانی دەکرد.

---

[1] تاريخ إبن خلدون، ج٤، ص٤١٠-٤١٨، ٦٨٧-٦٩٩.

لە گەرمەی ئەم ململانێ و پشێویەدا، دان پێدانانی کۆیی کۆمەڵە ئیسلامیەکان بە قەوارە سیاسییە تازەکاندا ـ وەك میرنشینە کوردییەکان ـ مەسەلەیەکی سروشتی بوو و بوونیان بە کارێکی پێویست دادەنرا بۆ پاراستنی ئاسایش و یەکڕیزیی ئەم کۆمەڵە فرە رەنگە. لە ئەنجامی ئەمەوە، هەندێ لە فەقیهەکانی ئەم سەردەمی پشێوی و لێکترازانە، هەوڵیاندا واتایەکی گشتگیرانەتر بدەن بە شەرعیەت، بۆئەوەی لەم بوارەدا توانای لەخۆگرتنی داواکارییەکان و رۆحی سەردەمی هەبێت، بە مەرجێك دان بە پێشەواتیدا بنێت ((دەسەڵاتی هەبێت یان نەبێت))[1] و دەیانوت ئەگەر کەسانی تر ـ جگە لە خەلیفە ـ بوونە خاوەن دەسەڵات و بە دادپەروەرانە فەرمانڕەواییان کرد، ئەوا ئەم دەسەڵاتدارییەیان بەهانەی شەرعیی خۆی هەیە[2]. بەم جۆرە دامەزراوەی فیقهی ئیسلامی کاری لەسەر وەرگرتنی گۆڕاوەکانی کایەی ئیسلامی و فراوان کردنی تێڕوانینی خۆی دەکرد بۆ بینینی ئەم گۆڕاوانە، ئەمەش بە دانانی چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ لەخۆگرتنی دەسەڵاتە زۆردارەکان لەم بوارەدا.

ئەبو حەسەن ماوەردی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز مردووە) دیارترین فەقیهی کایەی هزری سیاسیی ئیسلامییە، کە چارەسەری ئەم مەسەلەیەی کردووە و چەند بەشێکی کتێبی (الأحكام السلطانية)ی تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوەی جۆری میرنشینەکان و تایبەتمەندیی هەر جۆرێکیان. ئەوەی لەم مەسەلەیەدا ماوەردیی پێ جیا دەکرێتەوە، ئەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی واقیعیانەی سیستەمی میرنشینی کردووە و لەبەر رۆشنایی ئەوەی لە ریشەدا لە کایەی ئیسلامیدا هەبووە تیۆرەکانی داناوە.

ئەوەی ئەو لەبارەی میرنشینی دەسەبەسەراگرتنەوە (الامارة الاستيلاء) دەیڵێت، بەسەر میرنشینە کوردییەکان و ئەوانی تریشدا دەچەسپێت، چونکە بەپێی پێناسەی ئەم فەقیهە میرنشینی دەستبەسەراگرتن ئەوەیە خەلیفە بە ناچاری دان بنێت بە دەسەڵاتی میرێکدا، کە بەزۆر دەستی گرتووە بەسەر رووبەرێکی جیۆگرافیدا، بەمە میر ((بەزۆر دەست بەسەر سیاسەت و بەڕێوەبردندا دەگرێت، خەلیفەش رێی پێ دەدات بۆ

---

[1] الحليمي: المنهاج في شعب الإيمان، تحقيق: حلمي محمد فودة، (بيروت: ١٩٧٩)، ج٣، ص١٥٧.

[2] م.ن، ج٣، ص١٧٩.

جێبەجێکردنی فرمانەکانی ئاین، بۆ ئەوەی لە خراپە دەربچێت و بەرەو راستی بڕوات و لە قەدەغەوە ببێتە رێ پێدراو))[1].

لە راستیدا، ئەم تیۆریزەکردنەی ماوەردی، بەرگریکردنێکی سەر سەختانەیە لە خەلیفە و خەلافەت، مەسەلەی تاك دەسەلاتی یان یەکێتیی دەسەلات تێ دەپەڕێنێت و تەنها دەسەلاتی بالای ئاینی لەبەرچاو دەگرێت. میری دەستبەسەراگر لەژێر سایەی خەلیفەدا شەرعیەت بەدەست دێنێت و دانی پێدا دەنرێت، بەمەش خەلیفە لە کایەی ئیسلامیدا سەنترالیزمی رەمزی و پێگەی خۆی لە لوتکەی دەسەلاتدا دەچەسپێنێت. واتە میر شەرعیەتی دەسەلاتی نییە و خەلیفە ئەم شەرعیەتەی پێ دەبەخشێت، کەچی رێ بەخۆی دەدات دەسەلاتی بەسەر هەموو ئوممەتدا هەبێت[2]. ئەگەر بوونی دەستبەسەراگر بەشێوەیەکی شەرعی بێت، ئەوا حاڵەتەکە ئاساییە و - بەگوزارشتی هاملتۆن گب - ئەستەمە وا وەسف بکرێن لە خەلافەت یاخی بوون، چونکە دان بە سەروەریی خەلافەتدا دەنێن و دژایەتیی ناکەن[3]. لە حاڵەتی میرنشینە کوردییەکاندا بە روونی ئەمە بەرچاو دەکەوێت، چونکە ئەم میرنشینانە هەڵوێستێکی ئیجابییان هەبووە بەرامبەر خەلافەتی عەبباسی، بەتایبەتی بەرامبەر فەرمانڕەوایی خەلیفە (القادر بالله) (٣٨١-٤٢٢ك/ ٩٩١-١٠١٣ز) و خەلیفە (القائم بأمرلله) (٤٢٢-٤٦٧ك/ ١٠٣١-١٠٧٥ز)، کە ماوەردی لەسەردەمیاندا ژیاوە (٣٦٤-٤٥٠ك/ ٩٧٤-١٠٥٠ز)، ئەم خەلیفانە، بەتایبەتی (القادر بالله)، دانی بە میرە کوردەکاندا نابوو و نازناو و پەیمانی فەرمانڕەوایی پێ بەخشیبوون[4]. میرەکانیش لەلای خۆیانەوە دڵسۆزی خەلیفە بوون و لە وتاری هەینیدا

---

[1] الأحكام السلطانية، ص٥٥.

[2] الماوردي: قوانين الوزارة وسياسة الملك، تحقيق و دراسة: رضوان السيد، (بيروت: ١٩٧٩)، ص٢٩-٣٠(لە پێشەکیەکەی ساغکەرەوە وەرگیراوە).

[3] دراسات في حضارة الإسلام، ص٢١٣.

[4] الروذراوري: ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٣١١. الفارقي: تاريخ الفارقي، ص١٠٨. ابن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٣٦٠-٤٣٦١. سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الأعيان، (٤٣٥-٤٤٧ك)، تحقيق: جنان خليل الهموندي، (بغداد: ١٩٩٠)، ص٢٩٦-٢٩٧. ابن شداد: الأعلاق الخطيرة، ج٣، ق١، ص٣٥١-٣٥٢.

ناویان دەهێنا[1] و دراویان بەناوی ئەوەوە لێدەدا[2] و زۆر دیاردەی تری شوێنکەوتەیی و نیشانەی پەیوەندیی دۆستانە لەنێوان ئەم میرانەو خەلافەتدا هەبوو[3]. پاشان لەسەر ئاستی فەرمی و بەپێی سیستەمی فیقهی ئیسلامی و ئەو واتایەی بەپێی داواکارییە گۆڕاوەکانی سەردەم درابوو بە شەرعیەت، بوونی ئەم میرنشینانە شەرعی بوو.

لێرەوە ئیتر مێژوونوس لەلایەن ئەم سیستەمەوە ڕێی پێدەدرێت مێژووی ئەم میرە کوردانە و میرەکانی تری دەوروبەر، کە بەزۆر دەستیان بەسەر دەسەلات و سیاسەت و بەڕێوەبردندا گرتبوو، بنوسێتەوە، بەمەرجێك ئەوەی دەینوسێتەوە لەو چوارچێوەیە دەرنەچێت فەقیە بۆی دیاری کردووە.

بۆئەوەی باشتر لەمە تێبگەین و خەسڵەتی ئەم پەیوەندیەی نێوان فەقیە و مێژوونوسمان بۆ روون ببێتەوە، مێژوونوس و وەزیر (روذراوەری)[4](٤٨٨ك/ ١٠٩٥ز مردووە) و ئەو کتێبەی وەردەگرین، کە تەواوکەری کتێبی (تجارب الأمم)ی مەسکەویەیە. مێژوونوس لە پێشەکیی کتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکات شوێنپێی مەسکەویەی هەڵگرتووە و ڕێبازی ئەوی گرتووەتە بەر[5]، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە روذراوری لە هەمان روانگەی مەسکەویەوە سەیری ڕووداوەکان دەکات، لە هەمان کاتدا ئەمە بەو مانایەش

---

[1] بۆ شێوەی ئەمە لە میرنشینی رەوادی و حەسنەوەیهیدا بڕوانە: ناصر خسرو: سفرنامة ، ت: يحيى الخشاب، (القاهرة: ١٩٤٥)، ص٥. مؤلف مجهول: مجمل التواريخ والقصص، بتصحيح: ملك الشعراء محمد تقي بهار، (تهران: ١٣١٨هـ.ش)، ص٤٠١.

[2] لە بارەی دراوی میرنشینی حەسنەوەیە و دۆستەکی ـ مەروانی بڕوانە: النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص٣٠٤-٣٠٩. يوسف: الدولة الدوستكية، ج٢، ص١٠٦-١١٧.

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم پەیوەندیە بڕوانە: حسن: الإمارات الكردية، ص٦٢-٧٠.

[4] ناوی موحەمەد کوڕی حسێن کوڕی موحەمەد کوڕی عەبدوڵلایە، بە (ظهيرالدين الروذراوري) ناسراوە. لە ساڵی (٤٧٦ك/ ١٠٨٣ز)وە وەزیری خەلیفە (المقتدى بامرالله)ی عەباسی (٤٦٨-٤٨٧ك/ ١٠٧٥-١٠٩٤ز) بووەو ساڵی (٤٨٤ك/١٠٩١ز) لابراوە. کەسێکی خاکی بووەو زۆر یارمەتی لێقەوماوانی داوە.ساڵی (٤٨٨ك/١٠٩٥ز) مردووە. جگە لەم کتێبە مێژووییەی کتێبی تریشی هەیە. إبن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٤٩٢٤-٤٩٢٩. إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٥، ص١٣٤-١٣٥.

[5] ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٥.

نایەت باوەڕی بەو ناوەندێتییە نییە، کە مێژوونوسەکانی تر باوەڕیان پێی هەبوو، ئەمەش بەڕوونی لە پیاهەڵدانە زۆرەکانی بە خەلیفەی عەبباسیدا دەردەکەوێت[1]. بەڵام ئەم سەنتراڵیزمە، سەنتراڵیزمێکی هەموار کراوە، لێرەدا خەلیفە ڕەمزی دەسەڵاتی ئاینییە و بووەیهیەکان پارێزەر و دڵسۆزی ئەم ڕەمزەن[2].

ئەم نەرمییەی مامەڵەکردن لەگەڵ چەمکی دەسەڵاتدا ڕێگەی بە روذراوری دابوو بوونی سروشتیی کورد لەگەڵ دەسەڵاتدا قبوڵ بکات[3]، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێژەیی هەواڵەکانیانی تۆمار دەکرد، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو ئەو کوردەی لای بووەیهییەکان پەسەند بووایە و لەڕووی سیاسییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکردایە، لای ئەمیش پەسەند بوو و هەواڵەکانی تۆکار دەکرد. بەڵام ئەو کوردەی بەربەرکانێی بووەیهییەکانی بکردایە، لای ئەم مێژوونوسەش پەسەند نەبوو و هەواڵەکانی تۆمار نەدەکرد. واتە بە ئاشکرا لایەنی بووەیهیەکانی دەگرت[4]، بەڵام ئەم لایەنگرییە وای لێ نەکردبوو سڵ لە تۆمارکردنی چەند بەشێکی تێر و تەسەلی هەواڵەکانی کورد بکاتەوە، کوردی بە تەواوکەری سیاقی مێژوویی دادەنا و پێی وابوو کورد بوونێکی بەهێزیان هەیە و ناکرێ پشتگوێ بخرێن[5].

دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی بوونی شەرعیی کورد لە مێژوودا و بۆ روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە لای روذراوەری، یەکێك لە میرە کوردەکان وەردەگرین بۆ ئەوەی مەودای شەرعیەتی (بوون)ی لەم مێژووەدا ببینین، هەروەها ئەوە ببینین تا چ ئاستێك ئەم بوونە لەگەڵ ئەو مەرجانەدا یەك دەگرێتەوە، کە دەبێت لە میری دەستبەسەراگردا هەبن، بۆئەوەی ئەم شەرعیەتە بەدەست بهێنێت. ئەو میرەش روذراوەری لە هەموو میرەکانی تر زیاتر بایەخی پێ دەدات، میر بەدری کوڕی حەسنەوەیهە، کە دوای حەسنەوەیهی باوکی لەساڵی (٣٦٩ك/٩٧٩ز) فەرمانڕەوایی گرتە دەست و تا ساڵی (٤٠٥ك/ ١٠١٤ز) لە

---

(1) م.ن، ج٣، ص٦.

(2) م.ن، ج٣، ص٧-٨.

(3) بۆنموونە بڕوانە: م.ن، ج٣، ص٩، ١٦٤، ١٦٩، ٢٩٧-٢٩٨، ٣٠٠.

(4) م.ن، ج٣، ص١٢، ٨٤-٨٦.

(5) م.ن، ج٣، ص١٣٩-١٤٠، ٢٨٨، ٣١٤.

فەرمانڕەوایی کردن بەردەوام بوو. میر بەدر یەکێکە لە میرە گەورەکانی سەردەمی ڕوذراوەری، ماوەی فەرمانڕەواییەکەی بەگرنگترین ماوەی مێژووی میرنشینی حەسنەوەیە دادەنرێت، چونکە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمدا میرنشینەکە بەهێزبوو و پەلی هاویشت و دەسەڵاتی خۆی بەسەر زۆر ناوچەی ڕۆژئاوای هەرێمی چیادا سەپاند[1].

ڕوذراوەری بەتەواوی ئاگاداری ئەو مەرجانەبوو، کە لەم میرە کوردە دەست بەسەر دەسەڵات گرتووەدا هەبوون، بۆیە هەوڵ دەدات پاساو بۆ بوونی بهێنێتەوە، لەدووتوێی قسەکانیدا لەبارەی «کردار و ڕەوشتی بەدرەوە» باس لە مەرجەکانی فەرمانڕەوایی دروست دەکات، کە بریتین لەوەی خاوەنەکەی «ئاگای لە سیاسەت بێت، سەرباز سڵی لێ بکەنەوە، بەرامبەر خەڵك دادپەروەر بێت، لە چۆنیەتی کۆکردنەوە و خەرج کردنی داراییدا پسپۆڕ بێت، حەزی لەکاری چاکە بێت و چێژ لە چاکەکردن وەرگرێت، خاوەنی ڕا و بۆچوونی خۆی بێت، لە جەنگدا ئازا و چاونەترس بێت»[2]. مێژوونوس باوەڕی وابووە بەدر هەموو ئەم خەسڵەت و کردەوە چاکانەی تێدا بووە[3]. ئەمەش شەرعیەت دەدات بە بوونی مێژوویی ئەم میرە و مێژوونوس دەتوانێت پانتاییەکی زۆر بۆ هەواڵەکانی تەرخان بکات[4]. تەنانەت ئەم بوونە خۆی دەسەپێنێت بەسەر ئەو شاعیرانەی لەم بوارەدا شیعر دەنوسن[5]. تەنانەت ڕوذراوریش، کە لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا بەپێی ساڵەکان هەواڵەکانی تۆمار دەکرد، لەم ڕێبازە لادەدات و چەند لاپەڕەیەك تایبەت دەکات بە کار و سیاسەت و ڕاوبۆچوونەکانی بەدر[6].

---

(1) بڕوانە: النقشبندي: الكرد في الدينور، ص١٤٥-١٧١. هەروەها بڕوانە: ڕۆژبەیانی: مێژووی حەسنەوەیهی و عەییاری، ل٦٠-٩٦.

(2) ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٢٨٧.

(3) م.ن، ج٣، ص٢٨٨.

(4) بڕوانە ئەوەی مێژوونوسەکانی تر ـ جگە لە (ڕوذراوری) ـ لەبارەیەوە نوسیویانە: الصابي: تاريخ هلال الصابي، ج٤، ص٤٥٢-٤٥٥. إبن الجوزي: م.س، ج٩، ص٤٣٦٠-٤٣٦١. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص١٩٦-١٩٧، ٢٤٨. سبط إبن الجوزي: مرآة الزمان (٣٤٥ك-٤٤٧ك)، ص٢٩٦-٢٩٧. إبن كثير: م.س، ج١١، ص٣٥٣-٣٥٤.

(5) بۆنمونە بڕوانە: الثعالبي: خاص الخاص، قدم له: حسن الأمين، (بيروت: د.ت)، ص٢١٢.

(6) ذيل تجارب الأمم: ج٣، ص٢٧٨-٢٩٢.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە ئەو هەواڵانەی ئەم مێژوونوسە لەبارەی میر بەدرەوە تۆماری کردوون، زۆر لەو مەرجانە دەچن، کە ماوەردی داینابوون و دەبوایە لە میرەکاندا هەبوونایە بۆ ئەوەی بوون و فەرمانڕەواییەکەیان شەرعی و دان پیانراو بێت. واتە روزداوەری لەو رەوتە لای نەداوە، کە فەقیە دیاریی کردووە، یان لەو بوارە دەر نەچووە، کە دەبێت مێژوونوس تایبەتی کات بەم میر یان بەو میری کورد. بەلای روزداورییەوە بەدری کوڕی حەسنەوەیە زۆربەی ئەو مەرجانەی تێدا بوو، کە فەقیە داینابوون، وەك لەم وێنەیەدا روون دەبێتەوە:




**(وێنەی لەیەکچوونی تێڕوانینی مێژوونوس و فەقیە لە میری دەستبەسەراگر (کورد))**

بەم جۆرە دەبینین مێژوونوس باسی میرە کوردەکان ناکات وەك خودی خۆیان، بەڵکو بەپێی ئەو مەرجە گشتییانە باسیان دەکات، کە تەحەکوم بە بیرکردنەوەی دەکەن، بۆیە بوونی کورد دەخاتە ناو چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە و بەهۆی ئامادەیی ناوەندێتیی بەهێز و بەدەسەڵاتی تری وەك بووەیهیەکانەوە، ناوەندێتی نادات بەکورد و بوونی کورد دەبەستێتەوە بە بوونی ئەوانەی دەسەڵاتێکی بەهێزتریان هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا گەر لەم قۆناغەدا بوونێك درابێت بە کورد، ئەوا بوونێکی سروشتی بووەو نەدەکرا غایب بکرێت. مێژوونوس لەکاتی تۆمارکردنی هەواڵی میرە کوردەکاندا بایەخ بەوە دەدات، کە بە سەرچاوەی شەرعیەتی فەرمانڕەوایی ئەمانە دادەنرێت، کاتێکیش لە چوارچێوەی رووداوەکاندا باسی میرە کوردەکان دەکات، کە بوونی ئەم میرانە لەگەڵ دەسەڵاتدا بوونێکی ئاسایی و قبوڵ کراو بێت[1]. کورد وەك ئەوانی تر، بەشداریی ململانێکانی دەکرد و لەناو ئەو سیستەمی پەیوەندیانەی کایەی ئیسلامیدا کاری دەکرد، کە زانینی مێژوویی ئەم قۆناغە خەریکی بەرجەستە کردنیان بوو.

---

[1] جێی ئاماژەیە کە ئاڕاستەی شیعی ـ فاتمی لە نوسینەوەی مێژوودا، یان لە بینینی رووداوەکاندا، جیاوازبوو لەو ئاڕاستەیەی لە سایەی خەلافەتی عەبباسی ـ سوونیدا هەبوو. لێرەدا دەبینین ئامادەیی کوردو قبولکردنیان ، تا رادەیەکی زۆر بەستراوە بە وەڵامدانەوەی میرە کوردەکان بۆیان لەرووی سیاسی و عەقیدەییەوە. بۆ نمونە لای (داعی الدعاة)ی فاتمی (المؤید في الدین هبة الله الشیرازي) (٤٧٠ك/١٠٦٢ز مردووە)، تا میرەکانی میرنشینی مەروانی و میرنشینی جاوانی (٣٩٢-٦٥٦ك/١٠٠٢-١٢٥٨ز) لەگەڵیاندان تێڕوانینێکی باشی هەیە بۆیان، بەڵام کاتێك ئەم میرانە واز لە لایەنگریان دێنن، ئەم تێڕوانینە پێچەوانە دەبێتەوە. بڕوانە: سیرة المؤید في الدین الداعي الدعاة، تحقیق: محمد کامل حسین، (القاهرة: ١٩٤٩)، ص١٠٨-١١٦، ١٣١-١٣٩، ١٤٤-١٤٧، ١٦٣-١٧٠. لەبارەی پەیوەندی کورد بە فاتمیەکانەوە بڕوانە: یوسف: الدولة الدوستکیة، ج٢، ص٢٦-٤٠. آواز محمد علي (عبدالکریم): الکورد الجاوانیون ـ دورهم السیاسي والحضاري في العسر العباسي (٣٩٢-٦٥٦ك/ ١٠٠٢-١٢٥٨ز)، رسالة ماجستیر غیر منشورة، جامعة دهوك، (دهوك: ٢٠٠٣)، ص٧٠-٧٣. هەروەها بڕوانە: زرار صدیق توفیق: النفوذ الفاطمي في بلاد الکورد، دراسة في العلاقات الفاطمیة ـ الکوردیة، مجلة جامعة دهوك، (دهوك: ١٩٩٩)، مج٢، ع٣، ص٤٥٣-٤٦١.

دەتوانرێ بوترێت، بەشێوەیەکی گشتی میرە کوردەکان لە هەموو ئاستەکان و تەنانەت لە سەر ئاستی کۆمەڵایەتیش ئامادەییان هەبوو و خۆیان سەپاند بوو بەسەر ئەو کۆئەندێشەیەدا[1]، کە پێشتر کوردی رەت دەکردەوە. بۆ روونکردنەوەی ئەمە یەك نمونە دەهێنینەوە، ئەویش هەڵوێستی خەڵکی شاری موسڵە بەرامبەر کوژرانی میر بادی دامەزرێنەری میرنشینی دۆستەکی ـ مەروانی، کە لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی بووەیهی و دەست و پێوەندە حەمدانییەکانیاندا لە ساڵی (٣٨٠ك/ ٩٩٠ز)دا کوژرا[2]. خەڵکی ئەم شارە خەم و پەژارەیەکی زۆریان بۆ خوارد و زۆر بە داخەوە بوون بۆ کوژرانەکەی، کفنیان کرد و نوێژیان لەسەر کرد و ناشتیان و پرسەیان بۆ دانا و شیوەن و گریانیان بۆ کرد[3]. دیارە هەڵوێستی ئەم خەڵکە، تەنانەت وەزیر و مێژوونوسێکی وەك روذراوریی سەر بەچینە تایبەتەکەی تورەکردبوو، چونکە چارەی ئەم میرە کوردە بەرهەڵستکارەی بووەیهیەکانی نەدەویست[4]، بۆیە لەبارەی هەڵوێستی خەڵکی موسڵەوە دەڵێت: ((دوای لەناوچوونی، ئەو خۆشەویستیەی خەڵکە رەشۆکیەکە بۆیان دەربڕی شتێکی سەیربوو، ئەگەر چی دژە بۆچوون لای گێرە شێوێنان سەیر نییە و لەوەدا سەرزەنشت ناکرێن، کە رەفتاری جیاواز دەنوێنن، کە چاویان بڕییە شتێك زۆر نەوێرانە هەوڵی بەدەست هێنانی دەدەن، کە سەرکوتیشت کردن مەراییت بۆ دەکەن))[5]. ئامادەیی کورد لە خەیاڵداندا تا ئەو رادەیە بەهێز بووە، پاڵی بە شاعیرێکەوە ناوە، دوای نەمانی فەرمانڕەوایی مەروانی، لەبارەی دیاربەکرەوە بڵێت: ((لەو کاتەوەی (ئەم شارە) مەروانەکەی نەماوە، بووەتە وڵاتێکی وێرانە و کێوێکی سەخت و، خەڵکەکەی کوێراییان داهاتووە))[6].

---

[1] بۆنمونە بڕوانە: البیروني: کتاب الجماهر في معرفة الجواهر، (الدکن: ١٣٥٥ك)، ص٧٢. التوحیدي: الإمتاع والمؤانسة، ج٣، ص٢٨٨. إبن حمدون: التذکرة الحمدونیة، مج٢، ص٩٠-٩١.

[2] بۆ ئەمە بڕوانە: الروذراوري: ذیل تجارب الأمم، ج٣، ص١٧٦-١٧٨. الفارقي: تاریخ الفارقي، ص٥٧-٥٨. إبن الأثیر: الکامل، ج٩، ص٧٠-٧١. إبن الوردي: تاریخ إبن الوردي، ج١، ص٣٠٩. التکریتي: الإمارة المروانیة، ص٧١.

[3] الروذراوري: م.ن، ج٣، ص١٧٨. الفارقي: م.ن، ص٥٨.

[4] م.ن، ج٣، ص٨٤.

[5] م.ن، ج٣، ص١٧٨.

[6] عمادالدین الأصبهاني: خریدة القصر وجریدة العصر، القسم العراقي، ج٢، ص٦.

لەمەوە ئەوە دەردەکەوێت، تا کورد لەم کۆنەندێشەیەدا پەسەند بن و لەگەڵ دەسەڵاتدا بن، ئەستەمە جارێکی تر زانینی مێژوویی ئیسلامی کە ـ بەجۆرێك لە جۆرەکان ـ رەنگدانەوەی روانینی ئەم کۆنەندێشەیە بۆ مێژوو، بتوانێت بەئاسانی بیانکاتە دەرەوەی مێژووەوە.

## ٣- گۆشەنیگای مێژووی ناوچەیی

ئەو مێژوونوسانەی بایەخیان بە مێژووی گشتیی ئیسلام دەدا، لە تۆمارکردنی ئەو رووداوانەی تایبەتن بە مێژووی کورد، تەنها جەختیان لەو میرنشینانە دەکردەوە، کە لەناوەندی دەوڵەتی عەبباسییەوە نزیك بوون، وەك میرنشینی حەسنەوەیه و عەنازی، و دۆستەکی ـ مەروانی و جاوانی. لەکاتێکدا میرنشینە دوورەکانی وەك شەدادی و رەوادی، لە دەرەوەی چوارچێوەی کاریگەری و کار لێکردنی ئەو فەزا سیاسییەدا بوون، کە هزری مێژوونوس پێوەی سەرقاڵ بوو، بۆیە تەنانەت جێی بایەخی ئەو مێژوونوسانەش نەبووە، کە تەنها لە ئاستی زەینیدا بە ناوەندەوە پابەند بوون. بەڵام ئەمەش مانای نائامادەیی تەواوی ئەم میرنشینانە نییە لە گۆرەپانەکەی مێژوونوسدا، چونکە ئەم دوو میرنشینە، بەتایبەتی شەدادی، بەپلەی یەکەم میرنشینێکی جیهادی بوو، ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی ئەو کوردانەی لەناو ئەم میرنشینەدا بوون بەهۆی هاوسنورییان لەگەڵ بێزەنتی و قەفقاسیەکان، (میزاجێکی جەنگاوەرانە)یان بەدەست هێنابوو[1]. بۆیە سروشتی بوو هەواڵەکانیان لە کۆنەندێشەی ئەو کاتەو لای مێژوونوسیش دەنگدانەوەی هەبێت. لەو هەواڵەدا، کە لەبارەی میر فەزلون کوڕی موحەمەد کوڕی شەدادەوە لەناو مێژوونوسەکاندا بڵاو بووبوویەوە، هەست بەمە دەکرێت. ئەم میرە لەساڵی (٣٧٥ك/٩٨٥ز)یەوە تا ساڵی (٤٢٢ك/١٠٣٠ز) فەرمانڕەوای میرنشینی شەدادی بووە و رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە بەهێزکردنی میرنشینەکەدا و دژی ئەو هێزەکانی خانەی کوفر جەنگاوە، بۆیە بە دامەزرێنەری دووەمی میرنشینی بنەماڵەی شەدادی دادەنرێت[2]. ئەو هەواڵەش، کە

---

[1] کاهن: م.س، ص٢٠٣.

[2] لەبارەی ئەم میرەوە بڕوانە: شهریاران گمنام، ص٢٦٤-٢٦٨. رسول: الإمارة الشدادية الكردية، ص٧٢١. Minorsky: Studies, pp.40-45.

مێژوونوسەکان وەریانگرتووە، شەڕی ئەم میرەیە لەگەڵ (خەزەر)دا[1]، کە تیایدا شکا و زۆر لە کوردەکان و ئەو موسڵمانە خۆبەخشانەی لەگەڵی بوون کوژران. ئەم هەواڵە بەلای مێژوونوسەوە بابەتێکی مێژوویی گرنگە و شایەنی پاراستنە، دەگەیشتە گوێی موسڵمانان و شارە و شار دەگوێزرایەوە، لە موسڵەوە گەیشتە بەغداد. لەناو هەواڵەکانی ئەم میرنشینەدا، مێژوونوسەکان تەنها ئەم هەواڵەیان تۆمار کردووە[2]، بۆیە بە گشتی لەناو سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکاندا زۆربەی هەواڵەکانی ئەم میرنشینە بزرن و تەنها ئەو هەواڵانە ماون، کە مێژوونوسەکانی ئەرمەن و مێژوونوسانی تر[3]، یان مێژوونوسە ناوخۆییەکان، تۆماریان کردوون.

مایەی دڵخۆشییە زانینی مێژوویی ئیسلامی بە گۆڕانی بارودۆخەکان ئاڕاستەکانی دەگۆڕان و لە یەك ڕوانگەوە هەواڵی میرنشینەکانی تۆمار نەدەکرد، بەڵکو شێوازێکی نوێی زانینی مێژوویی دەرکەوت، ئەرکەکەشی گرنگیدان بوو بە مێژووی تایبەتی، نەك ئەو مێژووە گشتییەی پەیوەست بوو بە دەسەڵاتی ناوەندی و ئەو سنورانەی بۆ تێگەیشتنی مێژوونوس و دراوەکانی دانابوو. مەبەستمان لەم شێوازە مێژووییە، مێژووی ناوخۆییە، کە مێژوونوسەکانی بە پلەی یەکەم هەواڵی هەرێمەکەی خۆیان وەردەگرت و تەنها باسی چارەنوس و دەوڵەتەکەی خۆیان دەکرد[4]، واتە مێژووی ((خەڵکی وڵاتێکی دیاریکراو بوو))[5]. ئەم شێوازەی تۆمارکردنی مێژوو بەلایەنی کەمەوە لە سەدەی سێی کۆچی/نۆی زاینیەوە دەرکەوت، هەندێك هۆی ئەمە دەگەڕێننەوە بۆ دەرکەوتنی کۆمەڵێك ناوەندی ڕۆشنبیریی جۆراوجۆر لە سەراپای خانەی ئیسلامدا، کە لەنێوان خۆیاندا

---

[1] خەزەر ئەو تورکانەن لەپشت هەرێمی ئارانەوە نیشتەجێ بوون. یاقوت: معجم البلدان، ج٢، ص٣٦٨. ئەحمەد کیسرەوی، کە مێژوونوسێکی ئێرانییە، باوەڕی وایە ئەوانەی فضلون دژیان جەنگاوە کەرەج ـ واتە جۆرجی ـ بوون نەك خەزەر. بەڵام مێژوونوسە موسڵمانەکان ئەمەیان لێ تێکچووە. بڕوانە: م.ن، ص٢٦٧ (پەراوێزی ژمارە٢).

[2] إبن الجوزي: م.س، ج٩، ص٤٤٥٤. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٤٠٩. سبط إبن الجوزي: مرآة الزمان (٣٤٥-٤٨٠ك)، ص٣٤٦.

[3] كسروي: شهرياران گمنام: ص٢٥٢-٢٥٤. Minorsky: Ibid, p.2, 79-80.

[4] إبن خلدون: المقدمة، ص٣.

[5] السخاوي: الإعلان بالتوبيخ، ص٦١٣.

کەوتبوونە کێبڕکێوە[1]. لێرەدا مێژوونوس تەنها بایەخ بە یەك هەرێم یان شار یان قەوارەیەکی سیاسیی دیاریکراو دەدات لە ناوچەیەکی سنورداردا. بەم جۆرە زۆر کتێب دەرکەوتن لەبارەی یەك شاری وەك بەغداد یان موسڵ یان قاهیرە یان دیمەشق و[2] شارو هەرێمەکانی تری جیهانی ئیسلامییەوە بوون. زۆربوونی ئەم شێوازە مێژووییە، بەشێوەیەك لەشێوەکان، ڕەنگدانەوەی هەست کردنی دانیشتوانی ئەم شار و هەرێمانە بوو بە دابڕان لە ناوەند و گرتنە دەستی چارەنوسی خۆیان.

سەدای (گرتنە دەستی چارەنوس) لەناو کورد و شار و هەرێمە کوردییەکاندا دەهاتە گوێ، هەندێ مێژوونوسیش دەرکەوتن گرنگییان بە مێژووی ئەم وڵاتانە دەدا، ئەم مێژووە مێژووی دەسەڵاتە سیاسییە فەرمانڕەواکانی ئەم وڵاتانە بوو، لەناویشیاندا میرنشینە کوردییە ناوچەییەکان. سەرچاوەکان ئاماژە بە کۆمەڵێك کتێبی مێژوویی دەکەن، کە تایبەتن بە هەندێ بەشی وڵاتی کورد، لەوانە (مێژووی ئازەربایجان)ی ئیبن ئەبی هەیجایی ڕەوادی[3] و (مێژووی ئاران)ی بەردەعی[4] و چەندانی تر، کە زۆربەیان ون بوون و تا ئێستا جگە لە ناونیشانەکانیان هیچ شتێك لەبارەیانەوە نەزانراوە[5]. هەروەها هەندێ کتێبی تر هەن چانسی مانەوەیان هەبووە، لەوانە ئەو دەقە مێژووییەی تایبەتە بە میرنشینی شەدادی و لە سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/ یازدەی زاینی دانراوە و ئەحمەدی کوڕی لوتفوڵای مێژوونوس، کە بە (منجم باشی) ناسراوە، کردوویەتی بە پاشکۆی کتێبی

---

(1) بروانە: قاسم (عبده قاسم): الرؤية الحضارية للتأريخ، قراءة في التراث التاريخي العربي، ط٢، (القاهرة: ١٩٨٥)، ص١٠٠-١٠١.

(2) وەك : كتاب بغداد لإبن طيفور (٢٨٠ك/٨٩٣ز مردووە)،تاريخ بغداد للخطيب البغدادي (٤٦٣ك/١٠٧١ز مردووە)، تاريخ دمشق لإبن عساكر (٥٧١ك/١١٧٥ز مردووە) و زۆر کتێبی تر.

(3) واتە ئەم مێژوونوسە لە ڕەوادیەکانی فەرمانڕەوای میرنشینی ڕەوادی ئازەربایجان بووە. مینۆرسکی پێی وایە کە پێدەچێت یەکێك بووبێت لە میرەکانی ئەم میرنشینە بڕوانە:
Minorsky: Hudud al- A'lam, (Oxford/London-1973), p395.

(4) الصفدي: الوافي بالوفيات، باعتناء: هلموت ريتر، (فيسبادن: ١٣٨١ك/١٩٦٢ز)، ج١، ص٤٨.
السخاوي: م.س، ص٦١٤. حاجي خليفة: كشف الظنون، ج٢، ص١٠٧.
Minorsky: Studies, p5.

(5) النقشبندي: آذربيجان، ص١٣٢ (پەراوێزی ژمارە ٢).

(جامع الدول) و له فەوتان پاراستوویەتی، ئەم دەقە مێژووی ئەم میرنشینە لەخۆ دەگرێت لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ساڵی (٤٦٨ك/ ١٠٧٥ز). مینۆرسکی پێی وایە ئەم دەقە لەوانەیە هی مێژوونوسی نەناسراوی کورد مسعودی کوڕی نامدار (دەوروبەری ٥٠٠ك/١١٠٠ز) بێت، چونکە شێوازی ئەم نوسەرە لە شێوازی دەقەکەی لای (منجم باشی) دەچێت، مەصعودی کوڕی نامداریش لەو سەردەمەدا ژیاوە، کە ئەم دەقە و دەقی تری وەك (فصول من تاريخ الباب والشروان)ی تیا نوسراوە.

ئەم دەقە بریتییە لەو هەواڵانەی لەبارەی میرنشینی شەدادییەوەن و لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا بەرچاو ناکەون، هەروەها لە تۆمارکردنی هەواڵەکانی دەسەڵاتە سیاسییە تازەکانی دەوروبەردا، بەجوانترین شێوە گوزارشتی لە گۆشەنیگای مێژوونوسی ناوچەیی کردووە. لێرەدا مێژوونوسی ناوچەیی بایەخ بە چەسپاندنی شەرعیەتی میرنشینی شەدادی دەدات لە وڵاتی ئاراندا و ئەم بوونەی بە واقیعێکی قبوڵکراو داناوە، چونکە ئەم میرانە وڵات لە خەڵکانی خراپ و بەد دەپارێزن[1] و شەڕی ((کافر)) و ((موشریکەکان)) دەکەن و موسڵمانەکان لە خراپەکاری ئەو شەڕخوازانە رزگار دەکەن[2]. هەروەها، لەڕووی ناوخۆییەوە وڵات ئاوەدان دەکەنەوە[3] و بارودۆخی خەڵك و سەربازەکان رێك دەخەن[4]. ئەمەش شتێکی سروشتی بوو، چونکە ئەم میرانە موجاهید بوون و نازناوی موجاهیدیان درا بووە پاڵ[5]. خەڵك لێیان رازی بوون و شانازییان پێوە دەکردن[6].

بەم جۆرە دەبینین لەم شێوازە نوسینە مێژووییەدا، چەمکی مێژوو جیاوازە لەو چەمکەی مێژوونوسی مێژووی گشتی پێی دابوو. لێرەدا مێژوو، مێژووی خەلیفە و دەسەڵاتە ناوەندییەکەی و غایبکردنی ئەوی تری دەروبەر و بەناچاری دانپیانانی نییە،

---

(1) منجم باشي: جامع الدول، ص٣، ٧، ١٠.

(2) م. ن، ص٤-٨،٥، ١٢، ١٦-١٨.

(3) م. ن، ص١١.

(4) م. ن، ص١٣.

(5) م. ن، ص١٦.

(6) م. ن، ص٨، ١٠.

بەلکو مێژووی ئەم پەراوێزخراوەیە لە فۆڕمە ناوچەییەکەیدا، یان مێژووی ئەوەیە، کە مێژووی گشتی لە سیاقی هەواڵەکاندا ماف و پێگەی شایستەی خۆی ناداتێ.

بۆ ئەوەی وێنەیەکی روونتر و گۆشەنیگایەکی ناوچەیی گشتگیرتر بەدەستبێنین، پەنا دەبەینە بەر مێژوویەکی تری ناوچەیی، کە لە تۆمارکردنی مێژووی یەکێك لە میرنشینە کوردەکانی سەردەمی ئیسلامی کلاسیکیدا، پێگەیەکی بەرزتری هەیە، ئەویش (مێژووی میافارقین و ئامەد) یان کتێبی (تأريخ الفارقي)ی ئیبن ئەزرەقی، فارقیيە(٥٧٢ك/١١٧٦ز)[1]. ئەم کتێبە تەنها ئەو بەشەی چاپ کراوە، کە تایبەتە بە میرنشینی مەروانی و بەشەکانی تری چاپ نەکراون. لەم بەشەدا دەبینین کورد، بە تایبەتی میرەکانی ئەم میرنشینە، تا رادەیەك بوونێکی مەرکەزییان هەیە، ئەم بوونەیان بوونێکی شەرعی و بێگەردە و لەلایەن خەلافەتی عەبباسییەوە بە رەسمی دانی پیا نراوە و ئەو مەرجانەیان بەجێهانەوە، کە لەسەریان پێویستبووە، خەڵکی خراپ و ئاژاوەگێڕ لەناودەبەن و[2] وڵات ئاوەدان دەکەنەوە[3]. هەروەها فارقی بە مەبەستی سەلماندنی شەرعیەتیان زۆر گێڕانەوەی تر دێنێتەوە[4]. بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە، ئەو بابەتە وەردەگرین، کە ئەم مێژوونوسە لەبارەی سەردەمی گەورەترین میری ئەم میرنشینەوە هێناویەتی، ئەویش میر (نصر الدولة) ئەحمەدی کوڕی مەروانی کوردییە، کە لە ساڵی (٤٠٢ك/١٠١٢ز) تا ساڵی (٤٥٣ك/١٠٦١ز) فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینەی

---

[1] ئەحمەدی کوڕی یوسف کوڕی عەلی کوڕی ئەزرەقە، خەڵکی شاری میافارقینی هەرێمی جەزیرەیە، ساڵی (٥١٠ك/١١١٦ز) لەم شارە لەدایکبووە، سەردانی زۆر شارو وڵاتی ئیسلامی و نا ئیسلامیی کردووە، لە شارەکەی خۆیدا زۆر پۆستی ئیداری گرتووەتە دەست، وەك پۆستی چاودێریکردنی ئەوقاف و ...هتد. گرنگترین دانراوی، ئەم کتێبەیەتی کە لەبارەی مێژووی میافارقین و ئامەدەوەیە. لەبارەی فارقییەوە بڕوانە: بدوي عبد اللطيف عوض: مقدمته لتاريخ الفارقي، ص١-٤٧.

[2] تاريخ الفارقي: ص١٠٢-١٠٣.

[3] م. ن، ص٨٦-٨٧.

[4] م. ن، ص٩١-٩٢.

گرتووەتە دەست، فارقی زۆر بە دور و درێژی باسی هەواڵەکانی دەکات[1]. ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە ئەم میرە زۆر بەناوبانگ بووە و بە دیارترین کەسایەتیی کوردی سەردەمی ئیسلامی کلاسیکی دادەنرێت، لەسەردەمی ئەمدا میرنشینەکە گەیشتبووە لوتکەی گەشەکردنی سیاسی و شارستانی و لە رووی جیۆگرافییەوە زۆر فراوان بووبوو، وەک فارقی لەبارەیەوە دەڵێت پاشایەك بووە ((ئەوەی ئەو هەیبووە کەسی تری وەك ئەم نەیبووە، کەس وەك ئەم ناز و نیعمەتی نەبووە و لە هەموو لایەکەوە خەڵك روویان تێدەکرد))[2]، رۆژەکانی سەردەمی ئەو((وەك جەژن گەشاوە بوون))[3] و دەوڵەتەکەی ((ئەو دەوڵەتەی جاران نەبوو))[4]، لە راستیدا ژیاننامەکەی بووە جێی سەرسامیی زۆر مێژوونوسی موسڵمان و وەك میرێکی
گەورەی کایەی ئیسلامی لێی دەدوان[5].

بەراوردێکی سادەی نێوان ئەوەی مێژوونوسی مێژووی گشتی لەبارەی ئەم میرەوە نوسیویەتی لەگەڵ ئەوەی فارقی نوسیویەتی، رادەی فراوانی گۆشەنیگای مێژوونوسی ناوچەییمان لە بینینی بوونی کورد لە مێژوودا بۆ دەردەخات، ئەگەر مێژوونوسی مێژووی گشتی لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا تەنها باسی میر و جوڵانەوە سیاسییەکانی و هەندێ سیاسەتی کارگێڕی و ئابووریی میر بکات[6]، ئەوا مێژوونوسی ناوچەیی لەمە زیاتر دەڕوات و زۆر شت لەبارەی میرەوە باس دەکات و جۆرە مەرکەزیەتێکی مێژوویی پێ

---

[1] لاپەڕە (٩٣ تا ١٧٧)ی بەشە چاپکراوەکەی ئەم کتێبەدا، باسی ژیاننامەو رووداوەکانی سەردەمەکەی دەکات.

[2] م. ن، ص١٤٣.

[3] م. ن، ص١٤٤

[4] م. ن، ص١٦٦.

[5] إبن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٦٦١-٤٦٦٢. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٢٦، إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج١، ص٥٧. أبو الفداء: المختصر، ج٢، ص١٨٩. الذهبي: العبر في خبر من غبر، تحقيق : أبو هاجر محمد السعيد، (بيروت: د.ت)، ج٢، ص٣٠٠. إبن الوردي: تاريخ إبن الوردي، ج١، ص٣٦٧. اليافعي: مرآة الجنان: ج٣، ص٥٧. إبن كثير: البداية والنهاية، ج١٢، ص٨٧.

[6] بڕوانە: إبن الجوزي: م. ن. ص.

دەدات. جەخت لە دادپەروەری میر دەکاتەوە[1]، باسی ژیانی کۆمەڵایەتی[2] و ئاوەدانکارییە زۆرەکانی دەکات[3]، سەرەڕای ئەمانە، باسی سیاسەت و پەیوەندییەکانی دەکات لەگەڵ هێزە دەرەکییەکاندا[4]. هەرووەها ئەو هەواڵانە لەبیر ناکات، کە پەیوەستن بە دەسەڵاتی میر و بوونە شەرعییەکەیەوە، بۆیە باسی دادوەرەکانی میرنشین دەکات، لە وەزیرەکان و ژیاننامەیان دەدوێت، هەروەها هەواڵی خاوەن پلە و پایە کارگێڕییەکانی تر تۆمار دەکات[5].

ئەوەی مێژوونوسی مێژووی گشتی دەیڵێت و ئەو ڕێبازەی لە هەڵبژاردنی گێڕانەوەکانیدا دەیگرێتە بەر، پەیوەستە بە میر و میرنشینەکانەوە وەك گشتێك، شاردنەوەی ئەو مێژووەیە کە مێژوونوسی ناچەیی وردەکاریەکانی تۆمار دەکات. بەڵام مێژوونوسی ناوچەییش لە وەرگرتن و وەرنەگرتنی هەواڵەکاندا ڕێبازی خۆی هەبوو و نەیدەویست ئەو پەیمانە بشکێنێت، کە زانینی مێژوویی ئیسلامی وەك گشتێك لەگەڵ دەسەڵاتدا بەستبوویی و بریتی بوو لە جەختکردنەوە لە مەرکەزیەتی دەسەڵاتی سیاسی بە هەموو جۆرەکانیەوە و پەراوێزخستنی کۆمەڵگە و دامەزراوە جیاوازەکانی. ئێمە ئەوەندەی لە بارەی چالاکی ئاوەدانکردنەوە لە میرنشینەکەدا[6] شت دەزانین، ئەوەندە لەبارەی خێزان، وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی بنەڕەتیی هەموو کۆمەڵگایەکی مرۆیی، شت نازانین، مێژوو بە پلەی یەکەم مێژووی دەسەڵاتی ناوچەییە، مێژووی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ئەو شارە یان ئەو ناوچەیە، کە مێژوونوسی ناوچەیی لێی دەکۆڵێتەوە و هەواڵەکانی تۆمار دەکات، چالاکیی ئاوەدانکردنەوە کرۆکی کاری ئەم دەسەڵاتە و شەرعیەتەکەیەتی و شایەنی تۆمار کردنە، بەڵام خێزان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی

---

(1) الفارقي: م. ن، ص١١٤-١١٥، ١٢٦، ١٦٩، ١٧٢.

(2) م. ن، ص ١٢١-١٢٢، ١٤٢، ١٤٥، ١٥٠، ١٧٨-١٨٠.

(3) م. ن، ص ١٢٣، ١٤١، ١٦٣-١٦٤، ١٦٨-١٦٩.

(4) م. ن، ص ١٠٨-١١٠، ١٣١، ١٥٩، ١٦٢.

(5) م. ن، ص ١٣١، ١٤٧، ١٤٩، ١٦٤، ١٦٥.

(6) بروانە: م. ن، ص ١٦٣-١٦٤، ١٦٨-١٦٩. إبن شداد: الأعلاق الخطيرة، ج٣، ق١، ص١٧٣-٢٨٢.

تر، نوێنەرایەتیی ئەم شەرعیەتە ناکەن و سەبارەت بە مێژوونوس خێزان لە خانەی (بیر لێنەکراوە)دایە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

بە بۆچوونی ئێمە، فارقی - کاتێك هەواڵەکانی (نصر الدولة) تۆمار دەکات - دەیەوێت ئەوەی لەبارەیەوە دەینوسێت لە بوونی لەناو وڵاتەکەی و هەروەها لە دەرەوەی وڵاتەکەیدا چڕ ببێتەوە[1]. بێگومان تەنها ئەم بوونە نەبووبووە ناوەند یان نەبووبوو بە بوونێکی رەها، کاتێك فارقی بەشێکی زۆری مێژووەکەی - واتە بەشە چاپکراوەکەی[2]- تایبەت دەکات بەم میرنشینە و میرەکانی، ئەمە مانای ئەوە نییە. تەنها ئەمانە دەسەڵاتێکی ناوەندیی رەهایان هەبووە و کەسی تر نەیبووە، بەپێی تێڕوانینی ئەو - لە پاڵ مەروانییەکاندا - چەند هێزێکی دیکەی سیاسیی بە دەسەڵات هەبوون، کە نەك ناتوانرێت بوونیان پشتگوێ بخرێت، بەڵکو دەبێت هەندێ لە هەواڵەکانیان تۆمار بکرێت، ئەم هێزانە بریتین لە عەبباسیەکان[3] وەك رەمزی دەسەڵاتی شەرعی و بووەیهیەکان[4]، هەروەها فاتمیەکان - فەرمانڕەوای میسر و وڵاتی شام (٣٥٨-٥٦٧ك/٩٦٩- ١١٧١ز)[5]- و تەنانەت وەزیر و نوسەر و زۆر کەسایەتی بەدەسەڵاتی تری کایەی ئیسلامی[6]، کە هاوچاخی ئەم میرنشینە بوون. بەمە فارقی دەیەوێت بڵێت - لە پاڵ ئەم دەسەڵاتە ناوچەییەدا - ناوەندی دەسەڵاتی دیکە هەن، کە کاریگەرییان هەیە لەسەر رووداوە گشتییەکان و ئەو دەسەڵاتەی ئەم هەواڵەکانی تۆمار دەکات لەگەڵ ئەو دەسـەڵاتانەی تردا بوونی هەیە. واتە بوونی میرنشینی مەروانی بەستراوە بە بوونی ئەوانەوە و بوونە لەگەڵ عەبباسییەکان و بووەیهییەکان و فاتمیەکاندا، بەو واتایەی بوونی ئەمان لەگەڵ هەموو دەسەڵاتە بەهێزەکانی کایەی ئیسلامیدایە و بەستراوە بە هەموو جۆرە دەسەڵاتە

---

(1) الفارقي: م. ن، ص١٥٨-١٥٩، ١٧٦-١٧٧.

(2) بەهۆی بارودۆخی هەرێمی کوردستان و عێراقەوە نەمتوانی لەسەر ئەوە راوەستم کە لە بەشە چاپنەکراوەکاندا هەیە، ئەو بەشە چاپنەکراوانە لە لەندەن لە کتێبخانەکەی مۆزەخانەی بەریتانیادا هەن.

(3) م. ن، ص٦٤-٦٥، ١٣١-١٣٢، ١٣٤-١٣٥، ١٩٣-١٩٤.

(4) م. ن، ص ٥٤-٥٥، ٦٢-٦٣، ١٣٣-١٣٤، ١٣٦، ١٥٣-١٥٦.

(5) م. ن، ص٧١-٧٢، ٩٢-٩٣، ١٤١.

(6) م. ن، ص٦٩-٧٠، ٧٩، ٨٤-٨٥، ١١٦، ١٢٣، ١٣٧-١٤٥.

سیاسییەکانی ترەوە. ئەمەش دەلالەت لە باوەڕی فارقی دەکات بەوەی بە بەشەکی لە مێژوو بڕوانرێت و یەك ڕێرەوی تایبەت بە یەك ناوەندی دەسەڵات نەگیرێتە بەر. لێرەوەو لە مێژووی فارقیدا پاساوێك دەدۆزینەوە بۆ ناونانی ئەم قۆناغەی بوونی کورد لە مێژوودا، بە قۆناغی بوون لەگەڵ دەسەڵاتدا.

کەواتە، فارقی مێژوویەکی گشتی تۆمار دەکات، بەڵام تیایدا مەرکەزیەت دەدات بە کورد، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کورد بەشێکی تا رادەیەك سەرەکیی ئەو سیستەمە سەراپاییە پێك دەهێنن، کە مێژوونوس تیایدا بیر دەکاتەوە. ئەگەر جۆرە دەرچوونێك هەبێت لەم سیستەمە ئەوە دیسان بە ئاراستەی ئەو دیالێکتیکی (ئەویتر) و (ئێمە)یەیە، کە مێژوونوسەکانی دیکەی مێژووی گشتی کاریان پێ دەکرد، ئەگەرچی لەم قۆناغەدا، لەسەر ئاستی بوونی سیاسی، تەنها لەگەڵ هێزەکانی خانەی کوفر یان خانەی شەڕدا بەم دیالێکتیکە مامەڵە دەکرا، ئەوان بەردەوام (ئەویتر)ی ئێمەی ناو خانەی ئیسلامن بە هەموو پێکهاتە عەقیدەیی و سیاسییە ئیسلامیەکانەوە. لە مێژووەکەی فارقیدا، رۆمە بیزەنتیەکان ئەو (ئەویتر)ەن، کە بوونی نەگەتیفیان شەرعیەت دەدات بە فەرمانڕەوایی ئەم میرنشینە کوردییە و بوونی دەکاتە پێویستییەکی سیاسی لەناو خانەی ئیسلامدا، ئەم کوردانە لەناوچەکانی خۆیاندا لەڕووی ئەویتری ـ ناموسڵماندا وەستاونەتەوە، بەپێی بەرژەوەندیی کۆمەڵی ئیسلامی و پشتبەستن بە هاریکاری ئەم کۆمەڵە، مامەڵە و سەروکاری لەگەڵ دەکەن[1]، ئەگەرچی هەندێك جار جۆرە هاوکاریەك هەبووە لەگەڵیدا[2]، بەڵام ئەمەش هەر لەبەرژەوەندی کۆمەڵدا بووە.

---

[1] بۆنمونە بڕوانە: م. ن، ص٦١، ٩٦-٩٧.

[2] م. ن، ص٨٤.

# پاری سێیەم
# بوونی جیهادییانەی کورد

## ١- بەرە و شێوەگیربوونی کەسایەتییەکی جیهادی

ئەم قۆناغە دەکەوێتە نێوان نەمانی میرنشینە کوردییەکان تا کۆتایی ماوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، واتە لە سەدەی پێنجی کۆچییەوە دەست پێ دەکات و تا سەدەی هەشتی کۆچی، کە تیایدا ئیبن خەلدون دەرکەوت، بەردەوام دەبێت. ئەم قۆناغە ـ سەرەڕای درێژییەکەی ـ بە تەواوکەری قۆناغەکانی پێشووتر دادەنرێت لە چەسپانی بنەماکانی زانینی مێژوویی ئیسلامی و روانینی بۆ ئەتنیك و کۆمەڵە مرۆییە هەمەجۆرەکان و ئاستی بەدیهاتنی بوونیان لە مێژوودا. ئەم زانینە زۆر بە سستی هەنگاوی دەنا و بەردەوام چەمکەکانی خۆی بەرهەم دەهێنایەوە، بە تایبەتی ئەو چەمکانەی پەیوەستن بە بابەتی سەرەکیی ئەم بەشەوە، واتە مەسەلەی بوونی مێژوویی کورد وەك کۆمەڵە مرۆڤێکی دیاریکراو لە مێژووی ئیسلامیدا.

لەم قۆناغەدا مێژوونوسەکان هەڵوێستێکی جێگیریان نەبووە، بەڵام وەك ئەو دابڕانە نەبووە، کە لەنێوان قۆناغی بوون لە دەرەوەی دەسەڵات و قۆناغەکەی دوای ئەودا رووی دابوو. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی توخمێکی ئۆرگانی، کە تەحەکومی بە زانینی مێژووییەوە دەکرد و لەوەدا، کە پەیوەستە بە کورد و هەوڵی غایبکردنیان لە مێژوودا، رێڕەوێکی بۆ زانینی مێژوویی دیاری کردبوو و مێژوونوسەکان نەیاندەتوانی لەم رێڕەوە لابدەن . دانانی ئەم رێڕەوەش لەبەر ئەوە بووە بوونی کورد و ئەو نەفسە تووڕەییە (ئازایە)ی هەیانبووە، بووەتە پێویستییەکی سەرەکی ـ سەربازی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا. ئەم پێویستییە بە کورد، مۆرکێکی تایبەتیی دابوو بەو زانینە مێژووییەی لەم سەردەمەدا بەرهەم دەهات. ئەو توخمەش، کە تەحەکومی بە رەوتی نوسینی مێژووەوە دەکرد، بریتی بوو لە (جیهاد) یان جەنگان، کە بەهۆی هێرشە دەرەکییەکانەوە بۆسەر خانەی ئیسلام، بووبووە فەرزێك بەسەر موسڵمانانەوە.

پێش رۆچون بەمەدا، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین بوونی کورد لە مێژوودا، بەو واتایەی لە پاری پێشوودا چەسپا و لە میرنشینە کوردییەکاندا شێوەگیر بووبوو، بەهۆی

دەرکەوتنی هێزێکی سیاسییەوە، کە ـ هەر لە سەرەتاوە ـ بەشێوەیەکی مەرکەزی فەرمانڕەوایی دەکرد، زۆر بەردەوام نەبوو، چونکە هەواڵەکانی ئەم هێزە باڵیان بەسەر تۆمارکردنی مێژووی ئیسلامیدا کێشا. ئەم هێزەش لە سەرەتای سەدەی پێنجی کۆچی/ یازدەی زایینییەوە دەرکەوت بریتی بوو لەو کۆمەڵە خێڵەکییە تورکانەی بە سەلجوقییەکان ناسرابوون[١] و بە ئازایەتی و زۆری ژمارە جیا دەکرانەوە[٢]. هاتنی ئەمانە و دەست گرتنیان بەسەر جڵەوی فەرمانڕەوایی زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا و چوونیان بۆ ناو بەغدادی پایتەختی خەلافەتی عەبباسی لە ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز)دا، بانگەوازی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ بوو، لەم قۆناغەدا سوڵتانی سەلجوقی دەسەڵاتێکی باڵای هەبوو بەسەر ئەو وڵاتانەدا، کە خستبوویاننە ژێردەستی خۆیانەوە و نزیکەی سەدە و نیوێك فەرمانڕەواییان کردن. وڵاتی کورد و میرنشینەکانی، یەکێك بوو لەو وڵاتانەی سەلجوقییەکان توانییان وردە وردە دەستی بەسەردا بگرن و کۆتاییان بە فەرمانڕەوایی زۆربەی میرنشینەکانی هێنا، یاخود ملکەچی دەسەڵاتی خۆیان کردن[٣]، بەمە دەسەڵاتی ((کورد لە هەرێمەکانیاندا کۆتایی پێ هات و کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکانەوە))[٤].

---

[1] سەلجوقییەکان لقێکن لە خێڵەکانی غوز (الغُز)ی تورکی، باپیرەیان ناوی (سەلجوق کوڕی دوقاق) بووەو یەکێك بووە لە سەرۆکەکانی ئەم خێڵانەو بەناوی ئەوەوە ناسراون. وڵاتەکەی خۆیان جێهێشت و چوونە ئەو دیو روباری جەیحون لە خوراسان، ئاینی ئیسلامیان وەرگرت و بوونە موسڵمان، پاشان بەرەو قوڵایی جیهانی ئیسلامی کشان. لەبارەیانەوە بڕوانە: الحسيني: زبدة التواريخ ـ أخبار الأمراء والملوك السلجوقية، تحقيق : محمد نورالدين، ط٢، (بيروت: ١٤٠٦ك/١٩٨٦ز)، ص٢٣ بەدواوە. البنداري: تاريخ دولة آل سلجوق، (بغداد: ١٩٦٤)، ص٧-١٠.

[2] إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٤٧٥.

[3] نامانەوێت بچینە ناو وردەکاری هاتنی سەلجوقییەکان کە بووە هۆی لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکان، چونکە توێژەر نیشتمان بەشیر موحەمەد لە لێکۆڵینەوەکەیدا بە دورو درێژی لەم بابەتەی کۆڵیوەتەوە، بۆیە دەکرێ خوێنەر بگەڕێتەوە سەر ئەم لێکۆڵینەوەیە: الكرد والسلاجقة ـ دراسة في العلاقات السياسية (٤٢٠-٥٢١ك/١٠٢٩-١١٢٧ز)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٠)، ص١٨٩-٢٣٦.

[4] إبن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٩٩.

لەگەڵ گەیشتنی پێشەنگی خێڵە غوزە تورکیەکان بۆ ئەم ناوچەیە، زانینی مێژوویی لەبەرامبەر ئەم رووداوانە و بە تایبەتیش بوونی کورددا، هەڵوێستێکی ڕوونی نەبوو، چونکە لەم سەرەتایەدا سەلجوقییەکان وێرانی و کاولکارییەکی وایان بەسەر وڵاتی کورددا هێنا، کە تەنانەت مێژوونوسەکانیش پێی رازی نەبوون[1]، جگە لەمە سیماکانی ئەم سەردەمە ڕۆشن نەبوونەوە تا ئەو کاتەی سوڵتان (توغرول بەگ)ی[2]سەلجوقی توانی ئاسایش دابین بکات و بناغەی دەوڵەتەکەی بچەسپێنێت، ئیتر ئەمە ـ تا رادەیەك ـ بووە هۆی دیاریکردنی هێڵە سەرەکی و سیما گشتییەکانی تۆمارکردنی مێژووی ئەم قۆناغە[3]. مێژوونوسەکان، بەبێ ئەوەی رای بگەیەنن، لە میانەی بایەخدان بە هەواڵی سەلجوقییەکان و تەرخان کردنی بەشێکی زۆری کتێبەکانیان بۆیان، پشتی سەلجوقییەکانیان دەگرت، ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەو ئاڕاستەیەی زانینی مێژوویی لەم سیاقەدا گرتبوویە بەر. ئەوەی ئەم هەڵوێستەی زانینی مێژوویی بەهێز دەکرد، ناچاربوونی میرەکان بوو بەوەی دان بە دەسەڵاتی سەلجوقییەکاندا بنێن و بچنە ژێر دەسەڵاتیانەوە، کوردەکان پابەندی و شوێنکەوتەیی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان راگەیاند بوو[4]، ئەمەش مانای ئەوەبوو ئەوان لەمان لەپێشترن. بێگومان ئەمەش لە زەینی مێژوونوسدا رەنگی دایەوە و زۆر بە داخەوە نەبوو بۆ روخانی میرنشینە کوردییەکان، ئەگەرچی ئەمە پایەی کوردی لە مێژووی نوسراودا هەژاند. ئەو سیاسەتەی سەلجوقییەکان

---

(1) بۆنمونە بڕوانە: إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٣٩١، ٥١٧، ٥٢٨، ٥٢٩. البنداري: م.س، ص١٠.
ابو الفداء: المختصر، ج١، ص١٦٨.

(2) توغرول بەگ: محەمەدی کوڕی میکائیلی کوڕی سەلجوقی کوڕی دوقاقی سەرگەورەی سەلجوقییەکانە، توانی بنەماکانی دەوڵەتی سەلجوقی بچەسپێنێت و دەستی بەسەر زۆر وڵاتدا گرت کە یەکێکیان بەغداد بوو، تا لە ساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز)دا مرد لە فەرمانڕەواییکردن بەردەوام بوو.
إبن خلكان: وفيات الأعيان، مج٥، ص٦٣-٦٧.

(3) لەبارەی ئەم سیمایانەو بەناوبانگترین مێژوونوسەکانی سەردەمی سەلجوقی، بڕوانە:
Claud (Cahen): The Historiography of the suljuqid period, in: Lews and Holt: Op. pp.59-78.

(4) إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٥٥٦- ٥٥٧، ٥٩٨-٥٩٩. ابو الفداء: المختصر، ج٢، ص١٧٢.
ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٩٩.

گرتابوویانه بەر، شتێکی گونجاو بوو لەگەڵ ئارەزووی یەکێتیخوازانەی مێژوونوس و تێڕوانینی بۆ ئەو دەسەڵاتەی بەرەو مەرکەزییەت دەچێت و توانای پاراستن و دابینکردنی یەکێتیی کۆمەڵی ئیسلامیی هەیە[1]، پیادەکردنی ئەم سیاسەتەش لە لایەن سەلجوقییەکانەوە دوای ئەوە بوو، کە عەبباسییەکان دانیان پیا نان و بەمە شەرعەییەتیان وەرگرت و توانییان دەسەڵاتەکەیان بچەسپێنن[٢].

پێدانی ئەم مەرکەزیەتە بە سەلجوقییەکان مانای پەراوێزخستنی بوونی کورد نەبوو لە مێژوودا. ئەو پەرەسەندنە سیاسییانەی روویاندا، نەبوونە هۆی ئەوەی مێژوونوسەکان بگەڕێنەوە سەر ئەو هەڵوێستەی لە قۆناغی (بوون لە دەرەوەی دەسەڵاتدا) بەرامبەر بە کورد هەیانبوو و کورد لە مێژوو غایب بکەن، چونکە بوونی کورد شتێکی سروشتی بوو لەم مێژووەی سەلجوقییەکاندا، کە بە جۆرێك لە جۆرەکان جیاواز بوو لەو مێژووەی پێشتر هەبوو و تەنها جەختی لە دەسەڵاتی ناوەندی دەکردەوە بەو واتایەی لەو کاتەدا هەبوو. کورد لە پاڵ سەلجوقییەکاندا خاوەنی بوونی خۆیانن و مێژوونوس بوونی بەهێزی میرە کوردەکانی پشتگوێ نەدەخست[٣]، هەروەك چۆن نەیدەتوانی بەشداری کردنە کاریگەرەکانی کورد لە ((جەنگە جیهادییەکان))ی سەلجوقییەکاندا بشارێتەوە، بەتایبەتی بەشداری کردنیان لە شەڕی بەناوبانگی (مەلازگرد)ی[٤]ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧١ز)[1] دژی

---

(1) بڕوانە: البنداري: م.س، ص٦٥.

(2) بڕوانە: حسين (امين): تاريخ العراق في العصر السلجوقي، (بغداد: ١٩٦٥)، ص١٢٥-١٢٦.

(3) إبن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٣-٤٦. إبن الأثير: الكامل، ج٩، ص٥٩٩، ٦١٣-٦١٤، ٦٣٩، ٦٤٧. ج١٠، ص٢٩٥، ٣٤٢، ٣٤٦، ٣٤٧. البنداري: م. س، ص١٩، ٢٦، ٣٨. سبط إبن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الأعيان، حوادث (٤٤٨-٤٨٠ك)، عنى بنشره وراجعه: علي سويم، (انقرة: ١٩٦٨)، ص١، ٥٩، ٧١، ١٧٢. ابو الفداء: المختصر، ج٢، ص٢٢٢. إبن الوردي: تتمة المختصر، ج٢، ص١٨.

(4) ملا زگرد: لە سەرچاوە کۆنەکاندا بەزۆر شێوەی جیاواز ناوی هاتووە وەك (مناز جر، مازنكرد، منازكرد...هتد). ئەم شارە دەکەوتە هەرێمی جەزیرەی فوراتەوە و لەنێوان خەلات و وڵاتی ڕۆمدا بوو. ئەمڕۆ کورد ناویان ناوە (مازگێرد)و قەزایەکی سەربە پارێزگای (دەرسیم)ی کوردستانی تورکیایە. یاقوت: معجم البلدان، مج٥، ص٢٠٥. غەفور: فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، ل١٠١.

ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، ئەم شەڕە بە سەرکەوتنی سەلجوقییەکان کۆتایی هات و کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر رەوتی رووداوەکانی ناوچەکە، ئەم شەڕە سەرەتایەکی پێشوەختی شەڕی خاچییەکانە و پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی هێزە رۆژئاواییەکان هێرش بکەنە سەر خانەی ئیسلام[2].

سەرەڕای داننانی مێژوونوسەکان بە بوونی کورد لەم قۆناغەدا، بەڵام - لەکاتی تۆمارکردنی هەواڵەکانی پەیوەست بەم دوو لایەنەدا - ئەوە لەیاد ناکەن سەلجوقییەکان بە پەسەندتر دابنێن لە کورد[3]، تەنانەت ئەو کاتانەش فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان تووشی لاوازی و لێکترازان بووە، هێشتا کورد هەر پێیان ناگەن. لای ئیبن ئەثیری جەزیری[4]، کە یەکێکە لە مێژوونوسە گەورەکان، بەڕوونی هەست بەمە دەکرێت، ئەمەش کاتێک باس لە

---

[1] لەبارەی بەشداریی کورد لەم شەڕەدا بڕوانە: الفارقي: تاريخ الفارقي، ص١٨٧. سبط إبن الجوزي: م.س، ص١٤٨. الدواداري: كنز الدرر وجامع الغرر - الدرة المضيئة في اخبار الدولة الفاطمية، تحقيق: صلاح الدين المنجد، (القاهرة:١٣٨٠ك/١٩٦١ز)، ص٣٩٣. محمد: الكرد والسلاجقة، ص١٧٧-١٧٨.

[2] بۆ ئەمە بڕوانە: ستيفن (رنيسمان): تاريخ الحروب السليبة، نقله الى العربية: السيد الباز العريني، ط٢، (بيروت:١٩٦٧)، ص١٠٠. قاسم (عبده قاسم): ماهية الحروب الصليبية، (الكويت: ١٩٩٠)، ص٩٠-٩١.

[3] بۆنمونە بڕوانە: ابو الفداء: المختصر، ج٢، ص٢١٥. ابن الوردي: م.س، ج٢، ص١٤.

[4] ئیبن ئەثیر: ئەبوحەسەن عیزەددین عەلی کوڕی ئەبی کەرەم محەمەد ئەلجوزری شەیبانییە. ساڵی (٥٥٥ك/١١٦٠ز) لە شاری جەزیرەی ئیبن عومەری کوردی لەدایکبووە. خۆی و خێزانەکەی روویانکردووەتە موسڵ ، نەوەکانی ئەم خانەوادەیە لە دەرباری زەنگییەکاندا زۆر پۆستی بەرزیان گرتووەتە دەست. ئیبن ئەثیر لە میرەکانی ئەتابەکەوە نزیکبووەو بە یەکێك لە زاناو مێژوونوسە گەورەکانی سەردەمی خۆی دادەنرێت و هاوچاخی سەردەمی شەڕی خاچییەکان و هێرشەکانی مەغۆل بووە. زۆر دانراوی هەیە، وەك: (الكامل في التأريخ) و (الباهر في تاريخ الدولة الأتابكية بالموصل) و (اللباب في تهذيب الأنساب). ساڵی (٦٣٠ك/١٢٢٣ز) مردووە. إبن خلكان: وفيات، مج٣، ص٢٨٩-٢٩١. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: السامر: إبن الأثير، (بغداد: ١٩٨٦)، ص١١ بەدواوە.

سیاسەتی ملکەچ کردنی خاوەن قەلاّ و میرە کوردەکان دەکات لەلایەن جیوش بەگەوە[(١)]، کە یەکێکە لە میرە سەلجوقییەکان، ئەوەتە لە رووداوەکانی ساڵی (٥٠٩ك/١١١٥ز)دا دەڵێت: ((کوردەکان... بلاّو بووبوونەوە و خراپەیان زیادی کردبوو و قەلاّکانیان زۆر بووبوو، تەنگیان بە خەڵك هەڵچنی بوو و رێگا و بانەکانیان پڕ کردبوو لە مەترسی... جیوش بەگ خۆی پەلاماری دان و ڕایان کرد...ڕێگاکانی پاراست و خەڵك بلاّو بوونەوە و لە ئارامیدا بوون، کوردەکان لە ترسی ئەو نەیان دەوێرا جارێکی تر دەست بۆ چەك بەرن))[(٢)].

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵەدا سەرکردەی سەلجوقی لە تێڕوانینی مێژوونوسدا نوێنەرایەتیی بوونی پۆزەتیف دەکات، ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە بە لەناو بردنی کورد، کە لەم مێژووەدا نوێنەرایەتی بوونی سیاسیی نێگەتیف دەکەن، ئاسایش و ئارامی خەڵك دەپارێزێت.

لە قۆناغی دواتریشدا، کە دەوڵەتی سەلجوقی دابەش بوو و لەسەر دار و پەردووەکەی کۆمەڵێك دەوڵەتۆکە و میرنشینی سەلجوقی سەریان هەڵدا و هەریەکەیان فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی دیاریکراویان دەکرد و زۆربەیان بە ئەتابەگیەکان[(٣)]ناسرابوون، ئەم جۆرە تێڕوانین و مامەڵەکردنە بەرامبەر کورد هەر بەدەوام دەبێت و بایەخێکی تایبەتی بە مێژووی هەندێك لەم ئەتابەگیانە دەدرێت، بە تایبەتیش ئەو ئەتابەگییە زەنگییەی سەرکردەی بەناوبانگ عیمادەدینی زەنگی (٥٢١-٥٤١ك/١١٢٧-١١٤١ز)[(٤)] لە شاری موسڵ و دەوروبەریدا دایمەزراند بوو. دەرکەوتنی ئەم ئەتابەگییە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاری کردە سەر پێگە و بوونی کورد لە مێژوودا، بەتایبەتی ئەو کاتەی عیمادەدین زەنگی دەستی گرت بەسەر ناوچەیەکی فراوانی وڵاتی کورددا و کۆتایی بە فەرمانڕەوایی

---

(1) جیوش بەگ: میرێکی سەلجوقیە، ماوەیەك کاروباری موسڵی گرتووەتە دەست و ساڵی (٥١٥ك/١١٢١ز) وازی لیهێناوە. إبن الأثیر: الکامل، ج١٠، ص٥٨٨.

(2) م.ن، ج١٠، ص٦٠٤.

(3) ئەتابەگ: گوزارەیەکی تورکیەو لە دوو وشەی (ئەتا) بە واتای باوك و (بەگ) بە واتای میر پێکهاتووە، کەواتە ئەتابەگ بە مانای (باوکێك کە میرە) دێت. القلقشندي: صبح الأعشی، ج٤، ص١٨.

(4) لە بارەی ئەم ئەتابەگەو دامەزرێنەرەکەیەوە بڕوانە: إبن الأثیر: الباهر، ص١٨ بە دواوە. عمادالدین (الخلیل): عمادالدین زنکي، (بیروت: ١٩٧١)، ص٣١ بەدواوە.

زۆربەی میرنشین و سەرۆك خێڵە کوردەکان هێنا[1]. لێرەدا بەهۆی گرنگیی عیمادەدین زەنگی لە جەنگان دژی ((دوژمنە)) خاچییەکان و باڵادەستیی بەهێزی ئەم سەرکردە ((موجاهیدە)) بەسەر گۆڕەپانی مێژوونوسدا، دووبارە بوونی سەلبییانەی کورد لە مێژوودا دەبینرێت. هەموو ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدات، لەڕوانگەی ئاینی - جیهادییەوە پۆزەتیڤن و نابێت کورد لەڕووی ئەم بوونەوەرە مێژووییە پۆزەتیڤ و پێویستەی کۆمەڵی ئیسلامیدا بووەستنەوە، کە مێژوونوس بەناویەوە دەدوێت. کارەکانی عیمادەدین زەنگی بەرامبەر بە کوردو لەناو بردنی قەوارە ناوچەییەکانیان، لەبەر بەرژەوەندی خەڵکە و دڵنیاییە بۆیان، چونکە ئەوان لەگەڵ کورددا ((زیانی گەورەیان لێدەکەوت))[2].

بەم جۆرە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت نوسینەوەی مێژووی ئیسلامی لە سەردەمی سەلجوقی و ئەتابەگە شوێنکەوتەکانیاندا، گۆڕانی ریشەیی لە بیرۆکەکەی یان لە زەینی مێژوونوسەکەیدا، رووی نەدابوو. مێژوونوس لەم سەردەمەشدا دەیویست وەفای بۆ دەسەڵاتی ناوەندی هەبێت، یان بە دەربڕینێکی وردتر، دەیویست وەفای بۆ ئەو دەسەڵاتە هەبێت، کە بەهۆی ئامادەیی بەهێزی لە بواری سیاسیدا، مێژوونوس باوەڕی بە مەرکەزیەت و شەرعیەتی فەرمانڕەواییەکەی هەبوو. چونکە دەوڵەتی سەلجوقی بە میر و سوڵتانەکانیەوە، ئەو بوونەوەرە پۆزەتیڤەیە، کە مەوجودە مێژووییەکانی تری وەك کورد لە خولگەکەیدا دەخولێنەوە. هەروەها ئەوانیش - واتە کورد - بەهۆی بەشداری چالاکانەیان لە کاری سیاسیدا، ناکرێت پشتگوێ بخرێن و بوونیان لەبەرچاو نەگیرێت، ئەگەرچی ئەم بوونەیان دوای بوونی ئەوە دێت، کە هزری مێژوونوس لە دەوریدا چەق دەگرێت.

بەڵام ئەم جۆرە بیرکردنەوە و تێروانینە لە مەرکەزیەت، لە پێگەی مێژوویی کوردەوە، پێویستی بە نوێکردنەوە و داڕشتنەوە هەبوو بە پێی ئەو گۆڕانانەی بەسەر کایەی ئیسلامیدا هاتبوون، دەبوایە مێژوونوس ئەم گۆڕاوانە ببینێت و لەوانەوە بیر لە

---

[1] إبن الأثير: الكامل، ج١١، ص١٦. الباهر، ص٣٦، ٥٧، ٦٤. إبن العديم: زبدة الحلب في تاريخ حلب، تحقيق: سيامي الدهان، (دمشق: ١٩٥٤)، ج٢، ص٢٥٤. إبن واصل: مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، ج١، ص٣٤-٣٦، ٤٣، ٥٥-٥٧. أبو الفداء: المختصر، ج٣، ص٨، ١٦، ١٨.

[2] إبن واصل: م.ن،ج١، ص٥٦.

مەرکەزیەت بکاتەوە. ئەم گۆڕانانەش بریتی بوون لەو هێرشانەی کرانە سەر موسڵمانەکان لەلایەن ئەو هێزانەوە، کە لە کرۆکدا هەڕەشە بوون بۆ سەر (خانەی ئیسلام)، واتە هێرشی خاچییەکان و هێرشی خێڵە مەغۆلەکان. ئەم هێرشانە، بەتایبەتی شەڕی خاچییەکان، کە لەو کاتەدا موسڵمانەکان پێیان دەوت (شەڕی ئەفرەنجە) واتە فەرەنسیەکان و نزیکەی دوو سەدە درێژەی کێشا (٤٩٣-٦٩٢ك/١٠٩٩-١٢٩٢ز)، کاریگەریی ترسناکیان بەسەر سەرجەم بوارەکانی ژیانی کۆمەڵی ئیسلامیدا جێهێشت و رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی هەوڵی دەدا پێبەپێی ئەم کاریگەرییانە بڕوات و رەچاویان بکات.

ئەم شەڕانە، کە پاپاکان بانگەوازیان بۆ کرد و میللەت و هێزە رۆژئاواییەکان جێبەجێیان دەکرد[1]، هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بوون بۆ سەر کۆمەڵی ئیسلامی، بەتایبەتی دوای ئەوەی خاچییەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە لە بەرەی ئیسلامیدا هێزێکی سیاسی ـ سەربازی نەبوو بەرەنگاریان ببێتەوە و توانییان دەست بەسەر زۆر ناوچەی ئیسلامیدا بگرن، کە لە جەزیرەی فورات و وڵاتی شامەوە درێژ دەبوویەوە تا سنوری میسر. ئەمە موسڵمانەکانی راچڵەکاند و دەبوو بەرە و روویان ببنەوە و ئەو ناوچانەیان لێ بسەننەوە، کە دەستیان بەسەردا گرتبوو. هەموو ئەمانە کارێکی زۆریان کردە سەر بیرکردنەوەی کۆمەڵی ئیسلامی بە هەموو رەگەز و توێژ و هێزە سیاسییەکانییەوە.

سەبارەت بە دوو لایەنە شەڕکەرەکەش، هەڵوێست و تێڕوانینی جیاوازیان هەبوو لەبارەی ئەم شەڕانەوە. لە کایەی ئیسلامیدا، کە بابەتی ئێمەیە، ئەم شەڕانە ئاکامی درێژخایەنیان هەبوو و کاریگەرییەکەیانی تەنها لە ساتەوەختی مێژوویی رووداوەکاندا نەدەمایەوە، بەڵکو ئەو ساتەی تێ دەپەڕاند و تا چەند قۆناغێکی دواتر لە خەیاڵگەی ئەم کۆمەڵەدا دەمایەوە، ئەوەتە دەبینین هەڵوێستی کۆمەڵگەکانی ئەم کایەیە بەرامبەر بە رۆژئاوا، تا ئەمڕۆش کاریگەرە بە کۆمەڵە رووداوێك، کە ـ بە گوزارشتی لێکۆڵەرێك ـ دەبوایە پێش حەوت سەدە کاریگەرییەکەیان کۆتایی بهاتایە[2]، جا دەبێت لە ساتەوەختی

---

[1] لە بارەی چۆنیەتی هەڵگیرسان وهۆکاری ئەم شەڕانە بڕوانە: ارنست (بارکر): الحروب الصليبية: ت: اليد الباز العريني، (القاهرة: ١٩٦٠ز)، ص١١-٢٦. عبده قاسم: ماهية الحروب الصليبة، ص٥٧-٩٨.

[2] امين (معلوف): الحروب الصليبة كما رآها العرب، (بيروت: ١٩٩٨)، ص١٢١.

مێژوویی شەڕەکان و ماوەیەکی کەمی دوای شەڕەکاندا، چ کاریگەرییەکی هەبوو بێت لەسەر ئەو بۆچوون و هەڵوێستانەی شێوەگیر دەبوون، بەتایبەتی دەبێت. بۆچوون و هەڵوێستی زانینی مێژوویی - کە بابەتی ئەم نامەیە - چۆن بوو بێت؟

لەراستیدا ئەو مێژوونوسەی لەم سەردەمەدا دەژیا و کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم سەردەمەوە، هەستی بە بێ وێنەیی ئەو سەردەمە دەکرد، کە تیایدا دەژی یان رووداوە ترسناکەکانی دەگێڕێتەوە و باسی ئەو نەهامەتیانە دەکات، کە تیایدا بەسەر ((ئوممەتەکەیدا)) هاتبوون[1]. بۆیە دەبوو بەو هەواڵانەدا بچێتەوە، کە دەیاننوسێت و جەخت لەوانە بکاتەوە، کە کۆیاد (الذاكرة الجماعية) دەهەژێنن و بەها سیاسی و رەوشتیەکانی پێشوو، بەتایبەتی بەها و رەوشتەکانی سەرەتای ئیسلام - سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی راشیدین - بەبیر خەڵك دەهێننەوە و بۆ هاوشێوە هەنووکەییەکانیان بگەڕێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ئامانجی سەرەکیی سەردەمەکەی خۆی بەدی بهێنێت، کە خرۆشانی کۆمەڵی ئیسلامییە لە رووی ئاینی و سیاسییەوە بۆ ئەوەی ئامادەی رووبەڕووبوونەوەی مەترسییە چاوەڕوانکراوەکان بێت[2].

ئەم چوارچێوەیە بیرکردنەوەی مێژوویی مێژوونوسی سنوربەند کردبوو، بە جۆرێك دەبووایە تەنها بیر لەم رووداوە چارەنوسسازانە بکاتەوە، چونکە هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بوون بۆ سەر قەوارەی کۆمەڵەکەی و لەناوبردنی بیرۆکەی ئوممەت - دەوڵەتی ئیسلامی، ئەگەرچی ئەم بیرۆکەیە لەو کاتەدا زیاتر هیوا و ئاواتێك بوو، نەك حەقیقەتێکی واقیعی و بەرجەستە. مەبەستیش لە سنوربەند کردنی بیرکردنەوە ئەوەیە تەنها بیر لەو هەواڵانە بکرێتەوە، کە تۆمارکردنیان کارێکی راستە و گوزارشت لە پێویستیی بەرگریکردن لە کۆمەڵ و یەکڕیزیی کۆمەڵ دەکات دژی ئەویتری - دوژمن، کە هەڕەشەیە بۆ سەر قەوارەی ئەم کۆمەڵە. بۆیە دەبینین ئەو مێژوونوسانەی - بە دڵ و بەگیان - سەر بەو فەزا گشتییەن،

---

[1] بڕوانە: عماد الكاتب: الفتح القسي، ص٤٨-٤٩. هەروەها بڕوانە: إبن الأثير: الكامل، ج١٢، ص١٢٣-١٢٤ (باسی هاتنی مەغۆل و ئەو کارەساتانە دەکات کە بەهۆی ئەم هاتنەوە بەسەر موسڵمانان‌دا هات). هەروەها بڕوانە: ابو شامة: الروضتين، ج١، ق١، ص٤.

[2] Khalidi: op. Cit, p.148.

کە شەڕی خاچییەکان و دواتر هێرشی مەغۆلەکان هێنابوویانە ئاراوە، بە دوای هەواڵی هەموو ئەو کەسانەدا دەگەڕێن، کە هەوڵ دەدەن بەرپەرچی ئەمانە بدەنەوە یان لەم پرۆسەی بەرپەرچدانەوەدا بەشداری سوپای هێزە ئیسلامیەکان بکەن.

لێرەدا دەتوانین بڕیار لەسەر رادەی پەسەندکردنی بوونی کورد بدەین لە مێژووی ئەم قۆناغە درێژەدا. لەراستیدا کورد لەم قۆناغەدا، بەهۆی موسڵمانبوونیان و توانەوەیان لە کۆمەڵی ئیسلامیدا و ئەو توانای شەڕکردنەی پێی ناسرابوون، ئامادەییەکی بەهێز و کاریگەریان هەبوو، سەرەڕای ئەمانە، وڵاتەکەیان بەتایبەتی شاری رەهاو دەوروبەری، لە پێشەوەی ئەو ناوچانە و ناوچەکانی تری جەزیرەی فوراتدا بوو، کە کەوتبوونە بەر هێرشی خاچییەکانەوە[1]، هەروەها کورد لەو میللەتە ئیسلامیانە بوو، کە لەبەرەی شەڕەکانی وڵاتی شامەوە نزیکبوون. بۆیە یەکەم کەسبوون بەدەنگ بانگەوازی جیهادەوە چوون و زۆر سەرکردەیان تیا هەڵکەوت ـ لە پاڵ سەرکردەکانی تردا ـ هەوڵی رووبەڕووبوونەوەی خاچییەکانیان دەدا، بەتایبەتی لە سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/دوازدەی زاینیدا[2].

ئەم بەدەنگەوەچوونەی کورد لەو کتێبە مێژووییانەدا دەنگی دایەوە، کە لەبارەی سەرەتاکانی ئەم ململانێیە دانرابوون. یەکەم مێژوونوسی ئەم بوارە (ئیبن قەلانسی عەمید)و[3]کتێبی (ذیل تاریخ دمشق)ەکەیەتی. ئەم کتێبە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە سەرەتای دەستپێکردنی هێرشی خاچییەکان تا ساڵی (٥٥٥ك/١١٦٠ز)، کە مێژوونوس تیایدا مردووە، دەگێڕێتەوە و زۆربەی ئەو رووداوانەی تۆماری کردوون بە

---

(1) إبن الأثير: الكامل، ج١٠، ص٦٣. محمد: الكرد والسلاجقة، ص٢٨٨.

(2) بۆنمونە بڕوانە: إبن العديم: زبدة حلب، ج٢، ص١٥٧-١٥٩. إبن كثير: البداية والنهاية، ج١٢، ص١٧٤.

(3) حەمزەی کوڕی ئەسەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد ئەبو یەعلا تەمیمییە و بە ئیبن قەلانسی عەمید ناسراوە. یەکێك بووە لە کەسایەتیە دیارو پیاوە ماقوڵەکانی دیمەشق، دووجار سەرۆکایەتی دیوانی دیمەشقی وەرگرتووە. جگە لەوەی کە مێژوونوسەو بەهۆی کتێبە مێژووییەکەیەوە (ذيل تاريخ دمشق) کە لەسەر (تاريخ هلال)ی الصابی(٤٤٨ك/١٠٥٦ز مردووە) نوسیویەتی، ناوبانگی دەرکردووە، ئەدیب و شاعیریش بووە. ئیبن قەلانسی لە رەبیعی یەکەمی ساڵی (٥٥٥ك/١١٦٠ك)دا مردووە. إبن عساكر: تهذيب تاريخ دمشق، ج٤، ص٤٤٢-٤٤٣. الذهبي: سير اعلام النبلاء، تحقيق: شعيب الأرنؤوط ومحمد نعيم العرقوسي، ط٣، (بيروت: ١٩٨٦)، ج٢٠، ص٣٨٨-٣٨٩.

چاوی خۆی بینیونی یاخود گوێبیستیان بووە[١]. ئەم مێژوونوسە ئاماژەی بە ڕۆڵی هەندێ سەرکردەی کورد کردووە لەم شەڕانەدا[٢] و هەڵوێستی جیهادییانەیان بەرز دەنرخێنێت و بە ئاشکرا مەیلی بەلای ئەو سەرکردە کوردانەدا هەیە، کە لە وڵاتی شام دەرکەوتن، چونکە - بە وتەی ئیبن قەلانسی - ئەمانە ((ڕۆڵیان دیارە و جێی سوپاسن)) و ((لە شەڕکردندا شارەزا بوون))[٣].

ئەم هەڵوێستە ((جیهادییانە))ی کورد بەشێوەیەکی روونتر لە یاداشتنامە کەسییەکانی (المذكرات الشخصية) ئوسامەی کوڕی مونقیزی کینانیدا (٥٨٤ك/١١٨٨ز مردووە)[٤] دەبینرێن، کە هاوچاخی سەرەتای شەڕی خاچییەکان و راستەوخۆ بەشداریی بەرپەرچدانەوەی هێرشی فەرەنجەکانی کردووە. ئوسامە لە یاداشتنامەکەیدا، کە بە ناوی (الإعتبار)ەوەیە، زۆر هەواڵ وگێڕانەوە لەبارەی هەڵوێستی جیهادیی ئازایانەی ژنان و پیاوانی کورد لە پرۆسەی بەرگری و بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستەکان لە وڵاتی شامدا دەخاتە روو[٥]، ئەم هەڵوێستانەی بەدڵ بووە و پیایدا هەڵداون.

---

(1) جب: صلاح الدين الأيوبي - دراسات في التاريخ الإسلامي، حررها: يوسف ايبش، ط٢، (بيروت: ١٩٩٦)، ص٤١. هەروەها بڕوانە:

M. Hilmi. M. (Ahmed): Some notes on Arabic historiography during the Zangid and Ayyubid Periods, in: Historians..., p.82.

(2) ذيل تاريخ دمشق، (بيروت: ١٩٠٨)، ص١٩٨، ٣٣٩.

(3) م.ن، ص٣٠٤-٣٠٦. باسی موجاهیدەدین بەزان (٥٥٥ك/١١٦٠ز) دەکات کە میرێکی کوردەو یەکێکە لە میرەکانی خێڵی جەلالی، ئەم میرە لە وڵاتی شامدا پێگەیەکی بەرزی هەبووەو زۆر پۆستی بەرزی وەرگرتووە. لەبارەی ئەم میرەوە بڕوانە: م.ن، ص٢٨٢، ٢٩٦، ٣٠٦، ٣١١، ٣٥٩.

(4) ئەبو موزەفەر ئوسامە کوڕی مورشید کوڕی عەلی کینانییە و بە لایەنگری (الدولة مجدالدين) ناسراوە کە یەکێکبووە لە میرەکانی بەنی مونقیزی عەرەبی فەرمانڕەوای (شیزر)ی سەر رووباری عاصی لە تەنیشت جەماە. ساڵی (٤٨٨ك/١٠٩٥ز) لەدایکبووە. ڕۆڵێکی گرنگی سیاسی و سەربازی گێڕاوە. بە یەکێك لە ئەدیبەکانی سەردەمی خۆی دادەنرا. زۆر کتێبی هەیە. ياقوت الحموي: معجم الأدباء، ج٥، ص١٨٨-٢٤٥. إبن خلكان: وفيات الأعيان، مج١، ص١٩٥.

(5) كتاب الإعتبار، ص٤٩-٥٠، ٩٥-٩٧، ١١٦، ١٥٠.

لێره بەدواوه، کورد له کتێبە مێژووییەکاندا بوونێکی روون و دیاریکراوتریان دەبێت. زۆربەی کاتەکان لە پێناوی خوادا جیهاد دەکەن و سەربازی ئەوانەن دژی «کافر» و «دەستدرێژکەران»[1] دەجەنگن، واتە لێرەدا بوونیان رەنگدانەوەی کەسایەتیی پێشوویان نییە و زیاتر رەنگدانەوەی کەسایەتییەکی ترە، کە دەتوانین بە کەسایەتی جیهادی ناوی ببەین و لە دوورترین رەهەندەکانیدا ئەو کردەی جیهادکردنە ئەنجام دەدات، کە عەقیدەی ئیسلامی فەرزی کردووه بەسەر شوێنکەوتەکانیدا. بۆیە زانینی مێژوویی ناچارە گرنگی بەم رەهەندە نوێیەی کەسایەتیی کورد بدات، کە لە سەرکردە و میر و خێڵ و تەنانەت جەنگاوەرە سادەکاندا شێوەگیر دەبێت.

لێکۆڵینەوە لە تێڕوانینی مێژوونوسەکان لە کەسایەتییەکی کورد، کە ناوبانگێکی زۆری هەبووە، ئەمەمان بۆ روونتر دەکاتەوە، ئەو کەسەش صەلاحەدینی ئەیوبییە.

## ٢- صەلاحەدینی ئەیوبی و گوتاری مێژوویی چەقگرتوو لە دەوری کەسایەتیی جیهادیدا

یەکێك لە رووەکانی وەڵامدانەوەی جیهانی ئیسلامی بۆ ئەم ململانێ و رووبەڕووبوونەوە سەربازییە سەپێنراوانە، دەرکەوتنی دەوڵەتی سەربازی بوو وەك نمونەیەکی پەسەندی دەسەڵاتی سیاسی، کە هەموو دەرامەتی خۆی دەخاتە خزمەتی توانای سەربازی و جەنگەوە. گرنگیدان بە پێویستیی بەرگریکردن، ئە جۆرە دەوڵەتەی سەپاند، کە سوڵتانێکی جەنگاوەر سەرکردایەتیی دەکات. دەوڵەتی زەنگی و دەوڵەتی ئەیوبیی کوردی و پاشان دەوڵەتی مەملوکی لە میسرو وڵاتی شام، باشترین نمونەی ئەم جۆرە دەوڵەتە سوڵتانییە ـ سەربازییەن[2]، کە شەرعییەتی خۆی لە توانای

---

[1] بۆنمونە عیمادەدین کاتبی ئەدیب و مێژوونوس، کە دواتر دەیناسێنین، کاتێك مەدحی سوڵتان نورەدین مەحمود کوڕی عیمادەدین زەنگی دەکات، کە بەجیهاد کردن و شەڕ لە دژی خاچییەکان ناسرابوو، لە دێڕەشیعرێکیدا ئاماژە بەمە دەکات و دەڵێت:

للروم والأفرنج منك مصائب بالترك، والأكراد، والعربان

واتە، رۆم و ئەفرەنج بە دەستی تۆ تووشی کارەسات بوون، بە پاڵپشتیی تورك و کورد و عەرەب بۆ تۆ . ابو شامة: الروضتين، ج١، ق٢، ص٥٣٠.

[2] لەبارەی ئەم جۆرە دەوڵەتە سەربازیانەوە بڕوانە: عبده قاسم: ماهية الحروب الصليبية، ص١٨٣-١٩٤.

بەرپەرچدانەوەی هێزە شەڕکەرەکانەوە بەدەست هێنابوو. واتە شەرعییەتی دەوڵەت بەستراوە بەوەی تا چەند دەتوانێت رووبەڕووی دوژمنە دەرەکییەکان بێتەوە[١]. دەرکەوتنی ئەم دەوڵەتە سەربازییانە، دەرەنجامێکی قبوڵکراوی سیستەمی ئیقتاعی سەربازی بوو، کە هەر لە کاتی هاتنی سەلجوقییەکانەوە فۆڕمێکی پێشکەوتووی وەرگرت و بوو بە بەشێك لە سیاسەتی گشتیی دەوڵەتی گشتگیر لە کایەی ئیسلامیدا[٢]. ئەم سیستەمە ئیقتاعییە ماوەیەکی زۆر مایەوە و بەردەوامیی وەرگرت، کاریگەریی درێژخایەنیشی هەبوو لەسەر بونیاتی هێز و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و لایەنی سیاسی ـ واتە بابەتی سەرەکیی زانینی مێژوویی ـ لە رووی تیۆری و پراکتیکییەوە. هەروەها ئەم دەوڵەتە دەستی وەردەدایە ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ئاینی ـ رۆشنبیریی کۆمەڵی ئیسلامی[٣].

لەلایەکی ترەوە، بەهۆی ئاڕاستەی هێرشی خاچییەکانەوە، وڵاتی شام و میسر و دەوروبەریان بوونە بنکەی ململانێی نێوان موسڵمان و خاچپەرستەکان. بۆیە رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی و لەناویدا زانینی مێژوویی، لەم وڵاتانەدا چەقگیر بوو و بووژایەوە. گرنگیدان بە زانست و زانینە هەمەجۆرەکان و بە تایبەتی ئەو زانینەی پەیوەندییەکی پتەوی بە بارودۆخەکەوە هەبوو، زیادی کرد. قوتابخانە فیقهی و ئاینییەکان زۆر بوون و دەسەڵاتدارەکان بایەخیان بەم قوتابخانانە دەدا و پشتگیریی دەمەزرێنەرەکانیان دەکرد[٤]، پەیوەندییەکی ئۆرگانی لە نێوان سوڵتان و زاناکان، واتە لەنێوان خاوەن شمشێر و خاوەن پێنوسدا هەبوو، ئیتر زاناکان ـ لەناویاندا مێژوونوسەکانیش ـ لە دەرەوەی دەسەڵاتی (جیهادکەر)دا نەمانەوە، بەڵکو پێگەیەکی نزیك و هەندێ جار کاریگەرییان لای ئەم دەسەڵاتە باڵادەستە بۆخۆیان دۆزیبوویەوە[٥]. هەموو ئەمانە کاریان کردە سەر رەوتی زانینی مێژوویی و مێژوونوسەکان بەپێی ئەمە مێژوویان دەنوسییەوە. ئەم

---

(1) بڕوانە: شلق: الأمة والدولة، ص٢٣٠. Khalidi: op. Cit. p. 183

(2) خليل: الاقطاع الشرقي، ص١٦٧-١٦٨.

(3) بڕوانە: خليل: م.ن، ص١٧٤. شلق: م.س، ص٢٣٧. Khalidi: Ibid, p. 183.

(4) بۆ ئەم بابەتە بڕوانە: احمد احمد (بدوي): الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية بمصر وبلاد الشام، (القاهرة: ١٩٧٢)، ص٣٠-٨٢.

(5) Ahmed: Op. Cit, p.80.

نزیکبوونەوەیەی نێوان دەسەڵات و زانین، بەهۆی ئەو بارودۆخەی باس کرا، کارا مێژووییەکان یان ئەوانەی مافی ئەوەیان هەیە لە مێـژوودا بوونیان هەبێت و تەنانەت سەنتەری بوون بن لەو مێژووەدا، کە کۆمەڵی ئیسلامی بەگەورەی دەزانێت و ڕێزی پاڵەوانەکانی دەگرێت، ئەم نزیکبوونەوەیە بەوردی هەموو ئەمانەی بۆ مێژوونوس دەستنیشان کردبوو.

لێرەوە ئیتر ئاسانە قسە لە پێگەی صەلاحەدینی ئەیوبی و کەسانی تری کورد بکرێت، چونکە دەرکەوتنی صەلاحەدین وەك سەرکردەیەکی موجاهید، کە بەهۆی بوونە سەربازی - جیهادییەکەیەوە لە مێژوودا مەرکەزیەتی خۆی هەبوو، ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە چەسپاندنی ئەم بوونە لە مێژووی قۆناغەکەدا، ئیتر ئەمە پەیوەست بێت بە خودی صەلاحەدین و خێزانەکەیەوە، یان پەیوەست بێت بە سـەرکـردە و میرەکانی ئەو خێڵە کوردیانەوە، کە بەشداریی بەرەنگاریی خاچییەکانیان کردووە و دژیان جەنگاون.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ئێمە نامانەوێت لەبارەی کەسایەتیی صەلاحەدین و شەڕەکانی دژی خاچییەکان و سیاسەتەکانی و هەروەها ئەو بەها ڕەوشتیانەوە بدوێین، کە هەڵگریان بووە. هەموو ئەمانە بەشێوەیەکی دور و درێژ لەلایەن زۆر لێکۆڵەری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەوە لێیان کۆڵراوەتەوە[1]. تەنانەت هەر بەوەندە نەوەستاون، بەڵکو لە سروشتی ئەو زانینە مێژووییەش کۆڵیونەتەوە، کە لەبارەی صەلاحەدین و دەوڵەتەکەی و شەڕی خاچییەکان بەرهەم هاتووە، بۆیە سیما گشتییەکانی ئەم زانینە بۆ خوێنەر ڕۆشن کراوەتەوە[2]. لەبەر ئەمە و بۆ خۆ دوورگرتن لە دووبارەکردنەوە، تەنها جەخت لە هەندێك

---

[1] ئەوەی دەیەوێت ئاگاداربێت لەوەی لەبارەی صەلاحەدینەوە نوسراوە، دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو بیبلۆگرافیایەی کە یوسف ایبش لە کۆتایی کتێبەکەی گب لەبارەی صەلاحەدینی ئەیوبییەوە دایناوەو ناوی هەندێ لەو سەرچاوانەی تیایە بە زمانی عەرەبی لەبارەی ئەم سەرکردەوە نوسراون. جب: صلاح الدين الأيوبي، ص٢٣٦-٢٤٠.

[2] بۆنمونە بڕوانە: جب: م.ن، ص٦٩-١١١. السيد الباز (العريني): مؤرخو الحروب الصليبية، (القاهرة: ١٩٦٢)، ص١٩٨-٢٣٤. نظير حسان (سعداوي): المؤرخون المعاصرون لصلاح الدين، (القاهرة: ١٩٦٢).

لەو بابەتانە دەکەینەوە، کە چوارچێوەی بابەتەکەمان بۆ تەواودەکەن و میتۆدی زانستی ئەوە دەخوازێت باس بکرێن.

یەکەم بابەت، کە دەمانەوێت باسیبکەین، ئەو مەرکەزیەتەیە لە مێژووی ئەم قۆناغەدا درابوو بە صەلاحەدین و رەنگدانەوەی کەسایەتییە جیهادیەکەی بوو. جیهادکردن بەلای صەلاحەدینەوە زۆر خۆشەویست بوو و بە دڵ و بە گیان حەزی لێ دەکرد[1]. هەروەها ئەم مەرکەزیەتە لە باوەڕی مێژوونوسەوەیە بە هێز و توانای ئەم سوڵتانە و بێوێنەییەکەی لە دژایەتیکردنی خاچییەکاندا، کە بووە هۆی بەدیهاتنی یەکێتیی کۆمەڵی ئیسلامی - کە مێژوونوس لە هەموو شتێك زیاتر باوەڕی پێیەتی - و پاراستنی قەوارە مادی و مەعنەوییەکەی ئەم کۆمەڵە[2]. بۆیە بوونی جیهادییانەی صەلاحەدین لەپاڵ سەرکردە و سوڵتانەکانی تری وەك نورەدین مەحموددا، پێویستییەکی هەنووکەیی کۆمەڵی ئیسلامیی بوو، کە لەمێژ بوو چاوەڕێی ئەم بوونە جیهادییەی دەکرد[3]، واتە چاوەڕوانی سەرکردەیەکی بەهێزو چاکی دەکرد بێت و سەرکردایەتیی بکات. بەڕاستی صەلاحەدین ئەو سەرکردەیە بوو توانیی موسڵمانان یەك بخات و خاچپەرستەکان سەرکوت بکات و ئاڵای دادپەروەری هەڵکات و ((قودس لە دەستی موشریکەکان))[4] رزگار بکات.

هەرکەسێك ئەم تایبەتمەندییانەی هەبێت، دەبێتە مەرکەزێکی مێژوویی و رووداوەکان لە دەوری ئەو دەخولێنەوە و لاپەڕەیەکی زۆری کتێبە مێژووییەکان بۆ خۆی و ژیاننامەکەی و خانەوادەکەی تەرخان دەکرێت. تەنانەت زۆر نوسەر و مێژوونوس پەیوەندی راستەخۆ و ناراستەوخۆیان بە صەلاحەدینەوە هەبووە و لە کتێبەکانیاندا

---

[1] إبن شداد: النوادر السلطانية، ص٢١.

[2] بڕوانە: عماد الدين الكاتب: البرق الشامي، تحقيق وتقديم: خالد صالح حسين، (عمان: ١٩٨٧)، ج٥، ص٢٥، ٧٦.

[3] ابو شامة: الروضتين، ج١، ق١، ٧.

[4] إبن شداد: م.س، ص٣.

بەشێوەیەکی تایبەت باسیان کردووە[1]، هەروەها ئەمە پەڕییەوە بۆ ناو شاعیر و پزیشکەکانیش[2]و لە بیرکردنەوەیاندا مەرکەزیەتێکیان دابوو بە صەلاحەدین. بۆیە سروشتیە ببینین ئیبن شەدداد[3]تەنها مێژووی بۆ ئەو دەنوسی و کاتێك ویستی ژیاننامەی ئەم سەرکردەیە بنوسێتەوە بەو وتەیە دەستی پێکرد، کە مرۆڤ ناتوانێت هەواڵەکانی صەلاحەدین باس نەکات یان نەیانگێڕێتەوە[4]. صەلاحەدین سەرەڕای ئەوەی بە بەردەوامی فەرزە ئاینییەکان و مامەڵە شەرعییەکانی جێبەجێ کردووە، سەرکردەیەکی دادپەروەر و بەخشندەش بووە، لەکاتی جیهادکردنیشدا لە رادەبەدەر ئازا بووە و کەس شانی لە شانی نەداوە[5]. هەر ئەمانەش پاڵیان بە ئیبن شەددادەوە ناوە کتێبێکی تایبەت

---

[1] لەوانە: عیمادەدین کاتب ئەصفەهانی (٥٩٧ك/١٢٠٠زمردووە)، قازی فازیل (٥٩٦ك/١١٩٩ز مردووە) ،ئیبن شەدداد (٦٣٢ك/١٢٣٢ز مردووە)، هەروەها مێژوونوسی شیعە مەزهەب ئیبن ئەبی تەی حەلەبی (٦٣٢ك/١٢٣٤ز مردووە) کتێبێکی لەبارەی صەلاحەدینەوە داناوەو ناوی ناوە (كنز الموحدين في سيرة صلاح الدين) و لە ریزی کتێبە ونبووەکاندایە. کتێبەکانی ئەم مێژوونوسانە بوونە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ مێژوونوسەکانی دوای خۆیان بە تایبەتی ئەوانەیان دەتوانرێت لەناو ئەو مێژوونوسەکانی صەلاحەدین و دەوڵەتی ئەیوبی دابنرێن وەك : ئەبو شامە (٦٦٥ك/١٢٦٦ز مردووە)، ئیبن واصیل (٦٩٧ك/١٢٩٧ز مردووە)، ...هتد.

[2] بۆنمونە بڕوانە: إبن ابي اصيبعة: عيون الأنباء في طبقات الأطباء، شرح و تحقيق: نزار رضا، (بيروت: د.ت)، ص٦٣٠-٦٣٥، ٦٥٢-٦٥٣.

[3] ئیبن شەدداد: بەهائەدین یوسف کوڕی رافیع کوڕی تەمیم، ساڵی (٥٣٩ك/١١٤٥ز) لە موصڵ لەدایکبووە. لە قوتابخانەی نیزامیی بەغداد خوێندوویەتی، هەروەها لە موسڵیش خوێندوویەتی و پلەی بەرزبووەتەوە، ئەتابەگی موسڵ کردوویەتی بە نێردراوی خۆی بۆ لای خەلیفەی عەباسی و صەلاحەدینی ئەیوبی. ساڵی (٥٨٤ك/١١٨٨ز) چووەتە پاڵ صەلاحەدین و زۆر لێیەوە نزیکبووە. زۆر دانراوی هەیە. ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٩ز) لە حەلەب مردووە. إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٧، ص٨٤-١٠٠.

[4] إبن شداد: م. س، ص٣-٤.

[5] م.ن، ص٢١.

((جیهاد)) بۆ صەلاحەدین دابنێت[1]. ئەمەش مانای باوەڕی ڕەهایە بەم بوونە جیهادییە و لەسەر مێژوونوس پێویستە داوای ڕەحمەت و بەزەیی خوای بۆ بکات[2]، هەر بۆیە ئیبن شەدداد و کەسانی تریش زۆر پیایاندا هەڵداوە و باسی چاکەکانیان کردووە[3]، تەنانەت وتەکانی صەلاحەدین هاوواتای وتەکانی پێغەمبەر بوون[4].

لە ئێستاوە و لەم بارودۆخەدا، ئەوەی مێژوو دروست دەکات صەلاحەدینی ئەیوبییە، چونکە بەرەنگاری خاچییەکان بووەتەوە و شار و قەڵاکانی ڕزگار کردووە، یەکەم ڕووگەی موسڵمانان و سێیەم پیرۆزترین مزگەوتی سەر ڕووی زەوی، واتە قودسی ئازاد کردووە. هەر لەبەر ئەمانەیە عیمادەدین کاتب[5]- کە لە صەلاحەدین و خانەوادەکەیەوە نزیک بووە و یەکێک بووە لە مێژوونوسەکانی صەلاحەدین[6]- لە کتێبی (الفتح القسي في الفتح القدسي)یەکەیدا بانگەشەی ئەوە دەکات صەلاحەدین خاڵی دەستپێکردنی مێژوویەکی نوێیە و سەردەمە مێژووییەکە بەو دیاری دەکرێت، کاتێکیش لە هۆی دەستپێکردنی

---

(1) کتێبەکە ناوی (فضائل الجهاد)ەو بە دەستنوسی لە کتێبخانەی (کوبەرلی زادە)ی ئەستەنبوڵ بە ژمارە (٧٦٤) پارێزراوە.

(2) ((خوایە خۆت دەزانیت ئەو هەوڵی خۆی خستووەتەگەر بۆ سەرخستنی دینەکەت، لەپێناو ڕەحمەت و بەزەیی تۆدا جیهادیکردووە، خوایە تۆش ڕەحمی پێبکە))، ل٢٣. هەروەها: ل٢٧.

(3) إبن شداد: م.ن، ص٩-٢٣. عماد الكاتب: الفتح القسي، ص٥٤، ٦٢٧-٦٢٨، ٦٥٦-٦٦١. إبن واصل: م.س، ج٢، ص٢٢٧-٢٣٩. ابو الفداء: المختصر، ج٣، ص٨٦-٨٧. هەروەها زۆر سەرچاوەی تر.

(4) إبن شداد: م.ن، ص١١٨.

(5) ئەبو عەبدوڵا موحەمەد کوڕی صەفیەدین ئەبو فەرەج محمد کوڕی نەفیسەدینەو نازناوەکەی عیمادەدین کاتبی ئەصفەهانییە، ساڵی (٥١٩ك/١١٢٥ز) لە ئەصفەهان لەدایکبووەو ساڵی (٥٩٧ز/١٢٠٠ك) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. زۆر کتێبی مێژوویی و ئەدەبیی هەیە کە بەناوبانگترینیان بریتین لە: (البرق الشامي) و (خريدة القصر وجريدة العصر). بە یەکێك لە ئەدیبە گەورەکانی سەردەمی خۆی دانراوەو لە دەسەڵاتدارەکانەوە نزیکبووە، خزمەتی نورەدین مەحمودو صەلاحەدینی ئەیوبیی کردووە. إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٥، ص١٤٧-١٥٣. الصفدي: الوافي بالوفيات، ج١، ص١٣٢-١٤٠.

(6) بۆنمونە بڕوانە: ابو شامة: الروضتين، ج١، ق٢، ص٣٩٦.

کتێبەکەی بە رزگارکردنی قودس (٥٨٣ك/١١٨٧ز) لەلایەن صەلاحەدینەوە دەدوێت، لەپاش باسکردنی دانانی کۆچکردنەکەی پێغەمبەر بە سەرەتای مێژووی ئیسلامی لەلایەن عومەری کوڕی خەتابەوە، باس لەوە دەکات ئەو بە کۆچکردنی دووەمی دوای کۆچکردنەکەی پێغەمبەر مێژوو دیاری دەکات ((ئەم کۆچکردنەی دووەمیش کۆچکردنی ئیسلامە بۆ قودس و ئەوەی ئەم کۆچەی ئەنجامداوە سوڵتان صەلاحەدینی ئەیوبییە. وا باشە لەسەر ئەو ساڵەی ئەم کۆچەی تیادا ئەنجامدراوە مێژوویەك بنیات بنرێت و رێك بخرێت))[1]. بەپێی وتەی ئەم مێژوونوسە، ئەگەر کۆچکردنەکەی پێغەمبەر بۆ مەککە بووبێتە هۆی دەستپێکردنی مێژوویەکی نوێ و هەموو مێژووەکانی پێشتر سڕابنەوە، ئەوا رزگارکردنی قودس سەرەتای مێژوویەکی کۆچیی نوێ و سەردەمێکی نوێیە و دەتوانرێت بەپێی ئەم سەرەتا نوێیە مێژوو تۆمار بکرێت.

ئەوەی عیمادەدین دەیڵێت زەینی وەرگر قبوڵی دەکات، ئەو راشکاوانە باس لە سیستەمی باوی نوسینەوەی مێژوو دەکات و پێشنیاری سەرەتایەکی تازەی سەردەمێکی نوێ دەکات[2]، کە رووداوەکانی باڵیان کێشابوو بەسەر زەینی وەرگردا و وتەکانی مێژوونوس توشی شۆکیانێ نەدەکرد، چونکە بەپێوەری خەیاڵگەی کۆمەڵی ئیسلامی، بە تەواوی گوزارشتیان لە مێژووی ئەو سەردەمە دەکرد. واتە مێژوونوس بەم سەرکردەیە زەمەنی مێژوویی دیاری دەکات و ئاماژە بە مێژووی پێش صەلاحەدین و مێژووی دوای صەلاحەدین دەکات، لێرەدا سەرکردە یەکەیەکی مێژووییە و خاوەنی درێژبوونەوەیەکی زەمەنیی دیاریکراوە و گەڵاڵە بوونی مێژوو (صيرورة التاريخ) دەنوێنێت لە سەردەمی خۆیدا، یان زنجیرەیەکی سەرەکیی سەردەمەکەی خۆیەتی[3]. مێژوونوسەکان ئەم گەڵاڵەبوونەیان راگەیاند و بەتوندی جەختیان لە تۆمارکردنی هەواڵەکانی صەلاحەدین دەکردەوە بۆ ئەوەی بە تێپەڕبوونی کات لەیاد نەچنەوە[4].

---

[1] الفتح القسي، ص٤٨-٤٩.

[2] Khalidi: op.cit, p.182.

[3] بۆ بۆچوونی هاوشێوە، بەڵام گشتگیر بڕوانە: العظمة: الكتابة التاريخية، ص٧٢-٧٣.

[4] إبن شداد: النوادر السلطانية، ص٣-٤. البنداري: سنا البرق الشامي، تحقيق: رمضان ششن، (بيروت: ١٩٧٢)، ق١، ص٥٢-٥٣. إبن واصل: م.س، ج١، ص١.

بەڵام ئایا ئەوەی صەلاحەدین کوردە، واناکات شایەنی ئەم مەرکەزیەتە مێژووییە نەبێت؟ ئایا کوردبوونی، کاری نەکردبووە سەر پێگە مێژووییەکەی؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئاسان نییە، چونکە مێژوونوسانی هەواڵەکانی صەلاحەدین هەوڵیان نەداوە بەشێوەیەکی روون وئاشکرا وەڵامی پرسیاری لەم جۆرە بدەنەوە. بەڵام بە بۆچوونی ئێمە، چەند مێژوونوسێك هەستیان بە لێکدژی (مفارقة) کردبوو لە نێوان کوردێتی ئەم سەرکردەو خێزانەکەی، لەگەڵ ئەو ناوەندە دەسەڵاتدارییە بەرزەی لە کایەی ئیسلامیدا پێی گەیشتبوون و پێش ئەمان هیچ کوردێکی تر پێی نەگەیشتبوو. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، ئەتنیکەکانی تر بەتایبەتی عەرەب و فارس و پاشان تورك، بەردەوام دەسەڵاتیان قۆرخ کردبوو، مێژوونوسەکان وا راهاتبوون تەنها لەناو ئەمانەدا سوڵتان ببینن، بۆیە هەندێك لەم مێژوونوسانە ـ وەك مەرایی کردنێك ـ و لەگەڵیاندا چەند ئەندامێکی بنەماڵەی ئەیوبی، بەتایبەتی ئەوانەیان، کە بەدوای شەرعیەتێکی رەهادا دەگەڕان بۆ بوونیان، وەك پێشتر باسمان کرد صەلاحەدین و خانەوادەکەیان دەبردەوە سەر عەرەب[١].

بەڵام هەندێ مێژوونوسی تر، کە وادیارە کوردییەتیی صەلاحەدین و خانەوادەکەیان بۆ دەرکەوتبوو، هەوڵیاندەدا پاساو بۆ ئەم ریشەیان بهێننەوە، بەجۆرێك لەگەڵ پایە و ماهیەتی ئەو کارانەدا بگونجێت، کە ئەنجامیان دابوون، بۆیە خوویان بەو قسەیەوە گرتبوو، کە ئەمان لە کوردە ئاساییەکان نین، بەڵکو لە خانەدان و پایەدارترینیانن[٢]، بەبێ ئەوەی ئەمە واتای زاڵکردنی ئینتیمای کوردبوونی صەلاحەدین بێت بەسەر ئینتیمای عەقیدەییدا. لە روانگەی مێژوونوسەوە کوردبوونی صەلاحەدین و خانەوادەکەی مەرکەزیەتی بوونی نادەنێ، ئەم ئینتیما ئەتنییە، بەپێی لێکدانەوەی ئیبن خەلدون، دەمارگیرییەکی بەهێزی دەوێت بۆئەوەی وا لەمانە و لە پێش هەمووشیانەوە صەلاحەدین بکات بتوانێت بە کارامەیی ئەو رۆڵە ببینێت، کە لە کایەی ئیسلامیدا پێی سپێرراوە، مەرکەزیەتی صەلاحەدین لە پشتبەستنی بە سەرجەم رەگەزەکانی کۆمەڵی ئیسلامییەوە

---

(1) بڕوانە بەشی یەکەم.

(2) إبن الأثیر: الکامل، ج١١، ص٣٤١. إبن خلکان: م.س، مج٧، ص١٣٩. ابو شامة: الروضتین، ج١، ق١، ص٣٢٩.

سەرچاوەی گرتووە، نەك لە پشت بەستن بە یەكێك لە رەگەزە پێكهێنەرەكانی ئەم كۆمەڵە ئیسلامییەوە[1].

سەرەڕای ئەوەی لەسەرەوە وتمان، بوونی صەلاحەدین لە مێژوودا بەو بەهێزییەی زانینی مێژوویی بۆی دەرخستین، لە كاتێكدا كە كوردە، واتای كۆڕانی تێڕوانینی ئەم زانینە بوو بۆ كوڕانی نەتەوەكەی صەلاحەدین، بێگومان مەبەستمان چینە تایبەت و دەسەڵاتدارەكەی كوردە، لێرەدا صەلاحەدین و دەوڵەتی ئەیوبی ماوەیەكی زەمەنیی تایبەت دەنوێنن[2] و هەندێك مێژوونوس ئەم ماوە زەمەنییەیان بە ماوەیەكی كوردی دادەنا، ئەمەش بەوەی دەوڵەتی ئەیوبییان ناونا دەوڵەتی كوردی[3]. تەنها صەلاحەدین و خانەوادەكەی، كوردێتی ئەم دەوڵەتە، یان بەدەربڕینێكی تر كوردێتی ئەم ماوە زەمـەنییەیان دیاری نەدەكرد، چونكە راستە ئەم مەركەزیەتە رۆڵی هەبووە لە بەرزكردنەوەی پێگە و پلە و پایەی كورد و ئامادەییان لە زانینی مێژوویی ئیسلامیی تایبەت بەو سەردەمەدا، بەڵام مەركەزیەتی ئەم سەركردەیە بەو جۆرەی ئاماژەمان پێكرد، مانای پشتگوێخستن و غایبكردنی كوردەكانی تر نەبوو لە مێژوودا. لەڕاستیدا

---

(1) «صەلاحەدین بە جیهادكردنەوە خەریكبوو..... دەمارگیرییەكەی كەم بوو، تەنها عەشیرەتێكی كوردبوون.......ئەمانیش كەمبوون، بەڵام بەهۆی ئەو جیهادەوە كە صەلاحەدین بانگەوازی بۆ دەكرد، موسڵمانان لێی كۆبوونەوە و دەمارگیرییەكەی زیادی كرد و دەمارگیرییەكەی بە موسڵمانان پتەو بوو». التعريف بابن خلدون، ص ٣٤٧.

(2) إبن واصل: م.س، ج١، ص١.

(3) هەندێ كتێبی دەستنوس هەن لەبارەی دەوڵەتی ئەیوبییەوە كە دانەرەكانیان ئەم دەوڵەتەیان ناوناوە (دەوڵەتی كوردەكان). وەك: (تاريخ دولة الأكراد والأتراك) كە موحەمەد كوڕی ئیبراهیم ئەنصاری خەزرەجی (؟) داینراوە لە ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز) دەستپێدەكات تا ساڵی (٦٥٥ك/١٢٥٧ز). لە پەیمانگەی دەستنوس (معهد المخطوطات)ی كۆمكاری عەرەبی لەژێر ژمارە (١١٢)دا پارێزراوە. هەروەها كتێبێكی تر هەیە نوسەرەكەی دیار نییە و بەناوی (تاريخ دولة الأكراد الأيوبية)وەیەو ـ بەپێی وتەی گورگیس عەواد ـ لە كۆگای عارف حیكمەتدا لە شاری مەدینە لەژێر ژمارە (٣٠ كۆن، ٢٢٧ تازە)دا پارێزراوە. التكريتي: الأيوبيون في شمال الشام والجزيرة (٥٦٤-٦٤٨ك/١١٦٨-١٢٥٠ز)، (بغداد: ٩٨١)، ص١٩-٢٠. گورگیس (عواد): ماضي الكرد وحاضرهم في المصادر العربية القديمة والحديثة، (بغداد: ١٩٩٠)، ص.

کورد لەسەردەمی صەلاحەدین و دوای ئەویشدا رەکەزێکی سەرەکی بوون لەو رەکەزانەی دژی خاچییەکان دەجەنگان. بوونی جیهادییانەیان زۆر لەوە بەهێزتر بوو مێژوونوس هەستی پێ نەکات، چونکە مێژوونوس لە بەریەککەوتنی راستەوخۆدا بوو لەگەڵ ئەم رەگەزە مرۆییەدا، ئەمەش بەهۆی نزیکییانەوە بوو لەو ناوەندە رۆشنبیرییانەوە، کە مێژوونوس ئینتیمای هەبوو بۆیان.

لەپاڵ صەلاحەدیندا زۆر سەرکردەی تر لەناو کورددا دەرکەوتن، کە هەرچەندە زۆر بەناوبان نەبوون، بەڵام خۆیان و خێڵەکانیان بەشدارییەکی بەرچاویان هەبوو لە شەڕەکاندا[1]، یان لە کاروباری رامیاری و کارگێڕیدا، میرە هەکارییەکان باشترین نمونەن بۆ ئەمە[2]. لەبەر ئەمە مێژوونوس لە چوارچێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ سەرجەم جوڵانەوە جیهادییەکاندا، مامەڵەی لەگەڵ ئەم رەگەزە مرۆڤە و سەرکردەکانیدا کردووە. بوونی جیهادییانەی کورد لای کۆمەڵی ئیسلامی بوونێکی پەسەندە، بۆیە هەواڵەکانیان دەچێتە ناو ئەم رەوتەوە[3]، مێژوونوسەکان کاتێك لە کورد دەدوێن، هەوڵ دەدەن بایەخ بە رووە جیهادییەکەی کەسایەتییان بدەن، وەك ئەوەی بیانەوێت بەمە و وەك رەنگدانەوەی بارودۆخەکە، جەخت لە گرنگیی ئامادەیی کورد بکەنەوە لە رووی ئاینی و جیهادییەوە لە

---

[1] هەندێك لێکۆڵینەوە هەن لەبارەی بەشداریکردنی کورد - جگە لە ئەیوبییەکان - لە شەڕی خاچییەکاندا. بڕوانە: .Minorsky: studies..., p139-146 حسين: دور الكرد القيادي في جيش صلاح الدين، ص٩٧-١٠٣. محمود: الإمارة الهذبانية، ص١٠٢-١٠٤. ئەرسن موسا (رەشید) : دەوری هۆزە کوردەکان لە شەڕەکانی خاچ هەڵگراندا، گۆڤاری (شانەدەر)، (هەولێر: ١٩٩٧)، ژمارە (٢)، ل٦-٨.

[2] بڕوانە: امين: المشطوب الهكاري، ص٣٩ بەدواوە. هەروەها . هەمان نوسەر: عیسای هکاری، (سلێمانی: ٢٠٠٢).

[3] بۆنمونە بڕوانە: العماد الكاتب: البرق الشامي، ج٣، تحقيق: مصطفى الحياري، (عمان: ١٩٨٧)، ص٧٧-٧٨، ١٥٥-١٥٦، ١٦٥-١٦٦. إبن شداد: النوادر السلطانية، ص١١٢، ١١٠، ١١٦، ١٣٤، ١٤٧، ١٥٢-١٥٣، ١٦٣، ١٦٨-١٦٩. أبو شامة: الروضتين، ج١، ق٢، ص٦٥٥، ٦٦٦. ج٢، ص١٤٩-١٥٠، ٢٠٩. إبن شاهنشاه الأيوبي: مضمار الحقائق و سر الخلائق، تحقيق: حسين حبشي، (القاهرة: ١٩٦٨)، ص٣٤، ٢١٤. إبن الفرات: تاريخ إبن الفرات، تحقيق: حسن محمد الشماع، (البصرة: ١٩٦٧)، مجع٤، ج٢، ص١٦-١٧، ١٩. زۆر کتێب و سەرچاوەی تر.

گۆڕەپانەکەدا، چونکە ئەو مێژووەی مێژوونوس دەینوسێت زۆربەی زۆری مێژووی جیهاد و جەنگاوەر و شتی لەم بابەتەیە و لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا دیالێکتیکی (ئێمە)ی موسڵمان و موجاهید و (ئەویتر)ی کافر و دوژمن لەبەرچاو دەگرێت و لە کاتی تۆمارکردنی هەواڵەکاندا ئەم دیالێکتیکە ـ تا رادەیەکی زۆر ـ هزری مێژوونوسی سنوربەند دەکرد.

دەتوانین لە کتێبی (الفتح القسي في الفتح القدسي)ی[1] عیمادەدین کاتبی ئەصفەهانیدا زۆر بەوردی تێبینیی ئەمە بکەین، عیمادەدین مێژوونوسێکی بەناوبانگی ئەم سەردەمە بووە و ئەم کتێبەی مۆرکی یاداشتنامەی پێوەیە، چونکە دانەر بەچاوی خۆی زۆربەی ئەو رووداوانەی بینیوە، کە باسیان دەکات و ئەو هەواڵانەی وەریگرتوون دەکەونە ماوەی نێوان ساڵانی (٥٨٣ك/١١٨٧ز) و (٥٨٩ك/ ١١٩٣ز)یەوە، واتە لە رزگارکردنی قودسەوە تا مردنی صەلاحەدین.

ئەوەی چاو بە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا بخشێنێت، هەست بە پێگەی کورد و بوونی جیهادییانەی بەهێزیان دەکات. ئەمەش زیادەڕۆیی نییە، چونکە عیمادەدین ـ کە لەگەڵ صەلاحەدیندا بووە ـ بە چاوی خۆی بینویەتی کورد بەشێکی زۆری سوپاکەی صەلاحەدینیان پێك هێناوە، بەتایبەتی لای چەپی سوپا[2]. بۆیە بەردەوام ئازایەتی و توانای شەڕکردنیان بە بیر خوێنەر دێنێتەوە[3]، بەتایبەتی هی میر و سەرۆك خێڵەکانیان[4]، هەروەها باسی چاکەی شەهیدەکان دەکات[5] و ناوی هەموو ئەو خێڵە کوردانەش دێنێت، کە لە شەڕەکاندا هاوکاری صەلاحەدینیان دەکرد و بەشێوازێکی بەرز

---

(1) ئەم کتێبەمان هەڵبژارد نەك کتێبەکەی تری ـ واتە البرق الشامي ـ کە لای لێکۆڵەرەکان زیاتر ناسراوە، چونکە بەراورد بە (الفتح القسي) ناوەڕۆکی کتێبی (البرق الشامي) بەتەواوی پێمان نەگەیشتووەو لەمڕۆدا تەنها بەشی سێیەم و پێنجەمی ماوەتەوە لەگەڵ کورتەیەکیدا کە فەتح کوڕی عەلی ئەصفەهانیی ناسراو بە بنداری (٦٤٣ك/١٢٤٥ز مردووە) نوسیویەتی. ئەمەش بوونی کوردمان لای ئەم مێژوونوسە بۆ رووننا‌کاتەوە.

(2) الفتح القسي، ص٤٤٢، ٥٣٢-٥٣٤.

(3) م.ن، ص٥٩، ٢٢٦، ٣١١، ٣٢٨، ٤٤٢.

(4) م.ن، ص١٥١-١٥٢، ٣٥٦-٣٥٧، ٤٤٢-٤٤٨، ٥٠٥، ٥١٣.

(5) م.ن، ص٣٠٩، ١١٣، ٤١٣، ٤٩١، ٥٢٨، ٥٥٩.

و ڕەوان گوزارشت لەمانە دەکات[1]و ئاماژە بە ڕۆڵی ((پێشڕەوانە))و ((جوامێرانە))و ((ئازایانە))و ((هێرشبەرانە))و بەرچاوی خێڵەکانی وەك حەمیدی[2] و هەکاری و زەرزاری[3] و مەهرانی[4] دەکات. بێگومان لەم فەزا جیهادیەشدا، ئەوەی ئەم هەموو سیفەتانەی تێدابێت ، لای مێژوونوس پێگەیەکی بەرزی هەیە.

سەبارەت بە مەرکەزیەتی صەلاحەدین دەڵێین، ئەم مەرکەزیەتە بەس بوو بۆ ئەوەی متمانە بە بێلایەنیی ئەو مێژوونوسە لەق بکات، کە لەم مەرکەزیەتەوە مێژووی دەنوسییەوە. پێمان وایە مێژوونوس، کە لەژێر سایەی سەروەری و سەرکەوتنەکانی صەلاحەدیندا بیری کردووەتەوە، مێژووی بەو ئاڕاستەیەدا بردووە لە ئەنجامدا هەموو کار و کردەوەیەکی سوڵتان پەسەندە و جێی ڕەخنە لێگرتن نییە، چونکە مێژوونوس لێرەدا نوێنەرایەتیی خودی صەلاحەدین دەکات و لە مەرکەزیەتەکەی ئەوەوە کەسانی تر دەبینێت. ئەو نایەوێت حەقیقەتی ئەوانە ببینێت، کە بە (ئەویتر)ی صەلاحەدین و مێژوونوس خۆی دادەنرێن. کاتێك لێرەدا باسی (ئەویتر) دەکەین، مەبەستمان خاچییەکان نییە، چونکە سەبارەت بە زانینی مێژوویی بەتایبەتی و خەیاڵگەی کۆمەڵی ئیسلامی بەگشتی، ئەویتریەتیی ئەم دوژمنانە مەسەلەیەکە یەکلایی بووەتەوە، بەڵکو مەبەستمان (ئەویتر)ی سەر بە خودی خانەی ئیسلامە، وەك فاتمییەکان، کە صەلاحەدین ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز) لە میسر کۆتایی بە فەرمانڕەواییان هێنا. با ئەبو

---

[1] م. ن، ص ٣٢٨.

[2] حەمیدی: لە خێڵە کوردەکانی هەرێمی جەزیرەن، زۆر قەڵایان هەبووە، وەك قەڵای ئاکرێ (عقرة) و شوش. یاقوت: معجم البلدان، ج٤، ص١٣٩. العمري: مسالك الأبصار، ج٣، ص١٢٧. هەروەها بڕوانە: توفيق: القبائل والطوائف الكردية في العصور الوسطى، دراسة منشورة في حلقات، مجلة (طولآن العربي)، (اربيل: ٢٠٠١)، ع (٦١)، ص٧٩.

[3] زەرزاری: خێڵە کوردێکی بەناوبانگن، لە هەولێرو دەوروبەریدا هەن، ئەو ناوچانەی تێیدا نیشتەجێن تا شاری شنۆ درێژ دەبێتەوە. المسعودي: التنبيه والإشراف، ص٧٨. القلقشندي: صبح الاعشى، ج٤، ص٣٧٦-٣٧٧. النقشبندي: آذربيجان، ص١١٧- ١٢١.

[4] مەهرانی: لە وڵاتی هەکاری دادەنیشتن، زۆر قەڵایان هەبووەو ئەندامەکانی ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە جەنگان دژی خاچییەکان. إبن الأثير: الكامل، ج٨، ٣٤٣-٣٤٤. توفيق: م.س، ع (٦٣)، ص١١٧.

شامەی[1] مێژوونوس وەرگرین وەك نمونەیەكی ئەو مێژوونوسەی لە روانگەیەكی ناوەندییانەی صەلاحەدینییانەوە حوكم دەدات بەسەر ئەویتردا، كە لێرەدا فاتمییەكانن .
ئەم مێژوونوسە دوای ئەوەی باسی رووداوەكانی كۆتایی هێنان بە حوكمی فاتمییەكان دەكات لەلایەن صەلاحەدینەوە، زۆر بە ناشیرین و خراپ باسیان دەكات و دەوڵەتەكەیان بە دەوڵەتێكی جولەكە یان ئاگرپەستی بێباوەڕ ناو دەبات[2]، كە هەموو جۆرە گومڕایی و خراپە و لادانێك ئەنجام دەدەن[3]، هەروەها زۆر جنێو و قسەی ناشیرینی تریان پێدەڵێت[4]، باس لەوە دەكات خوا چاكەی لەگەڵ موسڵمانان كردووە بەوەی كەسێكی وەك صەلاحەدینی ناردووە، كە دەستی بەسەر وڵاتدا گرتەوە و ئەو دەوڵەتەی لەناو برد و ((لە كۆڵ موسڵمانانی كردەوە))[5].

بەم جۆرە مێژوونوس (ئەویتر)ی فاتمی دەكاتە ئەو دوژمنە بێباوەڕەی هەر دەبێت لەناو ببرێت. ئەنجامی ئەم هەڵوێستە دوژمنانەیەش بەرامبەر فاتمیەكان، پێدانی بوونێكی رەهایە لە مێژوودا بەو كەسەی لەناوی بردوون - واتە صەلاحەدینی ئەیوبی - ، بەڵام فاتمیەكان كۆمەڵێك یاخیی - بێباوەڕن، كە لە كۆمەڵی ئیسلامی هەڵگەڕاونەتەوە و دووبەرەكییان دروست كردووە. ئەوان نوێنەرایەتی بوونی سەلبی دەكەن لە مێژووی ئەو قۆناغە چارەنوسسازەدا، كە مێژوونوس لەبارەیەوە دەنوسێت. بۆیە لەسەر مێژوونوس پێویستە رووپەكی شەرعی بەم بوونەیان بدات، كە بتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت بۆ پاساوهێنانەوە بۆ سەلبییەتی ئەم بوونە و ئیجابییەتی ئەوەی لەڕووی سیاسی و ئاینییەوە لەناوی بردوون. واتە كاتێك ئەبو شامە بوونێكی سەلبییان پێدەدات، بەمە لە ئەندێشەی

---

[1] ابو شامة: عەبدولرەحمان كوڕی ئیسماعیل كوڕی ئیبراهیمی مەقدسییە، ساڵی (٥٩٩ك/ ١٢٠٣ز) لەدایكبووە، لە دیمەشق نیشتەجێ بووەو چەند جارێكی كەم نەبێت لە دیمەشق دەرنەچووە، ساڵی (٦٦٥ك/ ١٢٦٦ز) كۆچی دوایی كردووە. كتێبێكی هەیە بەناوی (كتاب الروضتين في اخبار الدولتين) و پاشكۆ بەناوبانگەكەی بەناوی (تراجم رجال القرنين السادس والسابع الهجريين). ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٣، ص٢٥٠ بەدواوە.

[2] الروضتين، ج١، ق٢، ص ٥١٠-٥١١.

[3] م. ن،ص٥١٥.

[4] م. ن، ص ٥٠٩-٥١٦.

[5] م. ن، ص٥١٢.

کۆمەڵی ئیسلامیدا ـ چ لایەنگرەکانیان بێت یان دژەکانیان ـ لە ئامادەیی ئاینی و سیاسیی ئەوان و باڵادەستی ئەم ئامادەییە کەم دەکاتەوە، ئەمەش بەوە دەکرێت لە شەرعییەتی ئەم ئامادەییە کەم بکاتەوە.

وا دیارە ئەبو شامە قەناعەتی نەکردوە یان وای بینیوە ئەو جنێوانەی پێی داون وەرگرەکانی قەناعەت پێناکات، بۆیە رێڕەوێکی ـ بەلای خۆیەوە کاریگەرتر ـ دەگرێتە بەر بۆ داماڵینی شەرعییەتی بوونیان و هەوڵ دەدا تانە لە ریشەیان بدات و ئەوە پوچەڵ بکاتەوە، کە دەچنەوە سەر فاتیمەی کچی پێغەمبەری هاوسەری عەلی کوڕی ئەبو تالیب. بۆیە کاتێك تاوتوێی ئەم رەچەڵەکە دەکات، بەدرۆیان دەخاتەوە و دەڵێت ئەوان سەر بەم رەچەڵەکە نین و بە درۆ خۆیان داوەتە پاڵ ئەم رەچەڵەکە، ئاماژە بەوەش دەکات کتێبێکی تایبەت کردووە بەم بابەتە و ناوی ناوە ((کشف ما کان علیە بنو عبید[1] من الکفر والکذب والمکر والکید))[2]. بە بۆچوونی ئێمە ئەم رێڕەوە، ئەوەندە بۆ ئەوە بووە لە پایەی فاتمییەکان کەم بکاتەوە و ژیاننامەی مەوجودە ئیجابییەکە ـ واتە صەلاحەدین ـ و هاو رێگاکانی گەورە بکات، ئەوەندە بۆ دەرخستنی ناڕاستیی رەچەڵەکی فاتمییەکان نەبووە، بۆیە مێژوونوسانی وەك ئیبن خەلدون[3] و مەقەریزی[4] پێی رازی نەبوون و ـ لە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەدا ـ بەو فەزایە کاریگەر نەبوون، کە ئەبو شامە پێی کاریگەر بووە. نا شەرعیبوونی فاتمییەکان جەختکردنەوەیە لەسەر شەرعییەتی ئەو کارە صەلاحەدینییەی سڕینەوەی کاراییی مێژوویی فاتمییەکان و ئامادەییان بوو لە کایەی ئیسلامیدا، بۆ ئەوەی ئەم کارە ببێتە هەنگاوێك بەرەو ئاڕاستەی یەکخستنی موسڵمانان، کە ئاواتی مێژوونوسان و کۆمەڵی ئیسلامی ((موجاهید))بوو.

---

(1) دەوڵەتی فاتمی لە هەندێك سەرچاوەدا بەناوی دامەزرێنەرەکەیەوە، کە عوبەیدوڵایەو لە ساڵی (٢٩٧ك/ ٩١٠ز) بەیعەتی خەلافەتی پێدراوە، بە دەوڵەتی عوبەیدی (الدولة العبيدية) ناوبراوە. المقريزي: اتعاظ الحنفاء باخبار الأئمة الفاطميين الحنفاء، تدقيق: جمال الدين الشيال، (القاهرة: ١٩٤٨)، ج١، ص .

(2) ابو شامة: م. ن، ج١، ق٢، ص٥١٤.

(3) المقدمة، ص١٦-١٨.

(4) اتعاظ الحنفاء، ج١، ص .

کاتێك باس لە چەقگیریی مێژوو دەکەین لە دەوری صەلاحەدین و هەواڵەکانی و هەواڵی ئەو میرو سەرکردە کوردانەی هاوچاخی ئەو بوون، دەبێت هەڵوێستی دوو لە مێژوونوسە گەورەکانی ئەو سەردەمە لەبیر نەکەین، کە بە کاریگەری ئینتیماکانیان، لە صەلاحەدیندا ئەم مەرکەزیەتەییان نەدەبینی یاخود هەوڵیان دەدا رەخنەی لێبگرن و دانی پیا نەنێن، بۆیە بەپێچەوانەی مامەڵەی مێژوونوسانی قوتابخانەی شام و میسرەوە مامەڵەیان لەگەڵ صەلاحەدیندا دەکرد، ئەم دوو مێژوونوسەش (ئەبو فەرەج ئیبن جەوزی)[1] و (ئیبن ئەثیری جەزیری)ن. گرنگیی هەڵوێستەکەیان لەوەدایە بەڵگەیەکی روونمان پێدەدەن لەبارەی مومارەسەی دەسەڵاتخوازانەوە لە نوسینی مێژوودا، ئەگەرچی هەندێك جار ئەمە بە پێچەوانەی هەڵوێستی کۆمەڵی ئیسلامییەوە رووی دەدا.

مێژوونوسی یەکەم - واتە ئیبن جەوزی - لە کتێبی (المنتظم)ەکەیدا مێژووی سەردەمەکان تۆمار دەکات تا ساڵی (٥٧٤ك/ ١١٧٨ز)، کەچی لەو کتێبەیدا نائامادەییەکی تەواوی صەلاحەدینی ئەیوبی و ئەو سەرکردە و میرانە دەبینرێت، کە لەگەڵیدابوون[2]. بەشێوەیەکی گشتیش هەست بە هیچ گەرمی و هەڵچوونێکی ئەم مێژوونوسە ناکەین بەرامبەر شەڕی خاچییەکان و ئەوانەی هەڵساون بە ئەرکی بەرگریکردن لە قەوارەی کۆمەڵی ئیسلامی[3].

بۆ تێگەیشتن لەم هەڵوێستە، پێویستە شوێنگەی ئەم مێژوونوسە لە رووداوەکاندا روون بکەینەوە، ئەو لە بەغدادی پایتەختی خەلافەتی عەبباسیدا دەژیا، لەم شارەدا

---

(1) جەمالەدین کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەلی کوڕی موحەممەدی بەغدادی حەنبەلی، ساڵی (٥١٠ك/ ١١١٦ز) لە بەغداد لەدایکبووەو هەر لەوێ زانستەکانی خوێندووە تا بووە بە (پێشەوای سەردەمەکەی خۆی). بەکتێبە دانراوە زۆرەکانی لە بواری زانست و زانینە جۆراوجۆرەکاندا بەتایبەتی زانستی ئاینی، بەناوبانگە. لە دانراوە بەناوبانگەکانی کتێبی مێژوویی (المنتظم في تأريخ الملوك ولأمم)، ( تلبيس ابليس)، (كتاب الأذكياء) و هیترن. ساڵی (٤٩٧ك/ ١٢٠٠ز) لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە. المنذري: التكملة لوفيات النقلة، تحقيق: بشار عواد معروف، (النجف: ١٩٦٨-١٩٧١)، مج٣، ص٢٩١-٢٩٣. ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات، مج٤، ج٢، ص٢١٠-٢٢٠.

(2) بۆ نمونە بڕوانە: المنتظم، ج١٠، ص٥٣٤.

(3) بڕوانە: حسن عيسى علي (الحكيم): كتاب المنتظم لإبن الجوزي - دراسة في منهجه وموارده واهميته، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٨٢)، ص٩٩-١٠٠.

وتاربێژێکی کەورە بووە، لەبەر ئەمە هەموو ئەوەی دەیڵێت یان دەینوسێت، پێویستە لەگەڵ ئاراستەی سیاسیی ئەو دەسەڵاتەدا بگونجێت، کە ئەو لەژێر سایەیدا دەژی و لە خاوەن بڕیارەکانییەوە نزیکە. بۆیە بێدەنگیی ئیبن جەوزی لەوەی لە وڵاتی شام و میسر رووی دەدا لەوەوە نییە، کە ئاگاداری هەواڵەکانی ئەم وڵاتە نەبووە، یان ئاگای لە هەواڵەکانی صەلاحەدین و سەرکردە کورد و تورکەکان و جوڵانەوە سەربازییەکانیان نەبووە، ئەو ـ وەك ئاماژەمان پێکرد ـ بە حوکمی پێگە ئاینییەکەی لە دامەزراوەی خەلافەتەوە نزیك بووە و هەواڵەکانی صەلاحەدینیش بە رێك و پێکی دەنێرران بۆ ئەو دامەزراوەیە[1]، بەڵام بێدەنگیی ئەو لەو هەواڵانە رەنگدانەوەی هەڵوێستی خەلافەتە لێیان[2]، بەتایبەتی لە صەلاحەدین. ئەو هەڵوێستە ئەمڕۆ روون و بەرچاوە و ئەوەیە خەلافەت حەزی بە صەلاحەدین نەکردووە[3]، ئەمەش گەیشتبووە ئاستی سزادانی ئەو کەسەی باسی صەلاحەدین و هەواڵەکانی دەکرد[4]چ جای پیاهەڵدان بە جیهاد و قوربانیدانەکانیدا. بۆیە سروشتییە ئەم مێژوونوسە لە تۆمارکردنی هەواڵەکاندا روانینی خۆی تەسك بکاتەوە بە جۆرێك تەنها یەك ناوەندی دەسەڵات ببینێت، کە خەلافەتی عەباسییە و دەبێت هەر هەواڵەکانی ئەو و ئەو بەشەی وڵات بگێڕێتەوە، کە بەشێوەیەکی کارەکی و راستەوخۆ لەژێر دەستیدا ماوەتەوە. بەڵام هەواڵەکانی جگە لەم ناوەندە و ناوچەکانی تری سەر بەم ناوەندە، کاری ئەم مێژوونوسە بەغدادییە نین. هەر هەڕەشەیەکی هێزە دوژمنکارەکان بۆ سەر خانەی ئیسلام و بەرگریکردنی هێزە موسڵمانە کوردەکان و ئەوانی تر، جێی بایەخی ئەم مێژوونوسە نین، کە پابەندە بەو فەزا سیاسییەی تیایدا

---

(1) بۆنمونە بڕوانە: عماد الدين الكاتب: الفتح القسي، ص١٤٧-١٤٩. البنداري: سنا البرق الشامي، ج١، ص١٩٢-١٩٣. ابو شامة: الروضتين، ج١، ص ٢٤١-٢٤٤.

(2) بڕوانە: حسين: نناشد صلاح الدين ام نحاسب انفسنا، (اربيل: ٢٠٠٢)، ص٥٦.

(3) لەبارەی ئەم پەیوەندییەوە بگەڕێوە بۆ: محمد صالح داود (القزاز): الحياة السياسية في العراق في العصر العباسي الأخير، (النجف: ١٩٧١)، ص٢٦٥-٢٦٨. دريد عبد القادر (نوري): سياسة صلاح الدين الأيوبي في بلاد مصر والشام والجزيرة (٥٧٠-٥٨٩ك/ ١١٧٤-١١٩٣ز)، (بغداد: ١٩٧٦)، ص ٤٠١-٤٠٦. حسين: نناشد صلاح الدين، ص٥٢-٦٤.

(4) القزاز: م. ن، ص٢٦٩.

ەژی، مادەم ئەم هەڕەشانە ئاڕاستەی ئەو فەزایە نەکراون و ڕاستەوخۆ شکاندنی
سەروەریی ئەو دەسەڵاتە نین، کە مێژوونوس لەپێشەوەی هەواڵەکاندا دایدەنێت.

ئەم کورتبینییەی ئیبن جەوزی دیارترین کەموکوڕیی کتێبە مێژووییەکەیەتی و
ادەکات ناوەڕۆکی کتێبەکە، بە تایبەتی بەشەکانی کۆتایی، کوزارشت لە ناونیشانەکەی
ەکەن کە (المنتظم في تاريخ ملوك الأمم)ەو تیایدا مێژوو دەبێت بە ڕێکخستنی چەند
ئەوالێکی پەرت و ناتەواو، بۆیە ئەو حوکمەی کلود کاهینی ڕۆژهەڵاتناس بەسەریدا
اویەتی لە جێی خۆیدایەتی، کە پێی وایە ئەوەندەی کتێبێکە لەبارەی مێژووی بەغداد و
دەوروبەرییەوە، ئەوەندە کتێبێك نییە لەبارەی مێژووی جیهانەوە[١].

دووەم مێژوونوسی ڕکابەری ناوەندییەتیی صەلاحەدین - وەك پێشتر وتمان - ئیبن
ئەثیری جەزیرییە، هەڵوێستی ئەم لە صەلاحەدین لە بناغەدا وەك هەڵوێستی ئیبن
جەوزییە. بەڵام جیاوازیی گەورەی نێوان ئەم دوو هەڵوێستە لەوەدایە یەکەمیان باسکردنی
صەلاحەدینی پشتگوێ خستووە، کەچی هەڵوێستی دووەمیان بەم جۆرە نەبووە، بەڵکو
زۆر هەواڵی لەبارەی صەلاحەدین و ئەو کۆمەڵ و سەرکردانەوە هێناوە، کە لەگەڵیدا بوون.
هۆی ئەمەش بەریەککەوتنی ڕاستەوخۆ بووە لەنێوان صەلاحەدین و ئەو دەسەڵاتەی ئیبن
ئەثیر پابەندبووە پێیەوە، کە زەنگییەکانی فەرمانڕەوای موسڵ و دەوروبەری بوون.

زۆر لێکۆڵەری پسپۆڕ لە مێژووی ئەم قۆناغە، لەسەر هەڵوێستی ئەم مێژوونوسە
گەورەیە لەبارەی صەلاحەدینەوە شتیان نوسیوە، زۆربەیان ڕەخنەی ئەوەیان لێگرتووە
هێرشی کردووەتە سەر صەلاحەدین و بێ ئینسافی نواندووە بەرامبەری[٢]، بەڵام هەندێکی
تریان پاساو بۆ ئەم هەڵوێستەی دەهێننەوە و بەرگریی لێدەکەن[٣]. ئەوانەی ڕەخنەی
لێدەگرن یان بەرگریی لێدەکەن بەڵگەیان هەرچییەك بێت، ئەوە لە کەس شاراوە نییە، کە

---

(1) Cloud cahen: op. Cit, p.63.

(2) بڕوانە: جب: سلاح الدين الأيوبي، ص٧٥-٩٦. العريني: مؤرخوا الحروب الصليبية، ص ٢٠٧-٢٣٤. حسين: موضوعان في التاريخ الكردي، (بغداد: ١٩٧٦)، ص٣-٣٩.

(3) دیارترینی ئەوانەی بەرگریی لێدەکەن عەبدولقادر ئەحمەد طلیماتە لە کتێبەیدا کە لەبارەی ئەم مێژوونوسەوەیە بەناوی : ابن الأثير الجزري المؤرخ، (القاهرة: ١٩٦٩)، ص٤٧-٤٨.

ئیبن ئەثیر لەکاتی گێڕانەوەی هەواڵەکانی ئەو قۆناغەدا ((نەزعەیەکی زەنگیگەرانە))ی[١] بەهێزی تێدا هەبووە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەو لە دەرباری زەنگییەکاندا ژیاوە و چاکەی زۆریان لەگەڵ خانەوادەکەیدا کردووە[٢]، بۆیە ئەگەر بە گریمانەش بێت، نەیدەتوانی لە کاتی وەرگرتنی هەواڵی دەسەڵاتەکانی تردا خۆی لە پابەندبوون بەم دەسەڵاتەوە رزگار بکات و ناکرێت وتەکانی ئەم لەبارەی صەلاحەدینەوە بە تەواوی مونسیفانە بن، چونکە مێژوونوس لە چوارچێوەی ((ناوەندێکی دەسەڵات))ی جیاواز لە ناوەندێتیی دەسەڵاتی صەلاحەدین بیر دەکاتەوە و ئەم ناوەندەش بەزۆری دژایەتیی صەلاحەدینی کردووە و بەرِوویدا وەستاوەتەوە[٣]. بۆیە لێرەدا وتەی یەکێك لەو لێکۆڵەرانەی بەرگری لە ئیبن ئەثیر دەکەن راست دەردەچێت کاتێك ئاماژە بەوە دەکات ئەم مێژوونوسە مافی خۆیەتی مەیلی بۆ زەنگییەکان هەبێت[٤]. ئەم مێژوونوسە پێش ئەوەی دەست بکات بە تۆمارکردنی هەواڵەکانی صەلاحەدین، هەواڵی زەنگییەکان تۆمار دەکات و ئاسەوارەکان و هەموو ئەوانە کۆ دەکاتەوە، کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە، بۆ ئەوەی بەمە ((کارە چاکەکانیان بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار))[٥] بە نەمری بهێڵێتەوە، بۆیە کتێبی (الباهر)ەکەی بەتەواوی بۆ ئەوان تەرخان دەکات و ناوەندێتییەکی مێژوویی وایان پێدەدات هیچ ناوەندێتییەکی تر پێی ناگات، تەنانەت ئەم بارە بەراورد بە کتێبی (الكامل فی التاریخ)ەکەی دەگاتە ئەو رادەیەی گیانی موجامەلە و هەندێك جاریش مەرایی کردن سەراپای کتێبەکەدا داگیر دەکات[٦]، چونکە بە زیادەڕۆییەوە هەڵیان دەنێت و زۆر پیایاندا هەڵدەدات[٧]. لێرەوەیە

---

[1] ئەم دەربڕینە فەیصەل سامری لێکۆڵەر بەکاری هێناوە لە کتێبەکەیدا بەناوی: ابن الأثیر، ص١٥٩.

[2] الباهر، ص٢-٣.

[3] لەبارەی پەیوەندی صەلاحەدین بە زەنگییەکانەوەبگەڕێوە بۆ: نوري: سیاسة صلاح الدین، ص١٣٩-٢٥٢. هەروەها بڕوانە: التكريتي: الايوبسون، ص٩٣-١٤١.

[4] طليمات: م. س، ص١٣٦-١٣٧.

[5] الباهر، ص١-٢.

[6] السامر: م. س، ص١٤٨.

[7] الباهر، ص٢-٣.

ڕەخنە و هێرشی ئەم مێژوونوسە بۆسەر صەلاحەدین[1]، کە دژایەتی خاوەن چاکەکانی دەکات، نەبووتە هۆی ئەوەی وەك ئیبن جەوزی پشتگوێی بخات، بەڵکو شوێنپێی هەواڵەکانی صەلاحەدین هەڵدەگرێت و نکۆڵی لە چاکە و گرنگیی ئەم سەرکردەیە ناکات، بۆیە دەبینین پاش ئەوەی صەلاحەدین دەمرێت پیایدا هەڵدەدات[2]. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم سەرکردەیە سەبارەت بەو، ئەو (ئەویتر)ە پەسەندەیە، کە دەتوانرێت تەنها لە شوێنگەی (موقعیە) ی مێژوونوسەوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، نەك لە روانگەی سەیرکردنی دەسکەوت و رەفتارەکانییەوە وەك مێژوونوسە نزیکەکان لە صەلاحەدینەوە یان ئەوانەی دواتر هاتن ئەم کارەیان دەکرد. لای (مێژوونوسی زەنگییەکان) صەلاحەدین سەرکردەیەکە سەرزەنشت دەکرێت، ئەمەش لەبەرئەوە نییە، کە سەرکردەیەکی مەزن نەبووە و لە مێژوودا بوونێکی ئیجابییانەی نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئەو مەزنییەی صەلاحەدین لەسەر حسابی ئەو دەسەڵاتە بووە، کە مێژوونوس پێوەی پابەندە و مێژوویان بۆ دەنوسێت. صەلاحەدین سەرەڕای «مەزنییەکەی»، لە گۆشەنیگای ئەم مێژوونوسەوە سەرکردەیەکە لە ناوەند دەرچووە یان - بەلایەنی کەمەوە - بە ئامادەیی ناوەندێکی باڵادەست بەسەر مێژوودا - واتە زەنگییەکان - ئەو نابێتە دەسەڵاتێکی دیکەی ناوەندیی. صەلاحەدین لەگەڵ ئەم ناوەندە لە ململانێدا بووە، بۆیە کەسێکە مایەی رەخنە لێگرتنە و تەنانەت مایەی ئەوەشە بە کەم سەیر بکرێت.

### ٣- دووبارە ناساندنەوەی کورد لە قۆناغی مەملوکیدا

دەوڵەتی مەملوکی (٦٤٨-٩٢٣ك/ ١٢٥٠-١٥١٧ز) لەسەر دار و پەردووی دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر دروست بوو، ئەوەندەی پێنەچوو ئەم دەوڵەتە تازەیە، کە خاوەنی مۆرکێکی ئیقتاعی - سەربازی بوو، بووە دوا قەڵای دەسەڵاتی ئیسلامی، ئەمەش بەهۆی هێرشی خێڵە مەغۆڵەکانەوە بوو، کە بووە هۆی روخانی زۆر لە قەوارە سیاسییە ئیسلامییەکان، لەناویشیاندا دەوڵەتی عەباسی، کە لە ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) لەسەر

---

(1) بۆ ئەم رەخنە و هێرشانە بڕوانە: الكامل، ج١١، ص ٥١٢، ٥٥٥-٥٥٦. ج١٢، ص٧٧. الباهر، ص١٦١.

(2) الكامل، ج١٢، ص٩٧.

دەستیان روخێنرا. سەرهەڵدانی دەوڵەتی مەملوکی لەم قۆناغە ناسکەدا لە میسر و چەند بەشێکی وڵاتی شام، سەبارەت بە کۆمەڵی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی و رۆشنبیری عەرەبیی بەشێوەیەکی تایبەتی، سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو. ئەم وڵاتە بووە ناوەندی سەرەکی ئەم رۆشنبیرییە و زانینی مێژوویی.

لێرەوە لێکۆڵەر پێشبینی ئەوە ناکات لە زانینی مێژوویی نوسراو بە زمانی عەرەبیدا شتی زۆری لەبارەی کوردەوە بەرچاو بکەوێت، چونکە بەشی زۆری وڵاتی کورد کەوتە ناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی مەغۆلەکانەوە[١]، کە بەشی زۆری مێژوونوسەکانیان، ئەگەر نەڵێین هەموویان، دەچنەوە سەر رۆشنبیریی فارسی و بەم زمانە مێژوو دەنوسنەوە[٢]. زانینی مێژوویی عەرەبیش لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لە سەدەی هەشتی کۆچی/ چواردەی زاینییەوە، لەڕووی چەندێتی و جۆرەوە پاشەکشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی[٣]. بێگومان ئەمەش کاری کردە سەر پێگەی کوردو ئامادەییان لەم زانینەدا.

لەگەڵ ئەمەشدا قوتابخانەی مێژوویی شوێنکەوتەی دەوڵەتی مەملوکی لە میسرو وڵاتی شام، کوردی پشتگوێ نەخست و لە مێژوودا دەری نەکردن، ئەمەش بەهۆی ئامادەیی بەهێزی کوردەوە بوو لەم وڵاتە و لای دەسەڵاتی مەملوکی، ئیتر ئەم کاریگەرییە چ بەهۆی کۆمەڵ و رەوەندە (جالية) کوردییەکانی ئەم وڵاتە و ئەو کوردانەوە بێت، کە بەهۆی شەڕی مەغۆلەکانەوە کۆچیان کردبوو بۆ ئەم وڵاتە[٤]، یان بە کاریگەریی ئەو پەیوەندییە سیاسییانە بێت، کە لەنێوان مەمالیك و ئەو میرنشین و سەرکردە

---

(1) سەبارەت بە داگیرکردنی وڵاتی کورد لەلایەن مەغۆلەکانەوە بگەڕێوە بۆ: عبدالله محمد (علي): الكرد في العهد المغولي، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٢).

(2) بۆ ئەمە بڕوانە: اشپولر (وديگران): تاريخنگاری در ايران، ص٩٥-١١٤.

(3) عماد عبد السلام (رؤوف): التاريخ والمؤرخون العراقيون في العصر العثماني، (بغداد: ١٩٨٣)، ص ١٤-١٥.

(4) بۆ ئەمە بگەڕێوە بۆ: ابن عبد الظاهر: تشريف الأيام والعصور في سيرة الملك المنصور، تحقيق: مراد كامل، (القاهرة: ١٩٦١)، ص٧٨. اليونيني: ذيل مرآة الزمان، مج٣، ص٣٠. ابو الفداء: المختصر، ج٣، ص٢٠٢. العمري: مسالك الابصار، مخطوط، ج٣، ص١٢٦. القلقشندي: صبح الأعشى، ج٤، ص٢٧٤.

خێڵەکییە کوردانەدا هەبوو، کە دوای هاتنی مەغۆڵەکان لە کوردستاندا دروست بوو بوون[1].

کاتێك مێژوونوسی ئەم قۆناغە باسی کورد دەکات، بە ئیجابی باسیان دەکات و بوونێکی کارایان پێدەدات، ئەم هەڵوێستەش رەنگدانەوەی رۆڵی کوردە لە جەنگان دژی مەغۆڵەکان، چونکە کاتێك ((موسڵمانان پارچە پارچە بوون و ئەو سیستەم و یاسا نەما، جگە لە دانیشتوانی چیاکان، کەس نەما توانای شەڕکردنی هەبێت لەگەڵ مەغۆڵەکاندا))[2]، مەبەست لە دانیشتوانی چیاکان کوردەکانن، کە مێژوونوسی قۆناغی مەملوکی باسی گشت بەشداربوونێکی ئەوانی دەکرد لە هێرشە سەربازییەکان و بەرەنگاربوونەوەی هێرشە دەرەکییەکان بە تایبەتی هێرشی مەغۆڵەکان[3]، هەروەها ئاماژە بە ئامادەییان دەکات لە رووداوە سیاسییەکاندا[4]. میرە کوردەکان لەم قۆناغەدا زۆر پیایاندا هەڵدەدرێت و بە ئازا و سوارچاك وەسف دەکرێن[5]. کورد مایەی شانازیی دەسەڵاتی مەملوکین[6]، بۆیە رێزیان دەگرێت و لەبەرچاویان دەگرێت[1].

---

(1) لەبارەی میرنشین و گەورە کوردەکان و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی مەملوکی بڕوانە: توفيق: كردستان، ص١١٩-١٨٨.

(2) العمري: مسالك الأبصار، ج٣، ص١٢٨.

(3) اليونيني: م.س، مج٢، ص٨-٩، ١٣، ٢٢٢-٢٢٣. مج٣، ص٨٩- ٩١. مج٤، ص١٢٠. الدواداري: كنز الدرر وجامع الغرر - الدرة الزكية في اخبار الدولة التركية، تحقيق: اولرخ هارمان، (القاهرة: ١٩٧١)، ج٨، ص٤٩، ١٥١، ٢١٩. ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات، تحقيق: قسطنطين زريق، (بيروت: ١٩٣٦)، ج٨، ص١٨٠.

(4) اليونيني: م. ن، مج٢، ص٤٤٣-٤٤٤. الكتبي: عيون التاريخ، تحقيق: نبيلة عبد المنعم داود، (بغداد: ١٩٩١)، حوادث ٦٨٨-٦٩٩ هـ، ص١٤٩، ١٥٣-١٥٤، ١٩٦، ٢٤٥، ٢٨٨.

(5) ابن الفوطي: مجمع الآداب في معجم الألقاب، تحقيق: محمد الكاظم، (طهران: ١٤١٦هـ. ش)، ج١، ص ١٨١، ج٢، ص٤٠٧-٤٠٨، ج ٤، ص٣٢٦-٣٢٧. اليونيني: م. ن، مج٢، ص٩، ٣٦٦-٣٦٧، ٤١٥-٤١٦، ٤٦٢. الذهبي: تاريخ الاسلام، حوادث (٦٥١-٦٦٠هـ)، ص٣٥١-٣٥٢. حوادث (٦٦١-٦٧٠)، ص ٨٩، ٢٩٢- ٢٩٣.

(6) ابن عبد الظاهر: م. س، ص٩٦، ١٠٥، ١٥٨. اليونيني: م. ن، مج٣، ص٤٩. مج٤، ص٤٩. ابن صصري: الدرة المضيئة في الدولة الظاهرية، ص٥٣.

بەم جۆرە مێژوونوسەکانی ئەم قۆناغە کوردیان لە مێژوودا هێشتەوە و دووریی وڵاتی کوردان لە ناوەندی رۆشنبیریی مێژوونوسەوە، نەبووە هۆی غایبکردنیان لە مێژوو. بەڵام ئەوەی ئێمە دەمانەوێت لێرەدا ئاماژەی پێبدەین، ئەوەیە ئەم هێشتنەوەیەی کورد لە مێژوودا، هاوکات بوو لەگەڵ پرۆسەی سەرلەنوێ ناساندنەوەی کورد. سەرەڕای ئەوەی پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد، کە زانینی مێژوویی لەم قۆناغەدا بەسەر خۆیدا داخرابوو و لە کولتوری مێژوویی پێشووتر رزگاری نەبووبوو، بەڵام ئەوەی ئەو کاتە وتومانە مانای ئەوە نییە مێژوونوسەکان هەوڵیان نەداوە سەرلەنوێ بەجۆرێك کورد کەشف بکەنەوە، کە لەگەڵ بارودۆخی تازە و سیاسیەتی مەملوکی بەرامبەریان، بگونجێت.

دووبارە کەشفکردنەوەی کورد و ناساندنەوەیان، باسی ریشەو رەچەڵەك[2] و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ خێڵەکی[3] و هەندێك رەفتاری کۆمەڵایەتیشیانی گرتەوە[4]. بە بۆچوونی من ئەم پرۆسەی دووبارە کەشفکردنەوەیەی کورد و ناساندنەوەیان پەیوەستە بە دەرکەوتنی تۆمارکراوە مەوسوعییەکانەوە، کە بە تایبەتمەندییەکی رۆشنبیری عەرەبی ئیسلامی سەردەمی مەملوکییەکان دادەنرێت، زۆر کەڵە نوسەری ئەو سەردەمە کاریان لەسەر دووبارە نوسینەوەی مێژوو دەکرد لە ((سەرەتاوە)) تا ((کۆتایی)). خەسڵەتی بەرچاوی زانینی مێژوویی بەرهەم هاتوو لەم سەردەمەدا، ئەوەیە تێڕوانینێکی سەراپاگیرانەی هەبوو بۆ مێژووی مرۆڤایەتی و بە گشتگیرانە لە کۆمەڵی ئیسلامی دەڕوانی و جیاوازییەکی بەرچاوی نەدەکرد لەنێوان رەگەزەکانیدا. ئەمەش پێویستی بە جۆرە مەوسوعییەتێك هەبوو لە هزردا، کە بووە هۆی بەناو یەکداچوون و تێکەڵبوونی زانینی

---

(1) اليونيني: م. ن، مج٣، ص٨٩-٩١. مج٤، ص١٢٠.

(2) بۆ نموونە بڕوانە: ابو الفداء: المختصر، ج١، ص٨٣. العمري: التعريف، ص٥٨. ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، ج١، ص٧٢. ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص١٨١. المقريزي: المواعظ والاعتبار، ج٢، ص٢٣٢.

(3) النويري: نهاية الأرب، السفر الثاني، ص٢٩٠. العمري: مسالك الأبصار، ج٣، ص١٢٤ بە دواوە. المقريزي: السلوك، ج١، ص١٠١.

(4) العباسي: اثار الأول في ترتيب الدول، ص١٤٧. النويري: م. ن، السفر الثاني، ص٢٩٣. الذهبي: المشتبه، ج١، ص٥٤٩.

مێژوویی و زانین و زانستەکانی تر[١]. لەوانەیە داگیرکردنی بەغداد و کورتبوونەوەی رۆشنبیری عەرەبی لە میسر و وڵاتی شامدا، ئەو هەستەیان هێنابێتە ئاراوە، کە پێویستە پەی بە هەموو زانستەکان ببرێت یان سەرجەم زانستە جیاوازەکان لە یەك کتێبدا کۆ بکرێنەوە. جگە لەمە دەوڵەتە تازەکە پێویستی بەوە بوو، بەمەبەستی بەکارهێنانی سیاسی و کارگێڕی، شارەزایی لەم زانستانەدا پەیدا بکات[٢] و ئارەزوویەکی زۆری هەبوو بۆ زانین و شارەزابوون لە رابردووی دوور و نزیکی کۆمەڵی ئیسلامی.

پرۆسەی دووبارە ناساندنەوەی کورد لەم چوارچێوەیەدا هاتووە، ئەگەرچی ئەم پرۆسەیە کردەیەکی دەسەڵاتخوازانە بووە و بۆ ئەوە بووە دەوڵەتی مەملوکی مامەڵە لەگەڵ ئەم کۆمەڵە مرۆییەدا بکات، کە «بوونێکی چالاکی» هەبوو لە هاوکێشەی سیاسیی ئەو سەردەمەدا، چونکە خۆیان و وڵاتەکەیان هێڵی جیاکەرەوە بوون لەنێوان دەسەڵاتی مەملوکی و دەسەڵاتی ئەو مەغۆلانەی لە عێراق و وڵاتی فارسدا یان رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بوون. لەو کاتەدا تێڕوانین لە کورد لەم پێگەیانەوە سەرچاوەی گرتبوو، بۆیە قسەی یەکێك لەو لێکۆڵەرانەی، لەم قۆناغەدا لە مێژووی کوردیان کۆڵیوەتەوە راست دەردەچێت، کە ئاماژەی بەوە کردووە ئەگەر سەرچاوە مێژووییەکان بکەین بە پێوانە بۆ مێژووی نوسراو، ئەوا پەیوەندی دۆستانە و گەرم و گوڕی نێوان قەوارە کوردییەکانی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی مەملوکی، لایەنێکی گرنگی ئەم مێژووە پێك دەهێنێت[٣].

بۆ ئەوەی دەست بخەینە سەر خاسیەتەکانی پەیوەندیی نێوان زانینی مێژوویی و دەسەڵاتی سیاسی لە باسکردنی کورددا، ئیبن فەزلوڵای عومەری و کتێبەکەی بە نمونە وەردەگرین. ئەم نوسەرە وەك بەشێکی ئومەتی ئیسلامی مامەڵە لەگەڵ کورد و کوردستان (بە وڵاتی چیا ناوی دەبات) دەکات و لە کتێبە مەوسوعییەکەیدا باسیان دەکات، ئەم کتێبە بەناوی (مسالك الأبصار في ممالك الأمصار)ەو وەك ئینسایکلۆپیدیایەکی

---

[1] بڕوانە: مصطفى: الملامح والميزات العامة، ص٣٢-٣٤. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی سیما گشتییەکانی زانینی مێژوویی لەم قۆناغەدا بگەڕێوە بۆ: عبده قاسم: الرؤية الحضارية، ص١١٥-٢٦٢.

[2] مصطفى: م. ن، ص٣٤-٣٦. Khalidi: Op. Cit, P.184.

[3] توفيق: كردستان، ص١٧٥.

هەمەچەشنە و تایبەتی کردووە بە مێژوو و جیۆگرافیای هەرێمە موسڵمان نشینەکان، نەك هەرێمی کافرەکان[1].

عومەری لە بەشی سێهەمی کتێبەکەیدا کوردی وەرگرتووە و پێناسەیان دەکات و وڵاتەکەیان و شوێنی نیشتەجێ بوونیان دیاری دەکات[2]، پاشان باسی خێڵەکانیان دەکات و ناوی سەرۆکەکانیان دەنوسێت، هەروەها هەوڵ دەدات بەپێی توانا باسی قەبارەی ئەم خێڵانە و توانای شەڕکردنیان بکات[3]، ئاماژەش بە هەڵوێستی سیاسیی هەندێك لەو خێڵانە دەکات بەرامبەر هەردوو هێزی رکابەر، کە مەملوکی و مەغۆلەکانن[4]و باسی شەڕکردنیان دەکات دژی مەغۆلەکان[5]. بە بۆچوونی ئێمە، هەموو ئەمە مانای ئەوەیە، ناساندنی کورد و دانی ئەم بوونە مێژووییە پێیان، مەغزایەکی سیاسیی لە پشتەوەیە و بۆ روونکردنەوەی ئەو «حەقیقەتە»یە، کە دەسەڵاتی سیاسی (مەملوکی) لە کوردی دەوێت. ئەم ناساندنە لە کۆمەڵە بڕیارێکی پێشوەختەوە سەرچاوەی گرتووە و تێڕوانینی عومەرییان لەم ئەم کۆمەڵەیە دیاری کردووە و وایان لێکردووە - زۆربەی جار - لە باسکردنیاندا جەخت لەو مەسەلانە بکاتەوە، کە جێی بایەخی ئەم دەسەڵاتەن. ئەم کتێبە کۆمەڵە راپۆرتێکی گشتگیرە و لەبارەی مەمالیکە ئیسلامییەکانەوە بۆ سەرکردە مەمالیکەکانی عومەری بەرزکراوەتەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵێك زانیاری پێکبهێنن و ببێتە بنەمایەك بۆ بڕیار و کارە سیاسییەکانی ئەم دەوڵەتە[6].

عومەری لە کتێبێکی تریدا، کە زیاتر فەرمییە، ئەم ئامانجەی روون دەکاتەوە، ئەویش کتێبی (التعریف بالمصطلح الشریف)ە. لێرەدا زۆر بەڕوونی ئەم مامەڵە سیاسییە لەگەڵ بوونی کورددا دەبینرێت، ناونیشانی کتێبەکە ئاماژە بەو یاسایانە دەکات، کە

---

[1] العمري: مسالك الأبصار في ممالك الأمصار، حققه: احمد زكي باشا، (القاهرة: ١٩٢٤)، ج١، ص٤.

[2] م. ن، الجزء الثالث المخطوط، ص١٢٤-١٢٥.

[3] م. ن، ص ١٢٥-١٣٥.

[4] م. ن، ص ١٢٧، ١٢٩، ١٣٣-١٣٤.

[5] م. ن، ص ١٢٨-١٣١.

[6] بڕوانە: Khalidi: Op. Cit, P. 219

پێویستە لە نوسراوەکانی دیوانی تایبەت بە دەرکردنی کتێب و نامەکانی سوڵتاندا رەچاو بکرێن و ئەوە روون دەکاتەوە دەبێت دەست پێکردن و کۆتاییەکانیان چۆن بێت و چۆنیەتیی دارِشتنی ئەو وتارانەش روون دەکاتەوە، کە ئاراستەی دەوروبەر دەکرێن[١]، عومەری خۆی ماوەیەك ئەم دیوانەی بەرِێوە دەبرد[٢].

عومەری لە (التعريف)دا زۆر هەواڵ لەبارەی سروشت و گرنگترین خێڵ و سەرکردە و پیاوە بەناوبانگەکانی کورد باس دەکات[٣]، هەروەها باسی ئەوە دەکات مەمالیکەکان بە چ شێوەیەك لەگەڵ ئەم میرو سەرکردانەدا بدوێن[٤]. واتە ئەوە بۆ خاوەنی (ديوان الانشا) و لە سەروو ئەویشەوە بۆ سوڵتانی مەملوکی روون دەکاتەوە لەرِووی سیاسییەوە چۆن لەگەڵ کورددا بدوێن. ئەو کورد بە دەسەڵات دەناسێنێت، بۆ ئەوەی لەرِێگەی دیاریکردنی شێوازی گوتاریی ئەم دەسەڵاتەوە کاتێك نوسراو بۆ کورد دەکات، یارمەتی دەسەڵات بدات سیاسەتێکی نمونەیی بەرامبەر کورد بگرێتە بەر.

بەم جۆرە سیماکانی ئەو وێنەیەی عومەری لەبارەی کوردەوە بۆمان دەکێشێت روون نییە و ناتوانرێت وەك وێنەیەکی راستەقینەی ئەوان لەسەردەمی عومەریدا پشتی پێ ببەسترێت. ئەو ـ کاتێك لەبارەی ئەم کۆمەڵە مرۆییەوە دەدوێت ـ تەنها ئەو مەبەستەی نییە ئەوان لە خودی خۆیان و مێژوویی بوونی خۆیاندا باس بکات، بەڵکو باسی ئەو «کوردانە» دەکات، کە مەمالیکەکان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و بوونێکی پەسەندکراویان پێدەدەن، لێرەدا کاری عومەری دیاریکردنی جۆری مامەڵەکردن و چۆنییەتیی پەیوەندی کردنە، نەك پەیوەندی پێوەکراو. گرنگیی پەیوەندی پێوەکراو «واتە کورد»و بوونەکەی، بەپێی سیاسەتی مەملوکی و هەڵوێستی بەرامبەر ئەم کۆمەڵەو میرەکانی، دیاری دەکرێت. ئەگەر ئەم دەوڵەتە هەندێك لە کۆمەڵە کوردەکانی بەدڵ نەبێت و خۆشی نەوێن،

---

(1) بۆ ئەمە بگەرِێوە: ابن خلدون: المقدمة، ص ١٩٤-١٩٨.

(2) الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٨، ص٢٥٢.

(3) العمري: التعريف، ص٥٨-٦٠.

(4) م. ن، ص ٥٢-٥٥، ٥٩-٦٠.

شێوەی قسەکردنی خودی عومەریش دەگۆڕێت و جۆرێکی تر زانیاریی و زاراوەی شەریفانە (مصطلحات شريفية) بەکار دەهێنێت بۆ لێدوان لەبارەیانەوە[١].

ئەم جۆرە مامەڵە کردنە لەگەڵ کورد لای ئەو مێژوونوس و دیوان نوسانەش مایەوە، کە دوای عومەری هاتن، ئەوانیش هەمان ڕێگەی ئەویان گرتەبەر و زۆربەی جار بۆ مەبەستی سیاسی و کارگێڕی کوردیان دەناساند، هەوڵەکانیان بۆ ناساندنی کورد و ئەو پانتاییەی تایبەتیان کردبوو بۆ بوونی کورد، نەك هەر لە هەوڵەکەی عومەری دەرنەدەچوو، بەڵکو هەموو ئەوەی ئەنجامیان دا، تەواوکردنی زانیارییەکانی ئەو بوو، یاخود گواستنەوەی ئەوە بوو ئەو باسی کردبوو[٢].

---

[1] تێبینی ئەوە بکە کە عومەری لەبارەی ئەو کوردانەوە دەیڵێت کە ڕێگری دەکەن: ((ئەمانەو نمونەی ئەمانە... هیچ ریشەو لقێکیان نییە، نەزانراوە کە ئەمانە پلەیەکی بەرچاویان هەبێت، هیچ یاسایەکیی دیاریان نییە لە ڕێورەسمی نامە نوسیندا، بۆیە نوسین بۆیان بەپێی پێویستی و ئاستی بەهێز بوونیانە. م. ن، ص٦٠.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: ابن ناظر الجيش: تثقيف التعريف، مخطوطة مصورة على المايكروفيلم، مكتبة الدراسات العليا، كلية الآداب، جامعة بغداد، ص ٣١-٣٧، ٤٣-٤٤. هەروەها بڕوانە: القلقشندي: صبح الاعشى، ج٧، ص٢٩٧-٣١٣. ج٨، ص ٢٢٦-٢٣٣.

# پاری یەکەم
# کورد وەك نەتەوەیەکی کارا لە مێژوودا

## ١ـ پێگەی کورد لە ریزبەندیی مێژوونوسەکاندا بۆ نەتەوەکان

یەکێك لەو خاسیەتانەی زانینی مێژوویی ئیسلامی پێ جیا دەکرێتەوە، باسکردنی هەموو جۆرە بابەتێکە، یەکێکیش لەو بابەتانە نوسینەوەی مێژووی جیهانییە. دەبینین خاوەنی ئەو کتێبانەی لەبارەی مێژووی گشتییەوەن، بەشی یەکەمی کتێبەکانیان تایبەت کردووە بە مێژووی نەتەوە (الأمم) کۆنەکان یان ئەوەی بە نەتەوە لەناوچووەکان ناودەبرێت و نەتەوە بیرۆکەی سەرەکی ئەم بەشانەیە. ئەم مێژووەش لە فۆرمە جیهانییەکەیدا، کە یەکێك لە لێکۆڵەرەکان بە مێژووی شارستانیی جیهانی ناوی دەبات و مێژوونوسە موسڵمانەکان بە پێشەنگی ئەم جۆرە لە نوسینەوەی مێژوو دادەنرێن[١]، بریتییە لە مێژووی ئەو نەتەوانەی مێژوونوس باوەڕی وایە، شایەنی ئەوەن لە مێژووی گشتیدا بخرێنە ریزی نەتەوە جیهانییە ـ کاراکانەوە[٢].

لەم روانگەوە ئەو مێژووەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین، سەرەڕای جیهانیبوونەکەی، چەمکێکی تریشی هەیە، ئەویش ئەوەیە مێژوویەکە دەزانێت چی دەڵێت و چی دەگێڕێتەوە. واتە مێژوونوس، چ وردەکارییەکانی بابەتە مێژووییەکە بگێڕێتەوە یان نا، بەجۆرە کارامەییەکەوە مامەڵە لەگەڵ بابەتەکەدا دەکات. بۆیە ئەم کارەی مێژوونوس لەسەر تێگەیشتنی کرۆکی مێژوو وەستاوە، ئەگەرچی ـ زۆربەی جار ـ ئەم تێگەیشتنە بێ بەشە لە توانای هەڵێنجان و شیکردنەوە، چونکە ((تێگەیشتنی مێژوو))[٣] کورت

---

[1] الخالدي: بحث في مفهوم التأريخ، ص ٢٩.

[2] بۆ نمونەی لەم جۆرە لە مێژوو دەکرێت بگەڕێینەوە بۆ بەشی یەکەم لە هەریەك لە (تأريخ اليعقوبي) و (تأريخ الطبري) و (مروج الذهب)ی مەسعودی و هەروەها بەشی یەکەمی (تأريخ ابن خلدون) و ...هتد.

[3] (التأريخ بالدراية) زاراوەیەکە لێکۆڵەر (عفت الشرقاوي) لە کاتی قسەکردن لەسەر ئەم جۆرە لە نوسینەوەی مێژوویی بەکاری دەهێنێت. بگەڕێوە بۆ . ادب التاريخ، ص ٢٧٦ بە دواوە.

دەبێتەوە بۆ باسکردنی نەتەوە کاراکان و ئەوەی لە پشت ئەم کاراییەوە لەناو هەموو نەتەوەکانی تری سەر زەویدا ((مێژوویی بوونی)) پێ بەخشیون.

لەم روانگەوە هەوڵ دەدەین لەم پارەدا لە پێگەی کورد بکۆڵینەوە بەپێی تێگەیشتنی زانینی مێژوویی و تێگەیشتنی لە چەمکی ((نەتەوە)). پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ئێمە لەبەردەم دوو چەمکی جیاوازداین بۆ کورد وەك نەتەوە: نەتەوەی کورد وەك واقیعێکی مێژوویی - کۆمەڵایەتی، لەگەڵ نەتەوەی کوردی وێناکراو لە ئەندێشەی مێژوونوسدا. ئەمەی دووەمیان لە یەکێك لە رووەکانیدا بابەتی بەشی یەکەم بوو. بەڵام لێرەدا هەوڵ دەدەین بەپێی ئەوەی لەبارەی چەمکی نەتەوە و دینامیکییەتەکە مێژووییەکەیەوە باسمان کرد، لە روویەکی تری ئەم نەتەوەیە بکۆڵینەوە.

مێژوونوسەکان و کەسانی تری سەر بە رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی لەو باوەڕەدابوون لە قۆناغی پێش هاتنی ئاینی ئیسلامدا، کارایی مێژوویی لە چەند نەتەوەیەکدا کورت بوو بوویەوە. هەندێکیان دەڵێن چوار نەتەوەی گەورە خاوەنی کارایی بوون و بریتین لە: عەرەب و فارس و هیند و رۆم[1]. هەندێکی تریش باسی حەوت یان هەشت نەتەوە دەکەن لەگەڵ هەندێك جیاوازی لەناوی ئەم نەتەوانەدا، بەڵام بەتێکڕا بریتین لە: چین، هیند، سودان، بەربەر، رۆم و یۆنانییەکان، تورك، فارس، کلدانیەکان (سریان)، میسرییەکان[2].

کارایی ئەم نەتەوە خاوەن شارستانیەتانە لەوەدایە بەشدارییان کردووە لەو کولتورە مرۆییەدا، کە لە رۆشنبیری ئیسلامیدا ناسراو و باو بووە. لەناو هەموو نەتەوەکاندا تەنها ئەمان گرنگییان بە زانین و زانستەکان داوە[3]- بە تایبەتی چواریان - داناییەکی

---

[1] بۆ نمونە بڕوانە: الجاحظ: البيان والتبين، ص ٨٧، ٢٠٠، ٤٠٤. المقدسي: البدء والتاريخ، ج١، ص٣٦-٣٧. الشهرستاني: الملل والنحل، ق١، ص٢٠.

[2] المسعودي: التنبيه والاشراف، ص . الأصفهاني: تاريخ سني ملوك الأرض، ص١٠. صاعد الأندلسي: طبقات الأمم، حققه: لويس شيخو اليسوعي، (بيروت: ١٩١٢)، ص٧-١٠. سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، السفر الأول، ص٦٣.

[3] صاعد الأندلسي: م. س، ص٧.

نەمریان هەیە[١]. هەروەها بەوە جیا دەکرێنەوە مێژوو و مامەڵەی تایبەتی خۆیان هەیە لەگەڵ زەمەندا[٢]: هەندێك مێژوونوس هەوڵی ئاشکراکردنی ئەو خاڵانەیان داوە، کە لەنێوان ئەو نەتەوانەدا هاوبەشە و بووەتە هۆی ئەو کارابیە مێژووییە، ئەوان وای بۆ دەچن ئەو نەتەوانە لەگەڵ جیاوازییان لە رەگەز و وڵات و بۆچووندا، لە نەریت و رەفتاری سروشتیدا هاوبەشن[٣] و خاوەنی سەربوردە و رێباز و ناو و ناوبانگی خۆیانن[٤]، تەنانەت دەگوترێت شتی تریش هەیە ئەمانە کۆدەکاتەوە و وایان لێ دەکات لە غەیری خۆیان بەرزتر بن، ئەویش ((باوەڕیانە بە خوا)) و ((جێ دەستی خوا))[٥].

ئەم زانیارییانەمان لەبارەی نەتەوە کاراکانەوە بۆ ئەوە هێنا تا هەندێك تیشك بخەینە سەر چەمکی ((نەتەوەی کارا)) لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوە ببینین، کە کورد لەریزی ئەم نەتەوانەدا نین، یان لەناو ئەم نەتەوە شارستانییە ـ کارایانەدا شوێنیان نییە. بۆیە دەبێت لێکۆڵەر لە چوارچێوەیەکی تردا بۆ کارایی کورد بگەڕێت وەك نەتەوەیەك، کە بەپێی لۆجیکی دوانەیی چوارچێوەیەکی جیاوازە لەوەی پێشوو. ئەو خاسیەتانەی باسکران ئەگەر خاسیەتی نەتەوە شارستانیەکان بن، ئەوا دەبێت نەتەوەکانی تر لەم خاسیەتانە بێبەش بن؛ لێرەدا جۆرە کەمکردنەوەیەك هەیە لە بەهای مرۆڤانەی ئەم نەتەوانە.

بۆ روونکردنەوەی ئەوەی وتمان، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لای مێژوونوسەکانی پێشوو تا بە گوزارشتی حەمزەی ئەصفەهانی[٦] پێگەی ئەم نەتەوانە بزانین لەلایان. لێرەدا دەبینین ئەم نەتەوانە بەرز نابنەوە بۆ ریزی نەتەوە شارستانییەکان، بۆیە مێژوونوس لە

---

(1) بڕوانە: مسکویە: الحکمة الخالدة، حققه وقدم له: عبد الرحمن بدوي، (طهران: ١٣٧٧ هـ. ش)، ص٥-٦.

(2) الأصفهاني: م. س، ص١٠. المسعودي: التنبیه، ص١٨٤-١٩٩. عماد الکاتب: الفتح القسي، ص ٤٤-٤٨.

(3) المسعودي: م. ن، ص٨٣.

(4) الجاحظ: م. س، ص٢٠٠. المقدسي: م. س، ج١، ص٣٦. هەروەها بڕوانە حاڵەتێکی تری لێك نزیکییان لای: الشهرستاني: م. س، ق١، ص٢٠.

(5) المقدسي: م. ن، ج١، ص٣٧.

(6) تاریخ سني ملوك الأرض، ص١٠.

ریزبەندییەکانی خۆیدا دەریان دەهێنێت و بەوەندە بەس دەکات بڵێت ئەمانە ((هەمەج و شێوە هەمەجییەکانن))و[1] ئەمانە ((پلەیان نزمترە لە پلەی ئەوانەی باسمان کردن))[2]، هیچ دانایی و بیرۆکەیەکی پەسەندی وا لەم نەتەوانەوە نەگوێزراوەتەوە مێژوونوس بتوانێت تۆماری بکات[3]، ئەمەش لەبەر ئەوەیە هەموویان مۆرکێکی ئاژەڵییانەیان هەیە و بەوە جیا دەکرێنەوە زۆر وشك و توندوتیژن[4]. هەموو ئەمە مانای ئەوەیە کارایی ئەم نەتەوانە کاراییەکی سەلبییە و ئاماژە بە جۆرە ژیانێك دەکات پێچەوانەی ژیانی شارستانییانەی نەتەوە گەورەکانە. لەلایەکی ترەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین هەندێك بیرمەندی وەك ئەبی حەیانی تەوحیدی (٣٨٠ك/ ٩٩٠ز) بەم جیاکارییەی نێوان ئەو نەتەوانە رازی نەبوون. تەوحیدی لەو باوەڕەدایە ئەم جیاکارییە رێژەییە و پێی وایە هەر نەتەوەیەك لایەنی چاکە و خراپەی خۆی هەیە و ئەم چاکە و خراپەیەش لەناو هەموو نەتەوەکاندا هەیە[5].

هەر چۆنێك بێت، ئێمە لەبارەی ئەم جیاکارییەی نێوان نەتەوە شارستانی و نەتەوە هەمەجی و کێوییەکانەوە، وردەکاری زۆرمان لا نییە و هەموو ئەوەی لامانە باسکردنی خەسڵەتەکانی نەتەوە شارستانییەکان و پاشان گێڕانەوەی مێژووەکەیانە. مێژوونوسەکانیش ناوی ئەوانە ناهێنن، کە پێچەوانەی ئەم نەتەوانە بوون و بەوەندە بەس دەکەن بە نەتەوە کێوییەکان یان هەمەجییەکان ناویان ببەن. ئێمە پێمان وایە ئەوە نەتەوە شارستانییەکانن، بە هۆی باڵادەستییان بەسەر زەینی رۆشنبیریی ئیسلامیدا، لە میانەی زانینی مێژووییەوە دەدوێن و بەمە لە خودی خۆیان و لەو نەتەوانەش دەڕوانن، کە لێیان جیاوازن. ئەم زانینە مێژووییە، کاتێك لەم نەتەوانە دەدوا، پشتی بەو هۆکارە زمانەوانی و بەو تۆمارکراوانە دەبەست، کە ئەو نەتەوانە لەپاش خۆیان جێیان هێشتبوون، وەك سەرچاوە یۆنانی و سریانییەکان، هەروەها پشتی بەو هەواڵانەش

---

[1] الجاحظ: البيان والتبيين، ص٨٧.

[2] المقدسي: م. ن، ج١، ص٣٦.

[3] صاعد الأندلسي: م. ن، ص٧.

[4] المقدسي: م، ن، ج١، ص٣٧.

[5] الإمتاع والمؤانسة، ج١، ص٧٣-٧٤.

دەبەست لەبارەی نەتەوە پێشینەکانەوە لەناو کتێبە پیرۆزەکاندا هەبوون، بەتایبەتی لەناو تەوراتدا[1]. ئەمە جگە لە تۆمارکراوە فارسی و هیندییەکان، یاخود کولتوری نوسراوی ئەو نەتەوانە، کە رۆشنبیریی ئیسلامی بەهۆی بەریەککەوتنی راستەوخۆی لەگەڵیاندا، کۆی کردبوویەوە. بە مەزەندەی ئێمە، هەموو ئەمە بەهۆی تێڕوانینی تەسکی مێژوونوسەکانەوەیە لە نەتەوەکان، ئەم تێڕوانینە تەسکە بواری ئەوەی نەداون هەموو نەتەوەکان ببینن، بۆیە ئەو نەتەوە نەناسراوانەی هەواڵ و تۆمارکراوەکانیان نەدەگەیشتە دەستی مێژوونوسەکان، یان تۆمارکراوێکی وایان نەبوو پشتی پێ ببەسترێت، بە هەمەجی و کێوی دادەنران. لێرەشدا کورد هیچ تۆمارکراوێکی نەبووە لە ناساندنیدا پشتی پێببەسترێت و پاشان بەهۆیەوە لەریزی نەتەوە شارستانیەکاندا دابنرێت. وادیارە لە دیدی مێژوونوساندا ئەمانە هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی، یان هیچ بەرهەمێکی رۆشنبیرییان نەبووە، کە ببێتە سەرمایەیەکی رەمزی و لەگەڵ ئەوەی ئەوانی تر هەیانە لێك بدرێت، یان تۆمار بکرێت بۆ ئەوەی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو (ئەوانیتر)ەدا خۆیانی پێوە هەڵکێشن. کورد و وڵاتەکەیان ماوەیەکی دوور و درێژ لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکان (واتە نەتەوەی فارسی شارستانی)دا بوون، بۆیە هەموو مێژوو و کاراییەکیان بەستراوە بە ساسانییەکان و کاراییەکەیانەوە، وەك لەمەو دوا روونی دەکەینەوە.

لێرەوە ئەگەر بمانەوێت لەبارەی ئەو نەتەوانەوە بدوێین، کە بە کێوی و هەمەجی وەسفکراون، دەبێت بە گریمانە وێنەیەکیان بۆ بکێشین پێچەوانەی وێنەی نەتەوە شارستانییەکان بێت. ئەگەرچی کورد، تەنها لای مەسعودی نەبێت[2]، بەڕاشکاوی لەناو ئەم نەتەوانەدا ناوی نەهاتووە، بەڵام نمونەیەکی روونی ئەو نەتەوانەیە، کە لە ریزی نەتەوە کێوییەکاندا دانراون. بۆ ئەوەی ئینتیمای کورد بۆ ئەم ریزکردنە، کە بەکەمزانینی تیایە، روون بکەینەوە، دەبێت سەرلەنوێ بە دوای بوونی کورددا بگەڕێین لە کولتوری پێش ئیسلامدا بەتایبەتی کولتوری فارسی و بەپێی ئەم ئامادەییە کاراییەکەیان روون بکەینەوە. ئەوەی لەناو تۆمارکراوەکانی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا بەدوای ئەم

---

(1) بۆ ئەمە بگەڕێوە بۆ: روزنتال: علم التاريخ، ص١١٤.

(2) مروج الذهب، مج١، ص٤٣١. التنبيه والاشراف، ص٩٥.

مەوجودەدا بگەڕێت، نائومێد دەبێت، چونکە باسی ئەم بوونە و کارایی ئەم بوونەی تیا نییە. ئەو چەند ریوایەتە کەمەی هەن، بەس نین بۆ ئەوەی وێنەیەکی روون بدەن بەم کاراییە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ریوایاتانە جەخت لەوە دەکەنەوە کارایی کورد دەچێتە ناو چوارچێوەی کارایی مێژوویی نەتەوەی فارسەوە، کە یەکێکە لە دیارترین نەتەوە شارستانییەکان[1]. ئەمەش لەگەڵ رێبازی مێژوونوسەکان لە ناساندنی نەتەوە کاراکاندا دژ نایەتەوە، چونکە هەر نەتەوەیەك لەم نەتەوانە ـ بە لایەنی کەم لە گۆشە نیگای مەسعودییەوە ـ لە زیاتر لە رەگەزێك پێکهاتووە. نەتەوەی فارسیش، ئەگەرچی یەك مەملەکەتی هەبوو، بەڵام هەریەك لە رەگەزەکانی زمانێکی تایبەت بەخۆیان هەبوو[2]، وڵاتی کوردیش لەناو چوارچێوەی مەملەکەتی فارسیدا بوو[3]و کورد بە بەشێك لە نەتەوەی فارس دادەنرا[4]. بۆیە ئاساییە کورد تەنها لە چوارچێوەی ئەم نەتەوەیەدا کارایی هەبێت. بەڵام ئایا لە چوارچێوەی کارایی ئەم نەتەوەیەدا بەشێکی چالاك پێك دەهێنن؟ یان ئایا لەناو ئەم نەتەوەیەدا کاراییەکی ئیجابییان هەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە نەرێیە، چونکە ئەوان وەك فارس نین، بەڵکو وەك پێشتر بینیمان[5]نوێنەرایەتی رووە کێوییەکەی ئەم نەتەوە ((شارستانییە)) دەکەن. ئەوان شوانکارەن و لە چیاکاندا دەژین و لە ئاوەدانی نزیك نابنەوە[6]، فارسە ((شارستانییەکان)) یاخود پایەدارەکانیان، بەکەم سەیریان دەکەن[7].

بۆیە بە رای ئێمە ئەو سیفەتەیان بەسەردا دەچەسپێت، کە مێژوونوسەکان بڕیبوویان بەسەر نەتەوە نا شارستانییەکاندا، واتە کێوی و هەمەجین. نابێت لێکۆڵەر چاوەڕێی ئەوە

---

[1] التنبيه والاشراف، ص ٨٣-٨٤.

[2] التنبيه والاشراف، ص٨٤.

[3] م. ن، ص٨٣.

[4] الطبري: تاريخ الرسل والملوك، مج١، ص٢٤٠-٢٤١. ابن الاثير: الكامل، ج١، ص٩٨. ابو الفداء: م. س، ج١، ص٨٣.

[5] بگەڕێوە بۆ بەشی یەکەم، ل

[6] ابن قتيبة: المعارف، ص٢٧٠. الثعالبي: تاريخ غرر السير، ص٢٥. المسعودي: مروج، مج١، ص٤٣٦.

[7] بۆ نمونە بڕوانە: الآبي: نثر الدرر، ج٧، ص٧٢.

بکات کارایی کورد شان بدات لە شانی کارایی نەتەوە گەورەکانی تری وەك فارس، بۆیە لە مێژووی جیهانیشدا کورد هیچ بوونێکیان نییە. ئەو ریوایەتانەی هەن بەشی ئەوە ناکەن لەرێگەیانەوە مێژوویەکی بەدوای یەکداهاتوو بۆ کورد بنوسرێتەوە، ئەوەی هەیە تایبەتە بە نەتەوە گەورەکان، بۆیە لەناو ئەو بوارە زەمەنییەدا، کە مێژوونوس تایبەتی دەکات بە زەمەن لای نەتەوەکان، کورد هیچ زەمەنێکیان نییە[1]، کەواتە ئەوان لە دەرەوەی زەمەندان، یان با بە دەربڕینێکی تر بڵێین لە دەرەوەی مێژووی جیهانیدان، ئەم مێژووە مێژووی نەتەوە گەورەکانە، بەڵام کورد و غەیری کورد مێژوویان نییە، ئەوەی لە وەرگرتنی ئەو چوار، یان حەوت، یان هەشت نەتەوەیە لای مێژوونوسەکان جێی سەرنجە، مەسەلەی ئامادەیی مێژوویی ئەوان و نائامادەیی مێژوویی غەیری ئەوانە. ئەم ئامادەییە ئامادەییەکی رۆشنبیری ـ دەسەڵاتداریی ـ کارگێڕییانەی بەناو یەکداچووە، نائامادەیش لێرەدا مانای نائامادەیی و نەبوونی ئەم رەهەندانە و بوونی چەند رەهەندێکی ترە، کە شایەنی باسکردن نین.

به بۆچوونی ئێمە، ئەم مەسەلەی ئامادەیی و نائامادەییە بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بە تێگەیشتنی زانینی مێژووییەوە لە بابەتەکە. ئەوەی کارایی نەتەوەیەك لە نەتەوەکان لە مێژوودا دیاری دەکات، بوونی جۆرێك لە بەدوای یەکدا هاتن یان زنجیرەییە لە مێژووی ئەو نەتەوەیەدا، ئەمەش لە بەدوای یەکداهاتنی پاشاکان یان دەوڵەتەکانی و تەنانەت فەیلەسوفەکانیدا (وەك لە حاڵەتی یۆنانیدا هەیە) شێوەگیر دەبێت. واتە بوونی کۆمەڵە هەواڵێکی لێکدراوە لەبارەی کارایی ئەم نەتەوە یان ئەو نەتەوەوە. ئەگەر لە ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراوی مێژووی ئەو نەتەوەیەدا هەواڵی لەم جۆرەش نەبێت، ئەوا بوونی ناوی پاشاکانی ئەو ماوەیە، بەسە بۆ ئەوەی ـ لەلایەن زانینی مێژووییەوە ـ دان بە بەردەوامییە مێژووییەکەیدا بنرێت[2]. حاڵەتی بەدوای یەکداهاتن و زنجیرەیی، نەتەوەی کارا دەکات بە یەکەیەکی مێژوویی وا، کە بتوانرێت بخرێتە پاڵ یەکە مێژووییەکانی تر، یان بەجۆرێك لەگەڵیاندا تێکەڵ بکرێت بە هەموویان لە مێژوودا کۆی

---

[1] التنبيه والاشراف، ص١٩٩ بە دواوە.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: اليعقوبي: التاريخ اليعقوبي، ج١، ص٨١. هەروەها لەبارەی ئەمە بڕوانە: العظمة: الكتابة التاريخية، ص٧٤-٧٥.

یەکەی ((ئەزموونی نەتەوە)) کاراکان پێك بهێنن . بەڵام کورد و نەتەوە کێوییەکانی تر ئەم جۆرە مێژووە زنجیرەییەیان نییە، ئەوەتە لە قۆناغی پێش هاتنی ئیسلامدا، هیچ پاشا یان دەوڵەتێکی کوردی ناسراو نییە وەك بناغەیەك بۆ نوسینەوەی ئەم جۆرە لە مێژوو پشتی پێ ببەسترێت. ئەو هەواڵانەی لەبارەی کوردەوە هەن، بە هەموویان سیستەمێکی هەواڵی پێك ناهێنن و لەنێوان بەشەکانیدا کۆمەڵە پەیوەندییەکی وا نییە ڕێگە بە بینینی بەدوای یەکدا هاتن یان زنجیرەی زەمەنی ڕووداوەکان بدات. لێرەدا چاوەڕێی ئەوە لە مێژوونوس ناکرێت قەناعەت بەم هەواڵە پچڕ پچڕانە بکات تا کورد لەناو نەتەوە کاراکاندا دابنێت. مێژوونوس ـ لە میانەی گێڕانەوەکانیەوە ـ بەوەندە بەس دەکات لە چوارچێوەی نەتەوەی هەمەکی ـ سەراپاگیردا، کارایی بەشەکی ئەم نەتەوەیە ـ واتە کورد ـ مان پێ ڕابگەیەنێت.

ئەگەر زۆربەی مێژوونوسەکان لە ریزکردنی نەتەوەکاندا، پشتیان بە زانینی نوسراو بەستبێت، یان بڕیاری پێشوەختەیان وەرگرتبێت و بڕەویان پێدابێت، ئەوا مەسعودی هەوڵی داوە تێگەیشتنی خۆی فراوان بکات، بۆیە لە ڕوانگەی زانینێکی بەرچاوەوە، کە وادیارە لە گەڕان و سوڕانەوەی بە وڵاتان و بینینی زۆر نەتەوەی گەورەو بچوکدا بەدەستی هێناوە، لە چەمکی نەتەوە و ریزکردنی نەتەوەکان دەدوێت[1]. بۆیە لە تێڕوانینی ئەودا بۆ کارایی نەتەوە مرۆییەکان، جۆرە سەراپاگیرییەك بەرچاو دەکەوێت. ئەو سەرەڕای باوەڕبوونی بە کارایی حەوت نەتەوەکە، پێیوایە ئەو کارایییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی بەسەرچوون، ئەوەتە ـ لەدوای ئەم نەتەوانە ـ زۆر وەچە و نەوەی تر دەرکەوتوون، زمانەکان جیاوازییان تێکەوتووە، نەتەوەکان جۆراوجۆر بوون و لە ڕاو بۆچوونیاندا جیاوازن[2]. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە مەسعودی باوەڕی وایە کارایی مێژوویی تەنها تایبەت نییە بە نەتەوە شارستانیەکان و ناکرێت مێژوو تەنها تایبەت بێت بە هەواڵی ئەوان، لای ئەو دروستە قسە لە کارایی نەتەوە ناشارستانییەکانیش بکرێت. ئەمەش یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مەسعودییە لە

---

(1) مروج الذهب، مج١، ص١٠.

(2) التنبیه والاشراف، ص٨٩.

مامەڵەکردن لەگەڵ چەمکی نەتەوەدا[١]. لای مەسعودی نەتەوە ناشارستانییەکان یان «کێوییەکان» عەرەب و تورك و کورد و بەربەر و ...هتد دەگرێتەوە، ئەم نەتەوانە بەوە جیا دەکرێنەوە لە دەشت و چیاکاندا دەژین و کۆچەرین[٢].

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە مەسعودی وەك نەتەوەیەك لە نەتەوە کێوییەکان باسی کورد دەکات، ئەو کاتێك کورد و خێڵە کوردەکان و ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان دەناسێنێت[٣]، لەم پێگەوەیە، کە کورد لەناو نەتەوەکاندا هەیەتی. ئەوەی مەسعودی لەبارەیانەوە دەیڵێت رەنگدانەوەی حاڵەتی کۆچەرییە ـ وەك جۆرێك لە کارایی ـ لای کورد، ئەوان چەند خێڵێکی دانیشتووی چیاکانن[٤]، بەوە جیا دەکرێنەوە زۆر توند و تیژ و وشکن[٥].

بەپێی تێگەیشتنی مەسعودی ئەم جۆرە لە ژیان، وێنەی هێڵە سەرەکییەکانی هەر کاراییەکی کورد دەکێشێت لە مێژوودا. بەڵام ئەم مێژوونوسە کاتێك لە عەرەب دەدوێت لە هەموو «نەتەوە کێوییەکان» بەتایبەتی لە کورد، بەباشتریان دەزانێت، چونکە لای ئەو عەرەب هەندێك سیفەتی جەستەیی و بنەمای رەوشتییان هەیە لە سەرجەم نەتەوەکانی تر جیایان دەکەنەوە، بۆیە ئەوان خۆیان لادەدەن لە توندی و دڵڕەقیی کورد و چیانشینەکان بەگشتی، چونکە پێکهاتەی جوگرافیی وڵاتەکەیان کاریگەرییەکی سەلبیی کردووەتە سەر رەفتار و رەوشتیان[٦] و توندوتیژی کردوون، وەك لە بەشی یەکەمدا بەدرێژی باسمان کرد. لەگەڵ ئەمەشدا بە چاکتر زانینی عەرەب لە کورد، کاری نەکردووەتە سەر پێگەی تایبەتی کورد لەو چوارچێوەیەدا، کە مەسعودی تایبەتی کردووە بە کارایی نەتەوە کێوییەکان.

---

(1) بڕوانە: ناصيف (نصار): مفهوم الأمة بين الدين والتاريخ ـ دراسة في مدلول الأمة في التراث العربي الاسلامي، ط٣، (بيروت: ١٩٨٣)، ص٦٥.

(2) مروج، مج١، ص٤٣١. التنبيه والاشراف، ص٩٥.

(3) مروج الذهب، مج١، ص٤٣٥-٤٣٦. التنبيه والاشراف، ص٩٤.

(4) مروج الذهب، مج١، ص٤٣٣.

(5) م. ن، ص.

(6) م. ن، ص.

هەموو ئەوەی لەبارەی کارایی نەتەوەکانەوە وتمان، دەچێتە ناو بواری مامەڵەکردنی مێژوونوس لەگەڵ چەمکی ((ئوممەت))دا لە مێژووی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، یان ئەوەی دەشێ بە مێژووی نا ئیسلامی ناو ببرێت، ئەگەرچی مێژوونوس لە روانگەی ئەو دید و هەڵوێستانەوە چارەسەری بابەتەکە دەکات، کە لە قۆناغی ئیسلامیدا شێوەگیر بووبوون. کاتێك دەچینە قۆناغی نوسینەوەی مێژووی ئیسلامییەوە، خۆمان لەبەردەم چەمکێکی نوێدا دەبینینەوە بۆ نەتەوە و بەشێوەیەکی جیاواز باس لە کارایی نەتەوەکان دەکرێت، چونکە بە دەرکەوتنی ئیسلام، مێژوونوس تۆمارکردنی هەواڵەکان لە هێنانی ئەو هەواڵە تایبەتییانەدا کورت دەکاتەوە، کە تایبەتن بە کایەی ئیسلامی، بەبێ هیچ ناوهێنانێکی نەتەوە شارستانییەکان. ئیتر ئامادەیی نەتەوەکان و کاراییان دەبەسترێتەوە بە رادەی بەشداریکردنیان لە ئەزموونی ئوممەتی ئیسلامیدا، وەك ئەوەی لەم روانگەیەدا مێژوو تۆمارکردنی داناییەکی مرۆیی بێت، کە بە هاتنی ئیسلام دەگاتە ئەوپەڕی کەماڵی خۆی، لای مێژوونوسەکان ئیسلام کۆتایی هاتنی کارایی نەتەوە شارستانییەکان و لوتکەی دانایی مرۆییشە[1].

بێگومان ئەم گۆڕانەی تێڕوانینی زانینی مێژوویی بۆ ئەزموونی نەتەوەکان، هاوشان بوو لەگەڵ گۆڕان لە تێڕوانینی کورددا وەك کۆمەڵەیەکی کارا لە چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامیدا، بە لەبەرچاو گرتنی سەراپاگیریی چەمکی ئوممەت لەم کایەیەدا. بەپێی وێناکردنی قورئان بۆ چەمکی ئوممەت، واتای یەکێتیی عەقیدە و رێبازی ئاینی بەسەر ئەم چەمکەدا زاڵە، پەیامە نوێکەش ئەوەی دەخواست یەك کۆمەڵ پێك بێت، کە لەسەر باوەڕبوون بە عەقیدە تازەکە و مومارەسەکردنی بڕیار و سیستەمی بەهاکانی، دامەزرابێت[2].

لەم چەمکەدا هەموو قسەکردنێك لە کارایی کورد وەك نەتەوەیەك، دەچێتە ناو چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامیی سەراپاگیرەوە. ئەگەر سیماکانی کارایی کورد لەناو نەتەوەی فارسدا سنووردار بووبێت و ـ لەکاتی باسکردنی نەتەوە شارستانیەکاندا ـ سەبارەت بە مێژوونوس جێی بایەخ نەبووبێت و بەوە جیا کرابێتەوە بە تەواوی سەلبییە،

---

[1] الخالدي: مفهوم التاريخ، ص٣٠.

[2] بڕوانە: مفهوم الأمـة، ص٢٢.

ئەوا كارابیان لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا جیاوازە لەم شێوازە نزمەی كارایی، چونكە كورد و وڵاتەكەیان، پێش هەموو شتێك، وەك مرۆڤ نوێنەرایەتی بەشێكی مرۆیی و وەك شوێنیش درێژكراوەی سەروەریی "ئوممەت ـ نەتەوە"ی ئیسلامین. بۆیە تا ئەم ئوممەتە سەراپاگیرە بوونی مابێت، كارایی كوردیش جۆرە بەردەوامییەكی هەیە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە كورد بەدرێژایی مێژووی ئەم ئوممەتە كاراییەكی ئیجابییان هەبووە، لێرەدا كارایی كورد، وەك لە بەشی پێشوودا بینیمان، كۆمەڵێك سنوربەندیی زەمانی و مەرجی تایبەتیی هەیە، كورد بەرەبەرە لە كارایەكی سەلبییەوە دەگۆڕێت بۆ كارایەكی پەسەندكراو و پاشان دەگۆڕێت بۆ كارایەكی پێویست. ئەوەی روونە ئەوەیە كورد لە چوارچێوەی ئەم ئوممەتەدا كارا بوون، بە چاوپۆشین لە جۆری ئەم كاراییە و چۆنیەتییەكەی لە گۆشەنیگای زانینی مێژووییەوە. لێرەدا واتای "كارای مێژوویی" لە چەمكی "بوونی مێژوویی" جیا دەبێتەوە، ئەگەر بوون پەیوەست بكەین بە زانینی مێژوویی و تێڕوانینە تەسك و مەرجدارەكەیەوە لە سەرجەم كۆمەڵە مرۆییەكانی كایەی ئیسلامیی ئەو كاتە، ئەوا هەموو لێكۆڵینەوەیەك لە كارایی كورد لەناو چوارچێوەی ئوممەتی ئیسلامیدا، پەیوەست دەبێت بە ئەزموونە مێژووییەكەیانەوە لەم چوارچێوە دیاریكراوەی ماهیەتی بووندا. بەڵام ئەو بوونەیان بوونە لەناو "ئوممەتی ئیسلامی"[1]ی خاوەن مەغزایەكی سەراپاگیردا، نەك لە رووی ئاكامەكانی ئەم بوونە و دەركەوتەكانی لە نوسینی مێژووییدا.

لە لایەكی ترەوە كاتێك لە جیاوازیی ئاشكرای نێوان كارایی كوردی پێش ئیسلام و كارایی قۆناغی ئیسلامیی مێژووەكەیان دەدوێین، دەبینین سیماكانی ئەزموونی مێژوویی كورد لە قۆناغی دووەمدا روونترن. لەوانەیە ئەمەش دەرئەنجامی تێكەڵبوونی راستەوخۆ و پابەندبوونی كورد بێت بەو ئوممەتە سەراپاگیرەوە، كە ئەزموونە مێژووییەكەی هەڵدەسەنگێنێت و هەروەها زانیارییەكی راستەوخۆی هەیە لەبارەی ئەو كۆمەڵانەی ئوممەتەكەیان پێكهێناوە، لەناویشیاندا كورد. بۆیە كاتێك دەبینین، بۆ نموونە مێژوونوسێك بەدوای ریشەی نەتەوە مرۆییەكاندا دەگەڕێت، كورد لەبیر ناكات و ـ وەك پێشتر باسمان

---

[1] بڕوانە: ابن حزم: الفصل في الملل والأهواء والنحل، ج١، ص١١٢.

کرد ـ ڕیشەکەیان پەیوەست دەکات بە ڕیشەی سەراپاگیری هەموو نەتەوەکانەوە[1]. چونکە هزری ئەو لە گەڕان بەدوای ئەم ڕیشانەدا، لەو چوارچێوەیەدا دێت و دەچێت، کە ئوممەتی ئیسلامیی سەراپاگیر بۆی داناوە. هەروەها کارایی مێژوویی لە قۆناغی ئیسلامیدا، زیاتر لە ڕەهەندێکی هەیە وەك ڕەهەندی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئاینی و کارگێڕی و ...هتد، بە جۆرێك لێکۆڵەر ـ دوای ئەوەی هەموو ئەم ڕەهەندانە لەگەڵ یەکدا کۆدەکاتەوە ـ ئەو وێنە گشتگیرەی کارایی کورد دەبینێت، کە هەموو جۆرە ئەزموونەکانی ئەم نەتەوەیەی لە خۆگرتووە و لەمەو دوا باس لە هەندێك سیمای ئەم ڕەهەندانە دەکەین.

## ٢) کارایی نەتەوەی کورد لە ڕوانگەی ئیبن خەلدونەوە

بۆ هەڵسەنگاندنی ((کارایی کورد)) لە قۆناغی ئیسلامیدا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ بەرهەمی هزری ـ مێژوویی یەکێك لە بەناوبانگترین ڕەمزە هزرییەکانی ئەم قۆناغە، ئەویش ئیبن خەلدونە، کە مەودایەکی گەورەی داوە بە چەمکی نەتەوە لەم بوارەدا.

ئەگەر مەسعودی لە تەقلیدی باو دەرچووبێت و چەمکی ((کارایی)) تەنها لە نەتەوە شارستانییەکاندا کورت نەکردبێتەوە و نەتەوە ناشارستانییەکانیشی ڕیزبەند کردبێت و لە مێژوودا پێگەیەکی پێدابن، ئەوا مێژووی ئیبن خەلدون ـ بەجۆرێك لە جۆرەکان ـ لەوێوە دەست پێدەکات، کە لای مەسعودی کۆتایی هاتووە. ئەو تیۆرەکانی خۆی لەبارەی مێژووەوە، لەم ڕیزبەندییە نوێیەوە، واتە لە نەتەوە کێوییەکانەوە بنیات دەنێت و بە نەتەوە کۆچەرییەکان (الامم البدوية) ناویان دەبات، بەتایبەتی ((عەرەب و تیرەکانی بەربەر و زەناتە لە ڕۆژئاوا و کورد و تورکمان و تورك لە ڕۆژهەڵات))[2]، ئەم نەتەوانە کێویترین خەڵکن ((لای خەڵکە شارستانییەکە وەك کێوییەکن، کە کەس دەسەڵاتی بەسەریدا نییە و زۆر دڕندەن))[3]. بۆ تێگەیشتن لەم دەقە خەلدونییانە و تیۆرەکانی

---

[1] بۆنمونە بڕوانە: الحميري: التيجان، ص٥١. النويري: نهاية الأرب، السفر الثاني، ص٢٨٨-٢٩٠. ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ج١، ص٩، ١٨١. القلقشندي: قلائد الجمان، ص٣١.

[2] المقدمة، ص٩٦-٩٧، ١١٥، ٢١٤.

[3] م. ن، ص٩٦.

بەشێوەیەکی کشتی و کارایی کورد لە روانگەی ئەم مێژوونوسەوە بە شێوەیەکی تایبەتی، پێویستە ئاماژە بکەین بە چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم بۆچوون و تیۆرانە و چۆنیەتی مامەڵەی ئیبن خەلدون لەگەڵ ئەو مادە مێژووییەی لەبەر دەستیایەتی. ئێمە لێرەدا لەبەردەم هزر و بیرکردنەوەیەك داین بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی پێشتر هەبووە مامەڵە لەگەڵ بابەتە گێڕراوەکەدا دەکات، بەبێ ئەوەی ئەمە لە تۆمارکردنی مێژوودا، مانای دەرچوونی ئەم بیرکردنەوەیە بێت لەو گێڕانەوە تەقلیدییە و لەو بەدیهییەتەی رووداوەکان، کە مێژوونوسەکانی پێشوو و دواییش بەرهەمیان هێناوە. بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە لە بینینی مەغزای گێڕانەوە مێژووییەکاندا لە بینینەکانی تر جیاوازە، چونکە ـ ئیبن خەلدون ـ لە (المقدمه)دا هەوڵ دەدات بە بەکارهێنانی چەند چەمکێکی وەك کۆچەری و دەمارگیری و شارستانێتی و ئاوەدانی (العمران)، لە روانگەیەکی هزری ـ کۆمەلایەتیی جیاواز لەوەی پێش خۆی، ئەزموونی مێژوویی ئیسلامی هەڵسەنگێنێت. بەپێی قسەی خۆی، بەمە توانیویەتی "زانست"ێکی نوێ بدۆزێتەوە و ناوی ناوە زانستی ئاوەدانی "علم العمران"، کە زانستێکی سەربەخۆیە و مەبەستی لەم زانستە گردبوونەوەی مرۆڤەکانە، ئەمەش پێکدێت "بە نیشتەجێبوون لە دەڤەر یان ناوچەیەکدا بۆ هاودەمی لەگەڵ عەشیرەت و دابینکردنی پێداویستییەکان و هاریکاریکردنی یەکتری بۆ بەدەستهێنانی بژێوی"[1]. ئەرکی سەرەکیی ئەم زانستە بریتییە لە گەڕان بەدوای هۆکارەکانی دروستبوون و روخانی دەوڵەت و هۆیەکانی بەدوای یەکداهاتن و پێشبڕکێ و بەربەرەکانێکردنی دەوڵەتەکان لەگەڵ یەکتردا. بەکورتی دەشێت بڵێیت دەوڵەت وەك بەرهەمێکی کارایی نەتەوەکان لە مێژوودا، ئەو مەسەلە سەرەکییەیە، کە ئیبن خەلدون پێوەی خەریك بووە و تیۆر و بیرکردنەوەکانی لە دەوری ئەم مەسەلەیە دەسوڕێنەوە. ئەویش خۆی جەخت لەم بابەتە دەکاتەوە کاتێك لە (المقدمه)دا هۆ و هۆکارەکانی گرنگیدان بە دەوڵەت و عیمران دەردەخات و بانگەشەی ئەوە دەکات بارودۆخی عیمران و شارنشینی (التمدن) باس دەکات و ئەو دیاردە خودییانەی گردبوونەوەی مرۆڤەکان دەخاتە روو، کە چێژمان پێ دەبەخشن و گوزارشت لە مەرج و "هۆیەکانی ئاوەدانکردنەوە دەکات و ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە خەڵکی دەوڵەتەکان چۆن لە دەرگای

---

[1] م. ن، ص٣٢.

بوون بە دەوڵەتیان داوە))[١]. بەم جۆرە ئیبن خەلدون وێنای عیمرانی مرۆیی دەکات لەسەر ئەو بنەمایەی دەوڵەت ئەو میحوەرە، یان بیرۆکە سەرەکییەیە، کە کاروباری گردبوونەوەی مرۆڤ بە دەوریدا دەسوڕێتەوە و پەیکەرێکە گرێچنی ژیانی کۆمەڵایەتیی لەسەر وەستاوە[٢] و کارایی نەتەوەکان لەم دامەزراوەیەدا بەرجەستە دەبێت.

بەڵام ئەو دەوڵەتەی ئیبن خەلدون مامەڵەی لەگەڵ دەکات و تێی دەڕوانێت لەسەر بنەمایەکی کۆچەری دامەزراوە، واتە ئەو دەوڵەتەی نەتەوە ناوبراوەکانی دەقی پێشوو (عەرەب، کورد، بەربەر، تورك) دایان مەزراندوون. تەنها ئەم کۆچەرییانە توانای دامەزراندنی ئەم دەوڵەتانەیان هەیە، چونکە دەمارگیری، کە دەوڵەتی گشتیی پێ دادەمەزرێت[٣]، دیاردەیەکی تایبەتە بە کۆچەر و کۆمەڵە کۆچەرییەکان، ئەم کۆمەڵە باسکراوانە بەهۆی ئەم دەمارگیرییەوە شان و شەوکەتیان زیاد دەکات و دەبنە جێی مەترسی، چونکە دەمارگیری دروشمی کۆچەرایەتییە[٤]. بە دەربڕێنێکی تر، دەوڵەت لە چوارچێوەی کۆچەرایەتیدا نەبێت، دانامەزرێت و وەك دامەزراوەیەکی بەهێزی ـ چالاك لە ژیاندا نامێنێتەوە، بۆیە پێشوەخت دەتوانین لەم پنتەوە کارایی کورد لە گۆشەنیگای ئیبن خەلدونەوە دیاری بکەین.

ئیبن خەلدون هەر بەوە ناوەستێت، کە کورد بە کۆچەر دادەنێت و کۆمەڵێك خاسیەت و مۆرکی تایبەت بە کۆمەڵگەی کۆچەرییان پێدەدات، چونکە کۆچەرایەتیی کورد و نەتەوەکانی تر، سەرەتای ئەو قۆناغەن، کە لە هزری خەلدونیدا بایەخێکی زۆری هەیە، ئەویش قۆناغی دامەزراندنی ئەو تیۆرانەیە، کە ڕەوتی مێژوویی ئەم شێوە کۆمەڵایەتییانە شرۆڤە دەکەن. بە کورتی ئەو دەیەوێت هۆیەکانی کارایی کۆچەر و دینامیکییەتیان لەناو کایەی ئیسلامیدا دەربخات. بەڵام ئایا ئیبن خەلدون باسی کارایی کوردی کردووە لە خۆیدا؟ یان با بەدەربڕینێکی تر بڵێین، ئایا کورد لە هزری ئیبن

---

(1) م. ن، ص٤.

(2) بڕوانە: العظمة: ابن خلدون وتاريخيته، ت: عبدالكريم ناصيف، ط١، (بيروت: ١٩٨١)، ص٤٩.
الجابري: فكر ابن خلدون ـ العصبية والدولة، (بغداد: د. ت)، ص١٧٤.

(3) المقدمة، ص١٢١.

(4) م. ن، ص١٠١، ٢٣٠.

خەلدوندا مەرکەزییەتیان هەیە؟ لە راستیدا پڕۆژەکەی ئەم بیرمەندە و لێکۆڵینەوەکانی لە مێژوو، تایبەتن بە رۆژئاوای ئیسلامی و بارودۆخی نەوە و نەتەوەکانی عەرەب و بەربەر و رای دەگەیەنێت خۆی لە قەرەی هەواڵەکانی رۆژهەلاتی ئیسلامی نادات، چونکە ئاگای لە بارودۆخی ئەم بەشە نییە[1]. ئەو لەبەر ئەوەی راستەوخۆ تێکەڵ بە عەرەب و بەربەر بووە و لەگەڵیاندا ژیاوە، شارەزاییەکی تەواوی لەبارەیانەوە هەیە. بەڵام شارەزاییەکی ئەوتۆی لە بارەی نەتەوە «رۆژهەلاتییەکان»ەوە نییە، چونکە بۆی نەگونجاوە لێیان شارەزا ببێت و تەنها لەڕێگەی گێڕانەوەی کەسانی ترەوە کەمێك شارەزایان بووە، بۆیە ئەمیش وەك ئەوانی تر لەو حوکمەی ئیبن ئەثیر دەرناچێت، کە بەهۆی کەمتەرخەمی مێژوونوسانی تۆمارکەری هەواڵەکانی کایەی ئیسلامی، داویەتی بەسەریاندا و پێی وایە رۆژهەلاتییەکانیان « کەم باسی رۆژئاواییەکان دەکەن و رۆژئاواییەکانیشیان بارودۆخی رۆژهەلاتیان پشتگوێ خستووە»[2].

لەگەڵ ئەمەشدا ئیبن خەلدون هەواڵەکانی رۆژهەلاتی ولاتی ئیسلامی و نەتەوەکانی پشتگوێ نەخستووە و سەرەڕای ئەوەی لە کاتی نوسینی (المقدمه)دا[3] راستەوخۆ تەنها عەرەب و بەربەری ناسیوە، بەڵام گرنگیی بە میللەت و نەتەوە رۆژهەلاتییەکانی وەك کورد و تورك و..هتد داوە و لەڕێگەی گێڕانەوە و ریوایەتە مێژوویییەکانەوە ئاگای لێیان بووە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو دوای ئەوەی عەرەب و بەربەر لە سەنتەردا دادەنێت، ئەوە رادەگەیەنێت کاتێك خۆی لە مێژووی نەتەوەکانی تر دەدات، لەپێناو خودی نەتەوەکاندا نییە و بەهەمان وردەکاریشەوە نییە، بەڵکو لەسەر ئەو بنەمایەیە لەڕووی زەمەنییەوە هاوچاخی مێژووی ئەم دوو رەگەزەن[4]. واتە لە مەرکەزییەتی نەتەوە رۆژئاواییەکانەوە (مەبەست رۆژئاوای خاکی ئیسلامە ـ و ـ) مێژووی نەتەوەکانی تر، بەتایبەتی نەتەوە

---

[1] المقدمة، ص٢٦.

[2] الكامل، ج١، ص٥.

[3] ئیبن خەلدون لە قەلای ئەبی سەلامە لە مەغریب، کتێبی (المقدمه)ی نوسیوە، واتە پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ میسرو ولاتی شام لە رۆژهەلات.

[4] المقدمة: ص٥. هەروەها ئەمە لە ناونیشانی کتێبەکەشدا «العبر وديوان المبتدأ والخبر في ايام العرب والعجم والبربر ومن عاصرهم من ذوي السلطان الاكبر»یشدا روون دەبێتەوە.

ڕۆژهەڵاتییەکان، دەگێڕێتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی زوڵم لە ئیبن خەلدون نەکەین، دەبێت ئەوە بڵێین، کە پەراوێزخستنی مێژووی نەتەوە ڕۆژهەڵاتییەکان لە چاو مێژووی ناوەندا، مانای کەمکردنەوە نییە لە کارایی مێژوویی ئەم نەتەوانە یان بڕیاردان بەسەریاندا لە تێڕوانینێکی ناوەندییەوە. ئەو عەرەب و بەربەر و کورد و تورك لە یەك ڕیزدا دادەنێت و بە جۆرە گشتیگیرییەکەوە مامەڵە لەگەڵ کاراییەکەیاندا دەکات. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە، پەراوێزی مێژوویی لێرەدا، وەك عەظمەی لێکۆڵەر ئاماژەی پێدەکات، تەنها چەند گۆشەیەکی زەمەنین، کە مێژووی ئەم نەتەوانە جێگەیەکی تێدا دەگرن[١].

واتە کاتێك ئیبن خەلدون کوردو تورك و تورکمان دەخاتە ڕیزی عەرەب و بەربەر، بەمە گوزارشت لە قەناعەتی خۆی دەکات بە بوونی چەند خاسیەتێکی سەرەکیی هاوبەش لەنێوان نەتەوە جیاوازەکاندا، ئەو لە تیۆریزەکردنەکانیدا پشت دەبەستێت بە تێبینی کردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو نەتەوانەی تێکەڵیان بووە و لە نزیکەوە لێیان ورد بووەتەوە و لە مێژووی ئەم میللەتانەدا بەدواداچوونی کردووە بۆ ئەم دیاردانە و هاوشێوەکانیان لە مێژووی ئەو میللەتانەی تر، کە هیچ ئەزموونێکی لەگەڵیاندا نەبووە و تێکەڵیان نەبووە، پاشان هەوڵی داوە هاوتاییەك لەنێوان هەموو ئەو دیاردانەدا بکات[٢].

ئیبن خەلدون کورد وەك نەتەوەیەکی تایبەت وەردەگرێت، کە ڕەچەڵەکی خۆی هەیە[٣]، ئەگەرچی لەم ڕەچەڵەکە و ئەو نیشتمانەی خێڵەکانی لەسەری دەژین، لەگەڵ نەتەوەکانی تردا هاوبەشە[٤]. بەڵام کاتێك ئیبن خەلدون کورد لەڕیزی ئەوانەدا دادەنێت، کە بە «نەتەوە کۆچەرییەکان» ناویان دەبات، ئەم تایبەتمەندییەی کورد لەخۆیدا خاوەنی کارایی نییە، بۆیە ئەگەر بمانەوێت لە ڕوانگەی ئیبن خەلدونەوە لە کارایی کورد بدوێین، پێویستە لەم هەمەکییەتە گشتییەوە ـ واتە نەتەوە کۆچەرییەکانەوە ـ دەست پێبکەین تا

---

(1) ابن خلدون وتأريخيته، ص٥٦.

(2) بڕوانە: علي عبدالواحد (وافي): عبقريات ابن خلدون، (القاهرة: ١٩٧٣)، ص٢٠٣. اومليل: مصادر التنظير عند ابن خلدون، ص٦٥.

(3) تاريخ ابن خلدون، ج١، ص١٨١.

(4) المقدمة، ص٥٠.

بتوانین بەمە کارایی کورد لە چوارچێوەی راستی خۆیدا بخوێنینەوە. لە هەمان کاتدا دەبێت لە کایەی ئیسلامیدا، وەك ئەوەی ئیبن خەلدون بینیویەتی و تۆماری کردووە، لە ئەزموونی مێژوویی کورد بڕوانین.

سەرەتا با بپرسین: ئەو سەرچاوانە چین، کە ئیبن خەلدون لە رێگەیانەوە کورد لەناو نەتەوە کۆچەرییەکاندا دادەنێت و تێکەڵیان دەکات بەپڕۆژە کەورەکەی خۆی لەبارەی ئەم جۆرە لە گردبووەنەوەی مرۆڤەکان و توانای تێپەڕاندن یان تێپەڕبوون بەو خولە شارستانییەدا؟ لەوانەیە ئەم بیرمەندە لە دوو رێگەی سەرەکییەوە کوردی ناسیبێت و مامەڵەی لەگەڵدا کردبن: ریگەی یەکەم ـ کە لێی دڵنیا نین ـ رێگەی راستەوخۆیە، واتە لەناویاندا ژیاوە و تیکەڵیان بووە. لەڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکی تەواومان نییە ئەم تێکەڵییەی ئیبن خەلدون لەگەڵ کورد، وەك ئەوەی لەگەڵ عەرەب و بەربەردا هەیبووە، بسەلمێنێت. بەڵام ئەوە بەدوور نازانین چاوی بە هەندێك کورد کەوتبێت، بە تایبەتی ئەوانەی بەهۆی هێرشی مەغۆلەکانەوە کۆچیان کردبوو ـ یان ناچار کرابوون کۆچ بکەن ـ بۆ وڵاتی شام و میسر و وەك ئیبن خەلدون باسی دەکات، هەندێکیان گەیشتبوونە مەغریب[1]. هەروەها ئیبن خەلدون لە ساڵی (٧٨٤ك-١٣٨٢ز) کۆچی کردووە بۆ میسر و قاهیرە بەوە ناودەبات، کە ((باخچەی جیهان و شوێنی کۆبوونەوەی نەتەوەکانە))[2]، وەك پێشتریش باسمان کرد، لە سەردەمی مەملوکیدا رەوەند (جالیە)ێکی گەورەی کورد لە میسر دەژیان و لەوێ ئیبن خەلدون چاوی بە هەندێکیان کەوتووە. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین بڵێین ئیبن خەلدون لەنزیکەوە لەگەڵ کورد ژیاوە، بۆیە پێویستە بە دوای سەرچاوە کتێبییەکاندا ـ رێگەی دووەم ـ بگەڕێین، واتە ئەو سەرچاوانەی مێژوونوس پشتی پێ بەستوون و لەڕێگەیانەوە رابردووی کوردی زانیوە و لە دارشتنی تیۆرە گشتییەکانی لەبارەی نەتەوە کۆچەرییەکان و کارایییانەوە، سودی لەم زانیارییانە بینیووە.

لەراستیدا دەبوایە، کاتێك لە بەشی یەکەمدا لەوە دواین ئیبن خەلدون کوردی لە ریزی نەتەوە کۆچەرییەکاندا داناوە و سروشتی کۆمەڵایەتییانی دیاری کردووە،

---

[1] تاریخ ابن خلدون، ج٦، ص٤٩٣. ج٧، ص١٤٢-١٤٣، ٢٧٥.

[2] لەبارەی چونی ئیبن خەلدون بۆ میسر بڕوانە ئەوەی خۆی نوسیویەتی لە: التعریف بابن خلدون، ص٢٦٤-٢٨٠.

ئاماژەمان بە سەرچاوەکانی تیۆریزەکردن بکردایە لای ئەم بیرمەندە. بەڵام ئەمەمان دواخست بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی سیاقی گشتیی باسکردنی کارایی نەتەوەی کورد بە تەواوی ببینین.

مەسعودی لە ریزی پێشەوەی ئەو مێژوونوسانەدایە، کە ئیبن خەلدون لە ریزکردنی نەتەوە کۆچەرییەکاندا، پشتی پێبەستوون و بە ((پێشەوای مێژوونوسان)) ناوی دەبات[1]، ئەگەرچی دوای ئەمە رەخنەی لێدەگرێت[2] و لەناو ئەو مێژوونوسانەدا دایدەنێت، کە تووشی هەڵە و لادان بوون بەهۆی رەچاونەکردنی ((بنەماکانی نەریت و یاساکانی سیاسەت و سروشتی عیمران و بارودۆخی کۆمەڵگەی مرۆییەوە)). لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ریزبەندییەی نەتەوە کۆچەرییەکان، کە مەسعودی پێشکەشی دەکات، ئیبن خەلدون وەری دەگرێت و دای دەرێژێت و و مامەڵەی لەگەڵ دەکات، بۆیە شێوە لێکچونێك لەنێوان هەردوو ریزبەندییەکەدا هەیە[3]، ناتوانین بڵێین دانانی کورد بە کۆچەر و دامەزراندنی تیۆر لەسەر ئەمە لەلایەن ئیبن خەلدونەوە، گوزارشتکردنە لە پابەندیی ئیبن خەلدون بەو چوارچێوە هزرییەی مەسعودی تیایدا بیری کردووەتەوە و ریزبەندیی نەتەوەکانی داناوە. گومان نەکردنی ئیبن خەلدون لەم ریزبەندییە، وەك ئەوەی کورد و هی تری تیا دەردەهێنێت، بەرێگەیەکی ناڕاستەوخۆ پاساوەکەی ئەوەیە دان بەوەدا دەنێت، کە وەك مەسعودی ئاگای لە مێژووی رۆژهەڵاتی ئیسلامی نییە[4]. وەك پێشتر باسمان کرد، بەراورد بە مێژوونوسەکانی تر، مەسعودی بە وردی و تێرو تەسەلی باسی کوردی کردووە، بێگومان ئەوەی ئەو لەبارەی سروشتی کورد و خێڵەکانی و شوێنی

---

(1) المقدمة، ص٢٥.

(2) مەسعودی ـ لە ریزبەندییەکەیدا ـ دەڵێت: ((من حل کۆچەرەکان لە عەرەب و نەتەوە کێوییەکانی تری وەك تورك و کوردو بجە (لە بەربەرن) و بەربەر. مروج الذهب، مج١، ص٤٣١. بەڵام ئیبن خەلدون دەڵێت: ((نەتەوە کێوییەکانی وەك عەرەب و تورك و تورکمان و کوردو هاوشێوەکانیان...)). المقدمة، ص٢١٤. لە دەقی تردا بەرەبەرو خێڵەکانیان زیاد دەکات، بۆنمونە بڕوانە: ص٩٦-٩٧.

(3) المقدمة، ص٢٦.

(4) المقدمة، ص٢٦.

نیشتەجێبوونیانەوە نوسیویەتی، بەجۆرێك لە جۆرەکان رۆڵی هەبووە لە پێکهێنانی بۆچوونی ئیبن خەلدون لەبارەی ئەم نەتەوە کۆچەرەوە.

هەروەها ئیبن خەلدون پشتی بە مێژوونوسی گەورە ئیبن ئەثیر بەستووە، بەتایبەتی کتێبی (الکامل فی التأریخ)ەکەی، چونکە ئەم کتێبە لەو سەرچاوانەیە، کە ئیبن خەلدون لە کاتی نوسینی مێژووی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، زۆر گەڕاوەتەوە سەری. تەنانەت لەو کاتانەشدا، کە ناوی ئەم کتێبە نابات، شێوازی گێڕانەوەی کتێبی (العبر) وەك شێوازی گێڕانەوەی کتێبی (الکامل) وایە و شتەکان وەك خۆیان وەردەگرێت، وەك لە وەرگرتنی هەواڵەکانی کورددا بەڕوونی ئەمە بەرچاو دەکەوێت. هەروەها ئیبن خەلدون لە کتێبی (مسالك الابصار)ی فەزلولای عومەری شتی وەرگرتووە[1]، پێشتریش ئاماژەمان بە گرنگیی ئەم کتێبە کرد لە ناساندنی کورد و سروشتی خێڵایەتییان و ناوچەکانی نێشتەجێبوونیاندا. لەوانەیە ئەوەی ئەم مێژوونوسە لەبارەی کوردەوە وتوویەتی، پاڵپشتێك بوبێت بۆ ئەو هەڵوێستەی ئیبن خەلدون، کە کوردی لەریزی نەتەوە کۆچەرەکاندا داناوە و ـ بەپێی ئەمە ـ دینامیکییەتی مێژووییانی روون کردووەتەوە.

پێش ئەوەی کۆتایی بە قسەکردن بێنین لە مەڕ سەرچاوەی تیۆرەکانی ئیبن خەلدون لەبارەی کوردەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین مێژوونوسانی هاوچاخی ئیبن خەلدون، یان ئەوانەی لەدوای خۆی هاتوون، رەخنەیان لێگرتووە و بەوە تۆمەتباریان کردووە لەبارەی مێژووی رۆژهەڵاتەوە زانیاریی کەم بووە و لە کاتی گواستنەوەی هەواڵی نەتەوە رۆژهەڵاتییەکاندا کەوتووەتە هەڵەوە[2]. لەگەڵ ئەمەشدا ئیبن خەلدون ـ بەپشت بەستن بەو سەرچاوانەی دەستی کەوتوون ـ وێنەیەکی ئەم نەتەوانەی لا دروست بووە و ئەمەش یارمەتیی ئەوەی داوە تیۆریزەیان بکات، هەوڵیشی داوە تیۆرەکانی بگشتێنێت، بۆ ئەوەی هەموو نەتەوە کاراکانی کایەی ئیسلامی لەخۆ بگرێت، ئەم تیۆرانە دەماخەنە بەردەم مێژوویەك، کە ئیبن خەلدون زانیویەتی و دواتر نوسیوویەتەوە[3]. ئێمە ـ سەرەڕای

---

(1) او ملیل: م. س، ص٧٠.

(2) لەبارەی هەندێك لەم رەخنانەوە بڕوانە: عبدالرحمن (بدوي): مؤلفات ابن خلدون، تونس: ١٩٧٩)، ص٢٨٦-٢٨٨.

(3) بڕوانە: او ملیل: م. س، ص٦٢.

ئەوەی لەسەرەوە لەبارەی سەرچاوەی تیۆردانانەکانی ئیبن خەلدونەوە وتمان ـ هاوڕای یەکێك لە لێکۆڵەرەکانین، کە پێی وایە قورسە ڕەهەندی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان لایەنی تیۆری بۆ مێژوو "واتە (المقدمە)"و گێڕانەوەکانی ئەم مێژووە "واتە (العبر)"بدۆزینەوە[1]. بەڵام ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبین، ئێمە باوەڕمان بە کارایی ئەم پەیوەندییە هەیە، بەتایبەتی، کە زانیمان بابەتی سەرەکیی هەردوولا "دەوڵەت"ە. لە (العبر)دا مێژوو لەوە دەرناچێت، کە مێژووی بەدوای یەکداهاتنی دەوڵەتەکانە، ئەم مێژووەش دەبێتە تەواوکەری ئەو بیرۆکە سەرەکییەکەی ئیبن خەلدون لە "المقدمە"دا خستوویەتییە ڕوو. بۆیە، ئەگەر بمانەوێت پەی بە پێگەی کورد ببەین لە هزری خەلدوونیدا، پێویستە بەدوای نمونەی "دەوڵەتە کوردییەکان"دا بگەڕێین، کە ئەم بیرمەندە لە کتێبی (العبر)دا مێژوویی بوونیان دەخاتەڕوو.

کاتێك ئیبن خەلدون مامەڵە لەگەڵ کورددا دەکات لە مێژوویی بوونیاندا، ئەوا دوو نمونەی سەرەکیی بوونی دەسەڵاتدارانەی کوردی لەبەر دەمدایە: نمونەی میرنشینە کوردییەکان، نمونەی صەلاحەدینی ئەیوبی و دەوڵەتی ئەیوبی. بەڵام ئەو کاتەی دەوڵەتی ئەیوبی ـ ئەگەر بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش بێت ـ لە چوارچێوە کوردییەکەی دەردەچێت، مێژوونوس ئەم نمونەی دووەمە یەکلایی دەکاتەوە و تێڕوانینمان تەسك دەکاتەوە، چونکە بەلای ئەوەوە ئەیوبییەکان نوێنەری قۆناغێکی تەواو (خالص) کوردیی نین، دەمارگیرییە کوردییەکەشیان بەس نەبوو بۆ ئەوەی ئەو ڕۆڵەیان بداتێ، کە لە کایەی ئیسلامیدا هەیانبوو[2]. ئەم ڕۆڵە زۆر لەوە فراوانترە "کوردیەتی"ی ئەوان بتوانێت لەخۆی بگرێت، چونکە ـ لە کۆتایدا ـ ئەم دەوڵەتە درێژکراوەیەکی سروشتیی دەوڵەتی تورکییە، ئەوان شوێنکەوتەی زەنگییەکانن و خولی مێژوویی تایبەت بەوان تەواو دەکەن[3]. لەبەر ئەمە ئەگەر بمانەوێت لە چوارچێوەی تیۆرەکانی ئیبن خەلدوندا کارایی کورد بزانین، دەبێت پشت بە نمونەی یەکەم ببەستین، واتە پشت بە نمونەی میرنشینە کوردییەکان ببەستین.

---

[1] العظمة: ابن خلدون وتأريخيته، ص١٤.

[2] التعريف بإبن خلدون، ص٣٤٧.

[3] بڕوانە: تأريخ ابن خلدون، ج٥، ص٣٢٦. هەروەها بڕوانە: العظمة: ابن خلدون، ص٤١.

بەراورد بە مێژوونوسەکانی تر، ئیبن خەلدون بە جۆرە تایبەتمەندییەکەوە مێژووی هەندێك لە میرنشینە کوردییەکان تۆمار دەکات، بەتایبەتی مێژووی میرنشینی حەسنەوەیهی - عەنازی [1] و میرنشینی دۆستەکی - مەروانی [2]. ئەو مێژووی ئەم میرنشینانە لەو ماوە زەمەنییە دەردەهێنێت، کە لەلایەن مێژوونوسانەوە پەیڕەو دەکرا و بەمە بڕیاری یەکێتیی زەمەنی مێژوویی ئەم میرنشینانە دەدات و دەیەوێت بوونی ئەم قەوارانە لە بەدوای یەکدا هاتنی زەمەنیی ئەو ڕووداوانەدا لێك بداتەوە، کە پەیوەستن بەم بوونەیانەوە، ئیتر میرنشینەکان لەو ماوە زەمەنییە زنجیرەییەدا کارایییەکی تایبەتیان هەیە.

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە، ئەم مامەڵە خەلدونییە تایبەتە لەگەڵ میرنشینە کوردییەکاندا، لەو ((مەرکەزیەت))ەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئەم بیرمەندە لە هزری خۆیدا دەیدات بە قەوارەی سیاسی یان دەوڵەت، بەلای ئیبن خەلدونەوە، مادەم ئەم میرنشینانە هەریەکەیان دەوڵەتێکی تایبەتن، لەسەر مێژوونوس پێویستە لە مەرکەزیەتی ئەم بیرۆکەیەوە مێژووەکەیان تۆمار بکات و ئەمەش پابەندبوونیەتی بەو پەیوەندییەی لەنێوان تیۆریزەکردنەکانی و ئەو مێژووەدا هەیە، کە دەینوسێتەوە و تۆماری دەکات. بەدوای یەکدا هاتنی میرەکان لەم ماوە زەمەنییە کوردییەدا، بەهای خۆی دەدات بەم مێژووە، بەپێی ئەم گۆشە نیگایە، دەکرێ ئەم مێژووە ببێتە نمونەیەك بۆ مێژووی ئەو دەوڵەتانەی، کە ((نەتەوە کۆچەرییەکان)) لە کایەی ئیسلامیدا دایان مەزراندوون. واتە ئەگەر لە ((مەرکەزیەتی کورد))ەوە وەك یەکێك لەو میللەتە کۆچەرییانەی تیۆرەکانی ئیبن خەلدونیان بەسەردا پراکتیزە دەبێت، سەیری تیۆرەکانی

---

[1] تاریخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٨٧-٦٩٩. سەرەڕای جیاوازی ئەم دوو میرنشینە، واتە میرنشینی حەسنەوەیهی و عەنازی، بەڵام ئیبن خەلدون مێژوویی بوونەکەیان تێکەڵ دەکات و وەك یەك قەوارە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات. لەوانەیە هۆی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دووەمیان - واتە میرنشینی عەنازی - لەسەر داروپەردووی یەکەمیان دامەزراوەو فەرمانڕەوایی هەمان ئەو ناوچانەی کردووە، کە میرنشینی حەسنەوەیهی فەرمانڕەوایی دەکردن.

[2] م. ن، ج٤، ص٤١٠-٤١٨.

ئیبن خەلدونمان کرد، ئەوا هەواڵەکانی ئەم میرنشینانە، بونیادی مێژوویی تیۆرەکانی ئەو لەبارەی دەوڵەتەوە دەنوێنن.

بەڵام ئایا ئەم میرنشینە کوردییانە هەریەکەیان دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووە و هاوشێوەی دەوڵەتی عەبباسیی هاوچاخی خۆیان بوون؟ لە کاتی باسکردنی بوونی ئەم میرنشینانە لە مێژوودا، ئەوەمان بینی بوونێکی ـ تا رادەیەك ـ شوێنکەوتەی دەوڵەتی عەباسییان هەبوو، مێژوونوسەکانیش ئەم پەیوەندییەی نێوان دەوڵەتی عەبباسیی سەراپاگیر و میرنشینە کوردییە مەرجدارەکانیان بەرجەستە کردبوو، یان هەوڵی بەرجەستەکردنیان دەدا. ئیبن خەلدونیش بە میتۆدە تایبەتییەکەی خۆی چارەسەری ئەم ئیشکالیەتە دەکات، لای ئەو دوو جۆر دەوڵەت هەن: دەوڵەتی گشتی و دەوڵەتی تایبەتی. دەوڵەتی گشتی ئەوەیە هەڵسوڕێنەرەکانی ملکەچی هیچ دەسەڵاتێکی دەرەکی نین و هەژموونی کردووەتە سەر هەموو ئەو ناوچە و هەرێمانەی دەسەڵاتی کارەکی و رەمزیی ئەم دەمارگیرە فەرمانڕەوایە دەیانگرێتەوە، واتە ئەم دەوڵەتە دەسەڵاتێکی تەواوی هەیە و فەرمانڕەواکەی ((خەڵکی دەکاتە بەندە و پارەیان لێ کۆدەکاتەوە و نوێنەر رەوانە دەکات و سنورەکان دەپارێزێت و هیچ کەسێك دەسەڵاتی بەسەریدا نییە))[1]. بەڵام مەبەستی لە دەوڵەتی تایبەت، فەرمانڕەوایی دەمارگیرییەکی تایبەتە لە هەرێمێکی دیاریکراودا، ئەمەش ویلایەت یان هەرێمێکی سەربەخۆیەو والییەکەی لە دەرەوەی دەسەڵاتی مەرکەزیدایە و فەرمانڕەواییەکەی ناتەواوە[2].

بەم جۆرە دەوڵەتی عەبباسی، ئەگەرچی لاواز بوو بوو و شایەنی ئەوە بوو فەرمانڕەواییەکەی بە ناتەواو دابنرێت، بەڵام سەبارەت بەو میرنشین و دەوڵەتۆکانەی لێی جیا بوونەوە،((دەوڵەتی گشتی))ی دەنواند، چونکە ئەو میرنشین و دەوڵەتۆکانە، لەناویشیاندا میرنشینە کوردییەکانی بەناو شوێنکەوتەی خەلافەتی عەبباسی، فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی سنورداریان دەکرد و لەسەر دەمارگیرییەکی دیاریکراو دامەزرابوون. بۆیە بەلای ئیبن خەلدونەوە، وا باشترە کارایی ئەم میرنشینانە لە چوارچێوەی دەوڵەتی تایبەتدا ریزبەند بکرێن. لە راستیدا ئەم بیرمەندە لەکاتی

---

[1] المقدمة، ص١٤٦.

[2] المقدمة، ص١٤٦.

باسکردنی ((دەوڵەتی بەنی حەسنەوەیە))دا ئەمەی وتووە، ئەوەتە لە سەرەتای لێدوانی لەبارەی ئەم بنەماڵەیەوە دەڵێت: ((هەواڵ لەبارەی دەوڵەتی بەنی حەسنەوەیهی کوردییەوەیە، کە بەخواستی عەبباسییەکان دامەزراوە))[1]. ئەم وتەیەی ئیبن خەلدون دەلالەت لەوە دەکات ئەو ماوە زەمەنییەی ئێمە بە سەردەمی ((کوردی)) ناوی دەبەین، لای ئەم بیرمەندە شوێنەکەوتەی مێژووی عەرەبە عەبباسییەکانە، واتە شوێنکەوتەی ئەو مێژووە هەمەکییەیە، کە دەوڵەتی عەبباسی دەینوێنێت، بەو پێیەی دەوڵەتێکی گشتییە و چەند دەوڵەتێکی تایبەتی وەك ئەم دەوڵەتە کوردییە و هیتری لێ بووەتەوە. بۆیە لێرەدا ئەم مێژوونوسە ـ بیرمەندە مێژووی ئەم دەوڵەتە تایبەتە لەو چوارچێوەیەدا دەهێڵێتەوە، کە خۆی بۆی دیاری دەکات. بەڵام ئەمە بە تەواوی مانای شوێنکەوتەیی هەواڵ و مێژووی دەوڵەتی تایبەت نییە بۆ هەواڵ و مێژووی دەوڵەتی گشتی. ئەو بڕیارەی مێژوونوس، کە پێگەیەکی تایبەت دەدات بەم دەوڵەتە کوردییە، لەوێوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئەم دەوڵەتە بە یەکەیەکی مێژوویی سەربەخۆ دادەنێت و بەپێی لۆجیکی ئەو هاوچاخییەی پێشتر ئاماژەی پێکرا، کارایییەکەی تێکەڵ بە کارایی دەوڵەتی گشتی دەبێت. بە بۆچوونی ئێمە، ئەم هاوچاخییە واتای دابڕانێکی تەواو نییە لەنێوان دوو یەکەی مێژوویی گشتی و تایبەتیدا. دەقە خەلدونییەکەی پێشوو ئاماژە بەوە دەکات هەموو کارایییەکی دەوڵەتی تایبەتی ((حەسنەوەیهی)) تەواوکەری کارایی دەوڵەتی گشتیی عەبباسییە و جیاوازیی سەرەکیی نێوانیان لەم تایبەتێتی و گشتێتییەدایە.

بەڵام بوونی میرنشینی حەسنەوەیهی، لە پێکەوە ژیان لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسیدا کورت نابێتەوە و پەیوەندییەکە لەوەدا ناوەستێت لەلایەن ئەم دەوڵەتە گشتییەوە دانی پیابنرێت و ئەمیش ملکەچی ببێت[2]. بە بۆچوونی ئێمە ناکرێت ئەم مەسەلانە پێگەی دەوڵەتی تایبەت لە چوارچێوەی کارایی دەوڵەتی گشتیدا دیاری بکەن، پەیوەندیی نێوان ئەم دوو لایەنە پەیوەندییەکی دیالێکتیکییە و لەسەر ئەوە دامەزراوە، کە دەوڵەتی تایبەت، بەدوای یەکدا هاتنی زەمەنیی ((تایبەت)) بە دەوڵەتی گشتی تەواو دەکلت، واتە

---

(1) تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٨٧.

(2) وەك (العظمة) بۆی دەچێت، ئەمە بارودۆخی بووەیهییەکان بووە لەگەڵ خەلافەتدا. بڕوانە: ابن خلدون وتأريخيته، ص٤٢.

مێژووی تایبەتیی میرنشینی حەسنەوەیهی، تەواوکەری سیاقی گشتیی مێژووی دەوڵەتی گشتییە. چونکە سەرەنجام دەوڵەتی تایبەت لەبری دەوڵەتی گشتی، لە ناوچەیەکی سنوردار و ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراودا، کارایی مێژوویی ئەنجام دەدات.

تایبەتمەندیی میرنشین - دەوڵەتی کوردی بەڕوونی لە ئینتیمای رەگەزیی هەڵسوڕێنەرەکانی، واتە ئینتیما کوردییەکەیاندا دەردەکەوێت، لێرەدا میرنشین - دەوڵەت بریتییی لە بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای کورد. بە ڕای ئیبن خەلدون، ئەم ئینتیما ئەتنییە پێگەی میرنشینەکە لە مێژووی نوسراودا دیاری دەکات، چونکە کوردیەتیی میرنشینەکە ئەوە بەسەر مێژوونوس - بیرمەندد دەسەپێنێت لە خودی میرنشینەکەوە مامەڵە لەگەڵ میرنشینەکەدا بکات، نەك لە پەیوەندیی هاوچاخێتیی میرنشینەکە بە دەوڵەتە گشتییەکانەوە وەك یەکەیەکی مێژوویی تایبەت. ئیبن خەلدون لەسەرەتای باسکردنی میرنشینی مەروانیدا، بەڕاشکاوی گوزارشت لەمە دەکات و باسی ئەم میرنشین - دەوڵەتە نالکێنێت بە دەوڵەتی بەنی حەمدانەوە، وەك لە باسکردنی ئەو دەوڵەتە عەرەبییانەی تردا دەیکرد، کە لە موسڵ و وڵاتی شام، لەسەر داروپەردووی دەوڵەتی بەنی حەمدان دامەزرابوون، هۆی ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆئەوەی "بەنی مەروان عەرەب نین و کوردن، بۆیە باسکردنی دەوڵەتەکەمان دواخست بۆئەوەی لەگەڵ عەجەمدا باسی بکەین"[1]. واتە سەرەڕای ئەوەی دەوڵەتی مەروانی لەسەر داروپەردووی دەوڵەتی حەمدانی دروست بوو بوو، بەڵام هەڵسوڕێنەرەکانی کوردن و وەك حەمدانییەکان عەرەب نین. بۆیە، ئەگەر ئینتیمای ئەتنیکیی هەڵسوڕێنەرەکانی ئەم دەوڵەتانە لەبەرچاو بگرین، دەبێت ئەم دەوڵەتە کوردییە (عەجەمییە) کاراییەکی جیاوازی هەبێت لە کارایی حەمدانییەکان.

ناتوانین لە دەوڵەتی خەلدونی تێبگەین، ئەگەر بێت و لە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و دەمارگیری تێ نەگەین، چونکە دەمارگیریی خێڵایەتی رێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەت خۆش دەکات و پارێزگاریی دەکات، دەبێت دەوڵەت دەمارگیرییەکی هەبێت، پاشا و دەوڵەت بە خێڵ و دەمارگیری دروست دەبن[2]. دەمارگیری لە پێکەوە لکانی رەچەڵەکیدا دروست دەبێت، چونکە "هاوخوێنی لەناو مرۆڤدا شتێکی سروشتییە، یەکێك لە جوانییەکانی،

---

[1] تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٤١٠.

[2] المقدمة، ص١٢١، ١٩٠.

بەدەمەوە چوونی خزم و کەسانی نزیکە لەو کاتەدا زۆرداریيان بەرامبەر دەکرێت یان تووشی کارەساتێك دەبن))[١]. لەناو کۆمەڵگەی کوردیشدا دەمارگیریی خێڵایەتی ئامادەییەکی دینامیکییانەی هەیە، چونکە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان پێکهاتەی خێڵایەتیی کورد و بوونی دەمارگیریدا. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بە ئیبن خەلدون یەکلایی بووەتەوە، چونکە ئەو کاتێك بڕیاری ئەوە دەدات کورد لەریزی میللەتە کۆچەرەکاندا دابنێت، مانای ئەوەیە دەمارگیریی خێڵایەتی رۆڵی خۆی هەیە لە دیاریکردنی کارایی ئەم کۆمەڵەدا، ئەمەش لەبەر پەیوەستبوونی هەر دوو چەمکی ((کۆچەرایەتی)) و ((دەمارگیری)) یە بەیەکەوە[٢].

لە میانەی بەدواداچوونی هەواڵی خێڵە کوردییەکانی سەردەمی مێژوویی لێکۆڵینەوەکەماندا، ئەم دەمارگیرییە بەشێوەیەکی روون دەردەکەوێت، کورد (( لە هەموو بارێکدا پشتگیریی یەك دەکەن، وەك چۆن عەرەب لە هەندێك بارودۆخدا بۆ یەك ئاوان، لە وەرگرتنی قەرز و دانەوەی ئەمانەتدا دەستپاکن، هۆی ئەم سیفەتانەش دەمارگیری و خزمایەتییە))[٣]. وادیارە دەمارگیریی خێڵایەتی لای کورد زۆر بەهێز بووە، وەك لە بەشی دووەمیشدا روونمان کردەوە، بەڵگەی ئەمە ئەوەیە ملکەچی هیچ دەسەڵاتێکی ناوەندی نەدەبوون، کە لە دەرەوە بەسەریاندا دەسەپێنرا، چونکە ملکەچی و سەرشۆڕبوونی خێڵ بەڵگەی لەدەستدانی دەمارگیرییە و خێڵە دەمارگیرەکان ملکەچی دەسەڵاتی دەوڵەت نابن[٤]. هەر بۆیە ئەو بڕیارە دروستە، کە دەڵێت کورد بەدرێژایی مێژوویان، پەیوەستبوون بە بیرۆکەی دەمارگیریی خێلایەتییەوە[٥].

دەمارگیریی خێڵایەتی لای کورد، تەنانەت لە قۆناغی پێش دامەزراندنی ئەم میرنشینانەشدا کارابووە، بەڵام بەهۆی بەهێزیی دەمارگیریی دەوڵەتی گشتییەوە

---

(1) م. ن، ص١٠٢.

(2) م. ن، ص١٠١، ٢٣٠.

(3) العباسي: اثار الأول، ص١٤٧.

(4) ابن خلدون: المقدمة، ص١١٢.

(5) یەڤگینا (ڤاسیلیەڤا): کوردستانی خوارووی رۆژهەڵات لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە، وەرگێڕانی: رەشاد میران، (هەولێر: ١٩٩٧)، ل٢٦٧.

(ئەمەوی و پاشان عەبباسییەکان)، ئەم کۆمەڵانە نەیانتوانیوە قەوارەی سیاسی دامەزرێنن. لە راستیدا مێژووی کورد لەپێش دەرکەوتنی میرنشینەکاندا، مێژووی هۆز و کۆمەڵە کوردییەکانە لە جوڵانەوەیاندا دژی ئەو دوو دەسەڵاتە مەکەزییە[1]، بەلای ئیبن خەڵدونەوە ئەم مێژووە، مێژووی خراپەکاری کوردە لە شارەکان و دەروبەریاندا[2]، لای خەڵکی ئاوەدانییەکان، یان با بڵێین لای بنەماڵە فەرمانڕەواکان، کورد ئەو کێوییانەن ((کەس ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ ببێت))[3]. لێرەدا کارایی کورد، شوێنەکەوتەی کارایی مێژوویی سەراپاگیری (ئەمەوی و عەبباسی)یەکانە، یاخود شوێنکەوتەی کارایی ئەو دەوڵەتۆکانەن، کە لە وڵاتەکەیاندا، یان لە نزیک وڵاتەکەیانەوە دامەزراون[4] و کارایی و بزاوتی مێژووییان بەپێی ئەم کاراییە سەراپاگیرە دیاری دەکرێت.

بەڵام کاتێك دەوڵەتی گشتی (عەبباسی) لاواز دەبێت و خەلیفە دەبێتە بەندی سیاسەتی میرە تورکەکان[5]، بەپێی لۆجیکی ئیبن خەلدون ئەم دەوڵەتە گشتییە بەش بەش دەبێت و میرو فەرمانڕەواکان لە دەوروبەرەکاندا خەڵك دەچەوسێننەوە[6]. ئا لەم ساتە وەختەدا میرە کوردەکان، پاڵپشت بە هێزە دەمارگیرییە خێلایەتییەکەیان، ئەو میرنشینە کوردییانە دادەمەزرێنن، کە پێشتر باسکران، ئەوان توانییان دەست بگرن بەسەر ناوچەیەکی زۆردا، ئەمەش مانای بوونی دەسەڵاتی سیاسییە بەسەر ئەو

---

[1] تاریخ ابن خلدون، ج٣، ص٣٣٤، ٣٦٤-٣٦٥، ٤١٨، ٤٤٤-٤٤٥،٤٨٣، ٥١٣-٥١٤.

[2] م. ن، ج٣، ص٢٥٤، ٤٢٣، ٤٨١، ٤٨٤.

[3] المقدمة: ١١٥.

[4] تاریخ ابن خلدون، ج٣، ص٣١، ٨١، ١٥٣، ٤١٠، ٤٢٣، ٥٠٩.

[5] یەکێك لە شاعیرەکان، لە دوو دێڕە شیعردا گوزارشتی لەمە کردووەو ئیبن خەلدونیش لە (المقدمة)دا ئەم دوو دێڕەی وەرگرتووە:

| | |
|---|---|
| خليفة في قفص | بين وصيف وبغا |
| يقول ما قالا له | كما تقول الببغا |

واتە: خەلیفە لەنێوان وەصیف و بەغا (دوو سەرکردەی سەربازیی تورك بوون لە دەوڵەتی عەبباسیدا) لە قەفەزدایە. ئەوان چی پێ بڵێن، ئەو وەك توتی دەیڵێتەوە. بڕوانە: المقدمة، ص١٩.

[6] م. ن، ص٢٣١-٢٣٢.

ناوچانەدا[1]. لە روانگەی ئیبن خەلدونەوە، ئەم کۆمەڵە کوردییانە بۆیە توانیویانە ئەم کارە ئەنجام بدەن، چونکە ریشەیان لە کۆچەرایەتیدا رۆچووە و بەوە ـ لە غەیری خۆیان ـ جیا دەکرێنەوە بەهێز و بەتوانان[2]. جێی سەرنجە ئەوانەی توانییان میرنشینە کوردییەکان دامەزرێنن، جا چ ئەو میرنشینانە بن، کە ئیبن خەلدون مێژووەکەیانی تۆمارکردووە، یان ئەوانەی مێژووەکەی تۆمار نەکردوون، «زۆر کوچەری تر بوون» لە کۆمەڵە کوردییەکانی تر، ئەو هەزبانییانەی میرنشینی رەوادی و شەدادیی و میرنشینێکیان لە هەولێر دامەزراند، لە ڕەوەندەکان بوون[3]، (بەنو حەسنەوەیە)یش لە مەڕدارەکان بوون[4]، بەهەمان شێوە (بادی کوڕی دۆستەك)ی دامەزرێنەری میرنشینی دۆستەکی ـ مەروانیش سەرەتا شوانی مەڕ بووە[5]. واتە، وەك ئیبن خەلدون تێبینیی کردووە، ئەمانە ئەو بنەمایەیان هەبووە، کە دەتوانرێت قەوارەی سیاسیی لەسەر بونیاد بنرێت، ئەو بنەمایەش کۆچەرایەتی و ژیانی رەوەندێتی و رەوکردنە لەپێناو مەڕداریدا. وەك باسمان کرد، ئەمانە لاوازیی خەلافەتی عەبباسییان قۆستەوە و لە دەوروبەری ئەم دەوڵەتە گشتییەدا، ئەم میرنشینانەیان دامەزراند.

گومان دروستبوونی میرنشینە کوردییەکان بەسترابوو بە بوونی دەمارگیرییەکی بەهێز و لاوازیی دەمارگیریی دەوڵەتی گشتییەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە دەمارگیری تاکە سەرچاوەی دروستبوونی دەوڵەتی خەلدونییە، بەڵکو سەرچاوەی تر هەن، کە دەوڵەت بەهێز دەکەن، لەوانە بانگەوازی ئاینی، کە هۆکاریکی چالاکی بەهێزبوونی قەوارەی سیاسییە، چونکە رەهەندی عەقیدەیی دەبێتە هۆی زیادبوونی هێز و توانای ئەو قەوارەیەی لەسەر دەمارگیری دامەزراوە، هۆی ئەمەش ئەوەیە «مۆرکی ئاینی ململانێ و رق و کینە لەناو خەڵکە دەمارگیرەکەدا ناهێڵێت و وایان لێ دەکات تەنها روو لە

---

[1] م. ن، ص١٣٨.

[2] م. ن، ص١١٠.

[3] ابن حوقل: صورة الأرض، ص١٩٥، ٢٨٩.

[4] الروذراوردي: ذيل تجارب الأمم، ج٢، ص٢٨٨.

[5] ابن الأثير: الكامل، ج٩، ص٣٦.

راستی بکەن»»[١]. ئەم «تەنها رووکردنە راستی»یەش لە پشت چەسپاندنی دەسەڵاتی میرە کوردەکانەوەیە لەناو کۆمەڵەکەیان و دەرەوەی کۆمەڵەکەیاندا، میر حەسنەوەیهی کوڕی حوسەینی کوردی پارەیەکی زۆری بۆ کاری «چاکە» خەرج دەکرد، مزگەوتی دروست دەکرد و پارەی بۆ شوێنە پیرۆزەکان تەرخان دەکرد[٢]. هەروەها میر بادی کوڕی دۆستەك لە ناوچە سنوورییەکاندا «غەزا» دەکات[٣]. ئەم پابەندبوونە عەقیدەییە سەرمایەیەکی رەمزیی گەورەی بۆ ئەم میرە دامەزرێنەرانە پێك دەهێنا، ئەمەش شەرعییەتی مانەوەی دەدا بە دەسەڵاتەکەیان، وەك لە هەڵوێستی خەڵکی موسڵ بەرامبەر کوژرانی میر بادداد بینیمان[٤].

لای ئەم بیرمەندە، گەشەکردنی دەوڵەت لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، بەستراوە بە گەشەکردنی خاوەن دەوڵەتەکەوە[٥]. لەکاتی باسکردنی میرنشینەکاندا تەنها جەختکردنە سەر میر بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەم پەیوەندییە ئۆرگانییەی نێوان دەوڵەت و هەڵسوڕێنەرەکانی، بەهێزی ئەم هەڵسوڕێنەرانە، کارایی و بەردەوامیی مێژوویی دەوڵەت مسۆگەر دەکات و لاوازیشیان دەبێتە هۆی لاوازبوونی دەوڵەتەکەیان[٦].

لێرەوەیە دەوڵەتی خەلدونی بەردەوام لە یەك حاڵەتدا نامێنێتەوە، بەڵکو لەبارودۆخەکانیدا دووچاری گۆڕان دەبێت، ئەو وەك بوونەوەرێکی زیندووە، لەدایك دەبێت، گەشە دەکات، پیر دەبێت، پاشان دەمرێت، واتە دەوڵەت بەردەوام بەپێی سیستەمێکی چەسپاو گەشە دەکات تا خولی شارستانی هەڵسوڕێنەرەکانی کۆتایی پێدێت[٧]، روخان چارەنوسی حەتمیی هەموو دەوڵەتێکە. ئیبن خەلدون گەشەی دەوڵەتی

---

(1) المقدمة، ص١٢٤. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی کاریگەری تاین لەسەر هێزی دەوڵەتی خەلدونی بڕوانە: الجابري: العصبية والدولة، ص٢٨٥-٢٨٩.

(2) بڕوانە: ابن الجوزي: المنتظم، ج٨، ص٤١٤٢. ابن الأثير: الكامل، ج٨، ص٧٠٦. ابن كثير: البداية والنهاية، ج١١، ص٢٩٦. ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٨٨.

(3) ابن الأثير: م. ن، ج٨، ص٧٠٦. ابن خلدون: م. ن، ج٤، ص٤١٠.

(4) الروذراوردي: م. س، ج٣، ص١٧٨. الفارقي: تاريخ الفارقي، ص٥٨.

(5) المقدمة، ص١٣٨-١٣٩.

(6) م. ن، ص١٣٣-١٣٤.

(7) م. ن، ص١٣٨-١٣٩.

بەستووەتەوە بە گۆڕانی دەمارگیری لە هاریکاری و یەکدەستەییەوە بۆ کێبڕکێ و سەر پێ شۆڕکردن. گەشەی دەوڵەت بەو پێیەی قەوارەی سیاسیی بنەماڵەی فەرمانڕەوایە، مانای پەرەسەندنی فەرمانڕەواییە لە بەشداریکردنەوە بۆ تاکڕەوی لە فەرمانڕەوایی و شکۆمەندیدا[1]. دەتوانین لە مێژووی میرنشینە کوردییەکاندا هەندێك نمونەی ئەم گۆڕانە حەتمییەی دەوڵەت بهێنینەوە، ئەوەتە میر بەدری کوڕی حەسنەوەیە، دوای ئەوەی پێگە و دەسەڵاتی خۆی دەچەسپێنێت، دەست دەکات بە لێدانی عەشیرەتەکەی، کە عەشیرەتی بەرزیکانە و خەڵکەکەی بەوە ناسراون یاخین و گوێڕایەڵیی دەسەڵاتدارەکانیان ناکەن[2]. بە بۆچوونی ئێمە ئەم سیاسەتەی میر بەدر لەوێوە سەرچاوەی گرتووە هەست دەکات پێویستە ئەندامانی کۆمەڵەکەی رەفتارە کۆچەرییەکانی خۆیان بگۆڕن، کە پێچەوانەی عیمرانە، ئەوان زۆر بە دڕندانەییەوە خەڵکی ناوچەکانی سەر بە میرنشینەکەیان دەچەوساندەوە، وەك مۆرانە لەم ناوچانەدا کشتوکاڵیان خراپ دەکرد، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سەر بژێویی جوتیارەکانی ئەو ناوچانە[3].

بەڵام بەرهەمی ئەم سیاسەتە، دەستبەردانی کوڕانی ئەم خێڵە بوو لە گوێڕایەڵیکردنی بەدر و پشتگیری کردنی هیلالی کوڕی بەدر بوو لە شەڕەکەیدا دژی باوکی[4]. بەپێی بۆچوونی ئیبن خەلدون هۆی ئەمەش ئەوەیە، سیاسەتی توندوتیژی و زۆرداری و تاکڕەوی لە فەرمانڕەواییدا کار دەکاتە سەر دەمارگیری و لە هێز و توانای کەم دەکاتەوە، بۆیە لەناو کۆمەڵەکەدا ـ لە خزمانی میر ـ کەسانێك دەردەکەون هەوڵی ئەوە دەدەن دەست بەسەر جڵەوی فەرمانڕەواییدا بگرن[5]. ئەمە حاڵی میرنشینی حەسنەوەیهی بوو، چونکە ململانێیەکی توند هەبوو لەنێوان بەدر و هیلالی کوڕیدا[6]، لە ئەنجامی ئەمەشەوە ئەم میرنشینە لاوازبوو و روخا.

---

[1] بڕوانە: الجابري: العصبية والدولة، ص٤٣٨-٤٣٩.

[2] بۆنمونە بڕوانە: الروذراوردي: م. س، ج٣، ص١٨٨. ابن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٣٦٠.

[3] ابن الجوزي: م. ن، ج٩، ص٤٣٦٠-٤٣٦١.

[4] ابن الأثير: الكامل، ج٩، ص٢١٥. النقشبندي: الكرد في الدينور، ص١٧٤.

[5] المقدمة، ص١٣٣.

[6] الروزراوردي: م. س، ج٣، ص٩، ١٢. النقشبندي: الكرد في الدينور، م. س، ص١٧٦-١٧٧.

لە هۆکارەکانی تری کەوتنی دەوڵەت لای ئیبن خەلدون، دەستبلاّویی خاوەنی دەوڵەت و بەرپرسەکانیەتی. کۆمەڵە دەمارگیرەکە کاتێك جڵەوی فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست و دەسەڵات بەدەست دەهێنێت، حەماسەتەکەی پێشوی نامێنێت و بایەخ بە خۆشگوزەرانی و خۆشی و ئارامی دەدات و تاکەکانی دەست دەکەن بە ((کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی دەسەڵاتداری لە باڵەخانە و خانوبەرە و جل و بەرگ، کۆشك و تەلار بنیات دەنێن و ئاو رادەکێشن و باخچە دروست دەکەن و چێژ لە شتە دنیاییەکان وەردەگرن))[1]. یەکێك لە دیارترین ئەو میرە کوردانەی لە هەموو میرەکانی دیکە زیاتر خەریکی خۆشگوزەرانی بووە، میر (نصر الدولە) ئەحمەدی کوڕی مەروانی میری میرنشینی مەروانییە، ئەم میرە لە ناز و نیعمەتێکی وادا بووە خەڵکی ئەو سەردەمە شتی وایان نەبیستبوو، کۆمەڵێك کەنیزەك و گۆرانیبێژی کچی هەبوو، هەندێکیانی بە پێنج هەزار دینار یان زیاتر کڕی بوو، جگە لەمە زۆر هۆکاری تری خۆشگوزەرانیی هەبوو[2]. تەنها میر خەریکی ئەم خۆشگوزەرانییە نەبوو، بەڵکو ئەو کەسانەش، کە لە سێبەری ئەم میرنشینەدا دەژیان، دەستیان دەکرد بەوەی وەك پاشاکانیان خەریکی خۆشگوزەرانی بن. ئەم خۆشگوزەرانییە دەبێتە هۆی زیادبوونی خەرجیی دەوڵەت و داهاتی دەوڵەت بەشی خەرجییەکان ناکات، بەمە دەمارگیریی هەڵسوڕێنەرەکانی دەوڵەت لاواز دەبێت و بە لاوازبوونی ئەوان، خاوەن دەوڵەتیش لاواز دەبێت[3]. لەبەر ئەمە ئەو سیاسەتە ئاشتیخوازانەیەی میر (نصر الدولە) گرتبوویە بەر، ئەنجامێکی سروشتیی ژیانە پڕ خۆشگوزەرانییەکەی بوو، ئەگەر دوژمنێك بیویستایە پەلاماری بدات، وەك ئیبن جەوزی دەڵێت: (( (نصر الدولە) دەیوت: خەرجیی ئەم شەڕە چەندی دەوێت؟ ئەگەر بیان وتایە پەنجا هەزار دینار، ئەم بڕە پارەیەی

---

(1) المقدمة، ص١٣٢.

(2) بۆنمونە بڕوانە: ابن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٦٦١-٤٦٦٢. ابن الأثير: الكامل، ج٩، ص٢٦. ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج١، ص٥٧. الذهبي: العبر، ج٢، ص٣٠٠. بۆ زانیای زیاتریش بگەڕێوە بۆ: الفارقي: م. س، ص١٢١-١٢٢، ١٤٢-١٤٥، ١٥٠، ١٧٨-١٨٠ و چەند شوێنێکی تر.

(3) المقدمة، ص١٣٢.

دەنارد... بەمە سەربازەکانی خۆی لە مەترسی دەپاراست»[1]. بەڵام ئەم سیاسەتە پاڵی بە هێزە بێگانەکانەوە نا، بە تایبەتی سەلجوقییەکان دەستدرێژیی بکەنە سەر دەوڵەتەکە، ئەو خۆشگوزەرانی و خەرجییە زیادانەی توشی دەوڵەتەکە بووبوو، یەکێك بوون لەو هۆکارانەی وای لە سەلجوقییەکان کرد رووی تێبکەن و پاشان لەناوی ببەن[2].

وەك پێشتر باسمان کرد، دەرکەوتنی سەلجوقییەکان و دەستگرتنی سوڵتان توغرل بەگ بەسەر ئەو زەوییانەی پێشتر لەژێر دەستی میرنشینە کوردییەکاندا بوون، راگەیاندنی کۆتایی هاتنی ماوەی مێژوویی کوردی بوو، بۆ ئەوەی ـ دوای ئەمە ـ مێژوو ئەو بەدوای یەکدا هاتنەی خۆی تەواو بکات، کە ئیبن خەلدونی بیرمەند باوەڕی پێی هەبوو.

بۆیە سەبارەت بە کورد، دەرکەوتنی سەلجوقییەکان، مانای «نەمانی کورد بوو»[3]. لێرەدا ئیبن خەلدون ـ مێژوونوس ئەوە دەزانێت، کە ئەم نەمانە، نەمانی دەسەڵاتەکەیانە نەك رەگەزەکەیان، رەگەزەکەیان ماوە، بەڵام ئەم رەگەزە هیچ کاراییەکی مێژوویی نییە و خاوەنی دەسەڵاتێکی سیاسی نییە بەناوی خۆیەوە، واتە نەمانی کورد، مانای گۆڕانە لە کاراییە مێژووییەکەیاندا، بێگومان ئەوان لە قۆناغی دوای نەمانی میرنشینەکانیشدا هەر دەمێنن، بەڵام بەهەمان کارایی پێشووەوە نا. ئەم نەمانە، نەمانی شکۆمەندی و باڵادەستیی کوردە و ئەو کاتە دەبنەوە بە خاوەنی کارایی، کە چەند کۆمەڵێکی تر لەناو ئەم نەتەوەیەدا، بە هەمان ئەو خولە شارستانییەدا بڕۆن، کە کۆمەڵەکانی پێشوو پیایدا رۆیشتوون و ئەم کۆمەڵە تازانە بتوانن، لەسەر ئینتیمای تاکەکان بۆ ئەم کۆمەڵانە، دەوڵەت بۆ خۆیان پێك بهێنن.

---

[1] ابن الجوزي: م. ن، ج٩، ص٣٦٦٢.

[2] بڕوانە: الفارقي: م. س، ص٢٠٨. يوسف: الدولة الدوستكية، ج٢، ص٥٢-٥٣.

[3] تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٩٩.

## پاری دووەم
## کارای مێژوویی کورد

### ١- سیماکانی تاکی کارا

کارایی مێژوویی نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی سەر بە کایەی ئیسلامی، تەنها بە پێگەی تایبەتیی ئەو نەتەوەیە لە زانینی مێژوویی بەرهەمهاتووی ئەم کایەیەدا دیاری ناکرێت، چونکە چەمکی نەتەوە مەرکەزیەتێکی ڕەهای نییە تا سەرجەم هەواڵە مێژووییەکان لە دەوری ئەو کۆ ببنەوە. ئەمەش لە سەراپاگیریی مامەڵەی زانینی مێژووییەوە دێت لەگەڵ کارای مێژوویی و پێش ئەمەش لەگەڵ چوارچێوە دیاریکراوەکانی بوونی مێژوویی نەتەوەیەك لە نەتەوەکان، یان تاکەکانی ئەو نەتەوەیە، یان تەنانەت دامەزراوە کارگێڕی و ئاینی و زانستییەکان و ئەو دامەزراوانەی تر، کە لەناو ئەو نەتەوەیەدا دروستبوون. بۆیە ئەگەر بمانەوێت ـ بەپێی بەرهەمی مێژوویی نوسراو ـ لە کارایی نەتەوە تێ بگەین لە سەرجەم ڕەهەند و دەرکەوتنە جیاوازەکانیدا، پێویستە تەنها بەوەندە نەوەستین لە یەکێتییە مێژووییەکەیدا بیبینین، بەڵکو دەبێت لە هەموو شێوەکانیدا یان لە هەموو ئەو یەکە مێژووییانەدا بیبینین، کە پێکیان هێناوە و دەیکەن بە یەکەیەکی مێژوویی گشتگیر و سەربەخۆ.

بەڵام ئایا زانینی مێژوویی، کە زۆر دڵسۆز و پابەندی چەکی ئوممەتی ئیسلامیی گشتگیرە، ڕێ بەم جۆرە تێڕوانینە دەدات لە کورد؟ ئایا پارچە پارچەکردنی (تفكيك) نەتەوەیەك لە نەتەوەکان ـ وەك نەتەوەی کورد ـ بۆ چەند یەکەیەکی مێژوویی بچووك، نابێتە هۆی ئینتیما بۆ ئەم یەکە بچووکانە، لە کاتێکدا چەمکی باوی ئەو کاتە بۆ ئینتیما، مانای ئینتیما بوو بۆ ئوممەتی سەراپاگیری خاوەن هەیمەنەت و کارایی گشتی، نەك ئینتیما بۆ نەتەوەی تایبەتی، کە کاراییەکەی لە چوارچێوەی ئەو سەراپاگیرییەدا سنوربەند کراوە؟ ئەگەر لە نوسینە مێژووییەکاندا بە دوای کارایی یەکە مێژووییە پێکهێنەرەکانی ئەم نەتەوە تایبەتە ـ کوردییەدا بگەڕێین، لەوانەیە بتوانین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزینەوە. بەپێی ئەم نوسینانە، یەکەی مێژوویی دیار و کارا، تاکەکانی ئەم

نەتەوە یان کارا مێژوویيەکانیەتی. مەبەست لە کارای مێژوویی، ئەو کەسانەن لەناو تاکەکانی نەتەوەی کورددا دەردەکەون و مێژوو دروست دەکەن یان لە دروستکردنی مێژوودا رۆڵیان هەیە، بەچاوپۆشین لە ماهییەتی ئەو رۆڵە و گرنگییەکەی سەبارەت بەو مێژوونوسەی بەرجەستەی دەکات.

سەرەتا دەتوانین بڵێین زانینی مێژوویی زیاتر مەیلی بەلای تاکی کارادا هەیە، نەک ئەو کۆمەڵە ئەتنییەی ئەم کارایەی لێ کەوتووەتەوە، تاکی کارا لەو تێڕوانین و هەڵوێستانە دەربازبووە ـ کە لەم زانینەدا ـ لەبارەی نەتەوەکەیەوە هەن و هەڵسەنگاندنی بوونە مێژوویيەکەی بەپێی رەفتارەکانی یان تەنانەت بەپێی ئەو خراپانەیەتی، کە ئەم لەسەرجەم تاکەکانی کۆمەڵەکەی جیادەکەنەوە، واتە بەپێی تێگەیشتنی مێژوونوسان و مامەڵەکردنیانە لەگەڵ کارایی مێژوویيدا. کارایی تاک لە سەردەمێکی دیاریکراودا بەتەواوی بەستراوە بە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی ئەو کەسەوە و مێژوونوس بەپێویستی دەزانێت لە تۆمارکردنی ژیاننامەی کەسەکەدا ئەو کارایيەمان پێ بناسێنێت، نەک لە ژیاننامە یان مێژووی کۆمەڵە ئەتنییەکەیدا، کە کارایيەکی سنورداری هەیە. تێبینیی ئەوە دەکرێت زۆربەی کات کارای کۆیی نەتەوەی کورد، لە کارایی تاکەکانی سەلبیترە. بە بۆچوونی ئێمە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ناتوانرێت کارای کۆیی کورد ئیحتیوا بکرێت، چونکە بەردەوام ئەم نەتەوەیە ئەوەی لێ چاوەڕوان کراوە کێشە دەنێتەوە و رێگە دەبڕێت و بەپێی نەفسە توڕەییەکەی (النفس الغضبية) دەجوڵێتەوە و ملکەچی دەسەڵات و دامەزراوەکانی دەوڵەتی ناوەندی نابێت. ئەمە لە کاتێکدایە تاکی سەر بە هەمان نەتەوە زیاتر قبوڵ دەکرێت، تەنانەت ئەگەر ئەم تاکە سەر بە کۆمەڵەیەکی کوردیی تاوانباریش بێت. بەم جۆرە وێنەکە وای لێ دێت: کوردەکان بەردەوام خەریکی رێگرین و ئەمە بووەتە سیفەتێك و پێوەیان لکاوە، بەڵام تاکەکانیان پەشیمان دەبنەوە و ئەم پەشیمان بوونەوەیان پێگە و سیماکانی کارایی مێژووییان دیاری دەکات[1]، میری کورد چاك و دادپەروەرە و لەلایەن کۆمەڵی ئیسلامییەوە قبوڵکراوە، کەچی خێڵەکەی بەوە وەسف دەکرێن ((خراپترین خێڵی سەر

---

[1] المقدسي: كتاب التوابين، ص٢٢٢-٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة، ص٢٣١-٢٣٢.

زەوین»»[١] و زۆر نمونەی تری لەم جۆرە، کە جەخت لەوە دەکەنەوە کارای کۆیی نەتەوەی کورد کارایەکی تاوانبارە، چونکە کاراییەکەی رەنگدانەوەی رەفتارە کۆمەلایەتی و هەلویستە سیاسییەکانیەتی، کە زۆربەی جار رەفتار و هەلویستی ناپەسەندن و لە زانینی میژووییدا رەخنەیان لیّ گیراوە. بەلام لە رەفتارەکانی کۆمەلەوە حوکم بەسەر تاکی کارادا نادریت، بەلکو کارایی تاك لەناو ئەو چوارچیوەیەدا هەلدەسەنگینریت، کە بە کاراییەکەی ئینتیمای بۆی هەیە وەك ئەوەی میریکە یان گەراوەیەکە (تائبا) بۆ لای خوا، بۆیە لەو حوکمە گشتییەوە، کە بەسەر کۆمەلی تایبەتدا دراوە، سەیری ئەم کاراییە دەکریت و ئەم تاکە کارایەش سەر بەو کۆمەلە تایبەیە. ئەم دیالیکتیکە، کە دیالیکتیکی کارای کۆیی ناپەسەند و تاکی کارای پەسەندە، پەیوەستە بە بەکەم سەیرکردنی چینە رەشۆکییەکەی کۆمەلگا (ناوی کۆمەلە ئەتنییەکە ـ واتە کوردە ـ ) لەلایەن چینە تایبەکەوە (تاکە کاراکە سەر بەوە)، کە پیشتر ئاماژەمان پیکرد.

لە روانگەی زانینی میژووییەوە، ئەو میژووەی تاکی کارا دروستی دەکات جیاوازە لەو میژووەی کۆمەلەکەی دروستی دەکەن، میژووی فەقیە و زاناو دادوەریکی کورد، با وای دابنیین لە شارەزوورییەکانە، بە تەواوی جیاوازە لە میژووی کوردە شارەزوورییەکانی هاوپشتی خۆی، ئەوان لە نیو سروشتە چەسپاوەکەیاندا جیگیرن، کە لە تالانی و راو و رووت و ترساندنی ریبواراندا خۆی دەنوینیت[٢]، ئەمەش مانای چەسپاویی کاراییانە لە میژوودا. کەچی تاکە کاراکانیان لە زانینە ئیسلامییە جۆراوجۆرەکاندا گەیشتوونەتە لوتکە و لە

کایەی ئیسلامیدا بەرزترین و هەستیارترین پلە و پایەیان بە دەست هیناوە[٣].

---

[1] الروذراوردي: ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٢٨٨. ابن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٣٦٠. ئەم وتەیەی لەبارەی میر بەدری کوڕی حەسنەوەیە و عەشیرەتەکەوەیەتی ، کە عەشیرەتی بەرزیکانییە.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: مسکویه: تجارب الأمم، ج٢، ص١٩٨. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص١٩٨-١٩٩. الهمداني: تكملة تأريخ الطبري، ص٢٦٤. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣، ص٣٧٦.

[3] بۆ نمونە بڕوانە: السمعاني: التحبير في المعجم الكبير، تحقيق: منيرة ناجي سالم، (بغداد: ١٣٩٥هـ/ ١٩٧٥م)، ج٢، ص١٣٨. ابن الجوزي: المنتظم، ج٩، ص٤٣٦٤. ج١٠، ص٥٠٣٦، ٥١١٣، ٥٢٥٧، ٥٣١٩-٥٣٢٠، ٥٤٤٧. ابن المستوفي: تاريخ اربل المسمى نباهة البلد الخامل بمن ورده من◄◄

لە زانینی مێژووییدا، پەسەندێتیی تاکی کارا، بە ڕوونی لەو جۆرە نوسینە مێژوویییانەدا بەرجەستە بووە، کە بە مێژووی چینەکان و ژیاننامە و مێژووی ژیان (التراجم) ناسراون، لەم جۆرە نوسینانەدا تاك دەکرێتە مەرکەز و یەکەیەکی مێژوویی پێك دەهێنێت و لەگەڵ یەکە هاوشێوەکانی خۆیدا مێژوو تەواو دەکات.

دەرکەوتنی ئەم جۆرە نوسینە مێژووییە پەیوەستە بە زانستی فەرموودە (علوم الحدیث)ەوە، بەتایبەتی زانستی دانەپاڵی فەرموودە (اسناد الأحادیث) و دڵنیابوون لە گێڕەرەوەکان (توثیق الرواة) و گەڕان بە دوای هەواڵ و بارودۆخەکانی تۆمارکردنیاندا[1]. لێرەدا هەندێك لێکۆڵەر ئاماژە بەوە دەکەن بیرۆکەی تۆمارکردنی هەواڵەکان، بیرۆکەیەکی تەواو ئیسلامییە و ئەنجامێکی سروشتیی بیرۆکەی لێکۆڵینەوەیە لە هاوڕێکانی پێغەمبەر[2]. ئەم جۆرە نوسینەوەیەی مێژوو زۆر ناوی لێنراوە، وەك: مێژووی ژیان (التراجم)، چینەکان (الطبقات) و فەرهەنگەکان (المعاجم) و پیرەکان (الشیوخ) و پیاوان (الرجال) و ژیاننامە (السیر) و تەنانەت ناوی شارێکی دیاری کراو[3]و زۆر ناوی تر، ئەگەرچی بەزۆری ناوی چینەکان (الطبقات)ی بۆ بەکار دەهات. لێرەدا چین بە واتای توێژێکی کۆمەڵایەتی نایەت، بەو چەمکەی ئەمڕۆ ئەم زاراوەیە هەیەتی[4]، بەڵکو مەبەست لێی کۆمەڵێك کارایە لە بوارێکی دیاری کراودا، وەك چینی یاوەران (طبقة الصحابة) (مەبەست هاوڕێیانی پێغەمبەرە) و چینی شوێنکەوتووان (التابعین) و چینی

---

◄◄ الأماثل، حققه وعلق علیه: سامي بن السید خماس الصقار، (بغداد: ١٩٨٠)، ق١، ص٢٠١-٢٠٦، ٢١١. المنذري: التكملة، مج١، ص٢٤١-٢٤٢. ابو شامة: ذیل – الروضتین او تراجم رجال القرنین السادس والسابع، عني بنشره: عزب العطار لاحسیني، ط٢، (بیروت: ١٩٧٤)، ص٣٥. ابن الساعي: الجامع المختصر، ج٩، ص١٠٢ و زۆر سەرچاوەی تر. بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: درویش یوسف (حسین): الأسرة الشهرزوریة ودورها السیاسي والحضاري، رسالة ماجستیر غیر منشورة، جامعة صلاح الدین، (اربیل: ١٩٩٨).

[1] مارجلیوث: دراسات عن المؤرخین، ص٦٨. عثمان (موافي): منهج البحث التاریخي عند المسلمین والمنهج الأوروبي، (الأسكندریة: د. ت)، ص٩٦.

[2] الخالدي: دراسات، ص٨٤. الشرقاوي: ادب التاریخ، ص٣٠٨.

[3] مصطفى: التاریخ العربي والمؤرخون، ج١، ص٣٨٣.

[4] كوثراني: التاریخ ومدارسه، ج١، ص٦٨.

فەرموودە گێڕەوەکان (طبقة المحدثين)، واتە چەند تاکێك لەگەڵ بیرۆکەی بە دوای یەکدا هاتنی مێژوویی یان پلەی ریزبەندیدا، هەروەها ئەم وشەیە ئاماژەیە بە چەند نەوەیەکی خاوەن یەك پیشە، وەك پزیشکەکان یان ئەوانەی سەر بە یەك ئاینزای دیاریکراون، یان شتی لەم جۆرە[1].

ئەگەر بەپێی کتێبە سەرەتاییەکانی چینەکان، کارای مێژوویی تەنها ئەوانەی گرتبێتەوە، کە فەرموودەیان لەبەرە و دەیگێڕنەوە، ئەوا دواتر ئەم کاراییە چوارچێوە ئاینییەکەی تێپەڕاند و کۆمەڵێك واتا و دەلالەتی گشتگیری لە خۆگرت، چونکە کارای مێژوویی لە پاڵ کایەی ئاینیدا بە هەموو دەرکەوتەکانییەوە، چووە ناو کایە جیاوازەکانی وەك کایەی سیاسی و رۆشنبیری و زانستی و کارگێڕی و... هتد. ئەگەرچی تاکی کارا پانتاییەکی زۆری کتێبەکانی چینەکان و ژیاننامەکانی داگیر کرد بوو و بابەتەکانی ئەم کتێبانە گەیشتبوونە رادەیەك لە ژمارە نەدەهاتن، بەڵام ئەم کتێبانە تەنها تایبەت نەبوون بە چینێکی تایبەت لە کاراکان[2].

لە ڕاستیدا «کارایی مێژوویی» چەمکێکی سەرەکیی هزری مێژوونوسەکانی ئەم جۆرە نوسینە مێژووییەیە، ئەمەش زیادەڕۆیی نییە، چونکە ئەوان بەردەوام هەوڵیان دەدا پەیڕەوی ئەم دوو فەرموودەیەی پێغەمبەر بکەن: (مافی هەموو خاوەن مافێك بدەن) و (خەڵك لە شوێنی شایستەی خۆیاندا دابنێن)[3]، بۆیە، ئەگەر مێژوونوس بیویستایە سەرپێچی ناوەڕۆکی ئەم دوو فەرموودەیە نەکات، دەبوو لە پرۆسەی تۆمارکردنی مێژوویدا، جەخت لە کارایی مێژوویی و زەقکردنەوەی ئەم کاراییە بکاتەوە. ئەوەی لای نوسەری کتێبی چینەکان دەبینرێت، هەستکردنیەتی بەم کاراییە، ئەو هەواڵی «نەجیبزادەکانی رۆژگار و کارەکانیان، سەرکردەی هەموو چاکەیەك، پایەکانی هەموو زانستێك، پاڵەوانانی داستانەکان و چاونەترسەکانی شەڕەکان و ناودارانی هەموو

---

(1) ماكسيم (رودنسن): التاريخ الأقتصادي وتاريخ الطبقات الاجتماعية في العالم الاسلامي، تعريب: شبيب بيضون، ط٢، (بيروت: ١٩٨١)، ص٩. مارجيلوث: م. س، ص٢١. روزنتال: علم التاريخ، ص١٣٣. ابو الضيف: منهج البحث التاريخي، ص٦٠-٦١.

(2) الصفدي: الوافي بالوفيات، ج١، ص٥٥.

(3) ئەم دەقە لە :(الخالدي: دراسات، ص٩٨)دا هاتوون.

هونەرەکان و زانا و بەکەڵکەکان»[1] تۆمار دەکات. مێژوونوس هەر بەوەندە بەس ناکات، بەڵکو لە کاتی تۆمارکردنی هەوڵەکاندا بەوە پاساوی دانانی تاکەکان لە سەنتەردا دەداتەوە ژیاننامەی ئەمانە زۆر پەند و ئامۆژگارییان تێدایە و دەکرێت وەرگر ئەم پەند و ئامۆژگارییانە وەك بەرچاوروونی وەرگرێت و بیریان لێ بکاتەوە، بۆ ئەوەی سوود لە رەفتار و هەڵسوکەوتی ئەم کارایانە و لایەنی چاکی پاشماوەکانیان وەرگرێت[2].

لێرەدا دەتوانین بڵێین جیاوازیی ئەم جۆرە نوسینە مێژووییە لە تایبەتمەندێتیی بابەتەکەیدایە، ئەو وەك گشتێك مامەڵە لەگەڵ مێژوودا ناکات، بەڵکو ـ لەبەر ئەوەی تەنها باسی ژیاننامەی کەسانێکی دیاریکراو دەکات ـ مێژوویەکی تایبەتە بە کارا مێژووییەکان بەپێی تێڕوانینی مێژوونوس و تێگەیشتنی لە چەمکی کارایی. بەڵام ئەگەر بەگشتی لە زەینی بەرهەمهێنەرانی کتێبی چینەکان رامێنین، وەك یەکێك لە لێکۆڵەرەکان بۆی چووە، جۆرێکە لە ئارەزووی بە نەمری هێشتنەوەی خود لای زاناکان[3] و جەختکردنەوەیە لەسەر تایبەتمەندێتیی کۆمەڵ یان چینەکەیان. جێی ئاماژە پێکردنە ناساندنی تاکە کارا مێژووییەکان تەنها لە کتێبی مێژووی تایبەتدا نییە، تەنانەت لە کتێبەکانی مێژووی گشتیشدا ئەم تاکە کارایانە پێگەی تایبەتیی خۆیان هەیە. ئەم کتێبانە سەرەڕای ئەوەی تایبەتن بە مێژووی سوڵتان یان تاکە خاوەن دەسەڵاتەکان، کەچی لە کۆتایی رووداوەکانی هەر ساڵێکدا ژیاننامەی ناودار و کەسە ناسراوەکانیش تۆمار کراوە. نوسەری مێژووی گشتی کۆمەڵێك زانیاری لە بارەی ئەو کەسە مردووانەوە دەهێنێت و لە بواری پسپۆڕییەکەی خۆیاندا باسی کاراییەکەیان دەکات. دیارترین نمونەش بۆ ئەم جۆرە نوسینە مێژووییە کتێبی (المنتظم)ی ئیبن

---

(1) الصفدي: م. س، ج١، ص٥-٦.

(2) السخاري: الاعلان، ص٤١٠، ٤١٨، ٤٢٨. سەخاری وتەکانی هەریەك لە: سوفیانی کوڕی عەینە (١٩٨ك/٨١٤ز مردووە) و ئیبن ئەبی دەم (٦١٢ك/ ١٢٤٤ز مردووە)و عەبدولقادر حەنەفی (٧٧٥ك/ ١٣٧٣ز مردووە) وەردەگرێت.

(3) الخالدي: بحث في مفهوم التاريخ، ص١٥.

جەوزییە[1]، کە دواتر لە باسی کاریگەریی میتۆد لە سەر کارایی کورد، دەگەڕێینەوە سەری. بە هەر حاڵ ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کتێبی پیاوان و چینەکان لەگەڵ کتێبەکانی مێژووی گشتیدا بەشداریی ناساندنی کارا مێژووییەکان دەکەن. بەڵام کتێبی چینەکان تەنها تایبەتن بە مێژووی کەسێتییە کاراکان، لەکاتێکدا کتێبە گشتییەکان باسی رووداو و کەسێتییەکان دەکەن[2]، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە بەدی بێنن، کە لەخۆگرتنی سەراپای مێژووە.

هەرچۆنێك بێت ئەو مێژووەی نوسەری مێژووی ژیانی تاکەکانی کورد دەینوسێتەوە، مێژووی ململانێ نییە بەو چەمکەی ململانێی بوونگەرایی، کە لە بەشی دووەمدا باس کرا، چونکە وا دیارە لێرەدا هیچ شتێکی شاراوە و نادیار لەم جۆرە مێژووەدا نییە و هیچ بنەمایەکی گشتیش نییە، کە تەحەکوم بە تێڕوانین و تێگەیشتنی مێژوونوس بکات لە هەڵبژاردنی تاکە کاراکاندا، تەنها ئەوەندە هەیە ئەم کارایە سەر بە هەمان ئەو کۆمەڵە تایبەیە، کە مێژوونوس مێژووەکەی تۆمار دەکات. ئەم تێڕوانینەش تەواو پێچەوانەی تێڕوانینەکەی پێشووە، کە لە کاتی باسکردنی بوونی کورد لە مێژووی سیاسیی ئیسلامیدا باسمان کرد، چونکە ئەوەی پێشوو تێکەڵەیەك بوو لەو چەمکە یەقینییانەی مێژوونوس بەپێی زەمەنە مێژووییەکە باوەڕی پێیان هێنابوو، وەك چەمکی سەنتەر و دەوروبەر و چەمکی بەرژەوەندیی ئوممەت و شتی تری لەم جۆرە. بەڵام مێژووی چینەکان پابەند نییە بەم چەمکانەوە، ئەمەش لەبەر ئەوە نا، کە رەتیان دەکاتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە نوسینە بەرهەمی باوەڕبوونە بەو چەمکانە و تەسلیمبوونە پێیان. لەبەر ئەمە مادەم ئەو تاکەی، کە نوسەری ژیاننامەکان هەواڵەکانی تۆمار دەکات، لە کایەی ئیسلامیدا کارایەکی مێژووییە، دەبێت - بەچاو پۆشین لە جۆری ئەم کاراییە - پێگە و شوێنی خۆی پێ بدرێت. لێرەوەیە لە قۆناغی یەکەمی بوونی کورد واتە قۆناغی بوون لە دەرەوەی دەسەڵاتدا، تێبینی سنورداریی کارایی تاکەکانی ئەم کۆمەڵە دەکرێت، چونکە

---

(1) بۆ نمونە بڕوانە ژیاننامەی هەندێك کارای کورد لەم کتێبەدا: المنتظم، ج٩، ص٤٣٦٠- ٤٣٦١، ٤٦٦٢. ج١٠، ص٥٠٣٤، ٥١١٣، ٥٣١٩-٥٣٢٠.

(2) بڕوانە: العظمة: الكتابة التاريخية، ص٧٠.

ئەم کارایيە لە هەموو کایەکانی وەك کایەی ئاینی[1] و کایەی رۆشنبیری[2] و کارگێڕیدا[3]، لە کارایی کەسێك یان دوان تێ ناپەڕێت.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم کارایيە، جیاوازیی تێڕوانینی مێژوونوسمان بۆ دەسەلمێنێت لە سەیرکردنی کارایی گشتیی کۆمەڵی کوردی و کارایی تایبەت بە تاکەکانی ئەم کۆمەڵەدا. ئەو کارایيە گشتییەی لە بوونی مێژووییەوە سەرچاوە دەگرێت، بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێت، بەڵام کارایی تاك لە یەکەم ساتی دەرکەوتنیەوە، لە دەرەوەی زەمەندایە و لەسەر یەك شێواز بەردەوام دەبێت، ئەم بەردەوامبوونەش بەگوێرەی سوربوونی مێژوونوسە لە بینینی جۆری کارایی تاکەکە لە کایەی ئیسلامیدا بێ گوێدانە ئینتیمای ئەتنیی ئەم تاکە و هەڵوێستی زانینی مێژوویی لەم کۆمەڵە ئەتنیکییە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە تاکی کورد لێرەدا کارای ئەو رەوتە مێژووییەیە، کە جۆرێکی تر کارایی کۆیی پێك دەهێنێت و چەمکی تایبەت بە خۆی هەیە، تاکی کورد بە تەواوی بەستراوە بە بوونی ئەم رۆڵە مێژووییەوە، بەبێ ئەوەی ئەم بوونە هەمان ئەو دەلالەت و لێکدانەوانەی هەبێت، کە پێشتر دراون بەو چەمکە.

کارایی لەسەر ئاستی تاکەکەس، رەنگدانەوەی بوونە لە ئاستێکی پەسەندا، ئەمەش مانای ئەوەیە لەم جۆرە نوسینە مێژووییەدا دیالێکتیکی «ئێمە» و «ئەوان»، کە تەحەکوم بە تێڕوانین لە کورد دەکات، دەکشێتەوە. ئەگەر مێژووی کۆمەڵە ئیسلامییەکان مێژووی دەسەڵات و ململانێی نێوان دەسەڵاتەکان بێت، ئەوا مێژووی تاکەکان بە جۆرێکی ترە و مێژووی کاراکانە وەك تاك لە بوارەکەی خۆیاندا، بۆ ئەوەی ئەم تاکایەتییە ببێتە تەواوکەری سیاقێکی نوێ بۆ مێژوو، کە تیایدا کۆمەڵێك تاکی دیکە هەن سەر بە کۆمەڵە ئەتنی ـ ئیسلامییە جیاوازەکانی ترن و ئەو کۆمەڵە تایبەتە پێك دەهێنن، کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد و مێژوونوس تایبەتە بەم کۆمەڵە و ئەم مێژووە جیاوازەیان (المتفرد) دەنوسێتەوە.

---

(1) ابن سعد: الطبقات الكبرى، مج٧، ص٢٨٠.

(2) ابن النديم: الفهرست، ص٣٥٦.

(3) الجهشياري: الوزراء والكتاب، ص٢٠٤، ٢٠٩-٢١٠.

هەموو ئەوەی لەسەرەوە وتمان، مانای توانەوەی تاکە لە کۆمەڵە تایبەتمەندەکەدا، کە لە دیارترین دەرکەوتنەکانیدا، نوێنەری کۆمەڵێکی بچووککراوەی ئوممەتی گشتگیرە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە لێرەدا بیرۆکەی مێژوو، بیرۆکەی نواندنی ئوممەتی گشتگیرە لە لایەن کۆمەڵە تایبەتەکەیەوە، نەك نواندنی ئەو نەتەوە بچووکانەی ئەم ئوممەتە سەراپاگیرە پێك دەهێنن[1].

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە مرۆڤ لەگەڵ تاکی کارادا هەست بە توانەوەی کۆمەڵە ئەتنیکییەکان دەکات لە ناو ئوممەتی ئیسلامیی گشتگیردا، بە جۆرێك سیماکانی کارایی کۆمەڵێکی ئەتنیکیی وەك کورد، یەك دەخرێن و ئەم سیمایانە لە روانگەی کارایی تاکەکانیەوە، لەناو ئوممەتی سەراپاگیردا دەردەکەون، وەك لەمەو دوا باسی دەکەین.

## ٢ ـ کارایی تاکی کورد لە نێوان ئینتیمای ئەتنیی و ئینتیما بۆ چیندا

ئەوەی لەسەرەوە وتمان مەسەلەیەکی گرنگ دەوروژێنێت، کە پەیوەستە بە تێڕوانینی زانینی مێژووییەوە لە کورد، ئەویش مەسەلەی ئینیتیمای تاکی کوردە بۆ کۆمەڵە ئەتنییەکەی خۆی، یان با بە دەربڕینێکی وردتر بڵێین، مەسەلەی ئینتیماکانی کارای مێژوویی و کاریگەریی ئەم کارایەیە لەسەر پێگە و کارایی کۆمەڵە ئەتنیکییەکەی. لە راستیدا هەر هەوڵدانێك بۆ گەڕان بە دوای ئینیتماکانی ئەم تاکانە بۆ کورد، بە جۆرێك ئەم ئینتیمایانە ببنە هۆی پێدانی کارایی بەم تاکانە، پێویستی بەوەیە تاکەکە لە ناوەندە مێژووییە گونجاوەکەی خۆیدا دەربهێنرێت و بخرێتە ناوەندێکی ـ بەپێی تێڕوانینە باوەکانی ئەو کاتە و چوارچێوە کۆمەڵایەتییە دیاریکەرەکانی ئینتیمای تاك ـ نەگونجاو و بێ بایەخ سەبارەت بەو تێڕوانین و چوارچێوانە.

لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێ کارایی مێژوویی تاکێك، کە سەر بە کۆمەڵێکی ئەتنیکیی دیاریکراوە (کورد)، ببێتە پاڵنەرێك بۆ بیرکردنەوە لە خودی کۆمەڵەکە و سەرنجدان لە کاراییە مێژووییەکەی، چونکە هەندێك مێژوونوس کاتێك باسی ژیانی زانایەك یان سەرکردەیەك یان فەقیهێکی کورد دەکەن، کە سەر بە خێڵێك یان خەڵکی شارێکی

---

[1] الصفدي: الوافي بالوفيات، ج١، ص٥.

کوردییە، لە چوارچێوەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ کارایی ئەم تاکەدا، خودی کورد یان خێڵ یان شارە کوردییەکانیش دەناسێنن[١]، وەك ئەوەی لێرەدا تاك نوێنەری هەموو کۆمەڵە ئەتنییە ـ خێڵەکییە ـ هەرێمایەتییەکەی بێت. کارایی ئەم تاکە تەحەکوم بە هزری مێژوونوس دەکات و ئەویش باسی هەموو ئینتیماکانی ئەم تاکە دەکات. مێژوونوس بۆیە باسی ئەم ئینتیمایانە دەکات، لەوانەیە پاڵنەرێك بن بۆ گرنگیدان یان بیرخستنەوەی رەگ و ریشەی تاك.

بەڵام چۆنیەتی زانینی ئینتیمای کارای مێژوویی، لە رێگەی ناوی بنەماڵە و نازناوی کاراکەوەیە، کتێبی چینەکان و ژیاننامەکان پڕن لە ناوی ئەو تاکانەی راستەوخۆ رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر کورد یاخود دەچێتەوە سەر شار و خێڵە کوردییەکانی وەك هەزبانی و زەرزاری و هەکاری و شارەزووری و حەمیدی و مەهرانی و ...هتد. لە راستیدا مێژوونوس لە دانان و رێکخستنی ئەم نازناوانەدا پێوەرێکی روونی نییە، جاری وا هەیە نازناوی (الکردي) بۆ یەکێکیان دادەنێت، پاشان بە شارەزووری و دواتر بە شافیعی ناوی دەبات، یان نازناوی هەزبانی و پاشان کوردی و دواتر هەولێری لە یەکێك دەنێت[٢]. واتە سیستەمێکی پەیڕەوکراو نەبووە نازناوەکان بە پێی گرنگیی یان بەپێی زنجیرەیەکی دیاریکراو رێك بخات[٣]. مەغزای ئەمەش ئەوەیە، کاتێك کەسێك دەدرێتە

---

[1] بۆ نمونە بڕوانە: السمعاني: الأنساب، ج٥، ص٥٤. عمادالدين الكاتب: خريدة القصر، ج٤، مج٢، ص٤٢١. ابن الأثير: اللباب، ج١، ص٢١، ٣٩-٤٠، ١٥٧، ٣٠٦. ج٣، ص٩٢. ابن الصابوني: تكملة اكمال الاكمال، حققه وقدم له: مصطفى جواد، (بيروت: ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م)، ص١٠٤. ابن خلكان: وفيات، ج٧، ص١٤٠-١٤١. الذهبي: المشتبه، ج١، ص٥٤٩.

[2] بڕوانە حاڵەتی رێکخستنی نازناوە کوردییەکان لای (الذهبي)ی مێژوونوس (٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز مردووە) لە بەشەکانی دوایی کتێبەکەیدا بە ناوی: تاريخ الاسلام، (حوادث ٦٤١-٦٥٠)، ص١٨٤-١٨٥، ١٩٨، ٢٩١، ٣٠٠، ٣١٩. (حوادث ٦٥١-٦٦٠)، ص٣٥٠، ٤١٣، ٤٢٦. (حوادث ٦٦١-٦٧٠) ص٨٩، ٩٦، ١٥٩، ٢٩٣. (حوادث ٦٧١-٦٨٠)ص١٢٤، ١٨٩، ٢٥٧، ٢٦٩، ٣٧٦.

[3] جۆرە ریزکردنێکی ناوی بنەماڵەو نازناو هەیە، کە (الصفدي)ی مێژوونوس (٧٦٤ك/ ١٣٦٣ز مردووە) دەیخاتە روو و بەم جۆرەیە"نازناو لە پێش ناوی بنەماڵەوە دێت، ناوی بنەماڵە لە پێش ناوی کەسەوە دێت، دواتر ناوی وڵات و پاشان ریشەو پاشان ئاینزا...". بڕوانە: الوافي بالوفيات، ج١، ص٣٣-٣٤.

پاڵ کورد یان دەدرێتە پاڵ یەکێك لە خێڵە کوردییەکان، تەنها بۆ ناساندنی ئەو کەسەیە و ئەم کارە لەم مەسەلەی ناساندنە تێناپەڕێت، پێدانی نازناوی (الكردي)یش بە تاکێك لە کارایی ئەو تاکە کەم ناکاتەوە یان کار ناکاتە سەر پێگەی ئەم لە ناو کاراکانی تردا، چونکە ـ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ـ کوردبوونی ئەم کارایە تەحەکوم بە کارایی و پێگەی کاراکە ناکات.

دەتوانین لە گۆشەیەکی ترەوە سەرنجی پەیوەندیی نێوان ئینتیمای ئەتنیکی و ئینتیمای پسپۆڕی بدەین، ئەمەش لە حاڵەتێکی تری کارایی تاکی کوردەوەیە، کە لە کتێبی چینەکان و ژیاننامەکاندا بەرچاو دەکەوێت، لێرەدا ئینتیما بۆ کورد رۆڵی خۆی هەیە لە دیاریکردنی ئینتیمای پسپۆڕیدا، ئەمەش لە ئەنجامی ئینتیمای ئەم کۆمەڵە ئەتنیکییەوەیە بۆ کۆمەڵێکی پسپۆڕیی دیاری کراو، کە سنورەکەی لە سنوری ئینتیمای رەگەزی فراوانترە، بۆ نمونە وەك ئینتیما بۆ ئاینزا. بەشی زۆری کورد لەسەر ئاینزای شافیعین (٢٠٤ك/٨١٩ز مردووە)، کە یەکێکە لە ئاینزا سوننییە سەرەکییەکانی فیقهـ و رێکخەری رێگەکانی ئیجتیهاد و دەرهێنانی حوکمەکانە، وەرگرتنی ئەم ئاینزایەش دوای سەرکەوتنی سوننییەکان بوو بەسەر ئاڕاستە و کۆمەڵە ئاینییەکانی وەك خەواریج، کە لەناو کورددا باوبوون[1]، ئیتر ـ لە بواری فیقهیدا ـ ئاینزای شافیعی لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی کورددا باڵادەست بوو، ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا کاری کردە سەر پێگەی تاکە کاراکانی کورد و فەقیهە کوردەکان لەناو ئەوانی تردا پێگەیەکی بەرزیان هەبوو.

لە وەرگرتنی ژیاننامەی کەسێتییە کوردییەکان لە لایەن مێژوونوسانەوە زۆر بە روونی ئەمە بەرچاو دەکەوێت، ئیتر ئەم مێژوونوسانە، چ نوسەری کتێبەکانی چینەکانی

---

[1] تا ئێستاش لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل نییە لەسەر ئەوەی کورد چۆن ئاینزای شافیعییان وەرگرتووەو وازیان لە ئاینزاو کۆمەڵە ئاینییەکانی تر هێناوە. هەر یەك لە حیسامەدین نەقشبەندی و عەبدولڕەقیب یوسف بە کورتی باسیان لە چۆنیەتیی بڵاوبوونەوەی ئاینزای شافیعی کردووە لە هەندێك لە ناوچە کوردییەکاندا، بە تایبەتی لە هەرێمی چیاو هەرێمی جزیرە. بڕوانە: الكرد في الدينور وشهرزور، ص٢٥٧. الدولة الدوستكية، ج٢، ص٢٥٦-٢٥٩.

تایبەت بە شافیعییەت بن[1]، یان کتێبەکانی مردووان (الوفیات)[2]، یان کتێبە مێژوویەکانی تر[3]، لای هەموویان ئەمە بەرچاو دەکەوێت. جگە لەمانە، تەنانەت کاریگەریی ئەم پابەندبوونە بە شافیعییەتەوە لە بەرهەمەکانی مێژوونوسێکی کوردی وەك ئیبن خەلەکانی هەولێریشدا[4]ڕەنگی داوەتەوە، بە تایبەتی لە کتێبی (وفیات الاعیان وانباء ابناء الزمان)ەکەیدا، ئەو کاتێك بڕیار دەدات، وەك پێویستییەکی ڕۆشنبیریی ئوممەتی ئیسلامی، ژیاننامەی ناودارانی کایەی ئیسلامی تۆمار بکات[5]، پابەندبوونی بە شافیعییەتەوە ڕۆڵێکی باڵای هەیە لە هەڵبژاردنی ناودارەکاندا. لەم کتێبەدا کەسێتی و فەقیهە شافیعییەکان، ڕێژەیەکی گەورەی ئەو ناودارانە پێك دەهێنن، کە مێژوونوس مێژووی ژیانیان دەنوسێتەوە و ڕێژەی شافیعییەکان دەگاتە نزیکەی

---

(1) السبكي: طبقات الشافعية، ج٤، ص ٥٦، ٢٠٧، ٣٠٥، ٣٢٣. ج٥، ص١٤، ١٩، ٥٧، ٦٥، ١٢٥، ١٢٧، ١٣٠. ج٦، ص١٢٥. الاسنوي: طبقات الشافعية، تحقيق: عبدالله الجبوري، (بيروت: ١٤٠٧هـ/ ١٩٨٧م)، ج١، ص٦٩، ٨٠، ٨٥، ٢٣٧-٢٣٩. ج٢، ص٤١، ١٦١، ١٨٦-١٨٧.

(2) المنذري: التكملة، مج١، ص٢٠٥، ٢١٣-٢١٥، ٤٤٢. مج٣، ص٩٣-٩٥، ١٣٦-١٣٧. ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣، ص٤٢٤-٤٢٥. ج٧، ص٦٥، ٢٥٤-٢٥٥. الكتبي: فوات الوفيات، مج٢، ص٣٠. الصفدي: الوافي بالوفيات، ج١، ص٢٠٣-٢٠٤.

(3) ابو شامة: الذيل على الروضتين، ص١٧٧-٢١٨. ابن الفوطي: مجمع الآداب، ج١، ص٨٩. اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٣، ص١٢٩، ٣٢١. الذهبي: تاريخ الاسلام (حوادث ٦٤١-٦٥٠هـ)، ص١٨٤-١٨٥، ٢٣٥. (حوادث ٦٧١-٦٨٠)، ص١٨٩، ٢٦٩.

(4) ناوی شەمسەدین کوڕی موحەمەد کوڕی ئیبراهیمی هەولێرییە، لە هەولێر لە دایك بووەو هەر لەوێش گەورە بووە، دواتر هەولێری بەجێهێشتووەو ڕووی کردووەتە وڵاتی شام و میسرو لەوێ پلەی (قاضي القضاة)ی وەرگرتووە. پاشان لە دیمەشق جێگیر بووەو هەر لەوێ ساڵی (٦٨١ك/ ١٢٨١ز) کۆچی دوایی کردووە . السبكي: م. س، ج٥، ص١٤. الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٧، ص٣٠٨. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: خليل ابراهيم (جاسم): منهج ابن خلكان في وفيات الأعيان، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٠)، ص١٥ به دواوه.

(5) وفيات الأعيان، ج١، ص٢٨٣.

(٦٠,٧١٪)ی سەرجەم ناودارانی ئاینزاکان[1]. بەمەش ئەوە دەردەکەوێت ئینتیمای مەزهەبی ـ کە بەرئەنجامی باوەڕی بنەماڵەکەیەتی بەم مەزهەبە ـ کاری کردووەتە سەر تێڕوانینی ئیبن خەلەکان بۆ کارا مێژووییەکانی سەرجەم کایەی ئیسلامی.

کەواتە ئەگەر کورد ئەم ئاینزایەیان وەرنەگرتایە و لە حوکمەکانی تایبەت بە پەرستن و هەڵس و کەوتدا پشتیان پێ نەبەستایە، ئەم ڕێژە زۆرەی کارا کوردە شافیعییەکان دروست نەدەبوون. لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئەوە لە بیر بکەین ئەم ئامادەییە بەهێزەی پابەندبووان بە ئاینزاوە ـ لە قۆناغی دوای قبوڵکردنی ئەم ئاینزایەدا ـ کاری کردووەتە سەر ئامادەیی کارای کۆیی کورد، لێرەدا ئینتیما بۆ کورد خۆی خزاندووەتە ناو ئینتیمای مەزهەبیی پەسەندکراو لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، چونکە مەزهەبی شافیعی توانی باڵادەستیی خۆی بەسەر ئەم زانینەدا بسەپێنێت، بۆیە بە ناچاری دەبووایە هەواڵ و ژیاننامەی فەقیه و پیر و پیاوە دیارەکانی ئەم مەزهەبە تۆمار بکرێت. ئەمە لە کاتێکدایە مێژوونوس بیر لەوە ناکاتەوە ژیاننامە و مێژووی ژیانی تاکی کورد لە خۆیدا تۆمار بکات، نەك لەپێناو ئینتیمایدا بۆ ئەم مەزهەبە، ئەم مەسەلەیە ـ واتە مەسەلەی کارایی کورد لەپێناو خۆیدا ـ سەبارەت بە زانینی مێژوویی بەرهەم هاتووی ئەو سەردەمە ـ دەچێتە ناو بواری بیر لێ نەکراوەوە، چونکە لە پلەی یەکەمدا و بەهۆی ئینتیما و باوەڕی مێژوونوسەکانەوە، کارایی مێژوویی پەسەند ئەوەیە کارایی سەراپاگیرانەی ئوممەتی ئیسلامی تەواو دەکات.

ئەوەی مەبەستمانە بیڵێین ئەوەیە: ئەوە شافیعی بوونی کوردە ڕێگە بە زانینی مێژوویی دەدات، کارایی مێژوویی ببەخشێت بە تاکەکانی ئەم کۆمەڵە ئەتنییە، نەك کوردبوونیان. بەڵام مەغزای گشتیی ئەم ئینتیمایە، لە ئینتیمای کورددایە بۆ ئەو ئینتیما گشتگیرەی لە ئوممەتی ئیسلامیدا خۆی دەنوێنێت. لە کۆتاییشدا ئاینزای شافیعی لە بوارە کاتی و شوێنییەکەی خۆیدا، بە یەکێك لە ئاینزا سوننییە بەرجەستەکەرەکانی

---

[1] لێکۆڵەر خەلیل ئیبراهیم جاسم، لە لێکۆڵینەوەکەیدا لە بارەی میتۆدی ئەم مێژوونوسەوە، ئەم ڕێژەیەی دەرهێناوە. بڕوانە: م.س، ص٦٧-٦٨. لە بارەی پێگەی شافیعییەکانیشەوە لە کتێبی (وفیات الأعیان)دا بڕوانە ئەوەی ساغکەرەوە (محقق)ی کتێبەکە ئیحسان عەبباس، نوسیویەتی، وفیات، ج٧، ص٨٠.

کارایی ڕەهای ئوممەتی ئیسلامی دەژمێررێت، کاتێکیش کورد دەبنە پەیڕەوکەری ئەم ئاینزایە، ئەمە وەك کارابیەکی مێژووییە بۆیان لە چوارچێوەی ئەم ئوممەتە سەراپاگیرەدا و لە ئاستی کارایی تاکیشدا دەبێتە هۆی نەمانی جیاوازی لە نێوان ئەمان و ئەو کۆمەڵانەی تری وەك عەرەبدا، کە لەسەر ئاستی کۆیی و لە زانینی مێژووییدا ئامادەییەکی مەرکەزییان هەبووە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مامەڵەکردن لەگەڵ کارایی مێژووییدا لەسەر ئاستی تاك، ئەو تێڕوانین و هەڵوێستانە تێك دەشکێنێت، کە لە کتێبەکانی مێژووی گشتیدا شێوەگیر بوون و لە بارەی مامەڵەکردنەوەن لەگەڵ بوونی مێژوویی داپۆشراو بە پێدراوە دەسەلاتخوازییەکانی ئەو کۆمەڵە مرۆییانەی دەچنە ناو چەمکی ئوممەتی ئیسلامیی سەراپاگیرەوە.

لە لایەکی ترەوە دەبینین کارایی تاك بە جۆرێك لە بوون، یان بە دوا واتای بوون دیاری دەکرێت، ئیتر ئەمە پەیوەست بێت بە بوونی کۆمەڵە ئەتنییەکەی ئەو تاکانەوە، یان پەیوەست بێت بەو شارەی تیایدا لە دایك بوون و گەورە بوون، یان تەنانەت سەردانیان کردووە. چونکە بوونی مێژوویی ئەو کۆمەڵە یان ئەو شارە پەیوەندییەکی ئاشکرای هەیە بە چەمکی کارابیەوە لای ئەو مێژوونوسەی بڕیار دەدات بەپێی ئەم چەمکانە مێژوو تۆمار بکات. کتێبی ((مێژووی هەولێر (تاریخ اربل))ی مێژوونوس ئین موستەوفیی هەولێریی[1]، بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەم پەیوەندییە لە نێوان کارایی و بووندا. کتێبەکە چوار بەرگ بووە[2]، بەڵام تەنها بەشی دووەمی ماوەتەوە[1]. ئەم بەشەی

---

(1) ئیبن موستەوفی: ناوی ئەبو بەرەکات موبارەك شەرەفەدین کوڕی ئیبن موستەوفیی هەولێرییە، ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٩ز) لە قەلای هەولێر لە دایك بووە، ئیبن موستەوفی لە خێزانێکە بەوە ناسراوە، کە نەوەکانی لە سەردەمی میرنشینی هەزبانی و ئەتابەکیدا پیشەی (الاستیفاء)یان وەرگرتووەو ئیبن موستەوفیش ئەم پیشەیەی وەرگرتووە. ئەم مێژوونوسە بەهۆی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر شارەکەی لە ساڵی (٦٣٤ك/ ١٢٣٧ز)دا، شارەکەی بەجێهێشتووە و چووەتە موسڵ و لەوێ ماوەتەوە تا ساڵی (٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز)دا کۆچی دوایی کردووە. جگە لە نوسینەوەی مێژووی شارەکەی، زۆر دانراوی تری هەیە، بە تایبەتی لە بواری زمان و ئەدەبدا. لەبارەی ژیاننامەکەیەوە بڕوانە: ابن خلکان: م. س، ج٤، ص١٤١-١٥١. الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٤، ص١٥٥. هه روه ها: حسين: اربيل في العهد الأتابكي، ص٢٧٦-٢٨٢.

(2) حسين: م. ن، ص٢٧٧.

کتێبەکە دیاردەی نەگونجانی تێدایە، ئەم نەگونجانەش چ لە هێنانی زانیارییەکاندا بێت، یان لەوەدا بێت، کە پەیوەستە بە مێژووی ژیانەکانەوە لە رووی دووبارەکردنەوەی ئەوانەی ژیانیان دەنوسێتەوە و رێك نەخستنی ژیاننامەکان بەپێی رێبازێکی دیاری کراو، چونکە لە رەشنوسی کتێبێك وەرگیراوە، کە پاکنوس نەکراوە و بە تەواوی رێك نەخراوە[٢]، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، دەتوانین بڵێین بیرۆکەی سەرەکی کتێبەکەمان پێگەیشتووە.

کرۆکی ئەم بیرۆکەیە ژیاننامە و هەواڵی ئەو کارایانەیە، کە هاتوونەتە هەولێر، یان ئەوانەی تیایدا دیار و ناودار بوون. ئەم بیرۆکەیە لە ناونیشانی تەواوی کتێبەکەدا بەرجەستە دەبێت، ناونیشانەکەش «مێژووی هەولێر - وریابوونەوەی وڵاتی سست بەهۆی ئەو ناودارانەی بۆی هاتوون (تاريخ اربيل المسمى نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل)»ە، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم شارە سست بووە و پاشان لەم سستییە بە ئاگاهاتووەتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو کەس و تاکانەوە بووە، کە بۆی هاتوون. بۆ تێگەیشتن لەم ناونیشانە و گرنگییەکەی سەبارەت بە کارایی مێژوویی تاکەکان و پەیوەندیی بە بوونی مێژوویی شارەکەوە، پێویستە لە واتای سستی و وریابوونەوە (الخمول والنباهة) رامێنین و تیایاندا قووڵ ببینەوە. ئەم دوو وشەیە دەلالەت لە بوونی مێژوویی دەکەن بەو جۆرەی لە بەشی پێشوودا ناساندمان، وریابوونەوە واتە هەستکردن بە بوونی شار یان هەستکردن بە بوونە پەسەندکراوەکەی لە کایەی ئیسلامیدا. بەڵام سستی واتە نەبوون (اللاوجود)، یان بوونێکی پەسەند نەکراو لە هەمان کایەدا. پەڕینەوەش لە سستییەوە بۆ وریایی لە رێگەی ناودارانەوە، واتە ئەو کارا مێژووییانەوە دەبێت، کە هاتوونەتە ئەم شارە و تیایدا دەردەکەون و ناوبانگ پەیدا دەکەن، ئیتر «کارایی» لەگەڵ «بوون»دا کارلێك دەکەن و فەزای بەرهەمهێنانی زانینی مێژوویی دروست دەبێت.

---

[1] (سامي بن السيد خماس الصقار) ئەم بەشەی کتێبەکەی ساغ کردووەتەوە (حققه) و لە زانکۆی کامبردج بڕوانامەی دکتۆرای پێ وەرگرتووە. ئەم بەشەی بە دوو بەش چاپ کردووە.

[2] بڕوانە ئەوەی ساغکەرەوەی کتێبەکە، لەم بابەتەدا بە بەڵگەوە دەیڵێت: تاريخ اربل، ق١، ص٢٥-٢٦.

بۆ ئەوەی لەم هاوکێشە ئاڵۆزە تێبگەین سەرەتا پێویستە ((سستی ـ نەبوون یان بوونی پەسەند نەکراو))ی ئەم شارە دەربخەین، بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەمە و بەپێی تێگەیشتنی ئیبن موستەوفی لە ((وریابوونەوەکەی ـ بوونە پەسەندەکەی)) تێ بگەین. سەرەڕای ئەوەی شاری هەولێر لە چاخە کۆنەکاندا ناوەندێکی ئاینی و رامیاریی گرنگ بووە و لە مێژوودا ئامادەییەکی بەهێزی هەبووە[1]، بەڵام لە سەدە سەرەتاییەکانی ئیسلامیدا هیچ رۆڵێکی نەبووە و وڵاتناس و مێژوونوسە موسڵمانەکانیش ئاوڕیان لێ نەداوەتەوە، هیچکام لە وڵاتناسانی وەك (الأصطخري) (٣٤١ك/ ٩٥٢ز مردووە) و ئیبن حەوقەل (٣٦٧ك/٩٧٧ز مردووە) و مەقدسی (٣٨٧ك/ ٩٩٧ز مردووە) و... هتد باسیان نەکردووە. هەروەها لە لایەن مێژوونوسە گەورەکانی وەك (ئەبو حەنیفەی دینەوەری و بەلاذری و یەعقوبی و طەبەری و مەسعودی و مەسکەویە و ...هتد)یشەوە پشتگوێ خراوە. ئەم شارە تا نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجی کۆچی/ یازدەی زاینی بە باسنەکراوی مایەوە، واتە تا ئەو کاتەی بوو بە ناوەندی میرنشینی هەزبانیی کوردی (٤٢٠-٥٢٦ك/ ١٠٢٩-١١٣٩ز)[2].

بە بۆچوونی ئێمە هۆی ئەم سستییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان لە کاتی پرۆسەی وڵاتگیرییەکاندا موسڵیان کرد بە شار، ئەمەش کاری کردە سەر بوونی مێژوویی هەولێر و ـ بە تێڕوانینی وڵاتناسەکان ـ موسڵ بووە پڕکەرەوەی کەلێنی نێوان ئازەربایجان و ئەرمینیا و عێراق و وڵاتی شام[3]. بەڵام هەر بە پێی پێوەری وڵاتناسەکان، هەولێر هیچ مێژوویەکی بۆ نەمایەوە، چونکە ئەو شارە ئیسلامییە نوێیە بوونی مێژوویی هەیە، کە شوێنی پشوو و نشینگەی سوڵتانی گەورەیە و شوێنێکە دیوانەکانی تیا کۆ دەکرێتەوە و کاروبارەکانی تیا دابەش دەکرێت[4]، هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە ئەمە

---

[1] لەبارەی هەندێك سیمای شاری هەولێر پێش هاتنی ئیسلام بڕوانە: مشیحازخا: کرونولوجیا اربیل، ت: عزیز عبدالأحد نباتي، (اربیل: ٢٠٠١)، ص١١٧ بە دواوە. هەروەها بڕوانە: احمد: ظهور الكرد في التاريخ، ج١، ص٥٣٢-٥٣٤.

[2] حسين: م. س، ص٣٣-٣٦. محمود: الامارة الهذبانية، ص٦١-٦٧.

[3] ابن الفقيه: مختصر كتاب البلدان، ص٢٦. ابن حوقل: صورة الأرض، ص١٩٥.

[4] بۆ ئەمە بڕوانە: المقدسي: احسن التقاسيم الى معرفة الأقاليم، (لايدن: ١٩٠٩)، ص٤٧.

بارودۆخی موسڵ بوو، دروستکردنیشی ((دیارترین سەرکەوتنی موسڵمانەکان بوو))[1]، بۆیە مێژوونوسەکان بە وردی بە دوادا چوون بۆ هەواڵ و ڕووداوەکانی شاری موسڵ و دەوروبەری دەکەن. لە نوسینی مێژووییدا ئەم شارە بووە ئەو ناوەندە شوێنیەی بە پێی ئەو پێگەی ڕووداوەکان دەزانرا، بە تایبەتی ڕووداوە کوردییەکان[2]. ئەمە لە کاتێکدایە ئەم شارە، یان ڕاستر نەینەوای کۆن، لە قۆناغی پێش ئیسلامدا، هەندێك جار دەخرایە سەر هەولێر، بە تایبەتی لە لایەن مەسیحییەکانەوە[3]. هەر چۆنێك بێت، شاری هەولێر لە سەدە سەرەتاییەکانی ئیسلامدا، بە هۆی بوونی ئەم ناوەندە شوێنیەوە واتە موسڵ، لە زەمەنی مێژووییدا هیچ بوونێکی نەبووە، واتە شوێنێکی بێ زەمەن بووە و لە ڕووی مێژوویی و جیۆگرافییەوە بوونی نەبووە.

بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ئیبن موستەوفی، هەولێر دەبێتە شوێنگەیەکی زەمەنی و بوونەوەرێکی تەواو مێژوویی، بەڵام - لە ڕوانگەی ئیبن موستەوفییەوە - ئەم بوونە بەستراوە بەو ناودار (کارا مێژوویی)انەوە، کە سەردانی دەکەن[4]، یان تیایدا سەر هەڵدەدەن و دەردەکەون[5]، ئەم سەردان یان دەرکەوتنانە بوونێکی مێژوویی دەدەن بەم شارە، چونکە بوونی ئەو کەسانە لە شاردا، مانای بینینی بوونی مێژوویی ئەم شارەیە. بەپێی هزری مێژوونوسیش بایەخی ئەو کارایانە، لەو بوونەدایە دەیدەن بە شوێنەکە، چونکە بە هاتن یان سەرهەڵدانی ئەمانە نەبێت، شارەکە لە سستییەکەی بە ئاگا

---

[1] م. ن، ص١٣٨-١٤٥. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبد الماجود احمد (السلمان): الموصل في العهدين الراشدي والأموي، (الموصل: ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٥م)، ص٢٣ بە دواوە.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ج٩، ص٤٩٠، ٥٥١. ج١٠، ص٣٨، ٤٠. المسعودي: التنبيه والاشراف، ص٣٤٤. القرطبي: صلة تاريخ الطبري، ص٢٥، ٥٥. مؤلف مجهول: العيون والحدائق، ج٤، ق٢، ص١٤٣. ابن الجوزي: المنتظم، ج٥، ص٢٣٥٦. ابن الأثير: الكامل، ج٦، ص١٥-١٦، ٥٠٦- ٥٠٧. ج؟، ص١٧٤-١٧٥.

[3] السلمان: م. س، ص٢٥.

[4] بۆ نمونە بڕوانە: م. س، ق١، ص٤٧، ٥٤، ٧٠، ٨٠، ٨٩، ١٠٣، ١٠٧، ١٣٣، ١٦٢، ١٦٥، ١٦٩، ٢٨١. ( زۆر جێگەی تر)

[5] م. ن، ق١، ص٤٠-٤٣، ٥٠-٥١، ٧٤، ٨١، ٨٣-٨٤، ٨٦، ٩٢-٩٣، ١٠٥-١٠٦، ١٢١، ١٤٥، ١٥١، ١٧٢، ١٨٤-١٨٥، ٢٠٣-٢٠٤، ٢٠٧-٢٠٨، ٢٧١، ٢٧٦.

نایەتەوە. بەڵام - لە هەمان کاتدا - ئەم شارەش پێگە و پلەی خۆیان پێ دەدات لە مێژوودا، چونکە پەیوەندییان بەم شوێنەوە خاڵی وەرچەرخانە لە کارایییە مێژووییەکەیاندا، ئەگەر چی - بە گشتی - کارایی ئەم تاکانە بە هاتن یان سەرهەڵدانیان لەم شارەدا دیاری ناکرێت، بەڵکو بە پێگەی کۆمەڵایەتی - رۆشنبیرییان لە کایەی ئیسلامیدا وەك گشتێك، دیاری دەکرێت.

**٣ - میتۆدی مێژوونوسەکان و چێوەدارکردنی کارایی تاکی کورد**

ئینتیمای تایبەتمەند بەسەر ئەم جۆرە لەنوسینەوەی مێژوودا زاڵە، بۆیە هەموو هەوڵدانێك بۆ دۆزینەوە یان ئاشکراکردنی سیما و تایبەتمەندییەکانی میتۆدی تۆمارکردنی هەواڵی ئەو کارا مێژووییانەی ئینتیمایان بۆ کۆمەڵێکی مرۆیی کارای دیاریکراوی کایەی ئیسلامی هەیە، ئەنجامەکەی گشتی دەبێت و ناتوانرێت بەپێی ئەم ئینتیمایە پەی بە تایبەتمەندێتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا ببرێت. میتۆدی خستنەرووی کارایی مێژوویی لەسەر ئەم ئینتیمایە بنیات نەنراوە، بە تایبەتی ئەو کتێبانەی بەوە جیا دەکرێنەوە مۆرکێکی گشتییان هەیە، نەك ئەو کتێبانەی تایبەتن بە کارایی تاکەکانی ناوچەیەکی سنورداری بۆ نمونە وەك هەولێر و دەوروبەری، کە کۆمەڵێکی مرۆیی دیاری کراو تیایدا باڵادەستن[1]. لێرەدا کارای مێژوویی لەسەر بنەمای ئەم ئینتیمایە هەڵنابژێردرێت، بەڵکو لەسەر بنەمای کۆمەڵێك ئینتیمای تر و چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراو هەڵدەبژێررێت، کە تاکەکە هەیەتی و مێژوونوس لەبەرچاویان دەگرێت و دەیانکاتە بناغەی نوسینی کتێبەکەی، وەك ئەوەی تاکەکە لە پیاوماقوڵەکانە و مێژوونوس هەواڵەکانی تۆمار دەکات[2]، یان لەو کەسانەیە فەرموودەکانی

---

[1] بڕوانە: م. ن، ق١، ص٤٠-٤١، ٩٢-٩٣، ٢٧١-٢٧٦.

[2] بۆ نمونە بڕوانە: ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج١، ص١٨٠-١٨٧، ٢٦٠-٢٦١، ١٧٧-١٧٨. ج٣، ص٢٤٢-٢٤٥. ج٥، ص٧٩-٩٢. ج٦، ص٤٠٥-٤٠٩. (هەروەها چەند شوێنێکی تر)

پێغەمبەریان لەبەرە، یان گێڕەرەوەی ئەم فەرموودانەن[1] و مێژوونوس دەیانخاتە ناو کتێبەکەی لەبارەی ئەم کەسانەوە، واتە لەسەر بنەمای ئامانجێکە و مێژوونوس لە نوسینەوەی مێژوودا لەبەر چاوی دەگرێت و لە کایەی ئیسلامیدا بە دوای ئەو کارا مێژووییانەدا دەگەڕێت، کە ئەم ئامانجەی بەدی دێنن، بۆ نمونە ئەگەر لێکۆڵەر بە دوای رێگرێکی کورددا بگەڕێت، کە پەشیمان بووەتەوە، دەبێ لە کتێبێکی تایبەت بە پەشیمان بووەوەکاندا (التوابین) بۆ ئەمە بگەڕێت[2]، یان ئەگەر بە دوای ئەو کوێر و نابینایانەی کورددا بگەڕێت، کە ناوبانگ و پێگەیەکیان هەیە، دەبێت چاو بە کتێبێکدا بخشێنێت لەبارەی ئەوانەی ئەم ناتەواوییەیان هەیە و[3] بەم جۆرە تا دوایی.

ئەم گشتگیرییەی مامەڵەکردن لەگەڵ کارای مێژووییدا، کە بێگومان بەرهەمی گشتگیریەتی چەمکی ((ئوممەتی ئیسلامی))یە، بواری ئەوەمان پێ نادات - لەم لێکۆڵینەوەیەدا - لە میتۆدە پەیڕەوکراوەکانی نوسینەوەی مێژووی کاراکانی کورددا قووڵ ببینەوە، چونکە لەم بوارەدا هەر هەوڵێك بدرێت، ئەنجامەکەی گشتی دەبێت. بۆیە لێرەدا تەنها چەند تێبینییەك دەخەینە روو، کە سیاقی گشتیی لێکۆڵینەوەکە تەواو دەکەن و هەندێك سیمای کارایی مێژوویی تاکی کوردمان بۆ ئاشکرا دەکەن.

گرنگترین مەسەلە، کە پەیوەستە بەم جۆرە لە نوسینەوەی مێژوو، خستنە رووی بابەتی مێژوویی، یان ژیاننامەی کەسەکان و چۆنییەتی ریزکردنیانە. گومانی تیا نییە کارایی تاك ملکەچی ئەو چوارچێوەیەیە، کە هزری مێژوونوس تیایدا دەخولێتەوە، چونکە ئەو چوارچێوەیە دەرکەوتنەکانی ئەم کاراییە دیاری دەکات، لێرەدا زانینی مێژوویی کاتێك باسی ژیاننامەی کوردێك یان هەر کەسێکی تر دەکات، خود پەسەندییە هزرییەکەی دەردەکەوێت، چونکە ئەم تاکە لە دەرەوەی بیرکردنەوەی مێژوونوس و ئەو ئامانجەی بۆ کتێبەکەی داناوە، هیچ کاراییەکی نییە شایەنی باسکردن بێت.

---

(1) المنذري: التکملة، مج١، ص٢٠٥، ٢٤١-٢٤٢، ٤٢٦، ٤٤٤. مج٣، ص٩٣-٩٥، ١٣٦-١٣٧. مج٤، ص٣٣-٣٤، ٣٥-٣٦، ٥٠، ٢٤٣-٢٤٤، ٢٧٥-٢٧٦. الذهبي: تذکرة الحفاظ، (بیروت: ١٩٥٨)، ج٢، ص٧٥٤-٧٥٥، ١٣٠٨. ج٤، ص١٢٠٤.

(2) المقدسي: کتاب التوابین، ص٢٢٢-٢٢٣.

(3) الصفدي: نکث الهمیان، ص٩٠، ١٤٢، ١٥٣، ٢٦٤، ٢٩٣.

بوونی مێژوویی سۆفییەکی کارا لە ڕەهەندەکانی کەسێتییە سۆفییەکەیدا کورت دەبێتەوە، موزەفەر کرماشانی سۆفییەکی شاری کرماشانی کوردییە لە هەرێمی چیادا، لای نوسەرانی چینی سۆفییەکان (طبقات الصوفية) وا دەناسرێنرێت ((یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی هەرێمی چیا))[1] و گرنگیی ئەم کەسە سەبارەت بە مێژوونوسانی ژیاننامەکەی لەوەدایە ((پیرەکان (المشايخ)ی تەریقەتەکەی کردووە بە یەك و یەکی خستوون))[2]، واتە کارایی موزەفەری قرمسینی لە ئینتیمایدا نییە بۆ هەرێمی چیا و شاری کرماشان، بەڵکو لە ئینتیمایدایە بۆ چینی چوارەمی چینەکانی سۆفییەکان (الطبقات الصوفية). کەواتە لەم بارەدا، ئەوەی لەبارەی ئینیتیماکانی جگە لە سۆفیگەرێتیی ئەم کارا مێژووییەوە دەزانرێت، لەوە تێناپەڕێت یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی هەرێمی چیا، جگە لەمە ژیاننامەی ئەم کەسە بریتییە لە کۆمەڵێك وتەی سۆفیگەرییانە[3].

بەڵام ئایا ئەمە مانای کەم و کوڕیی مێژوونوسە بەرامبەر بە نوسینەوەی مێژووی ژیانی ئەم کەسە و کەمکردنەوەی کاراییە مێژووییەکەیەتی؟ بێگومان ئەگەر لە زەینی بەرهەمهێنەرەوە، یان با بڵێین لە زەینی تۆمارکەری هەواڵەکانی ئەم کەسەوە سەیری مەسەلەکە بکەین، وەڵامەکە نەخێر دەبێت، چونکە مێژوونوس لە سەرەتای کتێبەکەی لە بارەی سۆفییەوە ڕای دەگەیەنێت ئەو باسی ((ژیاننامەی پیرانی ئەم تەریقەتە دەکات، لە ڕووی داب ونەریت و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و بیر و باوەڕەکانی ناو دڵیانەوە))[4]. ئەو ـ واتە مێژوونوس ـ هەموو ئەمانە بە کاریگەریی ئینتیماکانی ئەنجام دەدات، یان بە کاریگەریی هەستکردنی بە بایەخی عەقیدەیی ئەوانەی مێژووەکەیان تۆمار دەکات، ئەم کارە دەکات. لە تێڕوانینی مێژوونوسدا ئەوانە ((کەسانێکن خاوەنی

---

[1] السلمي: طبقات الصوفية، بتحقيق: نورالدين شريبة، ط٣، (القاهرة: ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م)، ص٣٩٧. الأصفهاني: حلية الأولياء في طبقات الأصفياء، (بيروت: د. ت)، ج١٠، ص٣٦٠-٣٦١. القشيري: الرسالة القشيرية في علم التصوف، تحقيق و تعليق: الشيخ عبدالحليم محمود، (دمشق: ١٤٢٣هـ/ ٢٠٠٣م)، ص١١٠.

[2] السلمي: م. ن، ص٣٩٧.

[3] السلمي: م. ن، ص٣٩٦-٣٩٨. الأصفهاني: م. س، ج١٠، ص٣٦١. القشيري: م. س، ص١١٠.

[4] القشيري: م. ن، ص٩.

راستیی یەکتاپەرستین، فەرموودە دەگێڕنەوە، خاوەنی بیری راست و داب ونەریتی جوانن و تا رۆژی قیامەت شوێنەکەوتەی سوننەتەکانی پێغەمبەرن))[1]. مەبەست لە هەموو ئەمانەش ئەوەیە ئەم ژیاننامانە ((بنە هێزێك بۆ موریدەکانی ئەم تەریقەتە))[2]. لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە لە تۆمارکردنی مێژووی تاکێکی وەك موزەفەری کرماشانیدا، پاڵنەرێکی تەواو خودی هەیە، بۆیە دەبێت ئەم مێژووەش گوزارشت لەم پاڵنەرە بکات و وەڵامدەرەوەی ئەم پاڵنەرە بێت نەك شتێکی تر.

مێژوونوس مێژووی کەسە کاراکان دەنوسێتەوە، بەڵام لەم نوسینەوەیەدا خودپەسەندییەکی ئاشکرا هەیە لە باسکردنی هەواڵەکانی پەیوەست بەم کەسانەوە، مەبەستیشمان لە خودپەسەندی باس نەکردنی هیچ هەواڵێکی کەسەکەیە لە دەرەوەی مەودای دیاریکراوی کارایییەکەیدا. لەوانەیە ئەم خودپەسەندییە لە نوسینەوەی مێژوودا، لە تێگەیشتنێکی ترەوە بۆ بوونی مێژوویی سەرچاوەی گرتبێت، وەك لەم پارەدا ئاماژەمان پێکرد. ئەو بوونەی لە میانەی دیاریکردنی رەهەندەکانی کارایی تاك لەم مێژووەدا بەدی دێت، لە تایبەتمەندێتییەوە بەرەو گشتێتی دەچێت، واتە کارای مێژوویی ئەوەیە لە بووندا قەوارەیەکی تایبەتی هەیە، بەڵام ئەم قەوارەیەی تەنها لە چوارچێوەی گشتیی چەمکی بوونی مێژووییدا بەدی دێت، ئەم چوارچێوەیەش نادۆزرێتەوە ئەگەر بێت و بە هەمان ئەو رێگەیە بیر نەکەینەوە، کە لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا پەیڕەو کراوە. بەپێی ئەم رێبازی بیرکردنەوەیە، بوونی تاك لە میانەی میتۆدی وێناکردنی بوونی مێژووییەوە لە مێژوودا بەدی دێت، لێرەدا بوونەوەر چەند دەرکەوتنێکی (تجلیات) هەیە مێژوونوس نایانبینێت، یان بە راستی نایەوێت بیانبینێت، چونکە مێژوونوسی دیکە هەن دەیانبینن و تۆماریان دەکەن یان هەر خۆشیانی لێ نادەن، بۆ نمونە ـ وەك پێشتر باس کرا ـ میر دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کوردی لای مێژوونوسێکی وەك مەسکەویە بوونێکی دەسەڵاتخوازانەی هەیە[3]، کەچی کارایی ئەم بوونە لای مێژوونوسی هەواڵی

---

[1] السلمي: م. س، ص٢.

[2] القشيري: م. س، ص٩.

[3] تجارب الأمم، ج١، ص٣٩٨-٤٠٠. ج٢، ص٣٢-٣٧.

شاعیرەکان تەسک دەبێتەوە و لە چەند دێڕە شیعرێك تێ ناپەڕێت[١]. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەمە، نمونەیەکی تر دەهێنینەوە لە بارەی کەسێتییەکی دیکە، کە ناوبانگی زیاترە، ئەویش صەلاحەدینی ئەیوبییە. کاتێك مێژوونوسێك لەو کتێبەیدا باسی صەلاحەدین دەکات، کە تایبەتی کردووە بە گێڕەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر و زاناکان، زۆربەی ژیاننامەی صەلاحەدین بریتییە لە باسکردنی ریش سپییەکانی و ئەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، واتە هەموو ئەوەی پەیوەستە بە کارایی ئاینی ـ ڕۆشنبیرییەوە، ئەو ـ لە زۆربەی ژیانیدا ـ کەسێکە فێر دەبێت و فەرموودە دەگێڕێتەوە و[٢]ئەو بوونە مەرکەزییەی نییە، کە مێژوونوسانی وەك عیمادەدین کاتیب و ئیبن شەدداد و ئەبو شامە و ...هتد، پێیان داوە. صەلاحەدین لەم چەمکە تایبەتەی بوونی مێژووییدا، بەزۆری کارایەکی ڕۆشنبیری و ئاینیی شوێنێکی (موقع) دیاریکراوە، لەو ساڵەی تیایدا کۆچی دوایی کردووە. کەواتە تایبەتێتیی و گشتێتیی بوونی مێژوویی و ڕەهەندەکانی ئەم بوونە و دەرکەوتنی کاراییەکەی، بە گشتی بەستراون بە بیرکردنەوە و میتۆدی مێژوونوسەوە، بەبێ ئەوەی ئەمە مانای کورتبوونەوەی ئەم کارە بێت لە مێژوونوسانی کتێبی چینەکاندا (کتب الطبقات) بە تەنها، بەڵکو ئەمە فەزایەکی گشتی بووە و سەرجەم زانینی مێژوویی لێی دەر نەدەچوو. ئەمە بە ڕوونی لە مامەڵەکردنی مێژوونوسێکی وەك ئیبن جەوزی لەگەڵ کارا مێژووییەکاندا دەردەکەوێت. پێشتریش ئاماژەمان بەوە کرد ئەم مێژوونوسە، کاتێك مێژووی گشتی دەنوسێتەوە، لەم مێژووەدا ڕووداو و ژیاننامەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە. کتێبی (المنتظم) کراوە بە دوو بەشەوە: لە بەشی یەکەمدا باسی ڕووداوە مێژووییەکان دەکات لە ساڵێکی دیاری کراودا، بەڵام لە بەشی دووەمدا باسی ژیاننامەی مردووەکانی هەمان ساڵ دەکات، بۆیە لێرەدا مێژووی جیهانی دەبێتە مێژووی جیهانیی ژیاننامەکانیش[٣].

---

[1] المنذري: التكملة، مج١، ص٣٣٧-٣٣٩.

[2] االباخرزي: دمية القصر وعصرة اهل العصر، تحقيق: سامي مكي العاني، (بغداد: ١٩٧١)، ج١، ص٣٨٦.

[3] ئەم دابەشکردنە لەگەڵ مێژووی ئیسلامیدا دەست پێ دەکات، نەك پێشتر. بڕوانە:
H. A. R. (Gibb) : Islamic Biographical Literature, in : Historians, p. 56.

ئەم میتۆدە دوو جۆر کارایی مێژوویی داوە بە هەندێك لە تاکەکان و هەریەك لەم دوو جۆرەش مەغزایەکی تایبەتی خۆیان هەیە. بۆ نمونە لە حاڵەتی میر بەدری کوڕی حەسنەوەیهدا ئەمە بەرچاو دەکەوێت، ئەو میرێکە لە رووداوە سیاسی و ئاینییە گشتییەکاندا رۆڵی خۆی هەیە، پارە دەدات بەوانەی رێ لە کاروانی حاجییەکان دەگرن، بۆ ئەوەی رێگە بە کاروانەکان بدەن بە سەلامەتی تێپەڕن[1]، پەیوەندی سیاسیی لەگەڵ دامەزراوەی خەلافەتدا هەیە[2]، کۆمەڵێك دادوەریشی هەیە مێژوونوس باسیان دەکات[3]. واتە ئەو کارایەکی مێژووی گشتییە لەو گۆڕەپانەدا، کە مێژوونوس تایبەتی دەکات بە بوونی ئەو، بۆیە کاتێك مێژوونوس ئەم بوونە دەچەسپێنێت دەیەوێت بەمە لە سیاقی گشتیی رووداوەکاندا ئەو کارایی‌ەی میرمان پیشان بدات، کە لە چوارچێوەیەکی زەمەنیی دیاری کراودا، کارایی سەراپاگیر تەواو دەکات. بەڵام کاتێك مێژوونوس مێژووی ژیانی هەمان میر دەنوسێتەوە و دوو لاپەڕە بۆ ژیاننامەکەی تەرخان دەکات[4]، بەمە لە لایەکەوە کارایی‌ەکەی لە کارایی گشتی جیا دەکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە لە کارایی ئەو کەسانەی تر جیای دەکاتەوە، کە بە پێی پیتی ئەبجەدی ژیاننامەکانیان دەنوسێتەوە. لەم دوو لاپەڕەیەدا، میر بەدر یەکەیەکی مێژوویی سەربەخۆیە و ماهییەتی کارایی‌ەکەی، جیاوازە لەو ماهییەتەی لە سیاقە گشتییەکەدا هەیبوو. بە پلەی یەکەم ئەم کاراییە، لەو چالاکییە سیاسی و کارە خێرخوازی و بیناسازییانەدایە، کە ئەم کەسە لە ژیانی خۆیدا ئەنجامی داون و بوونەتە هۆی ئەوەی مێژوونوس دان بە بوونە مێژووییەکەیدا بنێت. بە پلەی دووەمیش لە بیۆینەیی کارایی‌ەکەیدایە لە روانگەی مێژوونوسەوە. ئەم بیۆینەییە تێگەیشتنی مێژوونوسانی ژیاننامەکان لە مێژوو و کارای مێژوویی دیاری دەکات. لێرەدا کارای مێژوویی ئەوەیە خاوەنی کۆمەڵێك سیفەت و تایبەتمەندی و بایەخدانە و مێژوونوس هەست دەکات پێویستە بە مەبەستی پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن لە ژیاننامەی پێشینەکان تۆماریان بکات. لێرەدا میر بەدر

---

[1] المنتظم، ج٩، ص٤٢٥١، ٤٢٦١، ٤٣١١.

[2] م. ن، ج٩، ص٤٢٧٧.

[3] م. ن، ج٩، ص٤٣٦٤.

[4] م. ن، ج٩، ص٤٣٦٠-٤٣٦١. لێرەدا مەبەست دوو لاپەڕەی چاپکراوە.

ئەوەندەی لە مێژووی گشتیدا بوار درا بێت بوونی پێ دراوە، لە هەمان کاتدا مێژوویەکی تایبەت بە کارایی خۆیشی هەیە.

وەك پێشتر وتمان، بە زۆری کارایی مێژوویی لە کتێبی چینەکان و ژیاننامەکاندا، ملکەچی ئەو میتۆدەیە مێژوونوس بۆ تۆمارکردنی هەواڵی کاراکان هەڵی دەبژێرێت، واتە مێژوونوس جگە لە پلانەکەی خۆی بۆ هەڵبژاردنی خاوەن ژیاننامەکان، گوێ بە هیچ شتێکی تر نادات، ئەم پلانەش لەسەر بنەمای ژیاننامەکان، یان لەسەر بنەمای بنەماڵە و نازناو، یان لەسەر بنەمای ناوی کەسەکە، یاخود لەسەر هەر بنەمایەکی ترە، کە مێژوونوس دایناوە[1]. زۆربەی مێژوونوسەکانیش ژیاننامەی کەسەکانیان بە پێی پیتەکان ڕێکخستووە. ئەم میتۆدە ئەگەرچی ئاسانە، بەڵام - سەبارەت بە زەینی تۆمارکەری مێژوو - ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێت دەبێتە هۆی دواخستنی کەسانێك، کە کاراییەکی گەورەیان هەیە و کەسانێکیش پێش دەخرێن، کە بەم جۆرە خاوەنی کارایی نین، بۆیە ئیبن خەلەکان - یەکێکە لە پەیڕەوکەرانی ئەم میتۆدە - ڕای دەگەیەنێت ئەم میتۆدە دەبێتە هۆی «دواخستنی ئەوانەی لە پێشەوەن و پێشخستنی ئەوانەی لە دواوەن ، یان دەبێتە هۆی دانانی کەسێك لەناو کۆمەڵێکدا، کە خۆی لەوان نییە»[2]. ئەو گونجان و هاوجۆرییەی ئیبن خەلەکان ئاواتەخوازبوو لە نێوان کارا مێژووییەکاندا هەبێت، لەم میتۆدەدا لەسەر ئاستی کارایی تاك بەدی نایەت، بەڵام لە ڕووە سەراپاگیرەکەوە هاوجۆری و گونجان دەبینرێت، ئەگەر چی پیتە ئەبجەدییەکان یان نازناو بڕیاری دیاریکردنی پێگەی کارا دەدەن لەناو ئەوانی تردا.

ئەم سەرنجانەمان لە بارەی میتۆدەوە خستەروو، وەك ئاسانکارییەك بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتی کارایی تاکی کورد لە لایەن مێژوونوسانەوە کاتێك باسی ئەم کاراییە دەکەن.

---

(1) لە بارەی ئەم بنەمایانەو گرنگترین کتێب، کە بە پێی ئەم بنەمایانە دانراوە، بڕوانە: مصطفى: التاريخ العربي والمؤرخون، ج١، ص٤٣٠-٤٤١.

(2) وفيات الأعيان، ج١، ص٢٠.

لێرەدا کتێبیِ (مجمع الأداب في معجم الألقاب)ی ئیبن فوطیی[1] مێژوونوس، نمونەیەکی باشە بۆ ئەم جۆرە باسە.

ئەم مێژوونوسە کتێبەکەی بە پێی پیتە ئەبجەدییەکان و بەگوێرەی نازناو ڕێکخستووە، لای ئەو نازناو مەسەلەیەکی سەرەکییە و کارایی تاکی پێ دیاری دەکرێت، ئەو نازناو و ناو و بنەماڵە وەردەگرێت، پاشان باسی ئەو ڕەگەزانەی تر دەکات، کە کەسێتیی خاوەن نازناوەکە پێك دەهێنن[2]. بەراورد بە کتێبەکانی تری ژیاننامە، ئەم زانیاری زۆر لە بارەی ئەوانەوە ناهێنێت، کە مێژووی ژیانیان دەنوسێتەوە، بۆیە سیمای گشتیی ژیاننامەکانی ئەم کتێبە کورتبڕییە[3]. بەڵام تاکە پەیوەندیی بەهێزی نێوان خاوەن ژیاننامەکان، نازناوەکانیانە. جگە لەمە هەر تاکێك لە خۆیدا یەکەیەکی مێژووییە، کۆی یەکەکانیش ئەو مێژووە دەنوێنێت، کە ئیبن فوطی دەیەوێت تۆماری بکات، نەك مێژووی کارایی خودیی کەسەکان.

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەوەی وا دەکات تاکێکی کورد لەم مێژووەدا کارا بێت، نازناوەکەیەتی، تەنها نازناو گوزارشت لە کارایی تاك دەکات و سیماکانی بوونی مێژوویی تاکی پێ دیاری دەکرێت، ئەو ـ واتە ئیبن فوطی ـ کاتێك لە بارەی کوردێکی کارای خاوەن نازناوەوە زانیاری لا نەبێت، تەنها ناوی کەسەکە دەهێنێت[4]، بەبێ ئەوەی

---

[1] کەمالەدین عەبدولرەزاق کوڕی ئەحمەد کەڕی موحەمەد ناسراو بە (ابن الفوطي)، ساڵی (٦٤٢ك/ ١٢٤٤ز) لە بەغداد لە دایك بووەو هەر لەوێش ساڵی (٧٢٣ك/١٣٢٣ز) کۆچی دوایی کردووە. شارەزاییەکی باشی لە زۆربەی زانست و زانینەکانی سەردەمی خۆیدا هەبووە. سەدان دانراوی هەیە، دیارترینیان کتێبەکانی بریتین لە: کتێبی (مجمع الآداب المرتب على معجم الأسماء في معجم الألقاب) تەنها کورتەی ئەم کتێبەمان پێ گەیشتووە، هەروەها کتێبی (نظم الدرر الناصعة في شعراء اهل المائة السبعة) و کتێبی (التاريخ على الحوادث) و ...هتد. الذهبي: تذكرة الحفاظ، ج٤، ص١٤٩٣-١٤٩٤. الكتبي: فوات الوفيات، مج٢، ص٣١٩. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: زكية حسن ابراهيم (الدليمي): المؤرخ البغدادي ابن الفوطي وكتابه تلخيص مجمع الآداب في معجم الالقاب، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٩٠)، ص٤-٥٢.

[2] لە بارەی ئەم ڕەگەزانەوە بە شێوەیەکی گشتی، بڕوانە: الدليمي: م. ن، ص٦٣-٩٤.

[3] م. ن، ص٦٥.

[4] مجمع الآداب، ج٢، ص٣٣. ج٣، ص٣٤٦.

ئەمە ببێتە کەم و کوڕی بۆ کتێبەکەی، چونکە دانانی نازناوی ئەم کەسە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا، بەسە بۆ ئەوەی ببێتە کارایەکی مێژوویی. ئەو تاکانەی کورد، کە مێژووی ژیانیان دەنوسرێتەوە، بریتین لە میرو فەقیە و سۆفی و زاهید و قورئان خوێن و ...هتد. لەوانەیە ئاسان نەبێت بتوانین پەی بەوە ببەین لە کاتی هەڵبژاردنی کارا کوردەکاندا لە پشت زەینی مێژوونوس - نەك سەرچاوەکانیەوە - هەیە و بە پێی نازناوەکانیان هەر یەکەیان لەو شوێنەدا دادەنێت، کە لە سیاقی گشتیی مێژووی ((نازناو))دا بۆی دانراوە. بەڵام لەوەی پەیوەستە بە کۆی یەکە مێژووییەکانەوە، هەست بە جۆرە مامەڵەکردنێکی هوشیارانەی مێژوونوس دەکرێت. چونکە هەرە کاراکان لە میر و سەرکردەکانن (کارای سیاسی)، یان لە زاناو فەقیە و زاهیدەکانن (کارای ئاینی - رۆشنبیری)، واتە خاوەن شمشێر و پێنوسەکانی کوردن، کە ئاساییە کارایی مێژوویی خۆیان هەبێت و خاوەن نازناوی تایبەت بن. کاتێك مێژوونوس لە بارەی یەکێك لەم کارا کوردانەوە دەدوێت، هەوڵ دەدات قەناعەت بە خوێنەرانی کتێبەکەی بکات، کە ئەم کەسە بوونێکی ئیجابیی و پێگەیەکی مێژوویی بەرزی هەیە و نازناوەکەی لەگەڵ کەسێتییەکەیدا دەگونجێت، چونکە قەڵەم بە دەستانی کورد کۆمەڵێك سیفاتی چاکیان هەیە[1]، لە خانەی چاکە و چاکەخوازیدان[2]، خاوەن شمشێرەکانیشیان (اهل السیوف) مێژووەکی چاکیان هەیە و بەوە جیا دەکرێنەوە خاوەن عەقڵێکی پەسەندن[3] و لە سوارچاکی و ئازاییدا ناوبانگیان هەیە[4]، لە فەرمانڕەواییشدا

خاوەن ئەزموونن[5] و شاعیرەکان پیایاندا هەڵدەدەن[6]. بەم جۆرە گونجانی کارا و نازناوەکەی بەسە بۆ سەرکەوتنی پرۆژەکەی مێژوونوس، کە نوسینەوەی مێژوو و دەرخستنی کارایی مێژوویی ئەو تاکانەیە لە کایەی ئیسلامیدا دەردەکەون.

---

(1) م. ن، ج١، ص٨٢، ٢٣٦.

(2) م. ن، ج٢، ص١٠٥.

(3) م. ن، ج١، ص١٠١.

(4) م. ن، ج١، ص١٨١، ٢٩٧، ٣٥٦، ٥٥٩. ج٢، ص٢٤.

(5) م. ن، ج٢، ص٤٩.

(6) م. ن، ج٢، ص٦٣.

# پاری سێهەم
# میتۆدی مێژوونوسەکان لە ریوایەتکردن و گێڕانەوەی هەواڵە کوردییەکاندا

## ١ـ سیماکانی گێڕانەوەی هەواڵی کورد

لەم لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر وەك بیرۆکەیەك باس لە مێژوو کراوە، بۆیە وا دیارە لە گێڕانەوە و باسکردنی هەواڵەکاندا پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە لایەنە میتۆدییەکان یان شێوازە پەیڕەوکراوەکانی زانینی مێژوویی ئیسلامییەوە نییە. بەڵام ئێمە لە لێکۆڵینەوەی بیرۆکەی مێژوودا جۆرە پەیوەندییەك و تەنانەت ئاوێتە بوونێك لە نێوان ئەم بیرۆکەیە و میتۆدی خستنە رووی بابەتەکەی و روونکردنەوەیدا دەخەینەروو، بێگومان میتۆدەکە کاریگەریی خۆی هەیە لە شێوەگرتنی بیرۆکەکەدا بە جۆرێك، کە لەگەڵ پێدراو و رێبازەکانیدا بگونجێت.

لە لایەکی ترەوە و وەك لە پاری پێشووشدا ئاماژەمان پێکرد، مێژوونوسەکان لە گێڕانەوەی هەواڵەکانی کورد و تۆمارکردنیاندا، پەیڕەوی میتۆدێکی تایبەتیان نەدەکرد، بەڵکو بە پێی ئەو میتۆدە گشتییەی لە نوسینەوەی رووداوەکاندا پەیڕەو دەکرا، مامەڵەیان لەگەڵ کورددا دەکرد. ئەوان کاتێك باسی کورد دەکەن، وا دەرناکەوێت بە تایبەتمەندێتییەکەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، بەڵکو هەواڵەکانی ئەم کۆمەڵە تێکەڵ بە سیاقە هەواڵییە سەراپاگیرەکە دەکەن و کاتێکیش تەنها لە کورد دەدوێن، لەو میتۆد و رێگایانە لا نادەن، کە بۆ گێڕانەوە و باسکردن دایاننناون.

بەڵام دەتوانین بە دوای هەندێك لە شوێنەوارە ئاشکرا و گشتییەکانی ئەو میتۆدانەدا بگەڕێین، کە پەیڕەو کراون بەسەر رووداوە کوردییەکان و چۆنیەتی گێڕانەوەی ئەو هەواڵانەی پەیوەستن بەم رووداوانەوە: هەواڵی کوردی، وەك هەواڵەکانی تر، رووداوێك دەگێڕێتەوە سەرەتا و کۆتایی هەیە. یەك رووداو ـ هەر چییەك بێت ـ سێ خولی سەرەکیی هەیە و لە میانەی ئەو خولانەوە سیاقی گێڕانەوەییە تایبەتەکەی تەواو دەکات، ئەو خولانەش بریتین لە: خولی دامەزراندن ـ سەرەتا، خولی تەواوکاری و خولی

کۆتایی[1]. وەك نمونەیەکیش بۆ ئەمە، ئەو رووداوە وەردەکرین، کە پەیوەستە بە میر فەزلۆنی کوردیی میری میرنشینی شەددادییەوە، ئیبن ئەثیر لەناو رووداوەکانی سالّی (٤٢١ك/١٠٣٠ز) دا باسی کردووە: ((ئەم فەزلۆنی کوردییە دەستی گرتبوو بەسەر بەشێك لە ئازەربایجانداو بوو بووە خاوەنی، بۆیە وا رێککەوت لەو سالّەدا هێرشی کردە سەر خەزەرەکان، لێی کوشتن و حورمەتیانی بە تالاّن برد و زۆر شتی بەدەست هێنا. لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ولاّتەکەی خۆی، بە خاوی رێگەی دەبڕی و وای دەزانی پەرێشانی کردوون و بەوەوە خەریکی کردوون، کە بەسەریدا هێناون، کەچی ئەوانیش شوێنی کەوتن و دە هەزار کەسیان لە هاوڕێکانی و ئەو خۆبەخشانە کوشت، کە لەگەلّیدا بوون، هەموو ئەوەشیان گێڕایەوە، کە لێیان سەنرابوو، پارە و سامانی سەربازە ئیسلامییەکانیشیان بۆ خۆیان برد و گەڕانەوە))[2]. ئەم گێڕانەوەیە، کە تاکە گێڕانەوەی ئەم مێژوونوسەیە لە بارەی رووداوەکانی میرنشینی شەددادیی لە سەردەمی ئەم میرە کوردییەدا[3]، لە رووی میتۆدییەوە رووداوێکی نمونەییە، مێژوونوس لە خولی دامەزراندن ـ سەرەتادا بە ناساندنی ئەم میرە کوردە (دەست بەسەرا گرە) دەست پێ دەکات، ئەگەر چی ناساندنەکە تەنها لە دەست بەسەرا گرتندا کورت بووەتەوە، دوای ئەمە دەچێتە خولی دووەم (تەواوکاری)یەوەو لە هێرش کردنە سەر خەزەرەکان دەدوێت لە لایەن ئەم میرەوە، پاشان خولی کۆتایی دێت، ئەویش دژە هێرشەکەی خەزەرەکان و کوشتنی موسلّمانەکانە.

ئەمە لە رووی روالّەتی رووداوەکەوە، بەلاّم لە رووی ناوەڕۆکەوە، یان بە پێی لۆجیکی بوونی سەلبی و بوونی ئیجابی، یان ئەوەی بە خولە نەبینراوەکانی رووداو ناو دەبرێت، ئەوا بە رای ئێمە بەم جۆرەیە: میرێکی موسلّمانی دەست بەسەراگر (خولی دامەزراندن)، دژی خەلّکی خانەی کوفر جیهاد دەکات و دەسکەوت بە دەست دێنێت (خولی تەواوکاری)، بەلاّم شکست دێنێت و سەربازە موسلّمانەکان دووچاری کوشتن و تالاّنکردن دەکاتەوە (خولی کۆتایی). واتە مێژوونوس لە میانەی ئەم سێ خولەوە

---

[1] العظمة: الكتابة التاريخية، ص٤٤. ئەویش وەری گرتووە لە:

W. E. bull: Time, Tense, and the verb, (Berkly: 1968), P.17.

[2] الكامل، ج٩، ص٤٠٩.

[3] لە بارەی ئەم میرەوە بڕوانە:

Minorsky: studies, pp. 40-45.

(میتۆدی نوسینی مێژوویی) ئەو تێڕوانین و هەڵوێستە شێوەگیربووانە بەرجەستە دەکات، کە لە بارەی میری دەست بەسەراگر و مەرجە پێویستەکانی چەسپاندنی بوونی ئەون لە مێژوودا (بیرۆکەی مێژوو).

لە دەقەکەدا، وا دیارە هەواڵەکە سەربەخۆیە و سیاقێکی گێڕانەوەیی ناوەکیی هەیە، کە لە هەواڵەکانی تر جیای دەکاتەوە، یاخود نایبەستێت بەو هەواڵانەی باسی رووداوی تر دەکەن. بەڵام مێژوونوس هەمان ئەم تێڕوانینەی نییە و لەو باوەڕەدایە گێڕانەوەی ئەم رووداوانە پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە، ئەو بە میتۆدە سەراپاگیرەکەی گێڕانەوەی هەواڵەکان، ئەم پەیوەندییە لە نێوان سەرجەم رووداوەکاندا بەرجەستە دەکات. بۆیە قورسە ئەو لێکدانەوەیەی پێشوو قبوڵ بکرێت، ئەگەر بێت و رووداوەکە نەخەینە ناو ئەو چوارچێوە گشتییەوە، کە مێژوونوس لە ناویدا دایدەنێت و لەوەش تێ نەگەین، کە ناومان نا خولەکانی رووداوی نەبینراو. رووداو ئەگەرچی لە رواڵەتدا یەکەیەکە، بەڵام یەکەیەکی سەربەخۆ شێوەگیر ناکات و ئەو خولانەش، کە رووداوەکە پیایاندا تێدەپەڕێت، کۆمەڵێك خولی سەراپاگیرتر تەواو دەکەن، کە تەنها تێڕوانین و هەڵوێستەکان تەحەکومیان پێ ناکەن، بەڵکو میتۆدی پەیڕەوکراویش لە گێڕانەوەی ئەم رووداوە و رووداوکانی تردا تەحەکومی پێ دەکەن.

لە راستیدا وەك زانراوە، لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا دوو میتۆدی سەرەکی بۆ گێڕانەوەی رووداوەکان هەن و لە خستنە روو و ریزکردنی بابەتە مێژووییەکەدا پەیڕەو دەکرێن:

<u>میتۆدی یەکەم</u>: پێی دەوترێت نوسینەوەی مێژوو بە پێی ساڵ، یان مێژووی ساڵە وەختی، ئەم میتۆدە زنجیرەی مێژوویی لەبەرچاو دەگرێت، مێژووی طەبەری نمونەیەکی روونی ئەم شێوازەی نوسینەوەی مێژووە، چونکە مێژوونوس سەرجەم هەواڵەکانی پەیوەست بە ساڵێکی دیاری کراو دەنوسێتەوە و ـ وەك شتێکی باو ـ بە وشەی «هەروەها تیایدا ـ وفیها» بەیەکەوەیان دەبەستێت. بەرستەی «پاشان چووە ناو ساڵی ئەوەندە...» کۆتایی هاتنی ساڵەکەمان بیر دەخاتەوە.

**میتۆدی دووەم**: پێی دەوترێت نوسینەوەی مێژوو بە پێی بابەتەکان، وەك بە پێی دەوڵەتەکان یان سەردەمی پاشاو خەلیفەکان و هاوشێوەی ئەم بابەتانە، مەسعودی لەو مێژوونوسە یەکەمانەیە، کە ئەم ڕێبازەی پەیڕەو کردووە[1].

بە بەراوردکردنێکی سادە لە نێوان ئەم دوو میتۆدەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت دووەمیان ڕووداوەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ سیاقێکی گونجاو و لێرەدا ئەو داخرانە ڕەت دەکرێتەوە، کە لە میتۆدی یەکەم یان لە چوارچێوەی زەمەنیدا هەیە و بواری باسکردنی ئەو ڕووداوانەی تیا نییە، کە ڕەهەندێکی زەمەنیی فراوانیان هەیە[2].

بە پێی ئەم دوو میتۆدە، هەواڵی کوردی بە زۆری بەستراوە بە ناوەندەوە، بە واتا گشتگیرەکەی چەمکی ((ناوەند))، لە وانەیە ئەم مەرکەزە پاشایەك یان دەوڵەتێك یان ساڵێکی دیاری کراو بێت و هەواڵەکانیش دەبنە شوێنەکەوتەی ئەم ناوەندە دامەزراوەییە - مرۆییە - زەمەنیە[3]. مێژوونوسی پابەند بەم دوو میتۆدە و ڕەهەندە ناوەندییەکەیانەوە، لە کاتی تۆمارکردنی هەواڵی کورددا، تەنها یەك ڕوو لە ڕووەکانی بوونی کورد یان کاراییان وەردەگرێت، ئەویش ئەو ڕووەیە، کە لەگەڵ ئەم مەرکەزیەتەدا دەگونجێت. بۆ نمونە لەو دوو گێڕانەوەیەی یەعقوبیی مێژوونوسدا، کە لە بارەی کوردەوەن، یان ڕاستتر لە بارەی دوو دەسەڵاتداری کوردەوەن (جیلوەیه و عیصمەتی کوردی)[4]، دەبینین هەواڵی ئەم دوو کەسە سیاقە هەواڵییە گشتییەکە تەواو دەکەن و لەم سیاقەدا نەبێت، ناتوانین لێیان تێ بگەین و دەرهێنانیان لەم سیاقە گشتییەدا، کەمکردنەوەیە لە بوون و کاراییە مێژووییەکەیان، چونکە ئەوان تەنها دوو بوونی مێژوویین و بوونیان بەستراوە بە بوونەوەرە مەرکەزییەکانی ترەوە و ئەم مەرکەزیەتەیان

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم دوو ڕێبازەو سەرەتای سەرهەڵدانیان، بڕوانە: العزاوی: المنهجية التاريخية في العراق القرن (٤هـ/١٠م)، (بغداد: ١٩٨٨)، ص٣١-٦٥.

[2] م. ن، ص٤٦.

[3] العظمة: الكتابة التاريخية، ص٨٨.

[4] تاريخ اليعقوبي، ج٢، ص٤٤٠، ٤٧٣.

لەو میتۆدەوە بە دەست هێناوە، کە یەعقوبی لە تۆمارکردن و گێڕانەوەی هەواڵەکاندا پەیڕەوی دەکات[1].

لای هیچ یەکێك لە مێژوونوسەکان سیاقێکی ناوەکی نییە سەرجەم هەواڵە کوردییەکان کۆ بکاتەوە، هەروەها هیچ بەدوای یەکدا هاتنێکیش لە نێوان هەواڵەکاندا نییە، تەنانەت بە ئاشکرا هەست بە دابڕان دەکرێت لە نێوانیاندا. ئەم هەواڵانە لای زۆربەی مێژوونوسەکان، چەند پارچەیەکی پەرت وبلاون لە نێو هەواڵەکانی تری پەیوەست بە مەرکەزە ـ میتۆدییەوەکەوە. بەڵام ئەم دابڕان و پەرت و بلاوییە بە هیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێت هەواڵی کورد لای مێژوونوس هیچ مەغزایەکی نییە، مەغزای راستەقینەی هەواڵەکان لە پەیوەندیی هەواڵە گێڕراوەکەدایە بە هەواڵەکانی ترەوە لە چوارچێوەی زەمەنی یان بابەتیی گشتیدا. لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵمان دا لەم چوارچێوانەوە هەواڵە کوردییەکان شی بکەینەوە، بۆ ئەوەی بەمە دەست بخەینە سەر حوکمە پێشوەختە شاراوە و بالادەستەکان بەسەر تێڕوانین و هەڵوێستی مێژوونوس لە سەرجەم قۆناغە مێژووییەکاندا. دەمانەوێت لێرەدا ئەوە زیاد بکەین ئەم چوارچێوە میتۆدییانە ـ لە چوارچێوەیەکی زەمەنی یان بابەتیی دیاری کراودا ـ تەحەکوم بە خستنە روو و گێڕانەوەی هەواڵە کوردیەکان دەکەن.

کەواتە لەم بارەدا، پەرت و بلاوی و پچڕ پچڕیی ریشەیی هەواڵە کوردییەکان، ئەگەر بە پێی ئەو ماوە زەمەنییە سەیری بکەین، کە مێژوونوس تیایدا ژیاوە، کاریگەرییەکی گەورەی نەبووە لەسەر مەغزای گشتیی ئەم هەواڵانە، یەککگرتوویی سەرجەم هەواڵە کوردییەکانیش لەو وێناکردنانەدا دەردەکەوێت، کە لەو سەردەمەدا لە بارەی بوونی مێژوویی کوردەوە شێوەگیر بوو بوون، واتە لە بارەی بوونی سەلبی یان بوونی ئیجابی و

---

[1] دەتوانین زۆر نمونەی تر بهێنینەوە لە بارەی ئەم پەیوەندییەی نێوان میتۆدی مێژوویی و بیرۆکەی مێژوو، لە سەرجەم قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامیدا، بۆ نمونە بڕوانە: ابن سعد: **الطبقات الكبرى**، مج٧، ص٢٨٠. ابو حنيفة الدينوري: الأخبار الطوال، ص٣٦٧. القرطبي: صلة تاريخ الطبري، ص٦٤. ابن الجوزي: المنتظم، ج٥، ص٢٣٥٦. ج٩، ص٤٥٤٦. اليونيني: ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٢٢٢-٢٢٣، ٣٦٦-٣٦٧، ٤١٥-٤١٦. الذهبي: تاريخ الاسلام، حوادث و وفيات (٦٥١-٦٦٠هـ). زۆر شوێنی تری ئەم کتێبانەو کتێبی تر.

هەڵوێستە گشتییەکە لە بەرامبەر ئەم بوونە یان وێناکردنە شێوەگیربووەکان لە بارەی کاراییە کۆیی و تاکەکەسییە مێژووییەکەیانەوە. بۆ ئەمەش، ئەگەر - بۆ نموونە - هەواڵەکانی پەیوەست بە یەکێك لە میرنشینە کوردییەکان دەربهێنین و لە پاڵ یەکدا دایان بنێین و بیان کەین بە تەوەرەیەکی تایبەت، وەك ئەوەی باسی بە دوای یەکدا هاتنی میرەکانی بکەین، ئەوکاتە جۆرێك لە پەیوەندیی زنجیرەیی - پێکەوە بەستراو لە نێوان هەواڵەکاندا دەدۆزینەوە، لێرەدا هەواڵە پەرت و بڵاوەکان هەمان بونیادی گێڕانەوەییان هەیە، هەمووشیان لە دەوری یەك ناونیشان جێگیر دەبن، ئەویش میرنشینە باسکراوەکەیە، ئیبن خەلدون لەگەڵ هەندێك لە میرنشینە کوردییەکاندا ئەمەی کردووە[1].

بەڵام لە روویەکی ترەوە، ئاشکراکردنی تاکە بونیادێکی گێڕانەوەیی و پشت بەستن پێی، بۆ رزگاربوون لە پەرت و بڵاوی و دابڕانەکان، بەبێ گەڕانەوە بۆ ناساندنی ئەم بونیادە، وەك کارەکەی ئیبن خەلدون دەبێتە هۆی ئەوەی هەواڵەکان بونیادێکی زۆر گرنگ لە دەست بدەن، ئەویش ئەو بونیادە زەمەنییەیە، کە هەر هەواڵێکی کوردی بە تەنها هەیەتی و ئێمەش بە درێژایی ئەم نامەیە، سوور بووین لەسەر دەرخستنی رۆڵە کاراکەی لە دیاریکردنی پێگەی کورد لە زانینی مێژووییدا. بۆیە رێکخستنی بابەتە مێژووییەکەی کتێبێکی مێژوویی دیاریکراو لە بارەی میرێکی کورد یان میرنشینێك لە میرنشینە کوردییەکان، وەك ئەوەی لای مەسکەوەیه[2]یان روذراوری[3]یان ئیبن قەلانسی[4]یان ئیبن ئەثیر[1] یان ئەوانی تر هاتووە، پێویستی بە دووبارە ناساندنەوەی ئەو

---

[1] تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٤١٠-٤١٨، ٦٨٧-٦٩٩.

[2] تجارب الأمم، ج١، ص٣٩٨-٤٠٤. ج٢، ص٣١-٣٦. ( باسی هەواڵەکانی میر دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی دەکات)

[3] ذيل تجارب الأمم، ج٣، ص٢٧٨-٢٩٢. ( باسی هەواڵەکانی میر بەدری کوڕی حەسنەوەیە دەکات)

[4] ذيل تاريخ دمشق، ص٢٨٢، ٢٩٦، ٣٠٤-٣٠٦، ٣١١، ٣٥٩. ( باسی هەواڵەکانی میری موجاهیدەکان بەزان دەکات، کە لە پەراوێزی ژمارە ()ی لاپەڕە ()ی ئەم نامەیەدا باسکراوە)

ڕووداوانەیە، کە لە ڕووی زەمەنییەوە ڕێکخراون، بەبێ ئەوەی بتوانین لەم پرۆسەیەدا ئەو دەسەڵاتە سەراپاگیرە بدەینەوە بە زەمەن، کە لە کاتی پێکهێنانی چوارچێوەی گشتیی ڕووداوەکان لە ساڵێکی دیاری کراو یان لە چەند ساڵێکی بە دوای یەکدا هاتوودا هەبووە.

لێرەوە هەر هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لە مێژووی قۆناغێکی دیاریکراو، بە پێی زانینی مێژوویی ئیسلامی، دەبێت هەموو ئەو ڕووداوانە لە خۆ بگرێت، کە لەو قۆناغەدا ڕوویان داوە، بە چاوپۆشین لە ڕەگەزی کارای مێژوویی و جۆر و ئینتیماکانی. ئەو ڕیزکردنەش مێژوونوس لە هێنانی سەرجەم ڕووداوەکاندا پەیڕەوی دەکات، بەپێی بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان ڕیزکردنێکی پەسەندە. ڕووداوەکەش لە خۆیدا هیچ سەنگ و کاریگەرییەکی نییە، چونکە سەنگ و کاریگەرییەکەی لە سیاقی گشتیی گێڕانەوەکەدا دەرناکەوێت و لەم سیاقەدا ئەو واتایانەی مێژوونوس لە مێژوودا دەیاندات بە ڕووداوەکە و ئەو پێناسەیەش، کە دەیدات بەم کایە (حقل) مەعریفییە، بەرجەستە دەبن.

ناکرێت بە پشت بەستن بە ڕووداوی کوردی لەخۆیدا، ئەو واتایە بەدەست بهێنرێت، کە دراوە بە مێژوو، چونکە ئەمە مانای گەڕانە بە دوای واتا لە بەشەکییەکاندا، لە کاتێکدا واتای ڕاستەقینە لە گشتە سەراپاگیرەکەدایە، کە ـ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ـ بەهۆی ئەو میتۆدەی لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا پەیڕەو کراوە، لە سیاقی گشتیی گێڕانەوەکەدا دروست دەبێت. بۆیە یەعقوبی ناتوانێت وا پێناسەی مێژوو بکات، کە بریتییە لە مێژووی بە دوای یەکدا هاتنی خەلیفەکان یان خاوەن دەسەڵاتە سیاسی و ئاینییەکان، هەروەها ناشتوانێت تەنها بە پەنا بردنە بەر دوو گێڕانەوە کوردییەکە لە خۆیاندا، ئەم واتایە ببەخشێت. هەروەها ئەگەر عیمادەدین کاتبی ئەصفەهانیش، بیەوێت بەبێ باسکردنی بەدوای یەکدا هاتنە هەواڵییە تایبەتەکەی قۆناغی دوای گرتنەوەی قودس لە مێژووی جیهادییانەی ئوممەتی ئیسلامیدا، کە صەلاحەدینی ئەیوبی

---

(1) بۆ نموونە بڕوانە ئەوەی ئەم مێژوونوسە لە بارەی مێژووی میرەکانی میرنشینی ڕەوادیی کوردی لە ئازەربایجان، باسی دەکات لە کتێبی: الکامل، ج٩، ص٣٧٨، ٣٨٢، ٣٨٤، ٤٥٧، ٥٩٨، ٦٥٠. ج١٠، ص٤٤٧، ٤٨٥، ٤٨٧، ٥١٦، ٥٩٧.

دەیناند، تەنها باسی هەواڵە تایبەتەکان بە کورد[1] بکات، ئەوا ناتوانێت لەو چەمکەدا، کە ((جیهاد)) و ((رزگارکردنی)) قودس دەیدەن بە مێژوو، باسی دابڕان بکات[2].

لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا هەواڵ زیاد لە زەمەنێکی هەیە، چونکە تەنها یەك جار ناگێڕرێتەوە، بەڵکو لەو کاتەوەی ئەم هەواڵە دروست دەبێت، دەتوانرێت لە زیاتر لە یەك ئاستی زەمەنیدا بگێڕرێتەوە، دەتوانین دوو لەو ئاستە زەمەنییانە دیاری بکەین و ئاماژەیان پێ بکەین، ئەوانیش بریتین لە:

**ئاستی یەکەم:** لەو مێژوونوسەدا بەرجەستە دەبێت، کە ئەم هەواڵە دەگێڕێتەوە و لە زەمەنی رووداوەکەوە نزیکە، بۆیە تەنها ئەو دەیگێڕێتەوە، یان مێژوونوسانی تری هاوچاخیشی لە گێڕانەوەیدا بەشداری دەکەن، لەو سەرچاوە زارەکی یان نوسراوانەش ـ لەمرۆدا بزر بوون ـ هەواڵەکە وەردەگرێت، کە لە هەواڵەکەوە نزیکن، یاخود خۆیان سەرچاوەی هەواڵەکەن. لێرەدا مێژوونوس بە جۆرێك لە جۆرەکان، شایەد عەیانێکی هەواڵیەکە، یاخود خۆی سەر بە هەمان ئەو فەزا کۆمەڵایەتییەیە، کە رووداوەکە تیایدا رووی داوە و بووە بە هەواڵ، ئەو لە ژێر کاریگەریی ئەم فەزایەدایە و ناتوانێت رەهەندەکانی ئەو هەواڵە ببینێت، کە دواتر زەمەن یان گۆشەنیگای بینین ئاشکرایان دەکات. لای زۆربەی ئەو مێژوونوسانەی لە بەرهەمەکانیان دواین، ئەم هاوچاخییەی هەواڵەکان و کاریگەریی ئەم هاوچاخییەمان بینی لەسەر ئەو زانینەی، لەبارەی کوردەوە بەرهەم هاتووە، بەتایبەتی لای مێژوونوسانی وەك: طبەری لە قۆناغی بوونی کورد لە دەرەوەی دەسەڵاتی ناوەندی و مەسکەویە لە قۆناغی ساغ نەبوونەوەی دان پیانان یان دان پیا نەنان بە دەسەڵاتی میرە کوردەکان و لای عیمادەدین کاتب لە قۆناغی سەرسام بوون بە بوونی جیهادیانەی کورد و ... لای مێژوونوسانی تریش.

**ئاستی دووەم:** لەو مێژوونوسانەدا بەرجەستە دەبێت، کە دواتر دێن و زۆر لە زەمەنی هەواڵەکەوە دوورن، بۆیە لە مێژوونوس ـ گێڕەرەوەی یەکەم وەری دەگرن و لەو سیاقەدا جێگیری دەکەن، کە مێژوونوسی ئاستی یەکەم تایبەتی کردووە پێی. ئیبن خەلدونی بیرمەند رەخنەیەکی توند لەم مێژوونوسانە دەگرێت، بە تایبەتی ئەوانەی

---

[1] م. ن، ص٥٩، ١١٣، ١٥١-١٥٤، ٢٢٦، ٣٠٩، ٣١١، ٣٢٨، ٤٤٢، ٤٨٨، ٥٠٥، ٥١٣.

[2] الفتح القسي، ص٤٨-٤٩.

بەوەندە بەس دەکەن، کە هەواڵەکان لە مێژوونوسە پێشینەکان وەردەگرن، ئبن خەلدون ئەمانە بە خاو و خلیچك ناو دەبات، لەبەر ئەوەی "هەواڵی دەوڵەتەکان و حیکایەتی رووداوەکانی سەردەمە دێرینەکان دێنن، کە ئەمانە وێنەیەکن و لە بابەتەکانیان دارنراون"[1] هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمانە "لە بابەتەکانیاندا ئەو هەواڵانەی دەیان نوسن لە لایەن ئەوانەوە باس کراوە، کە بینیویانە و ئەمان وەك خۆیان دووبارەیان دەکەنەوە، وەك چاولێکەری ئەو پێشینانەی بایەخیان بەم مەسەلەیە داوە"[3]، مێژوونوسی ئەم ئاستی دووەمە ناتوانێت، یاخود نایەوێت تێڕوانین و هەڵوێستە شاراوەکانی پشت ئەو هەواڵە بگۆڕێت، کە جارێکی تر دەیگێڕێتەوە، ئەو بەمە مومارەسەی چەقبەستنی بیرکردنەوە دەکات لە مێژوودا، مەبەستیشمان لە چەقبەستن، نەبوونی توانای دەرچوونە لە لۆجیکی هەواڵە گێڕراوەکە و تەحەکومکردنی ئەم لۆجیکە بە تێگەیشتنی مێژوونوس لە مێژووی کۆن.

دەتوانین زۆر نمونە لەبارەی ئەو هەواڵە کوردییانە بهێنینەوە، کە مێژوونوسی ئاستی دووەم لە مێژوونوسی ئاستی یەکەم وەری گرتوون، دیارترین نمونەش وەرگرتنەکانی ئیبن ئەثیری مێژوونوسە لە طەبەری[2]. لێرەدا کەسی یەکەم هەواڵەکان لە مێژوونوسە کۆنەکە وەردەگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەك لە تێڕوانین و هەڵوێستە عەقیدەییەکانیدا بکات[3]، ئەو هەواڵەی کورد، کە مێژوونوسی ئاستی دووەم (ئیبن ئەثیر) لە شوێنی خۆیدا وەری دەگرێت، ئەو تێڕوانین و هەڵوێستانە تەحەکوم بە مەغزاکەی دەکەن، کە لە سەردەمی طەبەریدا باو بوون، مێژوونوسی دوایش ملکەچی لۆجیکی گێڕانەوەیی دەبێت و تێڕوانینەکان ناگۆڕێت، ئەگەر لە پرۆسەی گێڕانەوەشدا جۆرە گۆڕانێك بینرا، تەنها زیادکردنی هەندێ زانیاری یان زیادکردنی چەند هەواڵێکە، کە مەغزای سەرەکیی سیاقی گشتیی گێڕانەوەکە تەواو دەکەن بە پێی ئەو تێگەیشتنەی مێژوونوسی ئاستی یەکەم هەیەتی بۆی، واتە ئەم هەواڵە زیاد کراوانە تێڕوانین و هەڵوێستە شێوەگیربووەکانی

---

[1] المقدمة، ص٣.

[2] ئیبن ئەثیر خۆی لە پێشەکیی (الکامل)، ج١، ص)دا ئاماژە بەمە دەکات.

[3] بۆ نمونە بڕوانە: الطبري: م. س، ج٩، ص٤٧٤، ٤٩٠. ج١٠، ص٣٨، ٤٠. ابن الأثير: م. ن، ج٧، ص٢٤٠، ٢٥٧، ٤٦٦، ٤٦٩، ٤٧٠.

ئاستی زەمەنیی مێژوونوسی دووەم (لێرەدا ئیبن ئەثیر نوێنەرایەتی دەکات) روون دەکەنەوە، نەك تێڕوانین و هەڵوێستەکانی زەمەنی مێژوونوسی یەکەم. ئیبن ئەثیر لەکاتی نوسینەوەی مێژوودا، دەرك بەوە دەکات طبەری، کە لە پێش ئەم بووە، هەموو هەواڵەکانی تۆمار نەکردووە، بۆیە ئەم دێت گێڕانەوەکانی ئەو تەواو دەکات، ئەمەش بەوەی هەواڵ لە بارەی هەمان ئەو قۆناغەوە دەهێنێت، کە طبەری هەواڵەکانی تۆمار دەکات. لێرەدا دەبینین ئیبن ئەثیر هەندێك هەواڵ دەهێنێت، کە سەرەڕای طبەری، ئەو مێژوونوسانەی تریش پشتگوێیان خستووە، کە کتێبەکانیان بە ئێمە گەیشتووە، زۆربەی ئەم هەواڵانەش پەیوەستن بە کوردانی موسڵ و دەوروبەرییەوە[1]، کە ئیبن ئەثیر تیایدا ژیاوە، ئەم مێژوونوسە هەواڵەکانی لە سەرچاوەی ناوخۆیی بزربوو یان لە سەرچاوەی زارەکییەوە وەرگرتووە.

هەرچۆنێك بێت ئەو هەواڵانەی کورد، کە مێژوونوسی ئاستی دووەم تۆماریان دەکات و لە بارەی ئەو قۆناغەوەن مێژوونوسی ئاستی یەکەم تیایدا ژیاوە، گێڕانەوەکانی (سردیات) مێژوونوسی ئاستی یەکەم تەواو دەکەن، هەواڵەکەش بە رادەیەك نوێنەرەوەی کەسێتیی مێژوونوسە لە سەردەمەکەی خۆیدا، ئەگەر هەڵە نەبین، دەتوانین بڵێین لە کاتی گێڕانەوەی هەواڵەکاندا، مێژوونوسی دووەم کەسێتیی مێژوونوسی یەکەم وەردەگرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە بە چاوی خۆی ئەو رووداوەی نەبینیوە، کە دەیگێڕێتەوە و هەواڵەکە هیچ پەیوەندییەکی بە خۆی و تێڕوانین و هەڵوێستەکانییەوە نییە. بەڵام بۆچی مێژوونوس تەنها بەوەندە ناوەستێت هەواڵەکانی سەردەمی خۆی تۆمار بکات و واز لە هەواڵە کۆنەکان بهێنێت؟ بە رای ئێمە بۆیە هەواڵەکە دەگێڕێتەوە، چونکە لە لایەن ئەوانی پێشووترەوە گێڕراوەتەوە و لە سیاقێکی مێژوویی تایبەتدایە و ناتوانرێت دەستکاری بکرێت یان بگۆڕرێت. بۆیە مێژووی گێڕراوە بە پەسەندکراوی دەمێنێتەوە و هەریەکە لەوەی پێش خۆی وەردەگرێت[2]، گێڕانەوەی مێژووییش دەبێتە گێڕانەوەیەکی

---

[1] بۆ نمونە بڕوانە: الکامل، ج٦، ص٥٠٦-٥٠٧. ج٧، ص٤٥٤، ٥٣٨-٥٤٠.

[2] ئاشکرایە زۆر مێژوونوسی تر دوای ئیبن ئەثیر هاتوون و راستەوخۆ هەواڵەکانیان لێ وەرگرتووە، دیارترینیان بریتین لە: ئەبو فیدای ئەیوبیی (٧٣٢ك/ ١٣٣٢ز) لە کتێبەکەیدا (المختصر في اخبار البر)، هەروەها ئیبن خەلدون لەو کتێبەیدا، کە باسمان کرد.

سەروو زەمەنی و پڕکەرەوەی بۆشاییەك، کە لە نائامادەیی ئەو مێژووەدا دروست دەبێت، ئارەزووی گێڕانەوە دەبێتە پاڵنەرێکی بەهێزی تۆمارکردنی هەواڵی سەدەکانی پێشوو یان هەواڵەکانی سەرەتا.

ئەنجامی ئەم تەسلیمبوونە بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی رابردوو، ئەوەیە مێژوونوس خودە زەمەنییەکەی خۆی لە یاد دەکات و تێڕوانینەکانی رابردوو بەسەر ئێستادا دەگشتێنێت، دواجاریش سەرخستنی حەتمییەتە بەسەر تێڕوانین و هەڵوێستە بنیات نراوەکانی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا وەك گشتێك[1]. ئەمەش لەبەر ئەوەیە مەبەستەکانی هەواڵی مێژوویی، وەك لە هەواڵە کوردییەکاندا دەردەکەوێت، نە تازە دەبنەوە و نە دەشگۆڕێن، بەڵکو بەردەوام لای هەموو مێژوونوسەکانی سەر بە ئاستە زەمەنییە جیاواز و لە یەك دوورەکان، لە یەك حاڵەتدا جێگیر دەبن. بەڵام مێژوونوسی دوایی، کاتێك هەواڵێکی بینراو تۆمار دەکات، لەم کاتەدا، پەنا بۆ تێڕوانین و هەڵوێستە شێوەگیر بووەکانی زەمەنەکەی خۆی دەبات، لای ئیبن ئەثیر، ئەو کاتەی باسی صەلاحەدین و هاورێکانی دەکات، بە روونی هەست بەمە دەکرێت.

## ٢ ـ شوناسی گێڕانەوەیی هەواڵەکان و حەقیقەتی مێژوویی

شوناسی کۆمەڵێکی مێژوویی دیاری کراو لەوە دەرناچێت، کە یان شوناسی گێڕانەوەیە[2]، یان شوناسێکە دیاردە بەرچاوەکانی وەك باڵەخانە کۆنەکان و نەخش و نیگار و زەخرەفە و پارەو ...هتد بەرجەستەی دەکەن، ئەو مێژووەی لە رەمزەکانی ئەم بینراوانەدا هەیە نایەتە ناو بابەتەکەی ئێمەوە. بەڵام شوناسی گێڕانەوەی کورد ـ بە چڕکراوەیی ـ ئەو وێناکردنانە دەگرێتەوە، کە لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا لە بارەی

---

(1) بڕوانە: العروي: مفهوم التاريخ، ص٣٣٥.

(2) شوناسی گێڕانەوەیی: زاراوەیەکە لە فەیلەسوفیی هاوچەرخی فەرەنسی پۆل ریکۆر وەرمان گرتووە. ریکۆر ـ لە پێناسەیەکی سەرەتاییدا بۆی ـ پێی وایە شوناسی گێڕانەوەیی ئەوەیە خەڵك لە میانەی ناوەندێکی ئەرکیی گێڕانەوەییەوە (وساطة الوظيفة السردية)وەری دەگرن. بڕوانە:بول (ريكور): الهوية السردية، ضمن الكتاب الجماعي، الوجود والزمان والسرد، تحرير: ديفيد (وورد)، ترجمة وتقديم: سعيد الغانمي، (الدار البيضاء/ بيروت: ١٩٩٩)، ص٢٥١.

ریشەی کوردو سروشت و بوونی مێژوویی و پاشان کارایی مێژووییانەوە وەك کۆمەڵ و وەك تاك، پێك هاتوون. ئەمە شوناسێکی ئاڵۆز و بەناویەکدا چووە و زۆر دەرکەوتنی جیاوازی هەیە، بەبێ ئەوەی ئەمە لێکدژی یان خۆ پێدادانێکی کوێرانە بگەیەنێت، بەڵکو لە پشت ئەم فرەییەوە گونجانێك هەیە، کە سیماکانی لە ئاستی گشتیی گوتاری گێڕانەوەی زانینی مێژووییدا دەردەکەون.

لەم روانگەوە هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی کورت، باسی هەندێك لە سیما دیارەکانی ئەو گوتاری گێڕانەوەیە بکەین، کە بە درێژایی ئەم لێکۆڵینەوەیە مامەڵەمان لەگەڵدا کردووە، دەشمانەوێت بە گەڕانەوە بۆ ئەنجامەکانی بەش و پارەکانی پێشوو، لە رووی پێکهاتەکانی گێڕانەوەی مێژوویی تایبەت بە کورد و دەرکەوتەکانییەوە، کە پێویستن و تەواوکەری سیاقی توێژینەوەکەن، بە دوای مەغزای راستەقینەی ئەم گێڕانەوەدا بگەڕێین.

سەرەتا پێویستە ئەو سێ رەگەزە سەرەکییە لە یەك جیا بکەینەوە، کە لە کاتی باسکردنی کورد و مێژووەکەیدا، سیماکانی گوتاری مێژوویی دیاری دەکەن. رەگەزی یەکەم مێژوونوس یان گێڕەرەوەیە، رەگەزی دووەم گێڕانەوەکە یان بەرهەمە نوسراوەکەی مێژوونوسە، پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لە نێوان ئەم دوو رەگەزەدا هەیە، چونکە ئەگەر رەگەزی یەکەم نەبێت، ئەوا رەگەزی دووەمیش نابێت. رەگەزی سێهەمیش وەرگر یان خوێنەری گێڕانەوەکەیە.

بە رەگەزی سێهەم دەست پێ دەکەین، کە دەشتوانین بە رەگەزی نائامادە ناوی ببەین، بۆ ئەوەی لەم رەگەزە بدوێین، پێویستە کۆمەڵێك مەرج لە ئارادا بن: یەکەم، دەبێت وەرگر شارەزای زمانی عەرەبی بێت و ئاگاداری توانا رەوانبێژی و روونبێژییەکانی ئەم زمانە بێت، واتە دەبێت سەر بە رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی بێت، ئەگەر نا ناتوانێت بە قووڵی لە واتا و دەلالەتی هەواڵە کوردییەکان تێ بگات. دووەم، دەبێت ئەم وەرگرە بە دوای پەند و ئامۆژگاریدا بگەڕێت، چونکە ئامانجی مێژوو پەند و ئامۆژگارییە، کاتێکیش مێژوونوس لە سیاقی گشتیی گێڕانەوەدا هەواڵەکانی کورد دەگێڕێتەوە، چاوەڕێی ئەوە لە وەرگرەکانی دەکات پەندی لێ وەرگرن، بە تایبەتی خاوەن

شمشێر و دەسەڵاتدارەکان[1]، چونکە نابێت وەرگر تەنها لەسەر گێڕانەوەکە راوەستێت، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدات پەند و ئامۆژگارییەکانی پشت گێڕانەوەکەش ببینێت. پەند وەرگرتن ئەو ئەرکەیە، کە مێژوونوس بۆ وەرگری هەواڵەکانی دیاری دەکات، چونکە ئامانجی نوسینەوەی مێژوو و باسکردنی هەواڵەکانی کەسانی پێشوو، وەك لە دەستپێکدا وتمان، بریتییە لە پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن.

لە راستیدا ـ وەك یەکێك لە لێکۆڵەرەکان دەڵێت و ئێمەش لەگەڵیدا هاوڕاین ـ ئەگەر وەرگر ئارەزووی لە گوێگرتن یان خوێندنەوە نەبێت، ئەوا گێڕانەوەکە بێ مانا دەبێت و هیچ سوودێکیشی نابێت[2]، چونکە بۆ تێگەیشتن لە واتای تەواوی ناو گێڕانەوەکە، کردەی گوێگرتن و خوێندنەوە رۆڵێکی چارەنوسساز دەگێڕن[3]. لەوانەیە گێڕانەوەکە هەڵبەستراو و دروستکراو بێت، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ئامادەیی گوێگر مانای پێ دەدات یاخود ئەو واتایەی پێ دەدات، کە خۆی جارێکی تر دایدەڕێژێتەوە. وەرگری گێڕانەوەی مێژووییش بە پێی بابەتە گێڕراوەکە دەگۆڕێت، ئێمە بینیمان وەرگری گێڕانەوە تایبەتەکان بە ریشەی کورد، سەرەتا فارس و عەرەب (قەحتانی و عەدنانی) بوون، پاشان کورد خۆیان، بە تایبەتیش دەستەبژێرە رۆشنبیر و سیاسییەکانی کورد، ئەم گێڕانەوانەیان قبوڵ کرد و وەك باسمان کرد،جارێکی تر بە پێی تێگەیشتنی خۆیان دایان رشتنەوە.

وەرگرەکە لە هەر رەگەزێك بێت، لای ئەو کورد دەبنە کۆمەڵێکی ئەندێشەیی (المتخیلة)، کە یەکەم: تێڕوانینی مێژوونوس ـ گێڕەرەوە و دووەم: زمان و سێهەم: تێڕوانین و هەڵوێستەکانی وەرگر، تەحەکوم بە وێنەکەیەوە دەکەن، ناتوانین ئەمڕۆ بە تەواوی پەی

---

[1] بۆنمونە بڕوانە: مسکویە: تجارب الأمم، ج٢، ص٣٦-٣٧. رەخنە لە سیاسەتی میر دەیسەمی کوڕی ئیبراهیم و خراپ هەڵبژاردنی وەزیرە یاریدەدەرەکانی دەگرێت.

[2] عبدالفتاح (کیلیطو): الحکایة والتاویل ـ دراسات في السرد العربي، (الدار البیضاء: ١٩٩٨)، ص٣٣.

[3] ریکور: الحیاة بحثا عن السرد، ضمن: الوجود والزمان، ص٤٦.

بەمە ببەین، چونکە ئەم وێنەیەش بووەتە شتێکی مێژوویی و بە زۆریش تۆمار نەکراوە[1].

دەگەڕێینەوە سەر رەگەزی یەکەم لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی سیماکانی گوتاری گێڕانەوەیی، کە مێژوونوسە، لەم لێکۆڵینەوەیەدا سەبارەت بە ئێمە مێژوونوس گرنگترین رەگەزە، چونکە زۆربەی هەواڵ و گێڕانەوەکانی تایبەت بە کورد - واتە رەگەزی دووەم - لە میانەی مێژوونوسەوە دەگوێزرێنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین، یان با بڵێین لە توانامان‌دا نییە باسی کەسێتی مێژوونوس بکەین لە خۆیدا. ئایا مێژوونوس، کاتێك هەواڵەکانی کورد دەگێڕێتەوە، کەسێتییەکی سەربەخۆی هەیە؟ زۆر قورسە بتوانین ئەمە بسەلمێنین، بەڵام بە پێی ئەوەی بە درێژایی ئەم لێکۆڵینەوەیە بینیمان، مێژوونوس ئەوەندەی نوێنەرایەتیی کۆمەڵێك چوارچێوەی بابەتی (واتە نا خودی) دەکات، کە لە لایەن فەزای کۆمەلایەتی - عەقیدەیی - سیاسیی سەردەمەکەیەوە بەسەریدا سەپێنراون، ئەوەندە نوێنەرایەتیی خودی خۆی ناکات. مێژوونوس بەردەوام لەگەڵ غەیری خۆیدایە، ئەو کاتێك لە بارەی واتاکانی ناو زانینی مێژووییەوە بۆچوونەکانی دەردەبڕێت، لەگەڵ دەقی قورئانیدایە، کاتێك باسی رەگ و ریشەی کورد دەکات، لەگەڵ عەرەب یان فارسدایە، کاتێك باسی سروشتی کۆمەلایەتی - رەوشتیی کورد دەکات، لەگەڵ چینە تایبەتەکەدایە، کاتێك لە کوردێکی بەرهەڵستکار - یاخی دەڕوانێت، لەگەڵ دەسەلاتی ناوەندیدایە، کە پاساو بۆ رەوایەتیی بوونی مێژوویی میرێکی کورد دەهێنێتەوە، لەگەڵ فەقیهدایە، کاتێك کورد لە پێناو «ئوممەت - دەوڵەت»ی ئیسلامیدا جیهاد دەکەن، لەگەڵ کورددایە، کاتێکیش باسی کارایی مێژوویی نەتەوە و تاکەکان دەکات، لەگەڵ نەتەوە شارستانی و تاکە کاراکانی کورددایەو...هتد.

کەواتە زۆربەی زۆری مێژوونوسان، هەندێکیان نەبێت، کە ئیبن خەلدون پێشەنگەکەیانە، لە پرۆسەی تۆمارکردنی مێژوودا، خودە پسپۆڕەکەیان دەرنەدەخست و لەو تێڕوانینە گشتییەدا رۆچووبوون، کە لە لایەن ئەو فەزایەی پێشتر باسمان کرد،

---

(1) ئەوەی پەیوەستە بە تێڕوانین و هەڵوێستی خوێنەری هەنووکەییەوە، چ خوێنەرێکی ئاسایی بێت یان لێکۆڵەرێکی پسپۆڕ، ناچێتە ناو بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە، ئەگەرچی نکوڵی لە گرنگیی ئەم تێڕوانین و هەڵوێستانە ناکەین وەك بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوەیەکی تر.

بەسەریاندا سەپێنرابوو، ئەوان مێژوویان بەو جۆرە دەگێڕایەوە، کە ئەو فەزایە قبوڵی دەکرد. وەك طەبەریش ئاماژەی پێکردوە[1]، مێژوونوس بۆ ئەوەی پابەندبوونی خۆی بە چوارچێوە دیاری کراوەکەوە بسەلمێنێت، پەنای بۆ ئەو گێڕانەوەیە دەبرد، کە بەدەر بوو لە قووڵبوونەوە و بیرکردنەوە لەوەی دەیگێڕێتەوە، ئەمە لە روانگەی مێژوونوس خۆیەوە، بەڵام بە پێی تێڕوانینی ئێمە، لە گێڕانەوەی مێژووییدا کەسێتیی مێژوونوس بەو ئەندازەیە دەردەکەوت، کە سەردەمەکەی خۆی رێگەی پێ دەدا. لە کاتی گێڕانەوەی هەواڵەکانی کورد و ئەوانیتردا، سەردەمی مێژوونوسەکە کەسێتییە پابەندەکەی و تێڕوانین و هەڵوێستەکانی دیاری دەکات، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، ئەمەش بە پێی ئەو بابەتەیە، کە مێژوونوس باسی دەکات. لێرەدا دەتوانین بپرسین ئایا ئەو گێڕانەوە مێژووییەی مێژوونوس لە بارەی کوردەوە پێشکەشی دەکات، واقیعی ئەم کۆمەڵەمان پیشان دەدات، یان وێنەیەکی دیاریکراوی ئەم واقیعەمان بۆ دەگوێزێتەوە، وێنەیەك، کە زمان و توانا واتاییەکانی زمان و هەروەها هەڵوێستەکانی مێژوونوس و تێڕوانینی لە واقیع، تەحەکوم بە رەنگەکانییەوە بکەن، ئایا گێڕانەوەی مێژوویی مێژوونوس ئەمانەمان بۆ ئەنجام دەدات؟

ئەم پرسیارە رامان دەکێشێت بەرەو وردبوونەوە لە هەردوو چەمکی حەقیقەت و بابەتێتی و پەیوەندیی ئەم دووانە بەو گێڕانەوە مێژووییەی کەسێتی مێژوونوس و ئەو مێژووەی دەیگێڕێتەوە، واتە رەگەزی یەکەم و دووەمی گوتاری گێڕانەوە دەینوێنن.

مەسەلەی حەقیقەت و بابەتێتی سیفەتێکی گشتیی هەیە، چونکە تەنها پەیوەست نییە بە هەواڵەکانی کورد و بۆچوونی مێژوونوسان لە گێڕانەوەی ئەم هەواڵانەدا. مێژوونوس خاوەنی چەند میتۆدێکی گێڕانەوەی مێژوویی نییە و تەنها لە تێڕوانین و هەڵوێستەکاندا فرەیی هەیە. بۆیە، وەك پێشتریش بۆمان دەرکەوت، ئەگەر پرۆسەی گێڕانەوە لەگەڵ تێڕوانین و هەڵوێستەکاندا بە یەکەوە نەبەستین، ئەوا دیسان هەر قسەکردنێك لە بارەی حەقیقەتی گێڕانەوەی تایبەت بە ریوایەتی کوردەوە، ئەنجامەکانی گشتی دەبن.

[1] تاريخ الرسل والملوك، ج١، ص٦-٧.

کاتێك گێڕانەوەی مێژوویی بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی مێژوونوسەوە دەبەسترێت، ئەوا حەقیقەتی مێژوویی پێناسەیەکی دیاریکراوی دەبێت، کە بەستراوە بەم تێڕوانین و هەڵوێستانەوە، بۆیە لێکۆڵەر ناتوانێت بە پێی میکانیزمەکانی گێڕانەوەی تایبەت بە کورد، چەمکێکی چەسپاو و نەگۆڕ بدات بە حەقیقەتی مێژوویی، چونکە کاتێك ئەم حەقیقەتە دەخرێتە ریزی زاراوەکانی تری وەك ماقولیەت، وەك لە کاتی لێکۆڵینەوە لە ریشەی کورد و باسکردنی ئەم مەسەلەیە لای مێژوونوسەکان کردمان[1]، سیماکانی ون دەبن و رەهەندەکانی کاڵ دەبنەوە. بە بۆچوونی ئێمە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە گێڕانەوەی مێژوویی لە رەگەزی ئەندێشە و خەیاڵ بێبەش نییە و بابەتە ئەندێشەییەکان نەك هەر پەسەند بوون، بەڵکو سیاقی گشتیی گێڕانەوەیان تەواو دەکرد و بە هۆی نەبوونی سنورێکی دیاری کراو و روونیش لە نێوان لایەنی ئەندێشەیی و راستەقینەی رووداوەکاندا، ناتوانرێت پەی بەم رەگەزە ببرێت و لەوانی تر جیا بکرێتەوە.

لە دووبارە ناساندنەوەی ناوی کورد و ناوی شار و هەرێمەکانی وڵاتەکەیدا، هەروەها لە بەشتکردنی سروشتی کورد لای مێژوونوسان و ـ جار ناجارێکیش ـ جەختکردنەوە لە رێگرییەکەیان و (بە کێوی کردن)یان و نەهێشتنی کاراییان و دەرخستنی سەلبییەتی ئەم کاراییە لە کاتی باسکردنی کارایی مێژوویی نەتەوەکان و ...هتد دا، بە روونی ئەمەمان بەرچاو کەوت.

کەواتە لەم حاڵەتەدا، بابەتێتی لە گێڕانەوەی مێژووییدا ئەو واتایانە لە دەست دەدات، کە لەمڕۆدا پێی دراون، ئێمە لە کاتی قووڵبوونەوە لە بوونی کورد لە مێژووی ئیسلامیدا ئەمەمان بۆ دەرکەوتووە. تەنانەت هەندێك لە مێژوونوسە چاوکراوەکانی پێشووش، هەستیان بە نەبوونی بابەتێتی کردووە لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا، یەکێك لە مێژوونوسەکان پێی وایە، زۆر هۆکار هەن کەسەکان لە ئاست راستیدا کوێر دەکەن، وەك ((نەریتی باو، دەمارگیری، خۆ دەرخستن، کەوتنە شوێن ئارەزوو، بە دەستهێنانی دەسەڵات و شتی لەم بابەتە))[2].

---

(1) بڕوانە: پاری دووەمی بەشی یەکەم.

(2) البيروني: الاثار الباقية، ص٤. هەروەها بڕوانە رەخنەکانی ئیبن خەلدون لە مێژوونوسان بە هۆی راست نەگێڕانەوەی هەواڵەکانەوە: المقدمة، ص٧ بەدواوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی لەسەرەوە وتمان، مانای ئەوە نییە زانینی مێژوویی ـ لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا ـ پشتی بە میتۆدێکی رەخنەیی نەدەبەست، کە لە لێکۆڵینەوە و گەڕان بە دوای راستی لەناو ئەم گێڕانەوەیەدا یارمەتیی بدات. مێژوونوسە یەکەمەکان و ئەوانی دوای ئەوانیش، میتۆدێکی رەخنەیی توندیان بەسەر خۆیاندا سەپاند بوو، کە یەکەم و دوا مەبەست لێی، بەدیهێنانی بابەتێتی بوو لە نوسینی مێژووییدا. ئەم میتۆدەش، کە ناو نراوە میتۆدی دانەپاڵ ، لەو میتۆدانەی ئەهلی فەرموودە وەرگیراوە، کە بۆ ساغکردنەوەی راستیی فەرموودە گێڕراوەکانی پێغەمبەر پەیڕەویان دەکردن. ئێمە نامانەوێت بچینە ناو وردەکارییەکانی هەڵسەنگاندنی گێڕەرەوە و دانەپاڵی هەواڵەکان لەم میتۆدەدا[1]، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین بە پێی میتۆدەکە بابەتێتی گێڕانەوەکان و راستییەکەیان، بەستراوە بە مەسەلەی راستگۆیی بگێڕەکەوە، چونکە دان بە هەواڵەکەدا نانرێت، ئەگەر بێت و ئەو کەسەی دەیگەیەنێت بە راستگۆیی و دادپەروەری نەناسرا بێت[2]. تێبینی ئەوە دەکرێت ئەم میتۆدەدا کەم خۆی لە ناوەرۆکی دەقە وەرگیراوەکە دەدات و تەنها ئەوانە هەڵدەسەنگێنێت، کە هەواڵەکە دەگێڕنەوە[3]، طەبەری لە پێشەکیی کتێبەکەیدا، بە راشکاوی گوزارشتی لەمە کردووە، کاتێك دەڵێت: ((ئەو هەواڵانەی لە بارەی هەندێك لە کەسانی پێشووەوە لەم کتێبەی مندا هەن و خوێنەر نکۆڵییان لێ دەکات ... با بزانێت ئێمە هەر لە خۆمانەوە ئەوانەمان نەهێناوە، بەڵکو لەوانەمان وەرگرتوون کە بە ئێمەیان گەیاندوون، چۆن ئەوان بە ئێمەیان گەیاندوون، ئێمەش ئاوا گێڕاومانەتەوە))[4].

هێشتنەوەی رەخنە لە سنوری خوددا، کە ئاراستەی گێڕەرەوەکان بکرێت، نەك بابەتییانە ئاراستەی گێڕراوەکان بکرێت[5]، نابێتە هۆی کەمکردنەوەی گرنگیی

---

(1) بۆ ئاگاداربوون لەم میتۆدەو ئالیەتی ئیشکردنی بڕوانە: موافي: م. س، ص٥ بە دواوە.

(2) بڕوانە: كيليطو: الغائب ـ دراسة في مقامة للحريري، (الدار البيضاء: ١٩٨٧)، ص٤٣.

(3) بۆ ئەمە بڕوانە: هرنشو: علم التاريخ، ص٦١. الشرقاوي: ادب التاريخ، ص٢٦٨. ابو ضيف: منهج البحث التاريخي، ص٦٦.

(4) تاريخ الرسل والملوك، ج١، ص٧.

(5) ئەم دەستەواژەیە هیی لێکۆڵەر عەبدولحەمید عیبادییە، بڕوانە: هرنشو: م. س، ص٦١.

میتۆدەکە لە بەدیهێنانی بابەتێتیدا، ئەگەر بێت و واتای بابەتێتی لە چوارچێوەی زانینی مێژوویی ئیسلامیدا لەبەرچاو بگیرێت. چونکە لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا ئەم چەمکە تایبەتمەندییەکی بابەتیانەی هەیە، کە یان لەسەر پێویستبوونی شایەتی دان وەك ئەرکێکی ئاینی و دانانان بە حیکمەتی خواییدا، یان لەسەر دڵنیا نەبوون لە حەقیقەتی واقیع بنیات نراوە و لەبەر ئەوەی پێوەری هەڵبژاردنی رووداو و ئاشکراکردنی حەقیقەتی رووداوەکان بزرە، هەموو هەواڵەکان تۆمار دەکرێن[1]. بۆیە ئەو مێژوونوسانەی، بۆ نمونە، گێڕانەوەیەکی پەیوەست بە زوحاك و چۆنیەتی دەرکەوتنی کورد وەردەگرن[2]، بەم وەرگرتنە گوزارشت لە بێلایەنیی خۆیان دەکەن بەرامبەر گێڕانەوەیەك، کە لەوانەیە بە پێی توانای بیرکردنەوەی تایبەت بەو چاخانە، هەندێك راستیی تێدا بێت. لەبەر ئەوەی گێڕانەوەکە باوە، ناکرێت، یان پێویست نییە مێژوونوسی پابەند بە گێڕانەوە و یەك بەدوای یەکدا هاتنی رووداوەکان، پشتگوێی بخات لەبەر ئەوەی گومانی لە راستییەکەی هەیە.

ئەمە سەبارەت بەوەی پەیوەستە بەو گێڕانەوەیەی بە لای ئێمەوە ئەفسانەییە، بەڵام دەتوانرێت هەمان شت لە بارەی ئەو گێڕانەوانەش بوترێت، کە رووداوی واقیعیتر دەگێڕنەوە. بەڵام لە تواناشماندا نییە راستەقینەو نا راستەقینەکان بزانین، چونکە توانای ئاشکراکردنی ئەو هەنگاوانەمان نییە، کە گێڕانەوەکە تا ئەو کاتەی تۆمار کراوە، پیایاندا رۆیشتووە، بە هۆی باس نەکردنی ئەمە لە لایەن مێژوونوسەکانەوە، یان بە هۆی ئەوەوە، کە بەبێ گۆڕانکاری گێڕانەوەکەیان قبوڵ کردووە، بەمەش جەخت دەکەنەوە لە باوەڕبوونیان بە ویستی خوا و وەرگرتنی لایەنی دیاری واتا قبولکراو یان قبوڵ نەکراوەکەی هەواڵەکان، بەهۆی نەبوونی توانای پەی بردن بە لایەنە ناوەکییە شاراوەکەیان[3]. پاساوی نەبوونی ئەم توانایە، پابەندبوونە بە سیاقی گشتیی گێڕانەوەوە، چونکە لە کاتی باسکردنی کورددا وەك یەکەیەکی مێژوویی ئامادە، ئەم سیاقی

---

(1) بۆ ئەمە بڕوانە: العروي: العرب والفكر التاريخي، ص٨٥-٨٦.

(2) بۆ نمونە بڕوانە: ابن قتيبة: المعارف، ص٢٧٠. ابو حنيفة الدينوري: م. س، ص٥. المسعودي: مروج الذهب، ج١، ص٤٣٦.

(3) بڕوانە: العروي: م.س، ص٨٧.

گێڕانەوەیە تەحەکوم بە بیرکردنەوەی مێژوونوس دەکات، تەنانەت تێڕوانین و شێوازی گێڕانەوەش دیاری دەکات، کە لە رووی کاتەوە زۆر دوای هەواڵە گێڕراوەکە هاتووە. واتە گێڕانەوەکە پاساوی ئەوە دەدات بە مێژوونوس، کە بیر لە (ناوەوەی شاراوەی) هەواڵەکان نەکاتەوە، یان تەنها بەو ئەندازەیە، کە گێڕانەوەکە بواری بینینی راستی دەدات، بیر لە راستیی گێڕراوەکە بکاتەوە. لێرەدا باسکردنی وردەکاریی هەواڵێك یان تەنها ئاماژە پێکردنی، لە سیاقی گێڕانەوەدا، کاریگەریی نییە یان نابێتە هۆی گۆڕانی ئەو واتایەی دراوە بەو حەقیقەتە مێژووییەی، کە مێژوونوس دەیبینێت و لەناو هەواڵەکانی رووداوەکەدا دەیگێڕێتەوە، هەواڵی میر جەعفەری کوڕی فەهرجەشی کوردی[1]، لای هەریەك لە ئەبو حەنیفەی دینەوەری[2] و مەسعودی[3] تا رادەی کەم و کوڕی کورتە، کەچی لای ئیبن ئەثیر بەدرێژی باسکراوە[4]، بەڵام بە پێی سیاقی گشتیی گێڕانەوەکە، باسکردنی وەردەکاری هەواڵەکە نەبووەتە هۆی گۆڕانی مەغزای هەواڵەکە و هەواڵەکە هەر گوزارشت لە تێڕوانینی باو دەکات بۆ ئەم میرە کوردە، کە بەرهەڵستکارێکی یاخییە و لە دەسەڵاتی ناوەندی دەرچووە.

پاساو هێنانەوە بۆ هەڵوێستی مێژوونوس بەرامبەر حەقیقەتی مێژوویی، بە دەرنەچوون لە سیاقی گشتیی گێڕانەوە و پشت بەستن پێی، مانای بێ توانایییە لە بینینی دەلالەتەکانی تری رووداوەکەدا لە دەرەوەی چوارچێوەی گێڕانەوەکەدا، ئەو دەلالەتانەی، کە ئیبن خەلدون هەوڵی دەدا لە (مقدمە)کەیدا هەندێکیان دەرخات، ئەمەش کاتێك لە چوارچێوەی چەند چەمکێکی تایبەتی وەك دەوڵەت و قۆناغەکانی گەشەکردنی و حەتمیەتی روخانیدا، بارودۆخی کورد و ئەو نەتەوانەی تری شی دەکردەوە، کە بە کۆچەر ناو براون، ئەگەرچی ئەم پرۆسە شیکردنەوەییەش خۆی لە خۆیدا هەوڵێکە بۆ ئەوەی رووداوەکان بخاتە ناو گوتارێکی جیاواز لە گوتاری باو و باڵادەست. بەڵام زۆربەی مێژوونوسان ئەم رێگەیان نەگرتبوە بەر و هەوڵیشیان نەدەدا گێڕانەوەی مێژوویی بگۆڕن

---

(1) لە بارەیەوە بڕوانە ل ی توێژینەوەکە.

(2) الاخبار الطوال، ص٣٦٧.

(3) التنبیه والاشراف، ص٣٢٣-٣٢٤.

(4) الکامل، ج٦، ص٥٠٦-٥٠٧.

بە جۆرێکی تر لە بەڵگە هێنانەوە، کە ببێتە شیکەرەوەی سروشتی رووداوەکە نەك کاتەکەی یان شوێنەکەی، یان بە پێی پەسەندێتییەکەی لای مێژوونوس لە رووی هزری - مەبەستمان هزری مێژوویيە - یان لە رووی میتۆدییەوە.

بێگومان ئەم گێڕانەوە مێژووییە کاریگەریی هەیە لەسەر تێگەیشتن لە خودی مێژوو، چونکە گێڕانەوەکە سیماکانی ئەم چەمکە دیاری دەکات و لە میانەی سەپاندنی لۆجیکی تایبەتیی خۆی بەسەریدا، بە تایبەتی لە تێڕوانینی واقیع و نوسینەوەیدا، چێوەداری دەکات و لەوێوە پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەو واقیعە. مێژوونوسیش کاتێك هەواڵەکان دەگێڕێتەوە، لەم واقیعە گێڕانەوەییەوە دەست پێدەکات، واتە لەو واقیعەوە، کە جارێکی تر لە رێگەی گێڕانەوەوە بەرهەمی هێناوەتەوە.

بۆیە تێگەیشتن لەو واقیعەی کورد، کە ئێمە لە رێگەی کتێبە کۆن و نوێکانی مێژووی ئیسلامییەوە دەرکی پێ دەکەین، تەنها لە رێگەی ئەو گێڕانەوەوە دەبێت، کە پرۆسەی بەرهەمهێنانی کورد ئەنجام دەدات و ریشە و سروشت و بوون و کارایيان دادەرێژێتەوە و ئەم کۆمەڵە دەخاتە ناو لۆجیکە تایبەت و تێڕوانینە جیاوازەکانی خۆیەوە.

بەپێی لۆجیکی گێڕانەوەی پەیڕەوکراوی ناو زانینی مێژوویی، واقیعییەتی هەواڵی کورد لەو پێگەیەدا بەرجەستە دەبێت، کە لە ناو هەواڵە گشتییەکان و پەیڕەوکردنی زنجیرەی هەواڵەکان وەك میتۆدی نوسینەوەی مێژوو، بە دەستی هێناوە. کاتێك مێژوونوس هەواڵەکانی ساڵێکی دیاری کراو دەنوسێتەوە و دەڵێت: «هەر لەو ساڵەدا - وفیها» و باسی هەواڵە کوردییەکە دەکات، بەمە شوناسێکی واقیعییانە دەدات بە هەواڵەکە و لێرەدا هەواڵەکە واقیعێکە و دەگێڕرێتەوە، گێڕانەوەشی بەم جۆرە زامنی مانەوە و بەردەوامیی دەکات لە زانینی مێژووییدا. پرۆسەی گێڕانەوەش ماهییەت و دەرکەوتنەکانی واقیعەکە لە خۆی دەگرێت.

شوناسی گێڕانەوەیی مێژوویی، بواری بینینی شوناسە راستەقینە یاخود رەهاکانی کوردمان پێ نادات لە قۆناغی ئیسلامی کلاسیکیی مێژووەکەیاندا، لە لێکۆڵینەوەی ئەم مێژووەشدا بەردەوام ئەم شوناسە تەحەکوم بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانمان دەکات. واتە شوناسی گێڕانەوەی کوردی، ئەگەر چی زۆر جار وێنەیەکی سەلبیی کوردمان پێ دەدات، بەڵام - لە کۆتاییدا - تاکە وێنەی کورد دەنوێنێت و کۆمەڵێك بۆچوونمان لە

بارەی ئەم کۆمەڵە مرۆییەی سەر بە کایەی ئیسلامی و چۆنیەتی قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەیان پێشکەش دەکات. هەروەها شوناسی گێڕانەوەیی، دەرکەوتنی خودی کورد لە سەردەمێکی زەمەنیی دیاریکراودا دەخاتە ڕوو، ناشتوانین لەم خودە تێ بگەین، ئەگەر بێت و پشت بەم دەرکەوتنە و سەرجەم دەرکەوتنەکانی تری نەبەستین.

# ئەنجام

١.رۆشنبیری ئیسلامی لە بەرهەمهێنانی زانینی مێژووییدا، لە رووی میتۆد و بیرۆکەوە بە مەرجەعیەتی ئاینی و سیاسی کاریگەر بووە و ئەمەش بووەتە هۆی لە قالبدانی ئەم زانینە و سنوردارکردنی چوارچێوە میتۆدی و تێگەییەکەی.

٢.ئەم زانینە مێژووییە، هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە، هەوڵی داوە لە رێگەی وەرگرتنی رۆشنبیری فارسی و تێڕوانینی بۆ ئەم کۆمەڵە مرۆییەوە کورد بناسێت. هەروەها ئەم زانینە نوێیە هەوڵی داوە ناوی ((کورد)) لە سیاقی عەرەبی ـ ئیسلامیی ناساندن و ناوناندا بەکار بهێنێت، بۆیە چەندین پێناسەی بۆ ئەم ناولێنانە داناوە، هەروەها ناوی شار و هەرێمە کوردییەکانیش دەلالەتێکیان پێدراوە، کە لەگەڵ چوارچێوەی تازەی رۆشنبیری و توانا ناساندنەکانیدا بگونجێت، بەبێ ئەوەی ئەم پرۆسەیە رەنگدانەوەی تێگەیشتن بێت لە کورد و بۆچوونی تایبەتیان لەسەر ناوی خۆیان و ناوی شارەکانیان.

٣.لەو مەسەلانەی زانینی مێژوویی ئیسلامی بە شێوەیەکی فراوان باسی کردوون، مەسەلەی رەچەڵەك و ریشەی کوردە. ئەم زانینە نەیتوانیوە لە کاتی باسکردنی ئەم بابەتەدا لەو چوارچێوە تایبەتە دەرچێت، کە لە بارەی ریشەی میللەتە جیاوازەکانەوە هەبوو. بۆیە هەوڵەکانی دۆزینەوەی ریشەی کورد بە ئەفسانە دەورە دراون و سنورێکی روون لە نێوان مێژوو و ئەفسانەدا نییە. ریشەی کورد بوارێکی چالاکی رۆشنبیری عەرەبی و فارسی بوو، چونکە لە ململانێی نێوان خۆیاندا بەکاریان دەهێنا، بۆ ئەوەی بە رووی ئەوی تری رکابەردا پێگەی خۆیان بچەسپێنن. بۆیە ئاسایی بوو بوترێت کورد لە فارس کەوتوونەتەوە یان لە عەرەب (قەحتانی و عەدنانییەکان). ئەوەی کۆنترۆڵی گێڕانەوەکانی ئەم بوارەش دەکات پەیوەندیی (ئێمە)یە بە (ئەوانی تر)ەوە، چ پەیوەندیی میللەتە بەرهەم هێنەرەکانی مێژوو بێت، وەك فارس و عەرەب لە نێوان خۆیاندا، یان پەیوەندیی و مامەڵەکردنیان بێت لەگەڵ کورد. ئەوەی ئەم

مەسەلەیەی قوولتر کردەوە بەشداریکردنی کورد بوو - بە تایبەتی چینە باڵاکەیان - لە برەودان بەم ریشە ساختانە و دەستگرتنی خاوەن پلە و پایەکانیان بوو بە ریشە عەرەبییەکانەوە وەك گوزارشتکردنێك لە حاڵەتێکی بوونی کورد و باوەڕهێنانیان بەوەی پێدراوەکانی ئەوانی تر لە بارەیانەوە راستن.

٤.زانینی مێژوویی جەخت لە باڵادەستیی مۆرکی خێڵگەری دەکاتەوە بەسەر کۆمەڵگەی کوردیدا بە درێژایی مێژووی ئیسلامیی. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی مێژوونوس کورد بچوێنێت بە ئەعراب، یاخود کورد و ئەعراب بکات بە هاو واتای یەك و کار لەسەر گشتاندنی ئەم هاو واتاییە و جێکردنەوەی بکات لە یادەوەریدا. لە لایەکی ترەوە ئەم مێژوونوسانە و کەسانی تریش پێکهاتەی گشتیی کۆمەڵایەتیی کوردیان بەستووتەوە بەو خاکەی لەسەر دەژین و بە پێی شوێنگەی وڵاتەکەیان، لە دابەشکردنی جیۆگرافیایی پەیڕەوکراویش لەو سەردەمەدا، جەختیان لە کاریگەریی ژینگە کردوەتەوە لەسەر سروشت و رەفتاری کورد. هەموو ئەمانە رێگەیان بە کەسانی وەك مەسعودی و ئیبن خەلدون داوە کورد لەناو میلەتە کۆچەرەکاندا دابنێن و پاشان هەموو سیفەتەکانی ئەم نەمەتە کۆمەڵایەتییە بدەنە پاڵیان.

رەنگدانەوەی ئەم دیاریکردنە زۆرە ملێ و خاوەن یەك رەهەندەی بونیاتی کۆمەڵایەتیی کوردیش لای مێژوونوسەکان، لە دەستنیشانکردنی دیاردەی رێگریی ئەم کوردان دەردەکەوێت، مێژوونوسانی سەرجەم قۆناغە مێژووییەکان ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییەیان زەق کردووەتەوە، وەك ئەوەی بیانەوێت بەمە ئاماژە بە سروشتی نەگۆڕ و چەسپاوی کورد بکەن. لە دەرکەوتەکانی ئەم سروشتە کۆمەڵایەتییە، بۆ نمونە لای مێژوونوس و فەیلەسوفەکان، زاڵبوونی ئارەزوو و غەریزەیە - وەك ئازایەتی - بەسەریاندا و لاوازیی توانای عەقڵییانە، ئەم حوکمەش لەوەوە سەرچاوەی نەگرتووە، کە لە هەموو رەهەندەکانەوە کوردییان خوێندووەتەوە، بەڵکو لەوێوە سەرچاوەی گرتووە، کە تەنها لە یەك گۆشەی تەسکەوە ئەو میللەتانەیان بینیوە.

٥.وەك زانینی مێژوویی بۆمان روون دەکاتەوە، بوونی کورد لە مێژوودا بە چەند مەرجێکی دیاریکراو بەدی دێت. ئەوان کاتێك دەسەلات بوونیان بداتێ،

بوونیان هەیە، ئەم دەسەڵاتەش ئەو دەسەڵاتەیە مێژوونوس پابەندە پێوەی - چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان لەسەر ئاستی شێوەگیر بوونە زەینییەکاندا بێت - یان کاتێك بوونیان هەیە، کە پەیوەندییان بە دەسەڵاتی ناوەندییەوە هەیە. بە کۆتایی هاتنی پەیوەندییەکەیان بەم جۆرە دەسەڵاتەوە، ئەم بوونەشیان کۆتایی دێت، یان دەبێتە بوونێکی سەلبی. بەم جۆرە دەبینین لە ڕوانگەی زانینی مێژووییەوە، لەو قۆناغەوە، کە خەلافەتی ئیسلامی لە سەرەتای بە یەك گەیشتنی لەگەڵ کورد تا دەوروبەری چارەکی یەکەمی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زاینی، خاوەنی دەسەڵاتێکی ناوەندی و سەروەرییەکی ڕەها بوو، کورد لە دەرەوەی مێژوو بوون. بۆیە لای مێژوونوسانی ئەو سەردەمە، جۆرە غاییکردنێکی کورد بەدی دەکرێت و لە کتێبەکانیاندا باسی کوردیان نەکردووە، کاتێکیش باس دەکرێن، وێنەی یاخییەکی بەرهەڵستکار و دەرچوو لە دەسەڵاتی ناوەندییان هەیە. بەڵام لە هەمان کاتدا، مێژوونوس وڵات و هەواڵەکانی وڵاتەکەیان پشتگوێ ناخات، چونکە بەشێکە لە پێکهاتەکانی دەسەڵاتی باڵای دەوڵەتی خەلافەت.

٦.بەڵام ئەم هەڵوێستە لە کورد زۆر بەردەوام نابێت و لە ئەنجامی ئەو پەرەسەندن و گۆڕانکارییانەی کایەی ئیسلام لەسەر ئاستی سیاسی و کارگێڕی بە خۆیەوە بینی، کورد چوونە ناو مێژووەوە و بوونی خۆیان هەبوو و تەنانەت بوونە خاوەنی قەوارەی سیاسیی خۆیان، مێژوونوسیش دانی بەم کیانانەدا ناوە و هەواڵی میرە کوردەکانی تۆمار کردووە، بەڵام بینیمان مێژوونوس لە پێدانی بوونێکی مێژووییدا بە کورد و قەوارەکانیدا، چەند مەرجێکی هەبوو. بوونی کورد تەنها لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا قبوڵ دەکرا، ئەم چوارچێوەیە فەقیهەکان دیارییان کردبوو و ئەو مێژوونوسەش بەرجەستەی دەکرد، کە بەردەوام دەسەڵاتی سیاسی و ئەرکەکانی ئەوەی دەست بەسەر ئەو دەسەڵاتەدا دەگرێت لە میرە کوردەکان و ئەوانی تری لەبەرچاو دەگرت، ئەگەر چی بەهۆی بارودۆخەکانەوە بوونی ئەم میرە کوردانە بووە بوونێکی سروشتی و نەگۆڕ. دەرکەوتنی جۆرێکی نوێش لە جۆرەکانی نوسینی مێژوویی، کە نوسینەوەی مێژووی ناوخۆییە، کاریگەریی هەبوو لە چەسپاندنی ئەم بوونە سروشتییەدا،

ئەم جۆرە نوسینە بانگەوازی دانانی کورد بوو ـ بە تایبەتی خاوەن دەسەلاتەکانیان ـ لە جەرگەی مێژوودا و بە سەنتەر کردنیان بوو لە مێژووی نوسراودا.

٧.ئەم قۆناغەی بوونی کورد لە مێژوودا قۆناغێکی روونتر بوو لە قۆناغی پێشوو، چونکە ئەو کەسێتییەی کورد دەردەکەوێت، کە لای مێژوونوسەکان پەسەندە، ئەمەش بە هۆی بالادەستیی رەهەندی جیهادی بوو بەسەر رەهەندەکانی تری ئەم کەسێتییەدا. بوونی کورد لە سەردەمی نێوان هاتنی سەلجوقییەکان و سەردەمی ئیبن خەلدوندا، بە زۆری بوونێکی جیهادی بوو. بۆیە زانینی مێژوویش لەسەر ئەم بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و تەنانەت مێژوونوسەکان دەیانویست ئەم بوونە جیهادیەیان زەق بکەنەوە و بایەخ بە جۆرەکانی تری بوونی مێژوییان نەدەن، ئەمەش بە هۆی پێویستیی کۆمەڵی ئیسلامییەوە بوو بەم جۆرە لە بوون، بە تایبەتی دوای ئەوەی صەلاحەدینی ئەیوبی وەك کەسێتییەکی کوردی، لای ئەم کۆمەڵە پێگەیەکی مەرکەزیی بەدەست هێنا. ئەم مەرکەزیەتە کاریگەری هەبوو لەسەر هزری ئەو مێژوونوسانەی ـ وەك نەریتێك ـ باوەڕیان پێی هەبوو و برەویان پێ دەدا.

دوای ئەمە بینینی کورد پەیوەست بوو بەو پەرەسەندنانەی بەسەر کایەی ئیسلامیدا هاتن و بوونە هۆی پاشەکشەی رۆشنبیری عەرەبیی ئیسلامی و کورتبوونەوەی لە ولاتی شام و میسردا، لێرەوە مێژوونوسەکانیش لە دیدی دەسەلاتی سیاسیی مەملوکییەوە لە کوردیان دەڕوانی، دەسەلاتی مەملوکیش لە ململانێی لەگەڵ هێزە مەغۆلییەکان لە رۆژهەلاتی ئیسلامیدا، هەوڵی دەدا کورد بە لای خۆیدا رابکێشێت، مێژوونوسیش لەم چوارچێوەیەدا باسی کوردی دەکرد و لێی دەرنەدەچوو.

٨.کورد خاوەنی کارابیەکی مێژوویی زۆر نەبوو و لە ریزبەندییەکانی مێژوونوسە موسڵمانەکان بۆ نەتەوە شارستانییە ـ کاراکان لە مێژوودا هیچ پێگەیەکیان نەبوو، ئەم ناکارابیە یاخود کارابیە سەلبییە و دانانی کورد بە یەکێك لە نەتەوە کێوییەکان، بەسترا بوو بە هەڵسەنگاندنی مێژوونوسەکان و پەی بردنیان بە کارایی مێژوویی لە چوارچێوەی مێژووی گشتی یان مێژووی

سەراپاکێردا، ئەم هەڵسەنگاندن و پەی پێ بردنەش پەیوەست بوو بە چەند حوکمێکی پێشینە و چوارچێوەیەکی سنوردارو تەسکی بیرکردنەوەوە، کە لە مەرکەزیەتی ئەتنی و رۆشنبیری نەتەوە شارستانییەکان و پەراوێزخستنی نەتەوەکانی تری وەك کوردا خۆی دەنواند. بەڵام بە هاتنی ئیسلام و تێگەیشتنی گشتگیرانەی لە ئوممەت، تێڕوانین لە کارایی نەتەوەکان گۆڕا و چەند بیرمەندێك دەرکەوتن، لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە لە کارایی نەتەوەکانیان دەڕوانی، بە تایبەتی ئیبن خەلدون باوەڕی بەوە هەبوو کارایی مێژوویی تایبەتە بە نەتەوە کۆچەرییەکان و کوردیش یەکێکە لەو نەتەوانە. بەڵام تێڕوانینی ئیبن خەلدون لە کارایی کورد، لە ئەنجامی تێکەڵاوییەکی راستەوخۆوە نەبووە لەگەڵ ئەم نەتەوەدا، بەڵکو ـ بە پلەی یەکەم ـ لە رێگەی نوسراوی ناو کتێبەکانەوە بووە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو کاتێك ـ بە پێی ئەم ریزبەندییە ـ لە دەوڵەتی ڕوانیوە، کوردی لە ریزبەندیی نەتەوەکاندا دەرنەهێناوە. کاتێکیش بەراوردێکی پێکهاتەییمان کرد لە نێوان تیۆرەکانی و ئەوەی لە بارەی میرنشینە کوردییەکانەوە دەیڵێت وەك نمونەیەکی قەوارەی سیاسیی پەسەند لای ئەو، کە لەسەر بنەمایەکی کۆچەری راوەستاوە، جۆرە لێکچوونێك یان تەواوکارییەکمان بینی لە نێوان مێژووی تیۆری لای ئیبن خەلدون و ئەو مێژووەی بۆ کوردی نوسیوە، بە بێ ئەوەی ئەمە مانای لێکچوونێك و وەك یەکییەکی تەواو بگەیەنێت.

٩.کارای کوردی پەسەند کراو یان ویستراو لە زانینی مێژوویی ئیسلامیدا، ئەو تاکە کارا، یان ئەو تاکەیە، کە سەر بە کۆمەڵێکی تایبەت یان چینێکی پسپۆڕە. ئەم جۆرە کاراییەش لەو جۆرە نوسینە مێژووییانەدا بەرجەستە بووە، کە ناونراوە (چینەکان و ژیاننامەکان). بەپێی پێدراوە مێژووییەکانی ئەم جۆرە نوسینەش، ئینتیمای کارا بۆ کۆمەڵە پسپۆڕەکەی (وەك فەقیهەکان و صۆفی و خاوەن نازناوەکان) زاڵتر و باڵادەستترە لە ئینتیما بۆ کۆمەڵە ئەتنییەکەی (کورد)، چونکە ئەم ئینتیما ئەتنیکییە لە مەسەلەی ناساندنی کاراکە تێ نەدەپەڕی. لە لایەکی ترەوە ئەم جۆرە نوسینە مێژووییە، لە کاتی تۆمارکردنی هەواڵەکانی کارای کورددا بەوە جیا دەکرێتەوە، کە خود پەسەندیی پێوە دیارە،

چونکە مێژوونوس تەنها ئەو زانیارییانە لە بارەی کاراکەوە دێنێت، کە لەگەڵ میتۆدی تۆمارکردنی هەواڵەکانی چینەکە یان کۆمەڵە پسپۆڕەکەدا دەگونجێن.

.١٠ ئەنجامی ئەو میتۆدەی، کە مێژوونوسەکان مێژوویان پێ تۆمار دەکرد، داخرانی زانینی مێژوویی بوو بەسەر خۆیدا و نەبوونی توانای رزگاربوون بوو لە قاڵبە نەگۆڕ و دیاریکراوەکانی بیرکردنەوەی مێژوویی، لە بینینی رووداوەکاندا. مێژوونوسەکان کاتێك هەواڵەکانیان لە گێڕەرەوەی هەواڵەکان وەردەگرت، ئەو هەواڵانەیان لەو چوارچێوەیە دەرنەدەهێنا، کە ئەو گێڕەرەوانە تیایدا بیریان دەکردەوە. ئەوان لە گێڕانەوە مێژووییەکەدا هەستیان بە ماقوڵیەت و پەسەندێتیی هەواڵەکە دەکرد لە سیاقی گشتیی مێژووی هەمەکیدا. گێڕانەوە مێژووییەکە بواری بەوان نەدەدا بەسەر ناوەرۆکی هەواڵەکەدا بکرێنەوە و لە شیکردنەوەیدا قووڵ ببنەوە و ئەوە بهێنن کە گێڕانەوەکە بواری پێنادات وەك کۆکردنەوەی هەواڵەکانی کورد لە سیاقێکی مێژوویی تایبەتدا، چونکە ئەم هەواڵانە لە سیاقە مێژووییە گشتییەکاندا شوناسێکی گێڕانەوەییان هەیە و ئەم شوناسە بە جۆرێك لە جۆرەکان تەحەکوم بە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی مێژوونوسانەوە دەکات.

# سەرچاوەکان

## یەکەم: دەستنوس


العمري: شهاب الدين احمد بن يحي بن فضل الله (٧٤٩هـ/١٣٤٨م)

١ ـ مسالك الابصار في ممالك الامصار، مخطوط مصوّر عن نسخة مكتبة احمد الثالث، طوبقا سراي، اسطانبول، اصدار: فؤاد سزكين، المجمع العلمي العراقي، رقم (٢٩/٣٠٠جـ).

ابن ناظر الجيش: عبد الرحمن محمد التميمي الحلبي (٧٨٦هـ/ ١٣٨٤م)

٢ ـ تثقيف التعريف، نسخة مصورة على المايكروفلم، رقم (١٧٩٧)، مكتبة الدراسات العليا، كلية الآداب، جامعة بغداد.


## دووەم: سەرچاوە عەرەبییە لاوەکییەکان


ـ القرآن الكريم

الآبي: الوزير الكاتب ابي سعد منصور بن حسين (ت٤٢١هـ/١٠٣٠م).

١ـ نثر الدرّ، حققه: منير محمد المدني، مراجعة: د. حسين نصار، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٠.

ابن ابي اصيبعة: موفق الدين احمد بن قاسم بن خليفة (ت٦٦٨هـ/١٢٦٩م).

٢ ـ عيون الانباء في طبقات الاطباء، شرح وتحقيق: نزار رضا، دار الحياة، بيروت، د. ت.

ابن الاثير: عزالدين ابو الحسن علي بن ابي الكرم محمد الجزري (ت٦٣٠هـ/١٢٣٣م).

٣ ـ التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل، تحقيق: عبدالقادر احمد طليمات، دار الكتب الحديثة، القاهرة، ١٣٨٢هـ/١٩٦٣م.

٤ ـ الكامل في التاريخ، دار صادر، بيروت، ١٩٧٩-١٩٨٢.

٥ ـ اللباب في تهذيب الانساب، دار صادر، بيروت، ١٤٠٠هـ/ ١٩٨٠م.

الادريسي: محمد بن محمد بن عبدالله ادريس بن يحي (ت٥٦٠هـ/١١٦٥م).

٦ـ نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، دون مكان وسنة طبع.

الازدي: ابو زكريا يزيد بن محمد بن اياس (ت٣٣٤هـ/٩٤٥م).

٧ـ تاريخ الموصل، تحقيق: علي حبيبة، دار التحرير، ١٩٦٧.

الازهري: ابو منصور محمد بن احمد (ت٣٧٠هـ/٩٨٠م).

٨ـ تهذيب اللغة، حققه: علي حسن هلالي، مراجعة: محمد علي النجار، دار الكاتب العربي، القاهرة، ١٩٦٧.

اسامة بن منقذ: مؤيد الدولة ابو مظفر اسامة الكناني الشيزري (ت٥٨٤هـ/١٢٨٨م).

٩ـ كتاب الاعتبار، حرره: فيليب حتي، مطبعة جامعة برنستون، الولايات المتحدة، ١٩٣٠.

الاسنوي: عبدالرحيم بن علي بن عمر الاموي (ت٧٧٢هـ/١٣٧٠م).

١٠ـ طبقات الشافعية، تحقيق: عبدالله الجبوري، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٧.

الاشعري: ابو الحسن علي بن اسماعيل (ت٣٢٤هـ/٩٣٦م).

١١ـ مقالات الاسلاميين واختلاف المصلين، تحقيق: محمد محي الدينعبدالحميد، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٣٦٩هـ/١٩٥٠م.

الاصبهاني: ابو نعيم احمد بن عبدالله (ت٤٣٠هـ/١٠٣٨م).

١٢ـ حلية الاولياء في طبقات الاصفياء، دار الكتب العلمية، بيروت، د. ت.

الاصبهاني: حمزة بن حسن (ت٣٦٠هـ/٠٧٠م).

١٣ـ تاريخ سني ملوك الارض والانبياء، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦١.

الاصبهاني: ابو الفرج علي بن حسين (ت٣٥٦هـ/٩٦٦م).

١٤ـ كتاب الاغاني، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٩٧.

الاصطخري: ابو اسحق ابراهيم بن محمد الفارسي (ت بعد ٣٤٠هـ/٩٥١م).

١٥ـ المسالك والممالك، مطبعة بريل، ليدن، ١٩٢٧.

ابن الاعثم الكوفي: ابو محمد احمد بن اعثم (ت٣١٤هـ/ ٩٢٦م).

١٦ـ كتاب الفتوح، دار الندوة الجديدة، بيروت، ١٩٧٥.

افلاطون: توفي (٣٤٨ قبل الميلاد).

١٧ـ جمهورية افلاطون، ترجمة ودراسة: د. فؤاد زطريا، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٤.

الانصاري: شمس الدين ابو عبداللهمحمد ابي طالب الدمشقي المعروف بشيخ الربوة (ت٧٢٧هـ/١٣٢٦م).

١٨ـ نخبة الدهر في عجائب البرّ والبحر، مطبعة لايبزك، ١٩٢٣، اعادت طبعه باوفيست مكتبة المثنى ببغداد.

الباخرزي: ابو الحسن علي بن الحسن بن ابي الطيب (ت٤٦٧هـ/ ١٠٧٤م).

١٩ـ دمية القصر وعصرة اهل العصر، تحقيق: د. سامي مكي العاني، مطبعة المعارف، بغداد، ١٣٩١هـ/١٩٧١م.

البدليسي: الامير شرفخاني بن شمس الدين (ت حوالي ١٠١٠هـ/ ١٦٠١م).

٢٠ ـ شرفنامة، ترجمة: محمد جميل الروذبياني، الطبعة الثالثة، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٢.

ابن بطوطة: ابو عبدالله محمد بن عبدالله بن محمد بن ابراهيم اللواتي الطنجي (ت٧٧٩هـ/١٣٧٧م).

٢١ ـ رحلة ابن بطوطة، قدّم له وحققه: عبدالهادي التازي، مطبعة المعارف الجديدة، الرباط، ١٩٩٧.

البغدادي: ابو منصور عبدالقاهر بن طاهر الاسفراييني (ت٤٢٩هـ/١٠٣٧م).

٢٢ ـ الفرق بين الفرق، تحقيق: لجنة احياء التراث العربي، دار الجيل ودار الآفاق، بيروت، ١٩٨٧.

البكري: ابو عبيد عبدالله بن عبدالعزيز الاندلسي (ت٤٨٧هـ/١٠٩٣م).

٢٣ ـ معجم ما استعجم، تحقيق: مصطفى السقا، القاهرة، ١٣٦٨هـ/١٩٤٩م.

البلاذري: احمد بن يحي بن جابر (ت٢٧٩هـ/٨٩٢م).

٢٤ ـ جمل من انساب الاشراف، تحقيق: سهيل زكار ورياض الزركلي، دار الفكر للطباعة، بيروت، ١٩٩٦.

٢٥ ـ فتوح البلدان، دار ومكتبة الهلال، بيروت، ١٩٨٣.

البنداري: قوام الدين الفتح بن علي بن محمد (ت٦٣٢هـ/١٢٣٤م).

٢٦ ـ تاريخ دولة آل سلجوق، دار الآفاق الجديدة، بغداد، ١٩٨٣.

٢٧ ـ سنا البرق الشامي، تحقيق: رمضان ششن، دار الكتاب الجديد، بيروت، ١٩٧٢.

البيروني: ابو ريحان محمد احمد (ت٤٤٠هـ/١٠٤٨م).

٢٨ ـ الآثار الباقية عن القرون الخالية، طبعه: ادوار سخاو، لايبزك، ١٩٢٣، اعادت طبعه بالاوفيست مكتبة المثنى، بغداد، ١٩٦٤.

٢٩ ـ كتاب الجماهر في معرفة الجواهر، حيدر آباد/ الدكن، ١٣٣٥هـ.

البيهقي: ابراهيم بن محمد (ت٣٢٠هـ/٩٣٢م

٣٠ ـ المحاسن والمساوئ، تحقيق: محمد ابوالفضل ابراهيم، مطبعة نهضة مصر، القاهرة، د. ت.

التنوخي: ابو علي لحسن بن ابي القاسم (ت٣٨٤هـ/٩٩٤م).

٣١ ـ الفرج بعد الشدّة، تحقيق: عبود الشالجي، دار صادر، بيروت، ١٩٧٨.

٣٢ ـ نشوار المحاضرة واخبار المذاكرة، تحقيق: عبود الشالجي، دار صادر، بيروت، ١٩٧١.

ابن تيمية: ابو العباس تقي الدين احمد بن عبدالحليم الحراني (ت٧٢٨هـ/١٣٢٧م

٣٣ ـ السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية، راجعه وحققه: علي سامي النشار واحمد زكي عطية، الطبعة الثانية، دار الكتاب العربي، القاهرة، ١٩٥١.

الثعالبي: ابو منصور عبدالملك بن محمد النيسابوري (ت٤٣٠هـ/١٠٣٨م).

٣٤ ـ تاريخ غرر السير لامعروف بكتاب غرر اخبار ملوك الفرس وسيرهم، مكتبة الاسدي، طهران، ١٩٦٣.

٣٥ ـ ثمار القلوب في المضاف والمنسوب، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، دار نهضة مصر للطباعة واللنشر، القاهرة، ١٣٨٤هـ/١٩٦٥م.

٣٦ ـ خاص الخاص، قدّم له: حسن الامين، دار ومكتبة الحياة، بيروت، د. ت.

٣٧ ـ لطائف المعارف، تحقيق: ابراهيم الابياري وحسن كامل الصيرفي، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، د.ت.

الجاحظ: ابو عثمان عمرو بن بحر (ت٢٥٥هـ/٨٦٩م).

٣٨ ـ البيان والتبين، حققه: فوزي عطوي، الشركة اللبنانيةللكتاب، بيروت، ١٩٦٨.

٣٩ ـ الحيوان، حققه: عبدالسلام محمد هارون، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، القاهرة، ١٩٦٨.

٤٠ ـ رسائل الجاحظ، حققه: عبدالسلام محمد هارون، مكتبة الخانجي، القاهرة، ١٣٨٤هـ/١٩٦٤م.

ابن جبير: ابو الحسن محمد بن احمد (ت٦١٤هـ/١٢١٧م).

٤١ ـ رحلة ابن جبير، دار التراث العربي، بيروت، ١٩٦٨.

الجرجاني: علي محمد الشريف (ت٨١٦هـ/١٤١٣م).

٤٢ ـ كتاب التعريفات، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٦٩.

الجهشياري: ابو عبدالله محمد بن عبدوس (ت٣٣١هـ/٩٤٢م).

٤٣ ـ الوزراء والكتاب، باعتناء: مصطفى السقا وآخرون، مطبعة مصطفى البابي الحلبي واولاده، القاهرة، ١٣٥٧هـ/١٩٣٨م.

الجواليقي: ابو منصور موهوب بن احمد بن محمد (ت٥٤٠هـ/١١٤٥م).

٤٤ ـ المعرب من الكلام الاعجمي على حروف المعجم، تحقيق: احمد محمد شاكر، الطبعة الثانية، مطبعة دار

الكتب، القاهرة، ١٣٨٩هـ/١٩٦٩م.

ابن الجوزي: جمال الدين ابي الفرج عبدالرحمن بن علي (ت٥٩٧هـ/١٢٠٠م).

٤٥ ـ تلبيس ابليس ، مكتبة الشرف الجديد، بغداد، ١٩٨٣.

٤٦ ـ كتاب الاذكياء، حققه: محمد مرسي الخولي، القاهرة، ١٩٧٠.

٤٧ ـ المنتظم في تواريخ الملوك والامم، حققه وقدّم له: الاستاذ الدكتور سهيل زكار، دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ١٤١٥هـ/١٩٩٥م.

حاجي خليفة: مصطفى بن عبدالله (ت١٠٦٧هـ/١٦٥٧م).

٤٨ ـ كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، طبعة فلوكل.
ابن الحبيب: ابو جعفر محمد بن حبيب (ت٣٤٥هـ/٩٥٦م).
٤٩ ـ المحبر، تحقيق: ايلزه ليختن شيتز، مركز الموسوعات العالمية، بيروت، د. ت.
ابن الحزم الاندلسي: ابو محمد علي بن سعيد حزم (ت٤٥٦هـ/١٠٦٤م).
٥٠ ـ جمهرة انساب العرب، تحقيق: لجنة من العلماء، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٨هـ/١٩٨٨م.
٥١ ـ الفصل في الملل والاهواء والنحل، الطبعة الثانية، دار المعرفة للطباعة والنشر، بيروت، ١٣٩٥هـ/ ١٩٧٥م.
الحسيني: ابو الحسن علي بن ابي الفوارس (ت٦٢٤هـ/١٠٥٨م).
٥٢ ـ زبدة التواريخ في اخبار الامراء والملوك السلجوقية، تحقيق: محمد نورالدين، الطبعة الثالثة، دار إقراء للنشر والتوزيع، بيروت، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م.
الحليمي: حسين بن حسن بن محمد البخاري (ت٤٠٣هـ/١٠١٢م).
٥٣ ـ المنهاج في شعب الايمان، تحقيق: حلمي محمد فودة، دار الفكر، بيروت، ١٩٧٩.
ابن حمدون: محمد بن حسن بن محمد علي (ت٥٦٢هـ/١١٦٦م).
٥٤ ـ التذكرة الحمدونية، تحقيق: احسان عباس وبكر عباس، دار صادر، بيروت، ١٩٩٦.
الحميري:
٥٥ ـ التيجان في ملوكالحمير واليمن، نشره: م. ف. كرنكو، حيدر آباد/ الدكن، ١٣٤٧هـ.
الحنبلي: احمد بن ابراهيم (ت٨٧٦هـ/١٤٧٢م).
٥٦ ـ شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق: ناظم رشيد، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨.
ابو حنيفة الدينوري: احمد بن داود بن ونند (ت٢٨٢هـ/٨٩٥م).
٥٧ ـ الاخبار الطوال، تحقيق: عمر فاروقَ الطبّاع، دار الارقم بن ابي الارقم، بيروت، د. ت.
ابن الحوقل: ابو القاسم محمد بن علي النصيبي (ت٣٦٧هـ/٩٧٨م).
٥٨ ـ صورة الارض، الطبعة الثالثة، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٩.
الخزرجي: موفق الدين ابو الحسن علي بن وهاس الزبيدي (ت٨١٢هـ/١٤٠٩م).
٥٩ ـ العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، تحقيق: محمد بن علي الاكوع، صنعاء، ١٩٨٣.
الخطيب البغدادي: الحافظ ابو بكر احمد بن علي (ت٤٦٣هـ/١٠٧٠م).
٦٠ ـ تاريخ بغداد، دار الكتاب العربي، بيروت، د. ت.
ابن خلدون: ابو زيد عبدالرحمن بن محمد (ت٨٠٨هـ/١٤٠٦م).
٦١ ـ تاريخ ابن خلدون،تحقيق: خليل شحادة، الطبعة الثالثة، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٦.

٦٢ ـ التعريف بابن خلدون ورحلته غربا وشرقا، دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٧٩.
٦٣ ـ المقدمة، دار العودة، بيروت، ١٩٨١.

ابن خلكان: ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد الاربلي (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
٦٤ ـ وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، بيروت، د. ت.

خليفة بن خياط: ابو عمرو خليفة بن خياط بن ابي هبيرة (ت٢٤٠هـ/٨٥٤م).
٦٥ ـ تاريخ خليفة بن خياط، تحقيق: د. اكرم ياء العمري، دار القلم ومؤسسة الرسالة، بيروت، ١٣٩٧هـ/ ١٩٧٧م.

الخوارزمي: ابو عبدالله محمد بن احمد بن يوسف الكاتب (ت٣٧٨هـ/٩٩٧م).
٦٦ ـ مفاتيح العلوم، مطبعة الشرق، القاهرة، ١٣٤٢هـ/١٩٢٣م.

الخوارزمي: محمد بن عباس الطبري.
٦٧ ـ رسائل الخوارزمي، تقديم: الشيخ نسيب وهيبة الخازن، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٠.

ابن دحية: مجد الدين عمر بن حسن بن علي المعروف بذي النسبين (ت٦٣٣هـ/١٢٣٦م).
٦٨ ـ النبراس في تاريخ خلفاء بني العباس، حققه ووضع حواشيه: عباس العزاوي، مطبعة المعارف، بغداد،
١٩٤٨.

ابن دريد: ابو بكر محمد بن الحسن بن دريد (ت٣٢١هـ/٩٣٣م).
٦٩ ـ الاشتقاق، تحقيق: عبدالسلام محمد هارون، مؤسسة الخانجي، القاهرة، ١٣٧٨هـ/١٩٥٨م.
٧٠ ـ جمهرة اللغة، مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية، حيدر آباد/الدكن، ١٣٤٥هـ.

الدواداري: ابو بكر عبدالله بن ايبك (ت٧٣٦هـ/١٣٣٥م).
٧١ ـ كنز الدرر وجامع الغرر ـ الدرة المضيئة في اخبار الدولة الفاطمية، تحقيق: صلاح الدين المنجد، مطبعة
لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٣٨٠هـ/١٩٦١م.
٧٢ ـ الدرة الزكية في اخبار الدولة التركية، تحقيق: اولرخ هارمان، القاهرة، ١٩٧١.

الذهبي: شمس الدين ابي عبدالله محمد بن احمد بن عثمان (ت٧٤٨هـ/١٣٤٧م).
٧٣ ـ تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، دار الكتاب اللبناني، بيروت، حوادث ووفيات (١٤١هـ ـ ١٦١هـ)، ١٩٨٨، الاجزاء الاخرى طبع في ١٩٩٩.
٧٤ ـ تذكرة الحفاظ، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٥٨.

٧٥ ـ سير اعلام النبلاء، تحقيق: شعيب الارنؤوط ومحمد نعيم القرقوسي، الطبعة الثالثة، مؤسسة الرسالة،
بيروت، ١٩٨٦.
٧٦ ـ العبر في خبر من غبر، حققه وضبطه: ابو هاجر محمد السعيد، دار الكتب العلمية، بيروت، د. ت.
٧٧ ـ المشتبه في الرجال اسمائهم وانسابهم، تحقيق: علي محمد البجاوي، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، ١٩٦٢.

الرازي: ابو بكر محمد بن زكريا (ت٣٢٠هـ/٩٣٢م).
٧٨ ـ رسائل فلسفية، الطبعة الثانية، دار الآفاق الجديدة، بيروت، ١٩٧٧.

ابن رشد: ابو الوليد محمد بن احمد (ت٥٩٥هـ/١١٩٨م).
٧٩ ـ الضروري في السياسة ـ مختصر كتاب السياسة لأفلاطون، نقله عن العبرية: احمد شحلان، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٨.

الروذراوردي: ابو شجاع محمد بن الحسين ظهير الدين (ت٤٨٧هـ/١٠٩٤م).
٨٠ ـ ذيل كتاب تجارب الامم، اعتنى بنسخه وتصحيحه: هـ. ف. امدروز، مطبعة شركة التمدن الصناعية، مصر، ١٩١٦.

الزبيدي: ابو الفيض محب الدين محمد مرتضى الحسيني (ت١٢٠٦هـ/١٧٩١م).
٨١ ـ تاج العروس من جواهر القاموس، دار مكتبة الحياة، بيروت، د. ت.
٨٢ ـ ترويح القلوب في ذكر ملوك بني ايوب، تحقيق: صلاح الدين المنجد، مطبعة الترقي، دمشق، ١٩٧١.

الزمخشري: ابو القاسم محمود بن عمر بن محمد (ت٥٣٨هـ/١١٤٣م).
٨٣ ـ الجبال والامكنة والبقاع، تحقيق: ابراهيم السامرائي، مطبعة السعدون، بغداد، ١٩٦٨.

ابن الساعي: ابو طالب تاج الدين علي بن انجب بن عثمان البغدادي (ت٦٤٧هـ/١٢٧٦م).
٨٤ ـ الجامع المختصر في عنوان التواريخ وعيون السير، تحقيق: مصطفى جواد، المطبعة السريانية الكاثوليكية، بغداد، ١٩٣٤.

سبط ابن الجوزي: شمس الدين يوسف بن قزاوغلي (ت٦٥٤هـ/١٢٥٦م).
٨٥ ـ مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، السفر الاول، حققه وقدّم له: احسان عباس، دار الشروق، بيروت، ١٤٠٥هـ/ ١٩٨٥م.
٨٦ ـ مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، حوادث (٣٤٥-٤٤٧هـ)، تحقيق: جنان خليل الهموندي، بغداد، ١٩٩٠.
٨٧ ـ مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، حوادث (٤٤٨-٤٨٠هـ)، عني بنشره وراجعه: علي سويم، مطبعة

الجمعية التاريخية التركية، انقرة، ١٩٦٨.

السبكي: تاج الدين عبدالوهاب بن تقي الدين (ت٧٧١هـ/١٣٦٩م).

٨٨ ـ طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق: محمد محمود الطناحي وعبدالفتاح محمد الحلو، مطبعة عيسى البابي

الحلبي، القاهرة، ١٩٦٤-١٩٧٠.

السخاوي: شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت٩٠٢هـ/١٤٩٧م).

٨٩ ـ الاعلان بالتوبيخ لمن ذم التاريخ، تحقيق: فرانز روزنتال، منشور ضمن كتاب: علم التاريخ عند المسلمين، ترجمة: صالح احمد العلي، مكتبة المثنى، بغداد، ١٩٦٣.

ابن سعد: محمد بن سعد (ت٢٣٠هـ/٨٤٤م).

٩٠ ـ الطبقات الكبرى، حققه: احسان عباس، دار بيروت للطباعة والنشر، بيروت، ١٤٠٠هـ/١٩٨٠م.

ابن سعيد المغربي: ابو الحسن علي بن موسى بن سعيد (ت٦٨٥هـ/١٢٨٦م).

٩١ ـ كتاب الجغرافيا، تحقيق: اسماعيل المغربي، المكتب البخاري للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٠.

السلمي: محمد بن الحسين بن محمد (ت٤١٢هـ/١٠٢١م).

٩٢ ـ طبقات الصوفية، تحقيق: نورالدين شريبة، الطبعة الثالثة، مكتبة الخانجي، القاهرة، ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م.

السمعاني: ابو سعيد عبدالكريم بن محمد منصور (ت٥٦٢هـ/١١٦٧م).

٩٣ ـ الانساب، تقديم وتعليق: عبدالله عمر البارودي، دار الجنان، بيروت، ١٤٠٨هـ/١٩٨٨م.

٩٤ ـ التحبير في المعجم الكبير، تحقيق: منيرة ناجي سالم، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٣٩٥هـ/١٩٧٥م.

السيوطي: جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر (ت٩١١هـ/١٥٠٦م).

٩٥ ـ المزهر في علوم اللغة وانواعها، شرحه وضبطه: محمد احمد جاد المولى وآخرون، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، د. ت.

ابو شامة: شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي (ت٦٦٥هـ/١٢٦٦م).

٩٦ ـ الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: محمد حلمي محمد احمد، المؤسسة المصرية للتأليف والطباعة ـ القاهرة، ج١، ق١، ١٩٥٦، ج١، ق٢، ١٩٦٢.

٩٧ ـ الذيل على الروضتين او تراجم رجال القرنين السادس والسابع، عني بنشره: عزت العطار الحسيني، الطبعة الثانية، دار الجيل، بيروت، ١٩٧٤.

ابن شاهنشاه الايوبي: مجدالدين بن تقي الدين عمر (ت٦١٧هـ/١٢٢٠م).

٩٨ ـ مضمار الحقائق وسر الخلائق، تحقيق: حسن حبشي، دار الهنا للطباعة، القاهرة، ١٩٦٨.

ابن شداد: ابو المحاسن بهاءالدين يوسف بن رافع الاسدي (ت٦٣٢هـ/١٢٣٤م).

٩٩ ـ النوادر السلطانية والمهاسن اليوسفية (سيرة صلاح الدين الايوبي)، تحقيق: جمال الدين الشيال، الدار المصرية للتأليف والترجمة، القاهرة، ١٩٦٤.

ابن شداد: عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (٨٦٤هـ/١٢٨٥م).

١٠٠ـ الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، (قسم الجزيرة)، تحقيق: يحيى عبارة، منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي، دمشق، ١٩٧٨.

الشهرستاني: ابو الفتح محمد بن عبدالكريم (ت٥٤٨هـ/١١٥٣م).

١٠١ـ كتاب الملل والنحل، تحقيق: محمد بن فتح الله بدران، الطبعة الثالثة، مطبوعات الشريف الرضي، قم، ١٣٦٤هـ. ش.

الشيرازي: المؤيد في الدين هبة الله بن موسى بن داود (ت٤٧٠هـ/١٠٧٧م).

١٠٢ـ سيرة المؤيد في الدين داعي الدعاة، تحقيق: محمد كامل حسين، دار الكتّاب المصري، القاهرة، ١٩٤٩.

ابن الصابوني: جمال الدين ابي حامد محمد (ت٦٨٠هـ/١٢٨١م).

١٠٣ـ تكملة اكمال الكمال، حققه وقدم له: مصطفى جواد، عالم الكتب، بيروت، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦.

الصابي: ابو الحسين هلال بن المحسن (ت٤٤٨هـ/١٠٥٦م).

١٠٤ـ تاريخ الهلال الصابي، اُلحق بذيل الروذراوردي، عني بتصحيحه: هـ.ف. امدروز وبعده د.س. مرجليوث، مطابع شركة التمدن الصناعية، مصر، ١٩١٩.

١٠٥ـ رسوم دار الخلافة، تحقيق: ميخائيل عواد، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٦٤.

١٠٦ـ المنتزع من كتاب التاجي، تحقيق وشرح: محمد حسين الزبيدي، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧.

صاعد الاندلسي: صاعد بن احمد بن عبدالرحمن (ت٤٦٢هـ/١٠٦٩م).

١٠٧ـ طبقات الامم، حققه: لويس شيخو اليسوعي، المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ١٩١٢.

ابن صصري: محمد بن محمد (ت٧٩٩هـ/١٣٩٧م).

١٠٨ـ الدرّة المضيئة في الدولة الظاهرية، تحقيق: وليم برينر، جامعة كاليفورنيا، بيركرلي، د. ت.

الصفدي: صلاح الدين خليل بن ايبك (ت٧٦٤هـ/١٣٦٣م).

١٠٩ـ نكث الهميان في نكت العميان، طبعه: احمد زكي بك، المطبعة الجمالية، القاهرة، ١٩١١.

١١٠ـ الوافي بالوفيات، ج١، باعتناء: هلموت ريتر فرانز شتاير، الاجزاء الاخرى باعتناء: س. ديدريننغ وفرانشتايز وآخرين، فيسبادن، ١٩٦٤-١٩٨٢.

الصولي: ابوبكر محمد بن يحي (ت٣٣٥هـ/٩٤٧م).

١١١ـ اخبار الراضي بالله والمتقي لله، تحقيق: ونشر: ج. هيورث دن، الطبعة الثانية، دار المسيرة، بيروت، ١٩٧٩.

